


# شەرحی
# اللؤلؤ والمرجان
## فيما اتفق عليه الشيخان
## البخاري ومسلم

وضعه
محمد فؤاد عبد الباقي

بە پێنووسی
نوری فارس حەمەخان

سەرپەرشتی چاپ
محمود أحمد محمد

(بەرگی چوارەم)

منتدى إقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamontada.com

# شەرحی

# اللُّؤْلُؤُ وَالْمَرْجَان

# فِيما اتَّفَقَ عليه الشَّيْخَان

## البخاري ومسلم


وضَعَهُ

محمد فؤاد عبدالباقي

بەپێنووسی

نوری فارس حەمە خان

سەرپەرشتی چاپ

محمود أحمد محمد


﴿بەرگی چوارەم﴾



*********************************************

📖 ناوی کتێب: شەرحی اللؤلؤ والمرجان فیما أتفق علیه الشیخان البخاری ومسلم.

📖 نووسینی: مامۆستا نوری فارس حەمە خان

📖 تیراژ: ١٠٠٠ دانە

📖 ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردن (١٢٧٨)ی ساڵی (٢٠١٥ز)ی پێدراوە.

📖 کۆمپیوتەرو دیزاین: (سامان محمد أمین)

📖 لەسەر ئەرکی کتێبخانەی ئارام لەسلێمانی چاپکراوە، مافی چاپکردنەوەی بۆ کتێبخانەی ناوبراوە.



# ٢٩- كِتَابُ الحَدَوِدِ
# نامەی تۆڵەی تاوان (حودود)

{بڕوانە: تاجول ئوصول/٣، زنجیرە: ٨١ و ٨٢ لە ژمارە: ٢٢٨٧ هەتا ژمارە: ٢٣٠٥ + فیقهی ئاسان بەرگی دووەم زنجیرە: ٣١٩ چاپی تاران + تەجریدی بوخاری = مختصر صحیح البخاری، بەرگی پێنجەم، زنجیرە: ٨٩ لە ژمارە: ٢٠٦٥ هەتا ژمارە: ٢٠٧١ + مختصر صحیح مسلم بەرگی سێیەم لاپەڕە: ١ چاپی یەکەم، زنجیرە: ٨١٤ هەتا زنجیرە: ٨٢٧ لە ژمارە: ١٠٣٦ وە هەتا ژمارە: ١٠٥٠} + {بلوغ المرام/٣ لەژمارە: ١٠٣٦وە هەتا ژمارە: ١٢٨٢} .

## (١) باب حَدِّ السَرِقَةِ وَنِصَابُهَا
## باسی تۆڵەی دزیو ئەندازە (نصاب)ی دزی

١٠٩٧- عن عائشة رَضِي اللّٰهُ عَنْها عن النبي صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قال: تقطع اليد في ربع دينارٍ فصاعداً. (الحديث٦٧٨٩ طرفاه في: ٦٧٩٠، ٦٧٩١)؛ [١٠٩٧]

عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ خۆشەویست -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: دەستی دز بەپێی شەرع، کاتێ دەبڕرێ کە بایی چارەکێ دیناری زێڕ بدزێ، یا بایی زیاتر بدزێ. (تاجی کوردی/٣ ل/٢٣٤ ژ/٩٠ ژ/٢ — باسی سزای دزی — ش/د/ت/ن).

---

[١٠٩٧] تجرید/٥، ژمارە: ٢٠٦٩ = ٦٧٨٩ بخاری. پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ١٠٤٣ = ٤٣٧٨ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٨٦ رقم الباب/١٣).





١٠٩٨- عن عبدالله بن عمر رَضِي اللّٰـهُ عَنْهُمـا أنَّ رسـول الله صَـلّى اللّٰـهُ عَلَيْـهِ وَسَلّمَ قطع في مجنٍ ثمنه ثلاثة دراهم. (الحديث ٦٧٩٥ أطرافـه في: ٦٧٩٦، ٦٧٩٧، ٦٧٩٨): [١٠٩٨]

ئيبنو عومـەر -ڕەزای خوادایـان لێ بـێ- فـەرمووی: پێغەمـەر -دروودی خـوای لەسەر بێ- دەستی دزێکی بڕی، لەسەر دزینی قـەڵخانێ کـە بـایی سـێ درەم بـوو! (تاجی کوردی/٢ ل/٢٣٤ ز/٩٠ ژ/٢ — ش/د).

١٠٩٩- عن أبي هريرة رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ عن النبي صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ قـال: لعَـنَ الله الـسارق يـسرق البيـضة فتقطـع يـده، و يـسرق الحبـل فتقطـع يـده. (الحـديث ٦٧٨٣): [١٠٩٩]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فـەرمووی: خۆشەویـست -دروودی خـوای لەسەر بێ- فەرمووی: نەفرینو لەعنەتی خودا لەدز، کەئەوەندە نەفسی سـووکە، لەسەر دزینـی هێلکـەیێ، یـا بـەهۆی دزینـی گوریـسێکەوە دەسـتی دەبـڕن بـەپێی شـەرعی خـوا. (تـاجی کـوردی/٢ ل/٢٣٣ ژمـارە: ١، زنجـیرە: ٩٠ = ژمـارە: ٢٣٤٢ — ش/د/ت/ن باسی دزی..).

---

[١٠٩٨] تجریـد/٥، ژمـارە: ٢٠٧١ = ٦٧٩٥ بخـاری. پوختـەی موسـلیم/٢، ژمـارە: ١٠٤٤ = ٤٣٨٢ شـیحا (بخاری رقم الكتاب/٨٦ رقم الباب/٧).

[١٠٩٩] تجریـد/٥، ژمـارە: ٢٠٦٨ = ٦٧٨٣ بخـاری. پوختـەی موسـلیم/٢، ژمـارە: ١٠٤٥ = ٤٣٨٤ شـیحا (بخاری رقم الكتاب/٨٦ رقم الباب/٧).

## (٢) باب قطع السَّارق الشَّريف وَغيرِه وَالنهى عَنِ الشَّفَاعَةِ في الحُدُودِ

١١٠٠- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُا) زَوْجِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم): أَنَّ قُرَيْشًا أَهَمَّهُمْ شَأْنُ الْمَرْأَةِ الَّتِي سَرَقَتْ فِي عَهْدِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) فِي غَزْوَةِ الْفَتْحِ، فَقَالُوا: مَنْ يُكَلِّمُ فِيهَا رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، فَقَالُوا: وَمَنْ يَجْتَرِئُ عَلَيْهِ إِلاَّ أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ حِبُّ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، فَأُتِيَ بِهَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَكَلَّمَهُ فِيهَا أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ، فَتَلَوَّنَ وَجْهُ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ: « أَتَشْفَعُ فِي حَدٍّ مِنْ حُدُودِ اللَّهِ »؟ فَقَالَ لَهُ أُسَامَةُ: اسْتَغْفِرْ لِي يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَلَمَّا كَانَ الْعَشِيُّ، قَامَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَاخْتَطَبَ، فَأَثْنَى عَلَى اللَّهِ بِمَا هُوَ أَهْلُهُ ثُمَّ قَالَ: « أَمَّا بَعْدُ، فَإِنَّمَا أَهْلَكَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ أَنَّهُمْ كَانُوا إِذَا سَرَقَ فِيهِمُ الشَّرِيفُ تَرَكُوهُ، وَإِذَا سَرَقَ فِيهِمُ الضَّعِيفُ أَقَامُوا عَلَيْهِ الْحَدَّ، وَإِنِّي وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْ أَنَّ فَاطِمَةَ بِنْتَ مُحَمَّدٍ سَرَقَتْ لَقَطَعْتُ يَدَهَا »، ثُمَّ أَمَرَ بِتِلْكَ الْمَرْأَةِ الَّتِي سَرَقَتْ فَقُطِعَتْ يَدُهَا، قَالَتْ عَائِشَةُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُا): فَحَسُنَتْ تَوْبَتُهَا بَعْدُ، وَتَزَوَّجَتْ، وَكَانَتْ تَأْتِينِي بَعْدَ ذَلِكَ فَأَرْفَعُ حَاجَتَهَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم). {الحديث: ٤٣٨٧ = ٤٣٧٩ فم. تجريد/٤، رقم: ١٤٧٠ = ٣٧٣٣، ٢٦٤٨، ٣٤٧٥، ٣٧٣٢، ٣٧٣٣، ٤٣٠٤، ٦٧٨٧، ٦٧٨٨، ٦٨٠٠} :[١١٠٠]

عائیشه (ڕەزای خودای لێ بێ) کەهاوسەری پێغەمبەرە (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ژنێکی مەخزوومی دزیی کردبوو، قورەیش زۆر بەتەنگیەوە بوون، ئەمەیش لەسەردەمی پێغەمبەردا بوو، لەکاتی غەزای ئازادکردنی مەککەدا بوو، گوتیان: بەکێ بڵێین کە لەبارەیەوە لەگەڵ پێغەمبەردا قسە بکا؟ گوتیان: کێ پرکێشی ئەوە دەکا لە ئوسامەی کوڕی زەید بەولاوە، کە

[١١٠٠] تجرید/٤، ژمارە: ١٤٧٠ = ٣٧٣٣ بخاری. پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١٠٤٦ = ٤٣٨٧ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٦٠ رقم الباب/٥٤).




خۆشەویستی پێغەمبەرە (دروودی خودای لەسەر بێ) جا کەژنەکەیان برد بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئوسامە لەبارەیەوە قسەی لەگەڵ پێغەمبەر کرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕەنگی گۆڕاو فەرمووی: (چۆن هەڵەی وادەکەی، تکا دەکەی بۆ جێبەجێ نەکردنی حەددێ لە حەددە شەرعییەکان، کە خودای گەورە خۆی دایناوە؟) جا ئوسامە لە هەڵەکەی خۆی پەشیمان بۆوەو عەرزیکرد: ئەی پێغەمبەری خودا! داوای لێخۆشبوونم لەخودا بۆ بکە، کەلەم هەڵەیە لێم خۆش بێ!

جا سەر لەئێوارێ، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەڵسایەوە وتارێکی دا، لەپێشا سوپاس و ستایشێکی جوانی خودای کرد، بەشێوەیە کەهەر شایانی ئەوبێ، ئەوجا فەرمووی: (پاش سوپاس و ستایشی خودای گەورە، ئەی خەڵکینە! دەزانن کە بۆچی نەتەوەکانی پێش ئێوە لەناو چوون؟ چونکە کاتێ کەسێکی خانەدان لەناویانا دزی بکردایە، وازیان لێ دەهێنا، بەڵام ئەگەر لازەبوون و بێ نەواکانیان دزییان بکردایە حەددیان لێ دەدان، جوولەکەکان وابوون، حەددیان لەئاغاو بەگەکانیان نەدەدا، بەڵام هەژارێکیان دزی بکردایە دەستیان دەبڕی. جا سوێندم بەیەزدانی پاك من ناهەقی وا قەبووڵ ناکەم، گریمان فاطیمەی کچی موحەممەدیش، کەکچی خۆمە، دزی بکا، بەپێی یاسا نامەی خودا، دەستی دەبڕم!

عائیشە فەرمووی: ئینجا فەرمانی کرد دەستی ژنەکەیان بڕی، لەوەدوا، تەوبەیەکی جوانی کرد، وە شووی کرد، وەگەڵێ جار دەهات بۆلای من و هاموشۆی دەکردم، جا ئەگەر کارێ، داخوازییەکی ببوایە، بەمنی دەگوت، منیش عەرزی حەزرەتم دەکرد، ئەویش داخوازییەکەیی جێبەجێ دەکرد بۆی). {تاج/٣، زنجیرە: ١٠٠، ژمارە: ٢٣٩٨، چ/٤ — ش/د/ت/ن}.

## (٤) باب رَجم الثيب في الزنى

## بەردەبارانی ژن‌و پیاو، هاوسەرداربن، یان لە هاوسەر جیاوە بووبن، ئەنجام دەدرێ، کاتێ داوێنپیسی بکەن!

١١٠١- عَنِ عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ أَنَّهُ سَمِعَ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) يَقُولُ: قَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) وَهُوَ جَالِسٌ عَلَى مِنْبَرِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): إِنَّ اللَّهَ قَدْ بَعَثَ مُحَمَّدًا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِالْحَقِّ، وَأَنْزَلَ عَلَيْهِ الْكِتَابَ، فَكَانَ مِمَّا أُنْزِلَ عَلَيْهِ آيَةُ الرَّجْمِ، قَرَأْنَاهَا وَوَعَيْنَاهَا وَعَقَلْنَاهَا، فَرَجَمَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَرَجَمْنَا بَعْدَهُ، فَأَخْشَى إِنْ طَالَ بِالنَّاسِ زَمَانٌ أَنْ يَقُولَ قَائِلٌ: مَا نَجِدُ الرَّجْمَ فِي كِتَابِ اللَّهِ تعالى فَيَضِلُّوا بِتَرْكِ فَرِيضَةٍ أَنْزَلَهَا اللَّهُ، وَإِنَّ الرَّجْمَ فِي كِتَابِ اللَّهِ حَقٌّ عَلَى مَنْ زَنَى إِذَا أَحْصَنَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ إِذَا قَامَتِ الْبَيِّنَةُ، أَوْ كَانَ الْحَبَلُ أَوْ الاعْتِرَافُ. {الحديث: ٤٣٩٤ = ٤٣٨٦ فم} : [١١٠١]

عوبەیدوڵلای کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عوتبە (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لە عەبدوڵلای کوڕی عەبباسم بیست (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەیفەرموو: عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێ بێ) لەسەر دوانگە (واتە: لەسەر مینبەر)ەکەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: بێگومان کەخودا موحەممەدی ناردووە لەگەڵ ئایینی ڕاست‌و دروستداو قورئانی ناردۆتە خوارەوە بۆی، ئایەتی بەردە بارانکردنی داوێنپیسان جاران ئایەتێ بوو لە قورئان کە ئەمە دەقەکەی بوو: {الشَّيْخُ وَالشَّيْخَةُ إِذَا زَنَيَا فَارْجُمُوهُمَا الْبَتَّةَ} واتە: پیاوو ژنی بەتەمەن، ئەگەر زینایانکرد، بەبێ چەندو چوون سەنگە سەریان بکەن). ئیمامی عومەر فەرمووی: ئێمە بەخودی خۆمان ئەو ئایەتی ڕەجمەمان

---

[١١٠١] بخاری. حدود: ٦٨٢٩. پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١٠٣٧ - ٤٣٩٤ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٨٦ رقم الباب/٣١).

خوێندوەو لە مەبەستەکەی تێ گەیشتووین، هەرچەندە ئەم ئایەتە لە تیلاوەتدا نەسخ بۆتەوەو لە خوێندنەوەدا سڕاوەتەوەو لە قورئاندا نانووسرێ، بەڵام دەگەرو کاریگەریو برشتی هەرماوەو هێشتا حوکمی پێ دەکرێ، بۆیە پێغەمبەر خۆی (دروودی خوای لەسەر بێ) لەسەردەمی خۆیا، کاری پێ دەکردو داوێنپیسانی بەردەباران دەکرد، ئەوەتانێ ئێمەی یارانو جێنیشینانی ئەویش، لەپاش خۆی داوێنپیسان بەردەباران دەکەین، بەڵام دەترسم کە موسوڵمانان بکەونە سەردەمو رۆژگارێکەوە، کەسێ پەیدا ببێ بڵێ: لەنامەی خودادا ئایەتی بەردەباران کردنی تیانییە، ئەوسا بە نەکردنی ئەرکێ، کەخودا لەقورئانا دایناوە لەسەریان، تاوانبار دەبنو لەرێگە دەردەچن! بێگومان کە بەردەباران کردن فەرمانی نامەی خودایەو راستو دروستو هەقە، وەئەم فەرمانە (واتە: ئەم حوکمە) بۆ ئەو پیاوو ژنانەیە، کە لەوەو پێش ژنیان هێنابێو بەدەستیان گرتبێ، یاخود شوویان کردبێو مێرد چووبێتە لایانو بەدەستی گرتبن، واتە: موحصەن بن.

وەڵێ لەهەلو مەرجێکا کە بەڵگە هەبێ، کە برێتییە لەچوار شایەتی نێرینەی دادپەروەر، یاسك دیاری بداو سکەکە هیچ ئەگەرێکی تری نەبێ، یاپێ لێنانو چوونە ژێرو دانان بەتاوانا، لە ئارادا هەبێ). {تاج/٣، زنجیرە: ٩٢، ژمارە: ٢٣٥٦ — ش/د/ت/ن} .




## (٥) باب مَن إعتَرَفَ عَلَى نَفْسِهِ بالزِنى
## باسى پيلێنان (ئيعتيراف) له داوێنپيسى

١١٠٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: أَتَى رَجُلٌ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَهُوَ فِي الْمَسْجِدِ فَنَادَاهُ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي زَنَيْتُ . فَأَعْرَضَ عَنْهُ ، حَتَّى رَدَّدَ عَلَيْهِ أَرْبَعَ مَرَّاتٍ ، فَلَمَّا شَهِدَ عَلَى نَفْسِهِ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ ، دَعَاهُ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ « أَبِكَ جُنُونٌ ». قَالَ: لاَ. قَالَ: « فَهَلْ أَحْصَنْتَ». قَالَ: نَعَمْ. فَقَالَ: النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم): « اذْهَبُوا بِهِ فَارْجُمُوهُ»: (١١٠٢)

{بوخاری/مەناقیب/٣٦٣٥، ١٣٢٩، ٤٥٥٦، ٦٨١٩، ٦٨٤١، ٧٣٣٢، ٧٥٤٣. مختصر صحيح مسلم/٣، ژمارە: ١٠٣٨ = ٤٤٠٠ ء ٤٤٠١ ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا. صحيح مسلم: ١٦٩١}:

ئەبوهورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرموی: ماعیزی ئەسلەمی (رەزای خودای لێ بێ) هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزیکرد: کە داوێنپیسی کردووە، لەوکاتەدا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەمزگەوت بوو، بەڵام وەڵامی پیاوەکەی نەدایەوە، بەڵکوو رووی کرد بەولاوە، سا بەڵکوو واز لەو قسانە بهێنێ، بەڵام ئەو لەولاوە چووە بەردەمی‌و عەرزیکردەوە: ئەی پێغەمبەری خودا! داوێنپیسم کردووە، دیسان پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وەڵامی نەدایەوەو روووی لێ وەرگێڕایەوە، بەڵام ماعیز دیسانەوە رۆیشتەوە بەردەمی‌و عەرزیکردەوە: کەوا داوێنپیسی کردووە، جا هەتا چوار جار ئەم پێلێنانەی دووبارە کردەوەو چوار جار شایەتی لەخۆی دا، کە شەروالپیسی کردووە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بانگی کردو پێی

(١١٠٢) شەرحی بلوغ المرام/٣، ژمارە: ١٢٣٣. بخاری. مناقب/٣٦٣٥ پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ١٠٣٨ - ٤٤٠٠ شيحا (بخاری رقم الكتاب/٨٦ رقم الباب/٢٢).

فەرموو: (ئایا تۆ شێتیت؟) ماعیز (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: (نەخەیر، شێت نیم) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئایا ژنت هێناوە؟) ماعیز (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: (بەڵێ ژنم هێناوە).

ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئادەی بیبەن بەردەبارانی بکەن) ئەوانیش بردیان بەردەبارانیان کرد هەتا مرد. {تاج/٣، زنجیرە: ٩٢، ژمارە: ٢٣٥٧ ج/٤}.

**ڕوونکردنەوە:**

ماعیز کوڕی مالیکی ئەسلەمی (ڕەزای خودای لێ بێ) دائەنرێ بەهاوەڵی پێغەمبەر، چیرۆکی بەردەبارانکردنی لەصەحیحی بوخاریو لە صەحیحی موسلیمدا هەیە، دائەنری بەمەدینەیی، لەپاش ئەوەی کە داوێنپیسی لێی ڕوویدا، تەوبەیەکی جوانی کردو پەشیمان بۆوەو هاتە خزمەتی پێغەمبەرو پێی لەتاوانی خۆی ناو وازی نەهێنا، هەتا بەردەباران کرا، لە فەرموودەیەکا دەفەرموێ: بۆ ئەوەی کە ماعیز پەشیمان ببێتەوە، پێغەمبەر پێی فەرموو: ڕەنگە هەر ماچت کردبێ؟ گوتی: نەء، تاپێی فەرموو: بەشێوەیێ کە دەق بێ لەسەر داوێنپیسیو هیچ لێکدانەویەکی تر هەڵنەگرێ، پێی فەرموو: {هَلْ نِكْتَهَا؟}: ئایا گاوتە؟ گوتی: بەڵێ گاومە. لەگێڕانەوەیەکا: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەپاش سەنگەسار کردنەکەی فەرمووی: (ئەمە تەوبەیەکی وەهای کرد، ئەگەر بێتو دابەش بکرێ بەسەر نەتەوەیەکی گەورەدا، بەشی هەموویان دەکا).

لە فەتحولباریدا لەم شوێنەدا دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئێستا ماعیز لەڕووبارەکانی بەهەشت خۆی دەشۆرێ!!).

جا لەم ڕوانگەوە زاناکان (ڕەحمەتی خودایان لێ بێ) دەفەرموون:

١- بەهیچ شێوەیێ دروست نییە جنێو بەهاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بدرێو لەپاش مەرگیان تانەو تەشەریان لێ بدرێ، با گوناهی گەورەشیان لێ قەومابێ چونکە صوحبە، خەڵاتێکی خوداییە.

٢- گێڕانەوەی ئەم جۆرە فەرموودانە بۆ موسوڵمانانو باسکردنیان لەناو وتارو پەڕاوو شتی وادا دروستەو ناباشیی تیادا نییە، وە دانانرێ بەغەیبەتو بوختانو پاشملەگۆیی، چونکە مەبەست لەباسکردنی ئەم جۆرە داستانانە کە لەصەحابەو هەندێ پیاوباشانی نەتەوەی ئیسلام قەوماون،مەبەست سووکیو بێ ڕێزیو تانەو تەشەر نییە لەوان، بەڵکوو مەبەست پەند وەرگرتنە لەم جۆرە باسو خواسەو لە پلەی یەکەما، مەبەست زانینو فێربوونی بڕیارە شەرعییەکانە لێیان.

ئەمە گێڕانەوەی ژمارە (١٢٣٣)ی بەرگی سێی بلوغ المرام بوو، لە (ئەصڵە - اللؤلؤ والمرجان)ەکەدا ئەمەی پترە، لەکۆتایی فەرموودەکەوە:

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: خۆم یەکێك بووم لەوانەی کە بەردەبارانیانکرد، لە نوێژگاکە بەردەبارانمانکرد، کە تەختاییەك بوو لەنزیکی مزگەوتەکەی پێغەمبەرەوە بوو لەمەدینە، بۆ نوێژی جەژنو بۆنەکان دەچوون لەوێ نوێژی بەکۆمەڵیان دەکرد، جا بەرە بەرە کە بەردەکان ئێشیان پێ گەیاند هەڵهات، بەڵام نیشتینە سەری لە (ئەلحەررە) گرتمانو بەردەبارانمانکرد، تامرد.

(ئەلحەررە) جێگەیەکە، لەسەردەمی پێغەمبەردا، لەدەرەوەی شاری مەدینە بوو، خڕە بەرداوییەکی ڕەشبوو.

**روونكردنەوە:**

**لـەكاتی وادا، كـە داوێنپـیس رابكـات، هەنـدێ لـەزاناكان (وەك شـافعیو ئەحمـەدو كەسـانی تـریش) دەفـەرموون: (وازی لێ ئـەهێنرێ بـا ڕابكـا) چـونكە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) لـەم ڕووداوەدا فەرموويـەتی: «هَـلاَّ تَرَكْتُمُوهُ فَلَعَلَّهُ يَتُوبُ فَيَتُوبَ اللَّهُ عَلَيْهِ». واتە: بريا وازتان لێ دەهێنا، با رايبكردايە، سا بەشكوو تەوبەی بكردايەو خودا تەوبەی لێ قەبووڵ بكردايە!).**

١١٠٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ وَزَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) أَنَّهُمَـا قَـالا إِنَّ رَجُلاً مِنْ الأَعْرَابِ أَتَى رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَنْـشُدُكَ اللَّهَ إِلاّ قَضَيْتَ لِي بِكِتَابِ اللَّهِ فَقَالَ الْخَصْمُ الآخَرُ وَهُـوَ أَفْقَـهُ مِنْـهُ نَعَـمْ فَـاقْضِ بَيْنَنَـا بِكِتَابِ اللَّهِ وَأْذَنْ لِي فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (قُـلْ) قَـالَ: إِنَّ ابْنِـي كَانَ عَسِيفًا عَلَى هَذَا فَزَنَى بِامْرَأَتِهِ وَإِنِّي أُخْبِرْتُ أَنَّ عَلَـى ابْنِـي الـرَّجْمَ فَافْتَـدَيْتُ مِنْـهُ بِمِائَةِ شَاةٍ وَوَلِيدَةٍ فَسَأَلْتُ أَهْلَ الْعِلْمِ فَأَخْبَرُونِي: أَنَّمَا عَلَى ابْنِي جَلْدُ مِائَةٍ وَتَغْرِيبُ عَـامٍ وَأَنَّ عَلَى امْرَأَةِ هَذَا الرَّجْمَ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ): (وَالَّـذِي نَفْـسِي بِيَدِهِ لأَقْضِيَنَّ بَيْنَكُمَا بِكِتَابِ اللَّهِ الْوَلِيدَةُ وَالْغَنَمُ رَدٌّ وَعَلَى ابْنِكَ جَلْدُ مِائَةٍ وَتَغْرِيبُ عَـامٍ اغْدُ يَا أُنَيْسُ إِلَى امْرَأَةِ هَذَا فَإِنْ اعْتَرَفَتْ فَارْجُمْهَا) قَالَ: فَغَدَا عَلَيْهَا فَاعْتَرَفَتْ فَأَمَرَ بِهَـا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَرُجِمَتْ). (الحديث ٢٧٢٤، أطرافُهُ في: ٢٦٩٥، ٢٧٢٤، ٦٦٣٣، ٦٨٢٧، ٦٨٣٣، ٦٨٣٥، ٦٨٤٢، ٦٨٩٥، ٧١٩٣، ٧٢٥٨، ٧٢٧٨,٧٢٦٠). (الحـــديث ٢٧٢٥+، أطرافُـــهُ في: ٢٦٤٩، ٢٦٩٦، ٢٧٢٥، ٦٦٣٤، ٦٨٢٨، ٦٨٣١، ٦٨٣٦، ٦٨٤٣، ٦٨٦٠، ٧١٩٤، ٧٢٥٩، ٧٢٧٩): [١١٠٣]

---

[١١٠٣] **تجريـد/٣، ژمـارە: ١١٣٢ = ٢٧٢٤ بخـاری. مـسلم/شـيحا: ٤٤١٠ (بخـاری رقـم الكتـاب/٨٦ رقـم الباب/٤٦). شەرحی بلوغ المرام/٣، ژمارە: ١٢٣١.**

ئـەبوهورەیرەو زەیـدی کـوڕی خالیـدی جوهـەنی(ڕەزای خوایـان لــێ بــێ) فەرموویان: پیاوێـکی دەشتەکی هاتە خزمەت حـەزرەتو عـەرزی کـرد: قوربـان! ئەی رەوانەکراوی خودا! تۆبیتو خـودا ئەگـەر بـەپێی نامـەی خـودا، بڕیـارم بـۆ نەدەی! هاوداواکەیشی کە وادیاربوو لەو زرنگتر بـوو گـوتی: بەلـێ باشـە، بـەپێی نامەی خودا حوکم بکە لەنێوانماناو دادگاییمان بۆ بکـە، وەرێـگەیـشم بـدە تـامن لەپێشا قسە بکەم.

پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێ) رێـگەی پێ داو فـەرمووی: (ئـادەی بڵێ) گـوتی: کوڕێـکی مـن لـەلای ئەمـە رەنجبـەر بـوو، ژنەکـەی خـراپ کـردووە، داوێنپیسی لەگەڵ دا کردووە، بـەمنیان گـوت: گوایـە کوڕەکـەم دەبـێ بـەردەباران بکـرێ تـادەمرێ، جـا مـن لەتۆڵـەی کوڕەکـەما سـەد سـەر مـەڕم پـێ دا لەگـەڵ کەنیزێـکا، لەپاشا کاتێ لەزانایانی شەرعم پرسی، فەرموویان: کـە کوڕەکـەی مـن سـەد داری حـەددی لــێ دەدرێو سالــێ دوور دەخرێتـەوە، وەژنەکـەی ئـەمیش بەردەباران دەکرێ.

پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بـێ) فـەرمووی: (بـەو کەسـەی گیـانی منـی والەدەسا، بەپێی فەرمانی نامەی خودا بڕیاردەدەم لە نێوانتانا، کـەنیزەكو سـەد مەڕەکە دەدرێتەوە بەتۆ، کوڕەکەت سـەد داری حـەددی لــێ دەدرێو سالــێ دوور دەخرێتەوەو رەهەنـدە دەکرێ. ئەی ئونەیس! تۆیش هەڵسە بڕۆ بۆ لای ژنەکـەی ئەمە ئەگەر هاتوو چووە ژێریو دانی بەئیـشەکەدا نـا، ئـەوا بـەردە بـارانی بکـە. جا کە ئونەیس چوو بۆ لای، ژنەکە پێی لێ ی نا، پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بـێ) فـەرمانی دا، سـەنگە سـاریان کـرد). (تـاج/٢٣٨/٣، فـ٤، زنجیـرە: ٩٢ = ژمارە: ٢٣٥٤ - باسی تۆڵەی شەروالپیسی).

## (٦) باب رجم اليَهُودِ أهْلِ الذمَةِ في الزنى

## جوولەکەی پەنادار، کە ناودارن بە ئەهلی زیممە، کاتێ چەسپا داوێنپیسییان کردووە بەردەباران دەکرێن

١١٠٤- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُما) انَّ الْيَهُودَ جَاءوا الَى رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَذكَرُوا لَهُ انَّ رَجُلا مِنْهُمْ وَامْرَاةً زَنَيَا فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): مَا تَجِدُونَ فِي التَّوْرَاةِ فِي شَانِ الرَّجْمِ؟ فَقَالُوا: نَفْضحُهُمْ وَيُجْلَدُونَ فَقَالَ عَبْدُ اللّٰهِ بْنُ سَلامٍ: كَذبْتُمْ انَّ فِيهَا الرَّجْمَ فَاتَوْا بالتَّوْرَاةِ فَنَشرُوهَا فَوَضعَ احَدُهُمْ يَدَهُ عَلَى ايَةِ الرَّجْمِ فقَرَا مَا قَبْلَهَا وَمَا بَعْدَهَا فَقَالَ لَهُ عَبْدُ اللّٰهِ بْنُ سَلامٍ: ارْفَعْ يَدَكَ فَرَفَعَ يَدَهُ فَاذا فِيهَا ايَةُ الرَّجْمِ فَقَالُوا: صَدَقَ يَا مُحَمَّدُ فِيهَا ايَةُ الرَّجْمِ فَامَرَ بِهِمَا رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَرُجِمَا قَالَ عَبْدُ اللّٰهِ: فَرَايْتُ الرَّجُلَ يَجْنَأُ عَلَى الْمَرْاةِ يَقِيهَا الْحِجَارَةَ (الحديث: ٣٦٣٥، طرفه في: ١٣٢٩، ٤٥٥٦، ٦٨١٩، ٦٨٤١، ٧٣٣٢، ٧٥٤٣). (بڕوانە: ژمارە: ١٣٣٧ت= ٣٣٢٩ف): [١١٠٤]

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: جوولەکەکان لە مەدینە هاتنە خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) پێیان گوت: پیاوێك و ژنێ لە خۆمان داوێنپیسییان کردووە، تۆ مەحکەمەیان بکە بۆمان، ئەویش پێی فەرموون: (سەبارەت بە کەسێ داوێنپیسی بکا، لەتەوراتدا چی دەڵێ، لەبارەی سەنگە سارکردنیەوە؟) گوتیان: لەسەر ئەم شێوەیە ڕیسوایان دەکەین و لەپاشا داری حەدیان لێ دەدەین و تەواو، ڕووی هەر دوولایان ڕەش دەکەین و بەڕوپشت سواری دوو ولاخیان دەکەین و دەیانگێڕێن بەناو دێدا، هەتا ببن بە پەندو ڕیسوا ببن.

---

[١١٠٤] تەجریدی بوخاری/٤، ژمارە: ١٤٤٦ - ٣٦٣٥ بخاری. پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١٠٤٠ = ٤٤١٢ شیحا. شەرحی بلوغ المرام/٣، ژمارە: ١٢٣٩ و ١٢٤٠ (بخاری رقم الكتاب/٦١ رقم الباب/٢٦).

عەبدوڵلای کوڕی سەلام کە خۆی لە پێشا زانایەکی گەورەی جوولەکە بووەوە ئیسلام بوو، پێیانی فەرموو: (درۆدەکەن، لە تەوراتا ئایەتی سەنگە سار کردنی داوێنپیسانی واتیادا) جا تەوراتیان هێناو والآیان کردەوە، کەچی ئەو کەسەی کەدەیخوێندەوە ئایەتی ڕەجم کردنی کرد بە ژێر دەستیەوەو نەیخوێندەوە، بەڵکوو پێش و پاشەکەی خوێندەوە، عەبدوڵلای کوڕی سەلام پێی فەرموو: ئادەی دەستت هەڵبڕە، کەدەستی هەڵبڕی ئایەتەکە لەژێریدابوو، ئەو جا بە ناچاری گوتیان: ڕاست دەکا ئەی محمد! ئایەتی بەردە بارانکردنی واتیادا ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرمانی دەرکرد، ژنو پیاوەکەیان بەردەباران کرد). (تاج/٣ ل/٢٤٣ زنجیرە: ٩٢ ف/٨ = ژمارە: ٢٣٥٨ - باسی: تۆڵەی شەروالپیسی).

١١٠٥- حديث عَبْدَ اللَّهِ بْنَ أَبِي أَوْفَى عَنِ الشَّيْبَانِيِّ سَأَلْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ أَبِي أَوْفَى هَلْ رَجَمَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ نَعَمْ . قُلْتُ قَبْلَ سُورَةِ النُّورِ أَمْ بَعْدُ قَالَ لاَ أَدْرِي: [(١١٠٥)]

شەیبانی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) — کە ناسراوە بە ئەبو ئیسحاقی شەیبانی، کە لەپەیڕەوانە، واتە تابیعییە — فەرمووی: لە عەبدوڵلای کوڕی ئەبو ئەوفام پرسی: ئایا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) داوێنپیسی بەردەباران دەکرد، ئایا لەسەردەمی ئەودا، بە فەرمانی ئەو، کەسێ لەداوێنپیسان سەنگەسار کرا؟ فەرمووی: بەڵێ. گوتم: ئایا ئەمەی کە لەسەر فەرمانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) داوێنپیس بەردەبارانکراوە، ئایا بەر لە ئایەتی سورەتی (نوور) بوو، یا لەپاشی بوو؟ کە دەفەرموێ: ﴿الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا مِئَةَ جَلْدَةٍ — النور/٢﴾ واتە: داوێنپیس — چی ژن چی

(١١٠٥) (بخاري رقم الكتاب/٨٦ رقم الباب/٢١) مسلم/شيحا: ٤٤١٩.

پیاو – کاتێ چەسپا کە داوێنپیسی ئەنجام داوە، سەرو سەد قەمچی (جەڵدە)یان لێ بدەن!

مەبەستی شەیبانی لەم پرسیارە ئەوەیە: ئەگەر داوێنپیس بەردەبارانکردنی لەلایەنی پێغەمبەرەوە لەپێش هاتنی ئەم ئایەتەوە بووبێ، بەم ئایەتە هەڵدەوەشێتەوەو نەسخ دەبێتەوە. عەبدوڵڵا لە وەڵامی ئەم پرسیارەی شەیبانا فەرمووی: (نازانم کە ئایا بەردەباران لەپێش هاتنی ئەم ئایەتەدا بوو، یا لەپاش هاتنی ئەم ئایەتە بوو!).

١١٠٦- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) يَقُولُ: { "إِذَا زَنَتْ أَمَةُ أَحَدِكُمْ، فَتَبَيَّنَ زِنَاهَا، فَلْيَجْلِدْهَا اَلْحَدَّ، وَلَا يُثَرِّبْ عَلَيْهَا، ثُمَّ إِنْ زَنَتْ فَلْيَجْلِدْهَا اَلْحَدَّ، وَلَا يُثَرِّبْ عَلَيْهَا، ثُمَّ إِنْ زَنَتِ اَلثَّالِثَةَ، فَتَبَيَّنَ زِنَاهَا، فَلْيَبِعْهَا وَلَوْ بِحَبْلٍ مِنْ شَعَرٍ } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ وَهَذَا لَفْظُ مُسْلِمٍ. {تەجرید/٢، ژمارە: ٩٧٣ = ٢١٥٢، ٢١٥٣، ٢٢٣٣، ٢٢٣٤، ٢٥٥٥، ٦٨٣٧، ٦٨٣٩ بوخاری. مختصر صحيح مسلم/٣، ژمارە: ١٠٤١ = شیحا ٤٤٢٢ = مسلم ١٧٠٣}:[١١٠٦]

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: گوێم لێ بوو پرسیار کرا لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەبارەی کەنیزەکەوە، کە بەعەرەبی پێی دەگوترێ ئەمەتە، کە کۆیلەیە لەڕەگەزی مێ، پرسیاری لێ کرا: ئەگەر کەنیزەك داوێنپیسی کردو لەسەری چەسپاو لەهەمان کاتدا موحصەن بوو، واتە: درابوو بەشوو، وەگوێزرا بۆوە، ئایا لەکاتی وادا حەددی شەرعی لەسەرە یا نا؟

---

[١١٠٦] بلوغ المرام/٣، ژمارە: ١٢٣٦ تەجرید/٢، ژمارە: ٩٧٣ = ٢١٥٢ بخاری. پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١٠٤١ = شیحا: ٤٤٢٢ (بخاری رقم الكتاب/٣٦ رقم الباب/٦٦).

فـەرمووی: (درروودی خـودای لەسـەر بـێ) (ئەگـەر کـەنیزەك داوێنپیـسی کرد، داری حەددی لێ بـدەن، ئەگـەر دووبـارە داوێنپیـسی کـردەوە، دووبـارە داری حـەددی لێ بـدەن، ئەگـەر بـۆ جـاری سـێیەم داوێنپیـسی کـردەوە دیـسانەوە داری حـــەددی لێ بدەنـــەوە، ئـــیتر ئەگـــەر خاوەنەکـــەی تـــاڵان فرۆشـــی کـــردەوەو فرۆشتوویەتی بەپەتێکی موو، با بیفرۆشێت!).

ئیبنو شەهاب (رەحمەتی خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: نـازانم لـەپاش جـاری سێیەم، یان لەپاش جاری چوارەم، فەرمووی: (درروودی خودای لەسەر بـێ) (ئـیتر با بیفرۆشێت!). {تاج/٣، زنجیرە: ٩٢، ژمارە: ٢٣٥٩ ج/٤}.

١١٠٧- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صلى الله عليـه وسـلم) سُئِلَ عَنِ الأَمَةِ إِذَا زَنَتْ وَلَمْ تُحْصِنْ؟ قَالَ: « إِنْ زَنَتْ فَاجْلِدُوهَا، ثُمَّ إِنْ زَنَتْ فَاجْلِـدُوهَا، ثُمَّ إِنْ زَنَتْ فَاجْلِدُوهَا، ثُمَّ بِيعُوهَا وَلَوْ بِضَفِيرٍ ». قَالَ ابْنُ شِـهَابٍ: لاَ أَدْرِى أَبَعْـدَ الثَّالِثَـةِ أَوِ الرَّابِعَةِ. {الحـديث: ٤٤٢٢ = ٤٤١٤ فـم. تجريـد/٢، رقـم: ٩٧٣ = ٢١٥٢، ٢١٥٣، ٢٢٣٣، ٢٢٣٤، ٢٥٥٥، ٦٨٣٧، ٦٨٣٩}: [١١٠٧]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: پرسـیارکرا لـە پێغەمبـەر (درروودی خوای لەسەر بێ) لەبارەی کەنیزەکەوە، کە بەعـەرەبی پێـی دەگـوترێ: ئەمەتـە، ئەگـەر داوێنپیـسی کـردو لەسـەری چەسـپاو لەهـەمان کاتـا موحـصەن نەبوو، واتە: نـەدرابوو بەشـوو، ئایـا لـەکاتی وادا حـەددی شـەرعی لەسـەرە یانـا؟ فـەرمووی: (ئەگـەر کـەنیزەك داوێنپیـسی کـرد، داری حـەددی لێـدەن، ئەگـەر دووبارە داوێنپیسی کردەوە، دووبارە داری حەددی لێدەن، ئەگەر بۆجاری سێیەم داوێنپیسی کردەوە دیسانەوە داری حـەددی لێ بـدەن، ئـیتر ئەگـەر تـاڵان فرۆشـی کردووەو فرۆشتوویەتی بەپەتێکی موو بیفرۆشێ!).

---

[١١٠٧] بروانە: ژمارە: (١١٠٦).

ئیبنو شەهاب (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: نازانم لەپاش جاری سێیەم، یا لەپاش جاری چوارەم فەرمووی: (با بیفرۆشێ!). {تاج/٣، زنجیرە: ٩٢، ژمارە: ٢٣٥٩، ٢٣٦٠ چ/٤ – ش/د/ت/ن}.

## (٨) باب حد الخمر
## تۆڵەی مەینۆشی

١١٠٨- عَنْ أَنَسٍ قَالَ جَلَدَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) فِي الْخَمْرِ بِالْجَرِيدِ وَالنِّعَالِ ، وَجَلَدَ أَبُو بَكْرٍ أَرْبَعِينَ: (١١٠٨)

لەشەرحی بلوغ المرام، بەرگی/٣، ژمارە: ١٢٦٦ ئاوایە:

عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) أَتَى بِرَجُلٍ قَدْ شَرِبَ اَلْخَمْرَ، فَجَلَدَهُ بِجَرِيدَتَيْنِ نَحْوَ أَرْبَعِينَ. قَالَ: وَفَعَلَهُ أَبُو بَكْرٍ، فَلَمَّا كَانَ عُمَرُ اِسْتَشَارَ اَلنَّاسَ، فَقَالَ عَبْدُ اَلرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ: أَخَفَّ اَلْحُدُودِ ثَمَانُونَ، فَأَمَرَ بِهِ عُمَرُ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ. {بوخاری/٦٧٧٣. مسلم/ شیحا: ٤٤٢٧}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پیاوێکیان هێنا بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئارەقی خواردبۆوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی کرد، بەدوو پەلکە خورما دەوری چل داریان لێ دا. فەرمووی: ئەبوبەکریش لەسەردەمی جێنشینی خۆیدا، فەرمانی دەکرد بە پەلکە خورما نزیکەی چل داریان لەمەینۆش دەدا، بەڵام کاتێ عومەر بوو بەجێنشین، لەم بارەیەوە ڕاوێژی بە خەڵکەکە کرد، عەبدوڕەحمانی کوڕی

(١١٠٨) شەرحی بلوغ المرام/٣، ژمارە: ١٢٦٦، مسلم/شیحا: ٤٤٢٧ (بخاری رقم الكتاب/٨٦ رقم الباب/٤).

عەوف فەرمووی: سووکترین تۆڵە هەشتا جەڵدەیە، جا عومەریش حەددی بادە نۆشی کرد بە هەشتا جەڵدە.

### روونکردنەوە:

ئەوەی کە دەڵێ: (بەدوو پەلکە خورما، دەوری چل داریان لێی دا، مەبەست ئەوەیە: کە ژمارەی دارەکان چل داربووە، بە پەلکە خورمایێ ژمارەیەکیان لێ داوە، بە پەلکە خورمایێ تریش ژمارەیەکیان لێ داوە، کە هەردوو ژمارەکە کردوویانەتە چل جەڵدە، مەبەست ئەوە نییە کە بەدوو پەلکە خورما چل جەڵدەیان لێ دابێ).

١١٠٩- حديث عَلِيٍّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ (رضي الله عنه) قَالَ مَا كُنْتُ لأُقِيمَ حَدًّا عَلَى أَحَدٍ فَيَمُوتَ ، فَأَجِدَ فِي نَفْسِي ، إلاَّ صَاحِبَ الْخَمْرِ ، فَإِنَّهُ لَوْ مَاتَ وَدَيْتُهُ ، وَذَلِكَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) لَمْ يَسُنَّهُ: [١١٠٩]

له پوختەی موسلیما، ژمارە (١٠٤٨)دا ئاوایە:

عَنْ عَلِيّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: مَا كُنْتُ أُقِيمُ عَلَى أَحَدٍ حَدًّا فَيَمُوتَ فِيهِ فَأَجِدَ مِنْهُ فِي نَفْسِي إلاَّ صَاحِبَ الْخَمْرِ، لأَنَّهُ إِنْ مَاتَ وَدَيْتُهُ، لأَنَّ النبي (صلى الله عليه وسلم) لَمْ يَسُنَّهُ. {الحديث: ٤٤٣٣ = ٤٤٢٤ فم. تجريد/٥، رقم: ٢٠٦٦ = ٦٧٧٨ فتح الباري} :

عەلی (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: داری حەدد لە هەرکەسێ بدەم، لەو کەسانەی کەداری حەددیان بەپێی شەرع لێ دەدرێ، وەك بوختیانکەرو داوێنپیس، ئەگەر بەو داری حەددەی منە بشمرێ دەربەستی نیمو خەمو

---

[١١٠٩] تجرید/٥، ژمارە: ٢٠٦٦ = ٦٧٧٨ بخاری. پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١٠٤٨ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٨٦ رقم الباب/٢٠).

خەفەتی پێ ناخۆم، چونکە ئەو جۆرە حەددانە، پێغەمبەر خۆی دیاریکردوون و داینــاون، بەڵام ئەگەر گریمان داری حەددی مەینۆشی لەکەسێ بدەم و بەوداری حەددەی منە بمرێ، ئەوە پەستم دەکا، وە خوێنی ئەو کابرایەیش دەدەم کە لەکاتی وادا بمرێ، لەژێر داری حەددی مەینۆشیدا، چونکە حەددی مەینۆشی پێغەمبەر نەدیاریکردووەو نەداریناوە! لەسەر ئەم شێوەی ئێستا، کە هەشتا داری لێ دەدرێ). {بڕوانە: تاج/٣، زنجیرە: ٩٦، ژمارە: ٢٣٧٤}.

## (٩) باب قَدْرِ أَسْوَاطِ التَّعْزِيرِ

## باسی ئەندازەی ژمارەی قەمچییەکانی تەمێکردن (ژمارەی دارلێدانی تەمێکردن)

١١١٠- عَنْ أَبِي بُرْدَةَ الأَنْصَارِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ: « لاَ يُجْلَدُ أَحَدٌ فَوْقَ عَشَرَةِ أَسْوَاطٍ، إِلاَّ فِي حَدٍّ مِنْ حُدُودِ اللَّهِ ». {الحديث: ٤٤٣٥ = ٤٤٢٦ فـم. تجريد/٥، رقم: ٢٠٧٢ = ٦٨٤٩، ٦٨٥٠. أبو داود. حدود: ٤٤٩١. ترمذي. حدود: ١٤٦٣. ابن ماجة. حدود: ٢٦٠١. تحفة الأشراف: ١١٧٢٠}: [١١١٠]

ئەبو بوردە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (مەگەر بۆ حەددی شەرعی، ئەگینا لەسەر هیچ سەرپێچییەکی تر، لەدەدار (جەڵدە) زیاتر لەکەس نادرێ). {تاج/٣، زنجیرە: ٩٧، ژمارە: ٢٣٧٧، ج/٤}.

### ڕوونکردنەوە:

---

[١١١٠] تجرید/٥، ژمارە: ٢٠٧٢ = ٦٨٤٩ بخاری. پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١٠٤٩ = ٤٤٣٥ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٨٦ رقم الباب/٤٢).




ئەبو بوردەی ئەنصاری، ناوی هانی کوڕی نیارە، خاڵی بەرائی کوڕی عازیبە، ئامادەی جەنگی بەدرو نەبەردەکانی پاش بەدر بووە، هەروا ئامادەی پەیمانی عەقەبەی دووەم بووە، فەرموودەی لە بوخاریو موسلیمدا هەیە، لە بوخاریدا هەر ئەم فەرموودەیەی هەیە، ئەبو بوردە بێ وەچە بووە، منداڵو منداڵە زای لەپاش بەجێ نەماوە.

لایەنگیری عەلی بوو لەهەموو نەبەردەکانیدا، دەڵێن: لە دەوروبەری ساڵی چلو یەك، یادوو، یا پێنج مردووە (ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێ بێ).

## (١٠) باب الحدود كفاراتُ لأهلِها

## کەسێ شایانی حەددی شەرعی بێ، وە ئەو حەددەی بەسەردا جێبەجێ کرا، ئەوە دەبێ بە داپۆشەرو پاکەوەکەر بۆی!

١١١١- عَنْ عُبَادَةَ بْنَ الصَّامِتِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ وَحَوْلَهُ عِصَابَةٌ مِنْ أَصْحَابِهِ: (بَايِعُونِي عَلَى أَنْ لَا تُشْرِكُوا بِاللَّهِ شَيْئًا وَلَا تَسْرِقُوا وَلَا تَزْنُوا وَلَا تَقْتُلُوا أَوْلَادَكُمْ وَلَا تَأْتُوا بِبُهْتَانٍ تَفْتَرُونَهُ بَيْنَ أَيْدِيكُمْ وَأَرْجُلِكُمْ وَلَا تَعْصُوا فِي مَعْرُوفٍ فَمَنْ وَفَى مِنْكُمْ فَأَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ وَمَنْ أَصَابَ مِنْ ذلِكَ شَيْئًا فَعُوقِبَ به فِي الدُّنْيَا فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَهُ وَمَنْ أَصَابَ مِنْ ذلِكَ شَيْئًا ثُمَّ سَتَرَهُ اللَّهُ فَهُوَ إِلَى اللَّهِ إِنْ شَاءَ عَفَا عَنْهُ وَإِنْ شَاءَ عَاقَبَهُ فَبَايَعْنَاهُ عَلَى ذلِك). (الحديث ١٨ أطرافه في: ٣٨٩٢,٣٨٩٣,٣٩٩٩,٤٨٩٤,٦٧٨٤,٦٨٠١,٦٨٧٣,٧٠٥٥,٧١٩٩، ٧٢١٣، ٧٤٦٨): [١١١١]

---

[١١١١] تجريد/١، ژمارە: ١٨ = ١٨ بخاری. مسلم: ١٧٠٩ = ٤٤٣٦ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٢ رقم الباب/١١).

عوبادەی کوڕی صامیت (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: (دەستەیێ لەیارانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەدەوری بوون، فەرمووی پێیان: پەیمانم لەگەڵ دا بکەن لەسەر ئەوە: کەهاوبەش (شەریك) بۆ خوا دانەنێن‌و دزی‌و حیزی نەکەن‌و دەس پاك‌و داوێنپاك بن‌و منداڵی خۆتان لەبەر نەبوونی نەکوژن‌و لەخۆتانەوە لەخوت‌و خۆڕایی بوختیان هەڵنەبەستن، وەلەکردنی چاکەو پیاوەتی سەرپێچی نەکەن‌و لاریتان نەبێ لەکاری خێر) جا هەرکەسێکتان ئەم پەیمانەی هەتا سەر بردەسەر ئەوە پاداشی باشی دەکەوێتە سەر خوا، وەئەوەیشی تووشی شتێ بوو لەمانەو، لەم جیهانەدا تۆڵەی ئەوەی لێ سەندرا ئەوە دەبێ بەکەفارەت بۆی‌و ئەو تۆڵەیە بڕێتی ی تاوانەکەی دەکەوێ، وەئەوەیشی تووشی شتێ بوو لەمانە بەڵام لەجیهان داخودا بۆی پۆشی، ئەوە کاری دەکەوێتە دەست خوا، جا خودا ئەگەر حەز بکا ئەوا لێ ی دەبووری، ئەگینا تۆڵەی ئەوەی لەوجیهان دا لێ دەستێنێ) عوبادە فەرمووی: (جا ئێمەیش لەسەر ئەوە پەیمانمان پێ دا). (تاج/٣ ل/٢٦٥ ز/١٠١ ف/١ تاج/١ ز/٨ ژ/٥٥).

## (١١) باب جُرْحُ العَجْمَاءِ والمعدن والبير جُبَارُ
## زیانی ئاژەڵ‌و ماڵات‌و کان‌و بیر نابژێرێ!

١١١٢- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) عَنْ رَسُولِ اللّٰهِ (صلى الله عليه وسلم) أَنَّهُ قَالَ: « الْبِئْرُ جَرْحُهَا جُبَارٌ، وَالْمَعْدِنُ جُبَارٌ، وَالْعَجْمَاءُ جَرْحُهَا جُبَارٌ، وَفِى الرِّكَازِ الْخُمْسُ ». {الحديث: ٤٤٤٣ = ٤٤٣٤ فم}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کان‌و بیر ئەگەر شتێکیان تێکەوت، یا ڕمان بەسەریا، شتەکە زامار بوو، یامرد، وە لەوەدا سووچی خاوەن کان، یا سووچی خاوەن بیرەکەی تیانەبوو، ئەوە ئەو شتە خوێنی نییەو فیڕۆیە، هەروەها ئاژەڵ‌و

مـالاّتو ولاّخـيش ئەگـەر زيانـێ بـدەن، كەسـێ زامـار بكـەن، بـەبێ سووچـی خاوەنەكـەيان، خـوێنی نييـە، گەنجينـەی كـۆنی دۆزراوەيـش پێنجيـەكی هـی زەكاتە). {تاج/٢، زنجيرە: ٩، ژمارە: ١٢١٥}.

**روونكردنەوە:**

لەڕاستيدا زۆر لەشێوەو وێنـەو جۆرەكـانی سـەوداو مامەڵـەو بـاوو نـەريتو كێشە كۆمەڵايەتييـەكان، لەسـەر شـێوەی دێرينيـان نـەماونو بەشـێوەيەكی تـر سەريان هەڵداوە، ئێستا كارەساتی ڕێگەو بانو رووخانی كانو مردن بـە تـەزووی كارەبـاو رووداوی دڵتـەزێنی زۆری تـرپەيـدا بـوون، كـە زانـا كۆشـشكارەكان (مجتهدەكان) دەتوانن لەم جۆرە فەرموودانە، بڕيارە شەرعييەكانيان بدۆزنەوە.

**( پوختەی بڕيارەكانی ئەم باسە )**

١- حەددی مەينۆش، بەدوو شايەت دەچەسپێ، يا بەپێلێنانی مەينۆشەكە خۆی كە بڵێ بادەم نۆشيوە.

٢- ژمارەی دارو قەمچييەكان چل دارن.

٣- ئـەوەی كـە لەهەنـدێ فـەرموودەدا هـاتووە كـە لـەجاری چـوارەم يـا پێنجەمدا مـەينۆش دەكوژرێ، بـەكۆی دەنـگ زانايـان دەفـەرموون: (ئـەم بڕيـارە هەڵگيراوەو پووچ كراوەتەوەو نەماوەو كاری پێ ناكرێ).

٤- لـەكاتی لێـدانی كەسـێكا، بەحـەقو بەناهـەق، واباشـە لەدەموچـاوی نەدرێ، بەتايبەتی ئەگەر لێدانەكە بۆ تەمێو تەسكين بوو.

٥- حەدد لەمزگەوتا جێبەجێ نـاكرێ، هـەروا هـەر شتێ تـر كـە لەگـەڵ ڕيزی تايبەتی مزگەوتا نەگونجێ.

٦- هەرچی مرۆڤ سەرخۆش بکا حەرامو نادروستە، ئیتر کەم بێ یا زۆر، وشك بێ یا تەڕ، لەمێوە دروست کرابێ وەك ترێو خورما، یا لەشتێ تر وەك جۆو هەنگوین، وە بەهەر ناوێکەوە بێ جیاوازی نییە، مادام زۆرەکەی سەرخۆشکەرە، کەمو زۆری نادروسمتو قەدەغەو حەرامە.

٧- کۆمەڵێ شتی حەڵاڵو ڕەوا، کە پێغەمبەر خۆی لێی خواردوونەتەوە، وەك: ئاوو شەربەتی هەنگوینو شیراوو شیرو دۆو ماستاوو ئاوی زەمزەمو خۆشاوی ترێو خورماو ئاوی شەوی کوندەو ئاوی بیرو ئاوی بارانو ئاوی کوندەو ئاوی مەتارەو دەمی ناوە بە ئاوی جۆگەوەو لێی خواردۆتەوە، بەسواریو جاروبار بەپێوە ئاوی خواردۆتەوە.

٨- ناوهێنانی خودا لەسەرەتای هەموو خواردنەومیەکی دروستەوەو سوپاسکردنی خودا لەسەری لەدوا نۆشینی.

٩- لەم کاتانەدا نابێ بیسمیللا بکرێ، یا ناوی خودا بهێنرێ:

آ- لەکاتی خواردنو خواردنەوەی شتی نادروستو حەرامدا، وەك ئەوە کەدەست دەکا بە ئارەقخواردنەوە (بسم الله) بکا، شتی وا ئەگەر سووکی بەئایین بێ، پێی کافر دەبێ، یا وەك ئەوە کە دەست دەکا بەخواردنی گۆشتی بەراز، یا بۆ خواردنی شتی دزراو (بسم الله) بکا، ئەمیش هەروەها، ئەگەر بۆ سووکی بەئایین بێ، پێی ناموسوڵمان دەبێ، جا خوا نەخواستە، پێویستە لەسەر کەسێ کەشتی وا هەڵەو نادروست ئەنجام دەدا، بەبێ دواخستن تەوبە بکاو لەو تاوانە پەشیمان ببێتەوەو نەگەڕێتەوە بۆ سەری.

ب- لەکاتێکا کەشتی نادروست ئەنجام بدا، وەك: دزیو داوێنپیسیو گەندەڵی، تەنانەت حەرامە بۆ کەسێ کە لەکاتی بێنوێژیو سووڕی مانگانەدا




بچێته لای ژنی خۆی (بسم الله) بکا، یا ناوی خودا بهێنێ، یا کاتێ بەناڕەوا ڕۆژووەکەی بشکێنێ دروست نییە بیسمیللای لێ بکا.

١٠- هەروا نادروستو ناڕەواو تاوانە، کە لەدوا خواردنەوەو خواردنی نادروست حەمدو سوپاسی خودای لەسەربکا، یا لەپاش ئەنجامدانی کارێکی ناڕەوا حەمدو سوپاسی خودا بکا، وەك ئەوە لەپاش ئەنجامدانی دزیو حیزیو خواردنی پیسیو کردنی درۆ، سوپاسی خودا بکا لەسەری، وەك ئەوە بڵێ: (سوپاس بۆ خودا لەسەر ئەم گزییە!).

١١- بەڵام کاتێ کەسێ گوناهێ ئەنجام بدات، وەك ئەوە دزی، یا حیزی، یا بادەنۆشی، یا هەرتاوانێکی تر ئەنجام بدا، ئەگەر لەکاتی وادا، بەوێنە بڵێ: (سوپاس بۆ خودا پێیان نەزانیم دەنا حەیای هەزارساڵەم دەچوو، یا بڵێ: سوپاسم بۆ خودا کە وازم لەو کارە ناهەموارە هێنا، یا بڵێ: سوپاس بۆ خودا کە سوودم لەو دزییە وەرنەگرت، سوپاس بۆ خودا کە بەهۆی ئەو مەستیو سەرخۆشییەوە کەتنێکی گەورەم نەقەوماند، سوپاس بۆ خودا کە هەر دزییەکەم کرد، خاوەن ماڵەکەم نەکوشت، سوپاسکردنی خودای گەورەو سەرومر لەم جۆرە کاتانەدا، کارێ پەسەندە، ناپەسەند نییە، چونکە لەم جۆرە بارودۆخانەدا، سوپاسکردنەکە لەسەر کردنی تاوانەکە نییە، بەڵکوو لەسەر بەهرەو نیعمەتێکە کە بەپێی شوێنەکە هەستی پێ دەکرێ).

## ٣٠- كِتَابُ الأَقْضِيَةِ
## نامەی دادوەری

{بڕوانــه: ریــاض. زنجـیره: ٨٢، ٨٣، ژمــاره: ٦٧٨، ٦٧٩، ٦٨٠ + تەجریــد/٣، ژماره: ١١١٨ هەتا ژماره: ١١٢٥ + تاج/٣ له زنجیره: ١٠٢ هـەتا زنجـیره: ١٢١ لـه ژمـاره: ٢٤٠١ هەتا ٢٤٩٦ + فیقهـی ئاسـان، بـەرگی دووەم، زنجـیره: ٣٨٧، ٣٨٨، ٣٨٩، ٣٩٠، ٣٩١، له لاپەڕە: ١٠٣٥ هەتا لاپەڕە: ١٠٤٨ چاپی ئێران + زنجیره: ٤٠١ هـەتا زنجـیره: ٤٠٦ = لاپەڕە: ١٠٧٤} + {شەرحی بلوغ المرام/٣ لەژماره: ١٤١٠ هەتا ژماره: ١٤٤٦} .

### (١) باب اليمين عَلَى المُدَّعى عَلَيه
### بەڵگەو نیشانه لەسەر داواکاره، داوالێکراویش ئەگەر نەچووە ژێری، ئەوا سوێندی لەسەره

١١١٣- عَنْ ابْنِ ابِي مُلَيْكَةَ (رحمه الله تعالى)انَّ امْرَاتَيْنِ كَانَتَا تَخْرِزَانِ فِـي بَيْـتٍ اوْ فِي الْحُجْرَةِ فَخَرَجَتْ احْدَاهُمَا وَقَدْ انْفِذ باشْفَى فِي كَفِّهَا فَادَّعَتْ عَلَى الاخـرَى فَرُفِـعَ امرهما الَى ابْنِ عَباسٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُما) فَقَالَ ابْنُ عَباسٍ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَـلَّى اللّٰـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (لَوْ يُعْطى النَّاسُ بِدَعْوَاهُمْ لـذهَبَ دِمَـاء قَـوْمٍ وَامْـوَالُهُمْ ذكِّرُوهَـا باللّٰـهِ وَاقْرَءوا عَلَيْهَا: ﴿انَّ الَّذينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ اللّٰهِ﴾ فَذكِّرُوهَا فَاعْتَرَفَتْ فَقَالَ ابْـنُ عَبـاسٍ: قَالَ النَّبيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (الْيَمِينُ عَلَـى الْمُـدَّعَى عَلَيْـهِ). (الحـديث:٤٥٥٢، طرفاه في:٢٥١٤، ٢٦٦٨) بەرگی/ ٣ل – ١٧٥ژماره: ١٠٨٢ تەجرید): [١١١٣]

---

[١١١٣] تجريد/٤، ژمـاره: ١٦٤٤ - ٤٥٥٢ بخـاری. مـسلم: ١٧١١ - پوختـەی موسـلیم/٢، ژمـاره: ١٠٥٣ = ٤٤٥٠ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٦٥ رقم الباب/٣/٣).

ئیبنو ئەبی مولەیکە (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: دوو ژن لەناو ماڵێکا، یالەناوهۆدەیەکدا، درەوشەکاری دەکەن یەکێکیان بریندار دەبێ، درەوشەیێ چووبوو بەناو لەپیا، داوای ئەوە بووکە گوایە ژنەکەی تر وای لێکردووە، داوا کەیان برا بۆ لای ئیبنوعەباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)دەفەرموێ: (ئەگەر ئەو خەڵکە لەسەر داوای خۆیان، بەبێ پێ نیشاندانی بەڵگە و ڕاستکردنەوەی شایەت، هەرچی داوا بکەن بدرێ پێ یان ئەوا دەبێ بەتێکە و لێکەو هەرکەسەو بۆخۆیەو سەرئەنجام، گەلێ سەرو ماڵ و خوێن و سامانی زۆرکەس بەفیڕۆ دەڕوا).

ئیبنوعەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: تەمێو ئامۆژگاری ژنە گومان لێکراوە کە بکەن و ڕێزی خودای یاد بخەنەوە ترسی خودای بخەنەبەر، بە تایبەتی ئەم ئایەتەی بۆبخوێننەوە:﴿ انَّ الَّذينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ اللّٰهِ وَايْمَانِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلاً﴾٧٧/٣. (واتە: کەسانێ کەبەڵێن وپەیمان بەخودا دەدەن وسوێند دەخۆن و، لەپاشا پەیمانەکە دەشکێنن وسوێندەکانیان نابەنە سەر و، بەبەهایەکی دونیایی دەیانگۆڕنەوە...). فەرمووی: کەوایان کرد، ژنەکە پێی لێ نا کە ئەو وای لێکردووە. ئیبنوعەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: (لەکاتی داوا و داواکاریدا، سوێند دەدرێ بەداوا لێکراو) (تاج/٦ ل/٧٨ ز/٤ ف/١٣).

## (٣) باب الحكم بالظاهر وَاللَّحْنُ بِالحُجَّةَ

## بڕیاری شەرع بەپێی ڕووکارە (حوکم بەپێی زاهیرە) هەندێ کەسیش لە بەڵگە سازیدا بە دەمو پلترە

١١١٤- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) زَوْجِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) سَمِعَ جَلَبَةَ خَصْمٍ بِبَابِ حُجْرَتِهِ، فَخَرَجَ إِلَيْهِمْ، فَقَالَ: « إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ، وَإِنَّهُ يَأْتِينِي الْخَصْمُ، فَلَعَلَّ بَعْضَهُمْ أَنْ يَكُونَ أَبْلَغَ مِنْ بَعْضٍ فَأَحْسِبُ أَنَّهُ صَادِقٌ، فَأَقْضِي لَهُ، فَمَنْ قَضَيْتُ لَهُ بِحَقِّ مُسْلِمٍ، فَإِنَّمَا هِيَ قِطْعَةٌ مِنَ النَّارِ، فَلْيَحْمِلْهَا أَوْ يَذَرْهَا ». {الحديث: ٤٤٥٠ = ٤٤٤٠ فم. تجريد/٣، رقم: ١٠٦٧ = ٢٤٥٨، ٢٦٨٠، ٢٩٦٧، ٢١٦٩، ٧١٨١، ٢١٨٧} : [١١١٤]

ئوم سەلەمەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەهاوسەرەکانی بێ) فەرمووی: دوو پیاو هاتنە لای حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) هەندێ کەلەپووریان هەبوو، لەسەری بوو بوو بەناکۆکیان، لەبەردەرگای هۆدەکەی پێغەمبەرا بوو بەدەمەقاڵیان، کەسیشیان بەڵگەیان نەبوو، تەنیا داوای رووت نەبێ، کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گوێی لەقرە قرپیان بوو، چووە دەرەوە بۆلایان، کاتێ لە مەسەلەکە حاڵی بوو، فەرمووی: (منیش هەر ئادەمیزادەمو، وەك ئێوە غەیبزان نیم، لەبەرئەوە بەپێی ڕووکاری کارەکە بڕیار دەدەم، جاوادەبێ کەدوو هاوداوا دێن بۆلای من، بۆ دادگایی، وادەبێ یەکێکیان لەوی تریان بە دەموپلترەو قسە زانترە، منیش وادەزانم کەڕاست دەکا، وەلەم ڕووەوە بڕیاری بۆ دەدەمو بەظاهیر داواکە دەباتەوە، دەی بزانن: هەرکەسێ لەسەر قسەی ناڕەوای خۆی من شتێ بڕیاربدەم

---

[١١١٤] تجريد/٣، ژمارە: ١٠٦٧ = ٢٤٥٨ بخاری. پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١٠٥١ = ٤٤٥٠ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٤٦ رقم الباب/١٦).

بـۆی، بـەوە نابـێ بـەهی ئـەو، کەواتـە بـاوەری نـەگرێ، چـونکە شـتی وا بـەو بڕیاردانەی منە، کە لەسەر شایەتیو بەڵگەو قسەی ناڕەوای خۆی بووە، نابێ بەهی خۆی، بەڵکوو ئەوە پارچەیێ ئاگری رووتە من بڕی دەدەم بۆی! ئیتر پاش ئەم روونکردنەوەیە ئارەزووی خۆیەتی ئەو پارچە ئاگرەیە هەڵدەگرێ، یا وازی لێ دێنێ!). {تاج/٣، زنجیرە: ١١٨، ژمارە: ٢٤٨٣، زنجیرە: ١١٩، ژمارە: ٢٤٩١}.

## (٤) باب قَضِيَّةِ هِنْدٍ

## باسی سەرگوزەشتەکەی هیندی ژنی ئەبو سوفیان

١١١٥- عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ هِنْدَ بِنْتَ عُتْبَةَ قَالَتْ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ أَبَا سُفْيَانَ رَجُلٌ شَحِيحٌ ، وَلَيْسَ يُعْطِينِي مَا يَكْفِينِي وَوَلَدِي ، إِلاَّ مَا أَخَذْتُ مِنْهُ وَهْوَ لاَ يَعْلَمُ فَقَالَ « خُذِي مَا يَكْفِيكِ وَوَلَدَكِ بِالْمَعْرُوفِ»: [١١١٥]

لە تەجریدی بوخاریدا، ژمارە (٩٩٠) ئاوایە:

عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْها) قَالَتْ هِنْدٌ أُمُّ مُعَاوِيَةَ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : إِنَّ أَبَا سُفْيَانَ رَجُلٌ شَحِيحٌ فَهَلْ عَلَيَّ جُنَاحٌ أَنْ آخُذَ مِنْ مَالِهِ سِرًّا؟ قَالَ: (خُذِي أَنْتِ وَبَنُوكِ مَا يَكفِيكِ بِالْمَعْرُوفِ). (الحديث ٢٢١١، أطرافُهُ في: ٢٤٦٠، ٣٨٢٥، ٥٣٥٩، ٥٣٦٤، ٥٣٧٠، ٦٦٤١، ٧١٦١، ٧١٨٠):

عائیشە (رەزای خودای گەورەی لەسەر بێ) فەرمووی: هیندی دایکی موعاویە (رەزای خودایان لێ بێ) عەرزی پێغەمبەری کرد(دروودی خوای لەسەر بێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەبو سفیانی مێردم، پیاوێکی رژدو گیرەو، ئەوەندەم ناداتێ کەبەئاسایی بەشی خۆمو ماڵو منداڵەکانم بکا، مەگەر ئەو نەزانێ شتی تری ببەم ئەوسا بەشمان بکا، جا ئایا ئەگەر بەنهێنی

---

[١١١٥] تجرید/٣، ژمارە: ٩٩٠ = ٢٢١١ بخاری. پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ٨٨٥ - ٢٣٠٧ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٦٩ رقم الباب/٩).

لەماڵەکەی ببەم بۆ مەسرەفی خۆمو منداڵەکانم گوناهم دەگات؟ فەرمووی(درودی خوای لەسەر بێ) : (ئەوەندە ببە کە بەشی خۆتو منداڵەکانت بکا، بەشێوەیەکی پەسەند بەپێی یاسای شەرع). (تاج /١٩٦/٢، ف/٨، ژمارە: ٢٢٨٦ چ/٤ - ش).

لە پوختەی موسلیما، ژمارە (٨٨٥)دا ئاوایە کە روونکردنەوەیەکی باشە سەبارەت بەم بابەتە:

عَنْ ثَوْبَانَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « أَفْضَلُ دِينَارٍ يُنْفِقُهُ الرَّجُلُ دِينَارٌ يُنْفِقُهُ عَلَى عِيَالِهِ، وَدِينَارٌ يُنْفِقُهُ الرَّجُلُ عَلَى دَابَّتِهِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَدِينَارٌ يُنْفِقُهُ عَلَى أَصْحَابِهِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ »، قَالَ أَبُو قِلاَبَةَ: وَبَدَأَ بِالْعِيَالِ. ثُمَّ قَالَ أَبُو قِلاَبَةَ: وَأَيُّ رَجُلٍ أَعْظَمُ أَجْرًا مِنْ رَجُلٍ يُنْفِقُ عَلَى عِيَالٍ صِغَارٍ يُعِفُّهُمْ، أَوْ يَنْفَعُهُمُ اللَّهُ بِهِ، وَيُغْنِيهِمْ. {الحديث: ٢٣٠٧ = ٢٢٨٥ فم}:

ثەوبان (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (باشترین دیناری کەپیاو خەرجی بکا، ئەو دینارەیە کە خەرجی دەکا بۆ ماڵو منداڵی خۆی، هەروا ئەو دینارەیە کە پیاو خەرجی بکا بۆ وڵاخەکەی کە لەپێناوی خوادا پێی تێ دەکۆشێ، وەك ئەوە غەزای پێوە دەکا، یاپێی دەچێ بۆ حەج، هەروا ئەو دینارەیە کە پیاو سەرفی دەکا بۆ هاوەڵانی خۆی، کە لەرێگەی خوادا خەبات دەگێڕنو غەزا دەکەنو لەپێناوی ئایینی خوادا تێ دەکۆشن).

ئەبو قیلابە (کە ثەوبان مامۆستای مامۆستاکەیەتی) دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بەخەرجی خێزان ریزەکەی دەست پێ کردووە، تا ئامازەبێ بۆئەوە کە خێرکردن بەپێی ئەم ریزکردنە خێری زۆرترە. لەپاشا ئەبو قیلابە بۆ پشتیوانی ئەم بۆچوونەی خۆی، کە خێرکردن لەخێزانی

خۆتـەوە دەسـت پـێ بکـەی خێرتـرە فـەرمووی: دەی پاداشـی کـێ لەپاداشـی ئـەو کەسـە گـەورەترە، کـە مەسـرەفی کۆمـەڵێ منـاڵی ورد دەکێـشێ، تـا لەخـەم دەرەخـسێن‌و لـەروو زەردی دەرووزەو سـواڵ رزگاریـان دەبـێ‌و چـاویان لەدەسـتی ئـەم‌و ئـەو نابـێ! وەخـودا بـەهۆی ئـەوەوە سـوودیان پـێ بگەیـەنێ‌و داراو دەوڵەمەنـدیان بکـات؟! دیـارە کـەس. {بڕوانـە: تـاج/٢، زنجـیرە: ٢١، ژمـارە: ١٢٧٤، ج/٤} + {ریاض/١، زنجیرە: ٣٦، ژمارە: ٢٩٠}.

١١١٦- عن عَائِشَةَ (رضى الله عنها) قَالَتْ جَاءَتْ هِنْدٌ بِنْتُ عُتْبَةَ قَالَتْ يَا رَسُـولَ اللَّهِ ، مَا كَانَ عَلَى ظَهْرِ الأَرْضِ مِنْ أَهْلِ خِبَاءٍ أَحَبُّ إِلَيَّ أَنْ يَذِلُّوا مِـنْ أَهْـلِ خِبَائِـكَ ، ثُمَّ مَا أَصْبَحَ الْيَوْمَ عَلَى ظَهْرِ الأَرْضِ أَهْلُ خِبَاءٍ أَحَبَّ إِلَيَّ أَنْ يَعِزُّوا مِنْ أَهْـلِ خِبَائِـكَ . قَالَ وَأَيْضًا وَالَّذِى نَفْسِي بِيَدِهِ ، قَالَتْ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ أَبَا سُفْيَانَ رَجُلٌ مِسِّيكٌ ، فَهَـلْ عَلَيَّ حَرَجٌ أَنْ أُطْعِمَ مِنَ الَّذِى لَهُ عِيَالَنَا قَالَ « لاَ أُرَاهُ إِلاَّ بِالْمَعْرُوفِ»:[١١١٦]

ئەمـەیش گێڕانەوەیـەکی تـری پوختـەی موسـلیمە، بـۆ ژمـارە (١١١٥) کـە لەپوختەی موسلیما ژمارە: (٨٨٧)ی بەرگی دووە:

عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُا) قَالَتْ: جَاءَتْ هِنْدٌ إِلَى النَّبِـيِّ (صـلى الله عليـه وسلم) فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَاللَّهِ مَا كَانَ عَلَى ظَهْرِ الأَرْضِ أَهْلُ خِبَاءٍ أَحَبَّ إِلَـيَّ مِـنْ أَنْ يُذِلَّهُمُ اللَّهُ مِنْ أَهْلِ خِبَائِكَ، وَمَا عَلَـى ظَهْـرِ الأَرْضِ أَهْـلُ خِبَـاءٍ أَحَـبَّ إِلَـيَّ مِـنْ أَنْ يُعِزَّهُمُ اللَّهُ مِنْ أَهْلِ خِبَائِكَ، فَقَالَ النَّبِـيُّ (صـلى الله عليـه وسـلم): « وَأَيْـضًا، وَالَّـذِي نَفْسِي بِيَدِهِ »، ثُمَّ قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ أَبَا سُفْيَانَ رَجُلٌ مُمْسِكٌ، فَهَـلْ عَلَـيَّ حَـرَجٌ أَنْ أُنْفِقَ عَلَى عِيَالِهِ مِنْ مَالِهِ بِغَيْرِ إِذْنِهِ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسـلم): « لاَ حَـرَجَ

---

[١١١٦] تجریـد/٣، ژمـارە: ٩٩٠ - ٢٢١١ بخـاری. پوختـەی موسـلیم/٢، ژمـارە: ٨٨٧ - ٤٤٥٤ شـیحا (بخاری رقم الکتاب/٦٣ رقم الباب/٢٣).

عَلَيْكِ أَنْ تُنْفِقِي عَلَيْهِمْ بِالْمَعْرُوفِ ». {الحديث: ٤٤٥٤ شيحا = ٤٤٤٤ فم. تجريد/٣، رقم: ٩٩٠ = ٢٢١١، ٢٤٦٠، ٣٨٢٥، ٥٣٥٩، ٥٣٦٤}:

عائیشه (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: هیندی دایکی موعاوییه (رەزای خودایان لێ بێ) هات بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزیکرد: ئەی پێغەمبەری خودا! سوێند بەخودا، لەسەر رووی زەوی، بنەماڵەو وڵات نەبووە، کە بەقەد بنەماڵەو وڵاتی تۆ، پێم خۆش بێ، کەخودا داماوو کەساسیان بکا، بەڵام خودا کارێکی وایکرد، کەئێستا بنەماڵەو وڵات نییە، کە بەقەد بنەماڵەو وڵاتی تۆ، کەپێم خۆش بێ، خودا سەربەرزی هەردوو جیهانیان بکا. پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەوکەسە کە گیانی منی بەدەسە، ئەم خۆشەویستییەی تۆ بۆ منو بۆ ئایینی من، رۆژ بەرۆژ زیاتر دەبێ!)

ئەوجا هیند فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! پرسیارێکم هەیە کە ئەمەیە: ئەبو سوفیانی مێردم، پیاوێکی رژدو گیرە، ئەوەندەم ناداتێ کە بەشی خۆمو منداڵەکانم بکا، بەئاسایی، مەگەر ئەو نەزانێ، خۆم شتی تری ببەم ئەوسا بەشمان بکا، جا ئایا ئەگەر ئەو نەزانێ، بەنهێنی خۆم لە ماڵەکەی ببەم، بۆ مەسرەفی خۆمو منداڵەکانم گوناهم ناگا؟ پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (گوناهت ناگا، کە بەپێی دەستووری جوانی ناو کۆمەڵ مەسرەفیان بۆ بکەی!). {تاج/٣، زنجیرە: ٨٠، ژمارە: ٢٢٨٦}.

## روونکردنەوە:

هیندی کچی عوتبە، هاوسەری ئەبو سوفیان، دایکی موعاوییە، (رەزای خودایان لێ بێ) هەرسێکیان هاوەڵی پێغەمبەر بوون، خۆیو ئەبو سوفیانی

مێردی لە (مەسلەمە)ی فەتح بوون، ڕۆژی ئازادکردنی مەککە موسوڵمان بـوون، لەپێشا لەدوژمنـە هـەرە سـەر سـەختەکانی پێغەمبـەر بـوون، کـاتێکیش خـودا هیدایەتی دان موسوڵمانی جوانیان لێ دەرچوو، هیند لەجەنگی ئوحوددا، لەگـەڵ دەستەیێ، لەژنان، بەسروود خوێندنەوە هانی مێردەکانیـان دەدا کـە دەجـەنگان لەگەڵ پێغەمبەرو لەشکری ئیسلاما، هانیان دەدان لەسەر شـەڕکردنو بەدەفـەوە دەیانگوتو دەیانچڕاند:

نَحْـــنُ بَنَـــاتُ طَـــارِقِ نَمْـــشِي عَلَـــى النَّمَـــارِقِ

إِنْ تُقْبِلُـــوا نُعَـــانِقِ أَوَ تُـــدْبِرُوا نُفَـــارِقِ

فِـــرَاقَ غَيْـــرِ وَامِـــقِ

واتە:

کچی ئەستێرەی سوورین پـەروەردەی سـەر مـافوورین

عاشـق بەشـیرو شـوورین لـەپیاوی کـوونی دووریـن!

یـــــاری لاوی جەســـــوورین

یا ئاوا:-

کچی ئەستێرەو مـانگین بـــەنازو شـــۆخ و شـــەنگین

ئاشـق بەشـێری جـەنگین ئـەو گوڵـەو نێمـە هـەنگین

لــــە هـــەڵهاتوو دڵتـــەنگین

کاتێ هیند موسوڵمان بوو، بوتێکی هەبوو، بەتەشوێ پارچە پارچەی کـردو گوتی: بەڕاستی هەتا لەگەڵ تۆ بووین، چاك لەخۆمان بایی بوو بووین!

هیند کاتێ لەجەنگی ئوحوددا وەحشی حەمزەی مامی پێغەمبەری شەهید کرد، سکی دڕی و جەرگی دەرهێناو برژاندی و ویستی بیخوات، چونکە حەمزە لەجەنگی بەدردا عوتبەی باوکی هێندی کوشتبوو!

لەسەردەمی جێنشینی عومەری کوڕی خەتابا، لەو رۆژەدا کە ئەبو قوحافەی باوکی ئەبوبەکری صەدیق مرد، هیندیش مرد، (رەزاو رەحمەتی خودایان لێ بێ). بۆ تێگەیشتنی تەواو لەم بابەتە بڕوانە: ١- ژمارە: ١٩٧ لەپوختەی موسلیم ژینامەی موعاوییەی کوڕی ئەبو سوفیان. ٢- ژمارە: ٨٦٢ لەپوختەی موسلیم. هەروا تاج/٣، زنجیرە: ٣٣، ژمارە: ٣٤٢٢ + زنجیرە: ٣٤، ژمارە: ٣٤٢٤، ٣٤٢٣. هەروا تەجریدی بوخاری، بەرگی یەکەم ژمارە: ٦٣ + تەجرید/٢، ژمارە: ٦١٤.

### (٥) باب النَّهيِ عَنْ كَثْرَةِ المَسَائِلِ مِنْ غَيْرِ حَاجَةٍ وَالنَّهيِ عَنْ منع وهاتِ وَهُوَ الإمتِنَاعُ مِنْ أدَاءِ حَقٍ لَزِمَهُ أوْ طَلَبِ مَالا يَستَحِقُّهُ

### داواکردنی شت بە بێ پێویستی، ڕێگری لە بگرەو بەردە، وەك نەوە بە ناڕەوا مافی خەڵك نەداو بە ساختە گەڕو گێچەڵ بە خەڵك بکات

١١١٧- عَنْ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ عَنْ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ(ڕەزای خوای لێ بێ) قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : (إِنَّ اللَّهَ حَرَّمَ عَلَيْكُمْ عُقُوقَ الأُمَّهَاتِ وَوَأْدَ الْبَنَاتِ وَمَنَعَ وَهَاتِ وَكَرِهَ لَكُمْ قِيلَ وَقَالَ وَكَثْرَةَ السُّؤَالِ وَإِضَاعَةَ الْمَالِ) (الحديث ٢٤٠٨، أطرافُهُ في: ١٤٧٧)[1117]:

موغیرەی کوڕی شوعبە(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: خودا قەدەغەیکردووە

---

[1117] تجريد/٥، ژمارە: ٢١٢٣ = ٧٣٥٢ بخاری. پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١٠٥٦ = ٤٤٦٢ (بخاری رقم الكتاب/٤٣ رقم الباب/١٩).

لەسـەرتان، دڵڕەنجانی بـاوكو دایكـان، وەزیندەبەچـاڵ كردنـی كـچان، وەنـەدانی مافی سەرتان، وەزەوت كردنی مافی خەڵـكان، وەحـەزیش ناكـا لـەم سـێ رەفتـارە بۆتان: لەوتی وتیو لەپرسیاری زۆرو لەسواڵكردنی زۆر، لەزایەكردنی ماڵ بەبێ هوودە. (تاج/٢/٣٤٥ف-٤+تاج/٢ ص٢٢٥).

## (٦) باب بيان أجر الحاكم إذا إجتَهَدَ فأصَابَ أوْ أخطأ

## دادوەر كاتێ بڕیار دەدا، ئەگەر بەر لەوە بۆ دۆزینەوەی بڕیاری دروست تێبكۆشێ، ئیتر بیپێكێ، یان نەیپێكێو هەڵە بكا، پاداشی باشی بۆی هەیە

١١١٨- عَنْ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّـهُ سَـمِعَ رَسُـولَ اللَّـهِ (صـلى الله عليه وسلم) يقول: « إِذَا حَكَمَ الْحَاكِمُ فَاجْتَهَدَ ثُمَّ أَصَابَ فَلَهُ أَجْرَانِ، وَإِذَا حَكَمَ فَاجْتَهَدَ ثُمَّ أَخْطَأَ فَلَهُ أَجْرٌ ». {الحديث: ٤٤٦٢ = ٤٤٥١ فم. تجريد/٥، رقم: ٢١٢٣ = ٧٣٥٢ فتح الباري. أبو داود. أقضية: ٣٥٧٤} : [١١١٨]

عـەمری كـوڕی عـاص (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: خۆشەویـست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (دادپرس (حاكم = قازی) ئەگەر لەكاتی بڕیاردانـا، چـاك تێكۆشێو بـاش وردبێتـەوە بـۆ گەیـشتن بەهـەقو بـۆ پـەیبردن بـەرووی راسـتیی پرسـەكەو، ئـەنجا بڕیارەكـە دەركـا، ئـەوە لـەم كاتـەدا ئەگـەر بڕیارەكەی راست بوو، ئەوە دوو پاداشی بۆ هەیە، بەڵام ئەگەر لە بارودۆخی وادا بڕیارەكـەی هەڵـەبوو، ئـەوە یـەك پاداشـی بـۆ هەیـە، چـونكە ئـەو بـە ئـەركی سەرشانی خۆی هەڵساوەو درێغی نەكردووە!). {تاج/٣، زنجیرە: ١١٨، ژمـارە: ٢٤٨٢، ج/٤}.

[١١١٨] تجرید/٥، ژمارە: ٢١٢٣ = ٧٣٥٢ بخاری. (بخاری رقم الكتاب/٩٦ رقم الباب/٢١).

## (٧) باب كَرَاهة قضاءِ القاضي وَهُوَ غَضْبانِ
## له كاتي تورەييدا، دادوەر نابێ دادگايی بكا

١١١٩- حديث أَبِي بَكْرَةَ قَالَ كَتَبَ أَبُو بَكْرَةَ إِلَى ابْنِهِ وَكَانَ بِسِجِسْتَانَ بِأَنْ لاَ تَقْضِيَ بَيْنَ اثْنَيْنِ وَأَنْتَ غَضْبَانُ ، فَإِنِّي سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ « لاَ يَقْضِيَنَّ حَكَمٌ بَيْنَ اثْنَيْنِ وَهْوَ غَضْبَانُ »[١١١٩]:

ئەم فەرموودەيە لە پوختەی موسليما، ژمارە: (١٠٥٥) ئاوايە:

عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرَةَ قَالَ: كَتَبَ أَبِي وَكَتَبْتُ لَهُ إِلَى عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي بَكْرَةَ وَهُوَ قَاضٍ بِسِجِسْتَانَ أَنْ لاَ تَحْكُمَ بَيْنَ اثْنَيْنِ وَأَنْتَ غَضْبَانُ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ: « لاَ يَحْكُمْ أَحَدٌ بَيْنَ اثْنَيْنِ وَهُوَ غَضْبَانُ ». {الحديث: ٤٤٦٥ = ٤٤٥٤ فم. تجريد/٣، رقم: ٢١٠٩ = ٧١٥٨ فتح الباری} :

عەبدوڕەحمانی كوڕی ئەبوبەكرە، فەرمووی: عوبەيدوڵڵای برام لەسيجستان دادوەر (قازی) بوو، باوكم نامەيەكی بەمن نووسی بۆیو بۆينارد، بۆی نووسی: لەكاتی تووڕەييدا، دادگايی كەس مەكە، چونكە من خۆم بۆئەوە لە پێغەمبەرم بيستووە دەيفەرموو (دروودی خودای لەسەر بێ): (دادوەر لەكاتی تووڕەييدا، دادگايی كەس نەكا). {تاج/٣، زنجيرە: ١١٣، ژمارە: ٢٤٦٧، ج/٤} .

لەتەجريدی بوخاريدا، ژمارە (٢١٠٩) ئاوايە:

عَنْ أَبِي بَكْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ) يَقُولُ لَا يقضين حكمٌ بَيْنَ اثْنَيْنِ وَهُوَ غَضْبَانُ. (الحديث ٧١٥٨):

---

[١١١٩] تجريد/٥، ژمارە: ٢١٠٩ = ٧١٥٨ بخاری. پوختەی موسليم/٢، ژمارە: ١٠٥٥ = ٤٤٦٥ شيحا (بخاری رقم الكتاب/٩٣ رقم الباب/١٣).

ئەبو بەكرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست(دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی:(دادوەر لەكاتی تووڕەیی دا دادپرسیو مەحكەمەی كەس نەكا). (تاج/٢ ل/٣٠٤ ز/١١٣ ژ/١ - ش/د/ت/ن-باسی دەستووورو یاسای دادوەری).

## (٨) باب نقض الأحكام الباطلة وَرَدُ مُحْدَثاتِ الأمُور
## هەڵوەشاندنەوەی بڕیاری ناڕەواو بەر لە كاری تازە قەڵكرتن

١١٢٠- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) قَالَتْ قَالَ رَسُولُ اللّهِ (صلى الله عليه وسلم) « مَنْ أَحْدَثَ فِي أَمْرِنَا هَذَا مَا لَيْسَ فِيهِ فَهُوَ رَدٌّ »: [١١٢٠]

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەركەسێ شتێكی ناشایستە لەم ئایینەی ئێمە دابهێنێ، كە پەیوەندی پێوەی نەبێ، ئەو شتە قەبووڵ نییەو دەدرێتە دواوە).

ئەمەیش گێڕانەوەی ژمارە (١٢٣٧)ی پوختەی موسلیمە:

عَنْ سَعْدِ بْنِ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: سَأَلْتُ الْقَاسِمَ بْنَ مُحَمَّدٍ عَنْ رَجُلٍ لَهُ ثَلاَثَةُ مَسَاكِنَ فَأَوْصَى بِثُلُثِ كُلِّ مَسْكَنٍ مِنْهَا، قَالَ: يُجْمَعُ ذَلِكَ كُلُّهُ فِي مَسْكَنٍ وَاحِدٍ، ثُمَّ قَالَ: أَخْبَرَتْنِي عَائِشَةُ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «مَنْ عَمِلَ عَمَلاً لَيْسَ عَلَيْهِ أَمْرُنَا فَهُوَ رَدٌّ». {الحديث: ٤٤٦٨ = ٤٤٥٧ فـم. بخاری. صلح: ٢٦٩٧. أبو داود. السنة: ٤٦٠٦} :

سەعدی كوڕی ئیبراهیم (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: چووم بۆلای قاسمی كوڕی موحەممەد، ئەم پرسیارەم لێی كرد: پیاوێ سێ خانووی هەبێ، راسپێرێ كە لەپاش مەرگی خۆی، لەهەر خانوویەك لەو سێ خانووانە سێ

[١١٢٠] بوخاری. صلح: ٢٦٩٧. پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١٢٣٧ = ٤٤٦٨ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٥٣ رقم الباب/٥).




یەکێکی خێربێ، ئایا ئەمە چۆنەو ئەم راسپێرییە تەواوە یانا؟ فەرمووی: هەرسێ سێ یەکەکە لەیەك خانوویانا کۆدەکرێنەوەو ئەو خانووە هەمووی دەبێ بەخێرو دوو خانووەکەی تر دەمێننەوە بۆ کەلەپوور بەرەکان، چونکە من لە عائیشەی پوورمم بیست دەیفەرموو: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەرکەسێ شتێکی ناشایستە لەم ئایینەی ئێمە زیاد بکا، کە پەیوەندی پێوە نەبێ، ئەو شتە قەبووڵ نییەو دەدرێتە دواوە). {تاج/١، زنجیرە: ٩، ژمارە: ٦٣} گێڕانەوەی ئێرە ئاوایە: (هەرکەسێ کارێ بکا، کە فەرمانو رەزای ئێمەی لەسەر نەبێ، ئەوکارە قەبووڵ نییەو دەدرێتە دواوە!).

## روونکردنەوە:

١- لەپەڕاوە شەرحەکانا، پوختەی ئەم پرسە ئەمەیە:

(مەبەست ئەوەیە کە لایەنێ لە لایەنانی خاوەن ماف، لەم جۆرە پرسەدا زیانەوەمەند نەبێ، دەنا لەم پرسیارەی بەردەستدا، ئەگەر سێ خانووەکە لە باشیو خراپیدا جیاوازییان هەبوو، ئەوە دەبێ هەرسێ خانووەکان سێ یەکیان لێ دەرکرێ، دەنا نا، تا کەلەپوور بەرەکان زیانیان لێ نەکەوێ).

٢- قاسمی کوڕی موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکری صەدیق برازای حەزرەتی عائیشەیە، کە کەسناوی (کونیە)ی ئەبو عەبدورەحمانە، گێڕانەوەی لەزۆر لە هاوەڵە مەزنەکانی پێغەمبەرەوە هەیە، وەك عائیشەو عەبادیلە، قاسم راستاڵو پایە بڵندو زاناو پێشەوا بوو، زۆر خاوەن وەرع بوو، فەرموودەی زۆرە، کە موحەممەدی باوکی کوژرا، ئەوکاتە قاسیم هەتیو بوو، عائیشەی پووری سەرپەرشتی ئەوی دەکرد، بوخاری دەفەرموێ: قاسم باشترینی سەردەمی خۆی بوو، سوننەت زانێکی زۆر نایاب بوو، دەڵێن لە تەمەنی حەفتا ساڵیدا، لە سەدو شەشی کۆچیدا مردووە.

## (١٠) باب بيان إختلاف المجتهدين
## باسی ڕوونکردنەوەی جیاوازیی نێوانی کۆششکاران

١١٢١ – عَنْ ابَي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عنهُ) انَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ مَثلِي وَمَثلُ النَّاسِ كَمَثَلِ رَجُلٍ اسْتَوْقَدَ نَارًا فَجَعَلَ الْفَرَاشُ وَهَذهِ الدَّوَابُّ تَقَعُ فِي النَّارِ (الحديث٣٤٢٦). وَقَالَ: كَانَتْ امْرَاتَانِ مَعَهُمَا ابْنَاهُمَا جَاءَ الذئْبُ فَذهَبَ بابْنِ احْدَاهُمَا فَقَالَتْ صَاحِبَتُهَا: انَّمَا ذهَبَ بابْنِكِ وَقَالَتْ الاخْرَى: انَّمَا ذهَبَ بابْنِكِ فَتَحَاكَمَتَا الَى دَاوُدَ فَقَضى بِهِ لِلْكُبْرَى فَخَرَجَتَا عَلَى سُلَيْمَانَ بْنِ دَاوُدَ فَاخْبَرَتَاهُ فَقَالَ: ائْتُونِي بالسِّكِّينِ اشُقُّهُ بَيْنَهُمَا فَقَالَتْ الصُّغْرَى: لا تَفْعَلْ يَرْحَمُكَ اللّٰهُ هُوَ ابْنُهَا فَقَضى بِهِ لِلصُّغْرَى). (الحديث: ٣٤٢٧، طرفه في:٦٧٦٩): [1131]

**فەرموودەی یەکەم لە رياض الصالحين دا ئاوایە:**

لە جابیرەوە (ڕەزای خودای لێ بێ) لە حەزرەتەوە (دروودی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: (وێنەی من و وێنەی ئێوەی ئۆمەتی من، وەك وێنەی پیاوێ وایە، ئاگرێکی کردبێتەوە، جانەوەرو پەپولەیەکی زۆری تێ ووروکابێ و، پەیتا پەیتا بکەونە ناوی و بسووتێن، ئەویش خۆش خۆش بە پەرۆشەوە دووریان بخاتەوە لە ئاگرەکە، ئەوە تانێ من کەمەرم گرتوون و بەزۆر دوورتان دەخەمەوە لە ئاگرەکە، کەچی ئێوە بەزۆر خۆتان لە دەستم ڕادەپسکێنن و خۆتانی تێ فڕێ دەدەن!). (رياض/١ ل/١٥١ ز/١٦ ف/١٦٣) + (تاج/١ ل/٥٤ ز/٩ ف/٦، ژمارە: ٦٦).

**فەرموودەی دووەمیش لە تاجول ئوصول دا ئاوایە:**

ئەبو هورەیرە فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی (جارێ دووژن دوو کوڕی خۆیان پێ دەبێ، گورگێ لەولاوە دێ، کوڕی ژنێکیان

---

[1131] تجرید/٤، ژمارە: ١٣٦٤ = ٣٤٢٦، ٣٤٢٧ بخاری. مسلم/ترقیم محمد فؤاد/١٧٢٠ = پوختەی موسلی/٣، ژمارە: ١٠٥٧ = ٤٤٧٠ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٦٠ رقم الباب/٤٠).




دەبات، ژنەکە بەهاوڕێکەی دەڵێ: گورگەکە کوڕەکەی تۆی فڕاندووە، ئەویش دەڵێ: نەء، کوڕەکەی تۆی بردووە، جابۆ دادگایی و مەحکەمە دەچنە لای داوود پێغەمبەر داوودیش (سەلامی خوای لێ بێ) بڕیاردەدا: کە ئەو کوڕەی ماوە بۆ ژنە گەورە کەبێ، چاکە دێنە دەرەوە دەگەن بە حەزرەتی سولەیمانی کوڕی داوود (سەلامی خوای لێ بێ) وە باسەکەی بۆ دەگێڕنەوە، ئەویش دەفەرموێ: ئادەی چەقۆیەکم بۆبێنن دەیکەم بە دوو لەتەوە بۆتان!

جاژنە بچکۆلەکە دەڵێ: نا، ڕەحمەتی خودات لێ بێ وای لێ مەکە، کوڕی ئەوە، ئەویش کەڕوانی: ژنە بچکۆلەکە سکی بە مناڵەکە دەسووتێ زانی کەمناڵی خۆیەتی، جالەبەر ئەوە دایەوە بەژنە بچکۆلەکە).

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەخوا ئەو ڕۆژە نەبێ ناوی چەقۆم نەبیستبوو، ئێمە جاران لەولاتی خۆمان هەردەمانگوت سیکاردو کێرد (تاج/٣ ل/٣١٥ ز/١١٩ ف/٧، ژمارە: ٢٤٨٨ - باسی اجتهاد) + ( ریاض/٤ ل/١٣٢٣ ف/٢٠، ژمارە: ١٨٢٧).

## (١١) باب إستحباب إصلاح الحاكم بين الخصمين
## دادوەر ناوبژی لە نێوانی هاوداواکانا دەکا

١١٢٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قال: قال رَسُولِ اللّـهِ (صلى الله عليه وسلم): « اشْتَرَى رَجُلٌ مِنْ رَجُلٍ عَقَارًا لَهُ، فَوَجَدَ الرَّجُلُ الَّذِي اشْتَرَى الْعَقَارَ فِي عَقَارِهِ جَرَّةً فِيهَا ذَهَبٌ، فَقَالَ لَهُ الَّذِي اشْتَرَى الْعَقَارَ: خُذْ ذَهَبَكَ مِنِّي إِنَّمَا اشْتَرَيْتُ مِنْكَ الأَرْضَ، وَلَمْ أَبْتَعْ مِنْكَ الذَّهَبَ، فَقَالَ الَّذِي شَرَى الأَرْضَ: إِنَّمَا بِعْتُكَ الأَرْضَ وَمَا فِيهَا، قَالَ: فَتَحَاكَمَا إِلَى رَجُلٍ، فَقَالَ الَّذِي تَحَاكَمَا إِلَيْهِ: أَلَكُمَا وَلَدٌ؟ فَقَالَ أَحَدُهُمَا: لِي غُلاَمٌ،

وَقَالَ الآخَرُ: لِي جَارِيَةٌ، قَالَ: أَنْكِحُوا الْغُلاَمَ الْجَارِيَةَ وَأَنْفِقُوا عَلَى أَنْفُسِكُمَا مِنْهُ وَتَصَدَّقَا ». {الحديث: ٤٤٧٢ = ٤٤٦١ فم. تجريد/٤، رقم: ١٣٨٤ = ٣٤٧٢} : [١١٣٢]

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (جارێ پیاوێ خانوویەکی کڕی لەپیاوێکی تر، کڕیارەکە کووپەڵەیێ زێڕی تیا دۆزییەوە، جا بەفرۆشیارەکەی گوت: زێڕەکە هی تۆیە، لێم وەرگرەوە، چونکە من تەنیا زەوییەکەم لەتۆ کڕیوە، خۆ زێڕەکەم لێ نەکڕیوی، ئەویش گوتی: من زەوییەکە خۆیو هەرچی واتیادا، فرۆشتوومە بەتۆ، زێڕەکە هی خۆتە من وەری ناگرمەوە. فەرمووی: جابۆ دادگاییو ناوبژیکردن چوون بۆلای پیاوێو کردیان بە فەرمانڕەواو ناوبژیوان (حەکەم - ناوبژیکەر).

پیاوەکە گوتی: ئایا منالتان هەیە؟ یەکێکیان گوتی: من کوڕێکم هەیە، ئەوی تریشیان گوتی: منیش کچێکم هەیە، ئەویش گوتی: کەواتە کچەکە لە کوڕەکە مارە بکەنو زێڕەکەیش بۆ خۆتان خەرج بکەن بۆ مەسرەفی شایی، وەخێریشی لێ بکەن، ئیتر ئەوانیش وایان کرد). {تاج/٣، زنجیرە: ١٢١، ژمارە: ٢٤٩٣}.

---

[١١٣٢] تجرید/٤، ژمارە: ١٣٨٤ = ٣٤٧٢ بخاری. پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ١٠٥٨ = ٤٤٧٢ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٦٠ رقم الباب/٥٤).

## ٣١- كِتَابُ اللُقطَةِ
## نامەی دۆزراوە

{بڕوانـــە: تـــاج/٢، زنجـــیرە: ١٨٤، لـــە ژمـــارە: ١٩٥٩ — ١٩٦٥ + تجریـــدی بوخـاری/٢، زنجیرە: ٥٠، لاپـەڕە: ١٤٩، لـە ژمـارە: ١٠٥٥ هـەتا ژمـارە: ١٠٥٦ + فقهـی ئاسان، بەرگی یەکـەم زنجیرە: ٢٤٠ باسـی هـەلگرتنی شـتی دواکـەوتوو + شـەرحی بلوغ المرام/٢ لە ژمارە: ٩٦٥ هەتا ژمارە: ٩٧٠}.

١١٢٣- وَعَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ اَلْجُهَنِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: {جَاءَ رَجُلٌ إِلَى اَلنَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) فَسَأَلَهُ عَنِ اللُّقَطَةِ؟ فَقَالَ: " اِعْرِفْ عِفَاصَهَا وَوِكَاءَهَا، ثُمَّ عَرِّفْهَا سَنَةً، فَإِنْ جَاءَ صَاحِبُهَا وَإِلَّا فَشَأْنُكَ بِهَـا". قَـالَ: فَـضَالَّةُ اَلْغَـنَمِ؟ قَـالَ: "هِـيَ لَـكَ، أَوْ لِأَخِيكَ، أَوْ لِلذِّئْبِ". قَالَ: فَضَالَّةُ اَلْإِبِلِ؟ قَالَ: "مَا لَكَ وَلَهَا؟ مَعَهَا سِقَاؤُهَا وَحِذَاؤُهَا، تَرِدُ اَلْمَاءَ، وَتَأْكُلُ اَلشَّجَرَ، حَتَّى يَلْقَاهَـا رَبُّهَـا} مُتَّفَـقٌ عَلَيْـهِ. {تجریـدی بوخـاری/١، ژمـــــــارە: ٧٩ = ٩١، ٢٣٧٢، ٢٤٢٧، ٢٤٢٨، ٢٤٢٩، ٢٤٣٦، ٢٤٣٨، ٥٢٩٢، ٦١١٢ بوخـــاری. مختـــصر صـــحیح البخـــاری/٣، ژمـــارە: ١٠٦٠ = شیحا/٤٤٧٧}:[١١٢٣]

زەیـدی کـوڕی خالیـدی ئەلجوهـەنی (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پرسـیارکرا لـە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ): حـوکمو بڕیـاری زێـڕو زیوی دۆزراوەو شتی داکەوتەی تری دۆزراوە چییە؟

فەرمووی: (پڕیاسکەو دەمبێنەکەی نیشانە بکە، وەهەتا ساڵێ جاڕی بـۆ بـدەو ناونیـشانی هەڵبـدە، جـا ئەگـەر لـەوماوەدا خاوەنەکـەی پەیـدابوو، ئـەوا

---

[١١٢٣] شەرحی بلوغ المرام/٢، ژمارە: ٩٦٦. تجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٧٩ - ٩١ بخاری. پوختـەی موسلیم/٣، ژمارە: ١٠٦٠ = شیحا/٤٤٧٧. (بخاری رقم الکتاب/٤٢ رقم الباب/١٢).

بیدەرەوە پێی، ئەگەر چەسپانی کەهینی خۆیەتی، دەنا چی لێ دەکەی بیکە، یا خەرجی بکە بۆخۆت، وە لەهەمان کاتدا، وایدابنێ کە سپاردە (وەدیعە)یە لەلای تۆ، هەرکاتێ خاوەنەکەی داوای کردەوە، دەبێ بیدەیتەوە پێی).

لێشی پرسی: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! ئەی بڕیاری بزن‌و مەڕی گومبوو چییە؟ فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (بیبەرەوە، چونکە ئەگەر تۆ نەیبەیتەوەو خاوەنەکەی نەیدۆزێتەوەو برادەرێکی تر نەیباتەوە بۆخۆی، دیارە کە گورگ دەیخوات!).

عەرزیکرد: ئەی قوربان! بڕیاری وشتری بزر چییە؟

فەرمووی: (تۆ دەخڵت چییە بەسەریەوە؟ تۆ دەخڵی مەکە، وشتر پێڵاوو کوندەی خۆی پێ هەیە، بۆ خۆی ئاو دەخواتەوەو لەوەڕ دەخوا، هەتا خاوەنەکەی دەیدۆزێتەوەو دەیباتەوە). {تاج/٢، زنجیرە: ١٨٤، ژمارە: ١٩٦٠، ١٩٦١} .

١١٢٤- عَنْ أُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) فَقَالَ: وجدتُ صُرَّةً على عهد النبيّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فيها مِائَةَ دِينَارٍ فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: (عَرِّفْهَا حَوْلاً) فَعَرَّفْتُهَا حَوْلاً، فَلَمْ أَجِدْ مَنْ يَعْرِفُهَا، ثُمَّ أَتَيْتُهُ فَقَالَ: (عَرِّفْهَا حَوْلاً) فَعَرَّفْتُهَا فَلَمْ أَجِدْ ثُمَّ أَتَيْتُهُ ثَلاثًا فَقَالَ: (احْفَظْ وِعَاءَهَا وَعَدَدَهَا وَوِكَاءَهَا فَإِنْ جَاءَ صَاحِبُهَا وَإِلاَّ فَاسْتَمْتِعْ بِهَا) (الحديث ٢٤٢٦، أطرفُهُ في: ٢٤٣٧)؛ [١١٢٤]

ئوبەی کوڕی کەعب(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پڕیاسکەیەکم دۆزییەوە سەد دیناری زێڕی تیادا بوو، چووم بۆ خزمەتی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) بارودۆخەکەم بۆی ڕوونکردەوە، فەرمووی: (یەك ساڵی

[١١٢٤] تجرید/٣، ژمارە: ١٠٥٥ = ٢٤٢٦ بخاری. مسلم/محمد فؤاد/١٧٢٢ = مسلم/شیحا: ٤٤٨١ (بخاری رقم الکتاب/٤٥ رقم الباب/١٠).

تەواوجاڕی بۆ بدە) منیش وام کرد، بەڵام کەسم دەست نەکەوت کەناونیشانی شتەکەم بۆ هەڵ دا، دووبارە رۆیشتمەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرموویەوە: (ساڵێکی تریش جاڕی بۆ بدەرەوە). منیش دووبارە ساڵێکی تریش جاڕم بۆی دایەوەو، دیسانەوە کەسم دەست نەکەوت کەناونیشانی بزانێ، بۆ جاری سێیەم چوومەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئاگاداری پڕیاسکەکەی‌و ژمارەکەی‌و بەنی دەمبێنەکەی‌بکە، جا ئەگەر خاوەنەکەی هاتەوە بیدەرەوە پێی، بەمەرجی ناسینەوەی دەنا بۆ خۆت سوودی لێ وەربگرەو بیکە بەهی خۆت).

## (٢) باب تحريم حلب الماشية بغير إذن مالكها
## دۆشینی ئاژەڵ بەبێ مۆڵەتی خاوەنی نادروستە

١١٢٥- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « لاَ يَحْلُبَنَّ أَحَدٌ مَاشِيَةَ أَحَدٍ إلاَّ بِإِذْنِهِ، أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَنْ تُؤْتَى مَشْرُبَتُهُ فَتُكْسَرَ خِزَانَتُهُ، فَيُنْتَقَلَ طَعَامُهُ، فإِنَّمَا تَخْزُنُ لَهُمْ ضُرُوعُ مَوَاشِيهِمْ أَطْعِمَتَهُمْ، فَلاَ يَحْلُبَنَّ أَحَدٌ مَاشِيَةَ أَحَدٍ إلاَّ بِإِذْنِهِ ». {الحديث: ٤٤٨٦ = ٤٤٧٥ فم. بخاري. لقطة: ٢٤٣٥}:[١١٢٥]

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کەس ئاژەڵی کەس نەدۆشێ، مەگەر بەرەزای خۆی، کامتان پێتان خۆشە کە ڕەفەکەتان بشکێنن‌و خواردنەکەتان ببەن، دیارە کەس ئەمەی پێ خۆش نیە، دە ئەو خەڵکەیش گوانی ئاژەڵەکانیان دۆڵابی

(١١٢٥) بخاری. لقطة: ٢٤٣٥. پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١٠٦٢ = ٤٤٨٦ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٤٥ رقم الباب/٨).

خۆراکەکەیانە! کەواتە: کەس ئاژەڵی کەس نەدۆشێ، مەگەر بەخواستی خۆی).
{تاج/٢، زنجیرە: ١٨٤، ژمارە: ١٩٦٣}.

## (٣) باب الضِّيافة ونحوها
## بابەتی میوانداریو شتی تری وا

١١٢٦- عَنْ أَبِى شُرَيْحٍ الْعَدَوِىِّ قَالَ سَمِعَتْ أُذُنَاىَ وَأَبْصَرَتْ عَيْنَاىَ حِينَ تَكَلَّمَ النَّبِىُّ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ « مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلْيُكْرِمْ جَارَهُ ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ جَائِزَتَهُ » . قَالَ وَمَا جَائِزَتُهُ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ « يَوْمٌ وَلَيْلَةٌ وَالضِّيَافَةُ ثَلاَثَةُ أَيَّامٍ ، فَمَا كَانَ وَرَاءَ ذَلِكَ فَهْوَ صَدَقَةٌ عَلَيْهِ ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلْيَقُلْ خَيْرًا أَوْ لِيَصْمُتْ »:

عَنْ أَبِى شُرَيْحٍ الْخُزَاعِىِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « الضِّيَافَةُ ثَلاَثَةُ أَيَّامٍ، وَجَائِزَتُهُ يَوْمٌ وَلَيْلَةٌ، وَلاَ يَحِلُّ لِرَجُلٍ مُسْلِمٍ أَنْ يُقِيمَ عِنْدَ أَخِيهِ حَتَّى يُؤْثِمَهُ»، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ! وَكَيْفَ يُؤْثِمُهُ؟ قَالَ: « يُقِيمُ عِنْدَهُ وَلاَ شَىْءَ لَهُ يَقْرِيهِ بِهِ ». {الحديث: ٤٤٨٩ = ٤٤٧٨ فم}:

ئەبو شورەیحی خوزاعی (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (میوانداریی سێ ڕۆژە، خەڵاتەکەی شەوو ڕۆژێکە، دروست نییە بۆ موسوڵمان کەلەلای برای ئایینی خۆی بەناوی میوانداریییەوە دایکوتێ هەتا تووشی گوناهی دەکا) هاوەڵان عەرزیان کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! (چۆن چۆنی تووشی گوناهی دەکا؟) فەرمووی: (ئەوەندە لەلای دەمێنێتەوە بێزاری دەکا، نییەتی نانو ئاوی بداتێو وەك میوان میوانداریی پێ بکا، لەبارودۆخی وادا دوور نییە، کە غەیبەتی بکا).

١١٢٧- عَنْ أَبِي شُرَيْحٍ الْكَعْبِيِّ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ « مَـنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ ، جَائِزَتُهُ يَوْمٌ وَلَيْلَةٌ ، وَالضِّيَافَةُ ثَلاَثَةُ أَيَّـامٍ ، فَمَا بَعْدَ ذَلِكَ فَهُوَ صَدَقَةٌ ، وَلاَ يَحِلُّ لَهُ أَنْ يَثْوِيَ عِنْدَهُ حَتَّى يُحْرِجَهُ»: [١١٢٧]

له ژمارهکانی پێشیهوه لهم باسهدا واتاو مهبهست لێی رۆیشت.

١١٢٨- عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ قَالَ: قُلْنَا: يَـا رَسُـولَ اللَّـهِ إِنَّـكَ تَبْعَثُنَا، فَنَنْزِلُ بِقَوْمٍ فَلاَ يَقْرُونَنَـا، فَمَـا تَـرَى؟ فَقَـالَ لَنَـا رَسُـولُ اللَّـهِ (صـلى الله عليـه وسلم): « إِنْ نَزَلْتُمْ بِقَوْمٍ فَأَمَرُوا لَكُـمْ بِمَـا يَنْبَغِـي لِلـضَّيْفِ، فَـاقْبَلُوا، فَـإِنْ لَـمْ يَفْعَلُـوا فَخُـذُوا مِـنْهُمْ حَـقَّ الـضَّيْفِ الَّـذِي يَنْبَغِـي لَهُـمْ ». {الحـديث: ٤٤٩١ = ٤٤٨٠ فـم. تجريد/٣، رقم: ١٠٦٨ = ٢٤٦١، ٦١٣٧ فتح البارى}:

عوقبهی کوڕی عامیر (رەزای خودای لێ بێ) فهرمووی: عهرزی حهزرەتمان کرد: قوربان! وادەبێ تۆ دەمان نێری بۆ کارو فرمانێ، جاری واهەیه دەچینه ناو گوندێك، میوانداریمان پێ ناکەن، جالەم بارمیەوە فەرمانت بەچییه؟ فەرمووی پێمان: (کاتێ دەبن بەمیوانی خەڵك، ئەگەر ئەوەی کەباوە بۆ میوان دەکرێ بۆیانکردن ئەوا لێیان قەبووڵ بکەن، دەنا ئەگەر نەیانکرد خۆتان ئەوەی کەمافی میوانه لێیان بستێنن!).

[١١٢٧] بروانه: ژماره: (١٠٦٥).

## ٣٢- كِتَابُ الجِهَادِ
## نامەی خەباتو تێکۆشان

{بڕوانـە: تـاجول ئوصـول/٤، زنجـيرە: ١١، لاپـەڕە: ٦٤٣ لـە ژمـارە: ٤٢٩٧ەوە هەتا ژمارە: ٤٦٤٩ + تەجريدی بوخاری/٢، لاپەڕە: ٢٧٩ ج/١، زنجيرە: ٦٠، لە ژمارە: ١١٤٦ هەتا ژمـارە: ١٢٨٦ + مختـصر صـحيح مـسلم/٢، لاپـەڕە: ٢٠، چاپی يەكـەم لـە ژمارە: ١٠٦٨ەوە هەتا ژمارە: ١١١١ + رياض الـصالحين/٢، زنجـيرە: ٢٣٤، ژمـارە: ١٢٨٥ هەتا ژمارە: ١٣٥٧ + بلوغ المرام/٣ لە ژمارە: ١٢٨٣ هەتا ژمارە: ١٣٤٣}.

### (١) بابُ جَوازِ الإغَارَةِ عَلَى الكُفَّارِ الَّذينَ بَلَغَتْهُمْ دَعْوَةُ الإسْلاَمِ مِنْ غَيْرِ تَقَدُّمِ الإعْلاَمِ بِالإغَارَةِ
### پەلاماردانی بێباوەڕانێ کە بانگەوازی ئیسلامیان پێ گەیشتووە، لە ناکاوا، بەبێ ئاگادارکردنەوە

١١٢٩- عَنِ ابْنِ عَوْنٍ قَالَ: كَتَبْتُ إِلَى نَافِعٍ أَسْأَلُهُ عَنِ الدُّعَاءِ قَبْلَ الْقِتَالِ؟ قَالَ: فَكَتَبَ إِلَيَّ: إِنَّمَا كَانَ ذَلِكَ فِي أَوَّلِ الإِسْلاَمِ، قَدْ أَغَارَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) عَلَى بَنِي الْمُصْطَلِقِ، وَهُمْ غَارُّونَ وَأَنْعَامُهُمْ تُسْقَى عَلَى الْمَاءِ، فَقَتَلَ مُقَاتِلَتَهُمْ وَسَبَى سَبْيَهُمْ، وَأَصَابَ يَوْمَئِذٍ، قَالَ يَحْيَى: أَحْسِبُهُ قَالَ: جُوَيْرِيَةَ أَوْ الْبَتَّةَ ابْنَةَ الْحَارِثِ، وَحَدَّثَنِي هَذَا الْحَدِيثَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) وَكَانَ فِي ذَلِكَ الْجَيْشِ. {الحديث: ٤٩٣٩ = ٤٤٨٣ فم. تجريد/٣، لاپـەڕە: ١٨٠، رقم: ١٠٨٩ = ٢٥٤١. أبو داود. جهاد: ٢٦٣٣}: [١١٢٩]

---

[١١٢٩] تجريـد/٣، ژمـارە: ١٠٨٩ = ٢٥٤١ بخـاری. پوختـەی موسـليم/٣، ژمـارە: ١١٢٠ = ٤٥٣٩ شـيحا (بخاری رقم الكتاب/٤٩ رقم الباب/١٣).

ئیبنو عەون (کە فەرمووده زانێکی گەوره بوو، (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: نامەیەکم نووسی بۆ نافیعی شاگردی ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) لەبارەی بانگەوازی پێش دەستپێکردنی جەنگەوە، پرسیارم لێی کرد، ئەویش نامەی بۆمن نووسییەوەو لەوەڵاما فەرمووی: کە ئەمە لەسەرەتای ئیسلامەتییەوە وابوو، هەتا بانگیان نەکردنایە بۆسەر ئیسلامو لەپاش مل نەدانو ڕەتکردنەوەی قەبووڵی پەیامی ئیسلام، هەتا ئاگاداریان نەکردنایەتەوە: کە خۆیان ئامادە بکەن بۆ شەڕی بەرابەر، پەلاماریان نەدەدانو هەڵمەتیان نەدەبردە سەریان! بەڵام لەوەدوا پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەر بێ) بەلەشکرەوە، لەناکاو دای بەسەر تیرەی بەنی موصطەلەقداو پەلاماری دانو شاڵاوی بۆ بردن، بەبێ ئەوە کە ئاگایان لەخۆیان بێ، لەوکاتەدا ئاژەڵەکانیان لەسەر ئاو بوون، خەریکبوون ئاویان دەدان! جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەو جەنگەدا پیاوە جەنگاوەرەکانی کوشتنو خێزانی بەتاڵانی بردن، وەهەر لەو ڕۆژەدا بوو کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جوومەیرییەی کچی حاریثی سەرکۆماری ئەو خێڵەی دەست کەوتو مارەی کرد بۆخۆی).

مامۆستاکەی شێخی موسلیم، کە یەحیای کوڕی یەحیای تەمیمییە، فەرمووی: سولەیمی کوڕی ئەخضەری مامۆستام، بەبێ گومان کە فەرمووی: (کچی حاریث) بەڵام وادەزانم ناویشی هێناو بەدەق فەرمووی: (جوومەیرییەی کچی حاریثی.... تاد).

نافیع (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: عەبدوڵلای کوڕی عومەری کوڕی خەطاب (ڕەزای خودایان لێ بێ) ئەم فەرموودەیەی گێڕایەوە بۆم، وە عەبدوڵلا خۆی یەکێك بووە لە بەشداربوانی ئەو سوپایە لەم غەزایەدا. {تاج/٤، زنجیرە: ٤٦، ژمارە: ٤٤٦٢، چ/٤}.

## (٣) باب في الأمرِ بالتَّيْسيرِ وَتَرك التَنْفير
## فەرمان بە كارئاسانیو بە وازهێنان لە كارگرانی

١١٣٠- عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي بُرْدَةَ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ أَنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) بَعَثَ مُعَاذًا وَأَبَا مُوسَى إِلَى الْيَمَنِ قَالَ « يَسِّرَا وَلاَ تُعَسِّرَا ، وَبَشِّرَا وَلاَ تُنَفِّرَا ، وَتَطَاوَعَا »:[١١٣٠]

**لە پوختەی موسلیما ئاوایە:**

عَنْ أَبِي موسى (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) بَعَثَهُ وَمُعَاذًا إِلَى الْيَمَنِ فَقَالَ: « يَسِّرَا، وَلاَ تُعَسِّرَا، وَبَشِّرَا، وَلاَ تُنَفِّرَا، وَتَطَاوَعَا وَلاَ تَخْتَلِفَا ». {الحديث: ٤٥٠١ = ٤٤٨٩ فـم. بخاري. جهاد: ٣٠٣٨، ٤٣٤١، ٤٣٤٢، ٤٣٤٥، ٦١٢٤، ٧١٧٢. أبو داود: ٤٣٥٦. نسائي: ٥٦١١. ابن ماجة: ٣٣٩١}:

ئەبو موسای ئەشعەری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) منو موعازی كوڕی جەبەلی نارد بۆ یەمەنو پیی فەرمووین: (كار ئاسان بكەنو كار گران مەكەن، مژدەی خۆش بەخەڵك بدەنو، بەهەڕەشەو گوڕەشەی زۆر خەڵك لەدین مەتەكێننەوە، بەگوێی یەكتری بكەنو دژایەتی یەكتری مەكەنو لەبەینی خۆتانا ناكۆكو ناتەبا مەبن!). {ریاض/٢، زنجیرە: ٧٤، ژمارە: ٦٣٧} + {تاج/٤، زنجیرە: ١٠٤، ژمارە: ٤٦٤٧}.

١١٣١- عَنْ أَنَسٍ عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ « يَسِّرُوا وَلاَ تُعَسِّرُوا ، وَبَشِّرُوا وَلاَ تُنَفِّرُوا»: [١١٣١]

---

[١١٣٠] بخاری. جهاد: ٣٠٣٨. پوختەی موسلیم = مختصر صحيح مسلم/٣، ژمارە: ١١١٢ = ٤٥٠١ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٦٤ رقم الباب/٦٠).

[١١٣١] بخاری. علم: ٦٩ مسلم. شیحا: ٤٥٠٢ (بخاری رقم الكتاب/٣ رقم الباب/١١).

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کار ئاسان بکەن‌و ئاسانکاربن‌و کار گران مەکەن‌و گرانکار مەبن، وە موژدەی خۆش بەخەڵك بدەن‌و، بە هەڕەشەو گۆڕەشەی زۆر خەڵك لە ئایین مەتەکێننەوە!).

## (٤) باب تحريم الغَدْرِ
## بێپەیمانی نادروستەو ناڕەوایە

١١٣٢- عَنْ ابْنَ عُمَرَ رَضِيِ اللَّهُ عَنْهما عَنْ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَال: إنَّ الْغَادِرَ يَنْصِبُ اللَّهُ لَهُ لِوَاءً يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَيُقَالُ هَذِهِ غَدْرَةُ فُلَانِ بْنِ فُلَانٍ. (الحديث ٦١٧٨ أطرافه في: ٦١٧٧، ٣١٨٨، ٦١٧٨، ٦٩٦٦، ٧١١١):[1132]

ئیبنو عومەر -ڕەزای خوادایان لێ بێ- دەفەرموێ: پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: لەرۆژی قیامەتدا هەموو ستەمگەر و بێ پەیمانێ، ئالآیەکی تایبەتی خۆی هەیە، هەڵدەکرێ لە دیاری، پێی دەناسرێتەوە، دەڵێن: ئەمە نیشانەی ناپاکی‌و پەیمانشکێنی فیسارەکەسە، هەتا ئاوا ناوی بەدیی بزرێ و ریسوا ببێت.

١١٣٣- عنْ عبد الله وعنْ انس (رضي اللهُ عنهُما) عنِ النبيّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قال: (لكلّ غادر لواءٌ يومَ القيامةِ، قالَ أحدُهما: يُنصَبُ، وقالَ الآخرُ: يومَ القيامةِ، يعرفُ بهِ) (الحديثان: ٣١٨٦، ٣١٨٧):[1133]

---

(1132) تجريد/٥، ژمارە: ١٩٥٧ = ٦١٧٨ مسلم/محمد فؤاد/١٧٣٥ - پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١١٢٤ = ٤٥١٣ شيحا (بخاری رقم الكتاب/٧٨ رقم الباب/٩٩).

(1133) تجريد/٣، ژمارە: ١٢٨٦ = ٣١٨٦، ٣١٨٧. مسلم/شيحا: ٤٥١١ (بخاری رقم الكتاب/٥٨ رقم الباب/٢٢).

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودو ئەنەس (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرموویان: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (لەرۆژی قیامەتدا، لەئێستگاکانا بۆ هەموو ستەمگەرو بێ پەیمانێ، ئالایەکی تایبەتی خۆی هەیە، لەدیار سەری بۆی هەڵدەکرێ هەتا پێی بناسرێتەوەو ریسوا بێ، بانگەواز هەڵدەدرێ: (ئەمە نیشانەی ناپاکیو پەیمان شکێنی ئەم کابرایەیە) (تاج/٣/٣٧٥-٧- باسی پەیمان — زنجیرە: ١٠٤، ژمارە: ٢٤١٧) +(تاج/٨/١٣٢ز-٥٥).

## (٥) باب جواز الخداع في الحَرْب
## باسی فێڵو تەفرەدان لە جەنگا

١١٣٤- عَنْ جَابِرًا (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قال رَسُولُ اللّهِ (صلى الله عليه وسلم): « الْحَرْبُ خَدْعَةٌ ». {الحديث: ٤٥١٥ = ٤٥٠٢ فم. تجريد/٣/٣٦٠، رقم: بلا رقم = ٣٠٢٩، ٣٠٢٨ فتح الباري. أبو داود. جهاد: ٢٦٣٦. ترمذي. جهاد: ١٦٧٥. تحفة الأشراف: ١٤٦٧٦} : [(١١٣٤)]

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: شەڕ فڕوفێڵە، جەنگ بە فڕوفێڵ دەبرێتەوە!). {تاج/٤، زنجیرە: ٥٠، ژمارە: ٤٤٧٤}.

١١٣٥- أَبِي هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) قَالَ سَمَّى النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) الْحَرْبَ خُدْعَةً. [(١١٣٥)]

---

[(١١٣٤)] تجريد/٣، ژمارە: بلا، ژمارە: ١٢٣٨ = ٣٠٢٧ بخاری. (بخاری رقم الكتاب/٥٦ رقم الباب/١٥٧).

[(١١٣٥)] بڕوانە: (١١٣٤) (بخاری رقم الكتاب/٥٦ رقم الباب/١٥٧).

ئـەبو هـورەیرە (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) شەڕی ناونا: (فڕوفێڵ و تەفرەدان).

## (٦) بابُ كَرَاهَةِ تَمَنى لقَاءِ العَدُوِ، وَالأمرُ بالصَّبْرِ عِنْدَ اللقَاءِ
## موسوڵمان شەڕخواز نیەو حەزی لە ئاشتی‌یە، وە هەمیشە لا شەڕە، بەڵام کە توشیش بوو بە تووشەوە دەبێ خۆگرو ورە بەرز بێ

١١٣٦- أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (صـلى الله عليـه وسـلم) قَـالَ «لاَ تَمَنَّوْا لِقَاءَ الْعَدُوِّ ، فَإِذَا لَقِيتُمُوهُمْ فَاصْبِرُوا»: [(١١٣٦)]

ئـەبو هـورەیرە (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەی موسوڵمانینە! ئاوات مەخوازن بـۆ رووبـەڕوو بوونەوەی دوژمن و شەڕ فرۆش مەبن. وەلێ کاتێکیش تووش بوو بە تووشەوە بە ئارام و بەپشوو بن و خۆڕاگربن لەمەیدانا).

١١٣٧- عن عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي أَوْفَى حِينَ خَرَجَ إِلَى الْحَرُورِيَّةِ فَقَرَأْتُـهُ فَـإِذَا فِيـهِ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فِي بَعْضِ أَيَّامِهِ الَّتِي لَقِـيَ فِيهَـا الْعَـدُوَّ انْتَظَـرَ حَتَّـى مَالَتِ الشَّمْسُ، ثُمَّ قَامَ فِي النَّاسِ قَالَ « أَيُّهَا النَّاسُ ، لاَ تَتَمَنَّوْا لِقَاءَ الْعَدُوِّ ، وَسَلُوا اللَّهَ الْعَافِيَةَ ، فَإِذَا لَقِيتُمُوهُمْ فَاصْبِرُوا ، وَاعْلَمُوا أَنَّ الْجَنَّةَ تَحْتَ ظِلاَلِ السُّيُوفِ ، ثُـمَّ قَـالَ اللَّهُـمَّ مُنْـزِلَ الْكِتَـابِ وَمُجْـرِىَ الـسَّحَابِ وَهَـازِمَ الأَحْـزَابِ ، اهْـزِمْهُمْ وَانْـصُرْنَا عَلَيْهِمْ»: [(١١٣٧)]

لە پوختەی موسلیما، ژمارە: (١١٢٦) ئاوایە:

---

[(١١٣٦)] بخاری. جهاد: ٣٠٢٦. مسلم/شیحا: ٤٥١٦ (بخاری رقم الكتاب/٥٦ رقم الباب/١٥٦).

[(١١٣٧)] تجریـد/٣، ژمـارە: ١٢١٧ = ٢٩٦٥ بخـاری. پوختـەی موسـلیم/٢، ژمـارە: ١١٢٦ = ٤٥١٧ شـیحا (بخاری رقم الكتاب/٥٦ رقم الباب/١٥٦).

عَنْ أَبِى النَّضْرِ عَنْ كِتَابِ رَجُلٍ مِنْ أَسْلَمَ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِىِّ (صلى الله عليه وسلم) يُقَالُ لَهُ: عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِى أَوْفَى، فَكَتَبَ إِلَى عُمَرَ بْنِ عُبَيْدِ اللَّهِ حِينَ سَارَ إِلَى الْحَرُورِيَّةِ يُخْبِرُهُ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) كَانَ فِى بَعْضِ أَيَّامِهِ الَّتِى لَقِىَ فِيهَا الْعَدُوَّ يَنْتَظِرُ، حَتَّى إِذَا مَالَتِ الشَّمْسُ، قَامَ فِيهِمْ فَقَالَ: « يَا أَيُّهَا النَّاسُ لاَ تَتَمَنَّوْا لِقَاءَ الْعَدُوِّ، وَاسْأَلُوا اللَّهَ الْعَافِيَةَ، فَإِذَا لَقِيتُمُوهُمْ فَاصْبِرُوا، وَاعْلَمُوا أَنَّ الْجَنَّةَ تَحْتَ ظِلاَلِ السُّيُوفِ ». ثُمَّ قَامَ النَّبِىُّ (صلى الله عليه وسلم) وَقَالَ: « اللَّهُمَّ مُنْزِلَ الْكِتَابِ، وَمُجْرِىَ السَّحَابِ، وَهَازِمَ الأَحْزَابِ اهْزِمْهُمْ وزلزلهم». وفي رواية ثانية: «وَانْصُرْنَا عَلَيْهِمْ». {الحديث: ٤٥١٧ = ٤٥٥ فم. تجريد/٣/٣٤٢، رقم: ١٢١٧ = ٢٩٦٥ = ١٢٠٤ = ٢٩٣٣ فتح الباري. أبو داود. جهاد: ٢٦٣١. تحفة الأشراف: ٥١٦١}:

ئەبو نەضر كەنووسەری عومەری كوڕی عوبەیدوڵلا بوو، كە ئەم عومەرە سەر لەشكری ئەو سوپایە بوو، كەچوون بۆسەر حەرورییەكان، كەتیرەیێ بوون لەخەواریجەكان، ئەبو نەضر فەرمووی: كاتێ عومەری كوڕی عوبەیدوڵلا بەخۆیو لەشكرەكەیەوە كەوتنەڕێ بۆسەر ئەم حەرووریيانە، عەبدوڵلای كوڕی ئەبو ئەوفا، كە لەهۆزی ئەسلەم بوو، كە یەكێ بوو لەهاوەڵانی پێغەمبەر (درووودی خوادای لەسەر بێ) ئەم نامەیەی بۆ عومەری كوڕی عوبەیدوڵلا نووسی: لەیەكێ لەو ڕۆژانەدا كە پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) تووشی دوژمن بوو، چاوەڕوانی كرد هەتا خۆر لاربۆوە، ئەوسا هەڵسا وتارێكی بۆیان داو بە خەڵكەكەی فەرموو: (ئەی مەردووم! ئەی موسوڵمانینە! ئاوات مەخوازن بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی دوژمن، وە لەخودا داوای ئاسوودەیی ئێجگاریی بكەن، كە بریتییە لەخۆشیو باشیی لەشو گیانو دینو دونیا، كاتێكیش تووشی دوژمن بوونو چوونە مەیدان بۆ یەكتری، خۆڕاگربنو بە حەوسەڵەو بەپشووبن.

ومبزانن كه بەهەشت وا لەسايەی سێبەری شمشێردا) ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەڵساو فەرمووی:

«اللَّهُمَّ مُنْزِلَ الْكِتَابِ وَمُجْرِيَ السَّحَابِ وَهَازِمَ الأَحْزَابِ اهْزِمْهُمْ وَزَلْزِلْهُمْ»: خودایە! ئەی ئەوكەسەی كە قورئانت بەخەلآت ناردووە بۆ موحەممەد! ئەی ئەو كەسەی كە بەتەوانایی خۆت با هەڵدەكەیتو بەهەموو لایەكا دەیخەیتە ڕێو هەوری پێ لێ دەخوڕی بۆ هەر لایێ كەبتەوێ! ئەی ئەو كەسەی كە بەتەنیا خۆت گەلەكۆمەی كۆمەڵەی دوژمنانی ئیسلامت تێك شكاند! لەم غەزایەشدا تێكو پێكیان بشكێنەو سەرمان بخە بەسەریانا). {تاج/٤، زنجیرە: ٤٨، ژمارە: ٤٤٦٦} .

## (٨) باب تحريم قتل النساء والصبيان في الحرب

## لە كاتی جەنگا، بەبێ مەهانەی ڕەوا، كوشتنی ژنانو منالآن نادروستەو ناڕەوایە

١١٣٨- عَنْ عَبْد اللَّهِ بن عمر (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) أَخْبَرَهُ أَنَّ امْرَأَةً وُجِدَتْ فِي بَعْضِ مَغَازِي النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَقْتُولَةً فَأَنْكَرَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَتْلَ النِّسَاءِ وَالصِّبْيَانِ. (الحديث ٣٠١٤، طرفُهُ في: ٣٠١٥): [١١٣٨]

عەبدوڵلای كوڕی عومەر(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەغەزایەكا لەغەزاكانی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) لاشەی ژنێكی كوژراو دۆزرایەوە، پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) كوشتنی ژنو منالی

---

[١١٣٨] تجريد/٣، ژمارە: ١٢٣٤ = ٣٠١٤ بخاری. مسلم: ١٧٤٤ = پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١١٣٣ = ٤٥٢٣ شيحا (بخاری رقم الكتاب/٥٦ رقم الباب/١٤٧).

بەناپەسەند دانا. (تاج/٨ل-١٣٠ف-١از -٥٢، ژمارە: ٤٤٧٩. باسی ژنو منالو پیرەمێردو کۆیلەو سوتان).

## (٩) باب جواز قتل النساءِ والصبيانِ في البيَاتِ مِنْ غَيْرِ تَعَمُّدٍ
## پێکانو زامار بوونو کوژرانی ژنو منالی دوژمن لە کاتی هێرش بردنە سەرو شەبەیخوونی شەودا دروستە

١١٣٩- عَنِ الصَّعْبِ بْنِ جَثَّامَةَ (رضى الله عنهم) قَالَ مَرَّ بِىَ النَّبِىُّ (صلى الله عليه وسلم) بِالأَبْوَاءِ - أَوْ بِوَدَّانَ - وَسُئِلَ عَنْ أَهْلِ الدَّارِ يُبَيَّتُونَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ ، فَيُصَابُ مِنْ نِسَائِهِمْ وَذَرَارِيِّهِمْ قَالَ «هُمْ مِنْهُمْ». [١١٣٩]

لە موختەصەری صەحیحی بوخاریدا، کە ناسراوە بە تەجریدی بوخاری ئاوایە:

عَنْ الصَّعْبِ بْنِ جَثَّامَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: مَرَّ بِيَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِالأَبْوَاءِ أَوْ بِوَدَّانَ وَسُئِلَ عَنْ أَهْلِ الدَّارِ يُبَيَّتُونَ مِنْ الْمُشْرِكِينَ فَيُصَابُ مِنْ نِسَائِهِمْ وَذَرَارِيِّهِمْ قَالَ: (هُمْ مِنْهُمْ) وَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: (لا حِمَى إِلاَّ لِلَّهِ وَلِرَسُولِهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ). (الحديث ٣٠١٢، طرفُهُ في: ١٠٤١ تجريد= ٢٣٧٠ فتح):

صەعبی کوڕی جەثثامە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لە ئەبواء، یا لە وەددان، پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) تەشریفی هات، ئەم پرسیارمیان لێ کرد: لەشەودا دەدرێ بەسەر ناموسوڵمانانی جەنگی (حەربی) دا، لەناو ماڵەکانیانا لەکاتی ئەو شەبەیخوونەدا، ژنو منالیان بەردەکەون ئایا بەکوشتن یا

---

[١١٣٩] تجرید/٣، ژمارە: ١٢٣٣ = ٣٠١٢. مسلم ترقیم محمد فؤاد/١٧٣٥ - پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١١٣٤ = ٤٥٢٥ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٥٦ رقم الباب/١٤٦).

بـەزامار بـوون، ئایا حـوکمو بڕیـاری ئـەو ژنو منالآنــە چـییە؟ فـەرمووی: (ئەوانیش لەوانن لەبەرناچاری بڕیاری کوشتنی ژنو منالو شەرکەریان لـەحالی وادا -کەستەمە لەیەکتری جیابکرێنەوە- وەك یەکەو دروستە) (بڕوانە: تاج/٨ل-١٣٠ز-٥٢ف-٢، ژمارە: ٤٤٨٠. باسی ژنو مندالو پیرەمێرد ناکوژرێن) + (ژمـارە: ١٠٤١ تجرید).

## (١٠) باب جواز قطع أشجار الكُفَارِ وَتَحْرِيقها

## بڕینی دارو درەختو باخی دوژمنی بێباوەڕو سووتاندنیان لە کاتی شەڕو شۆڕدا دروستە

١١٤٠- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضی الله عنهما) قَالَ حَرَّقَ رَسُـولُ اللّـهِ (صـلی الله علیـه وسلم) نَخْلَ بَنِي النَّضِيرِ وَقَطَعَ وَهْيَ الْبُوَيْرَةُ فَنَزَلَتْ ( مَا قَطَعْتُمْ مِنْ لِينَـةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَـا قَائِمَةً عَلَى أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ اللَّهِ ):(١١٤٠)

لەبەرئەوەی لە پوختـەی موسـلیمدا، لـەژمارە (١١٣٥)دا، ئـەم فەرموودەیـە تێرو تەسەلترە، نەقلی دەکەین:

عَنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِـيَ اللهُ عَنْهُمـا): أَنَّ رَسُـولَ اللّـهِ (صـلی الله علیـه وسلم) قَطَعَ نَخْلَ بَنِي النَّضِيرِ وَحَرَّقَه، وَبِهَا يَقُولُ حَسَّانُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ):

وَهَانَ عَلَى سَرَاةِ بَنِي لُؤَيّ حَرِيقٌ بِالْبُوَيْرَةِ مُسْتَطِيرُ

وَفِي ذَلِكَ نَزَلَتْ (مَا قَطَعْتُمْ مِنْ لِينَـةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَـا قَائِمَـةً عَلَـى أُصُولِهَا) الآيَـةَ. {الحـديث: ٤٥٢٨ = ٤٥١٦ فـم. تجريـد/٤/٢٧٣، رقـم: ١٥٣٨ = ٤٠٣١، ٣٠٢١، ٤٠٣٢، ٤٨٨٤}:

(١١٤٠) تجرید/٢، ژمارە: ١٢٦٥ = ٣١٢٤ بوخاری. مسلم: ١٧٤٧ = پوختەی موسلیم/٢، ژمـارە: ١١٣٧ = ٤٥٣٠ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٥٧ رقم الباب/٨).

ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) رەزە دارخورماکانی جوولەکەی بەنی نەزیری سووتاندو فەرمانیدا بەبڕینیان، کە ئەم رەزانە لەبووەیرە بوون، کەنزیکی دوو میل لەمەدینەوە دوورە، کە ئەم جوولەکانە ئەو پەیمانەی دابوویان بە پێغەمبەر هەڵیان وەشاندەوە، جوولەکەکان بەمە ئاگریان تێ بەربوو، گوتیان: ئەی موحەممەد! تۆ لەلایەکەوە دەڵێیت: من پێغەمبەرم، کەچی لەلایەکی ترەوە دەچی رەزوباخ دادەپاچیو داری بەری دەسووتێنیو دادەهێنی، ئەمە چەنی بەچەنە؟

جا خودای گەورە بۆ بەرپەرچی ئەم گومانە ئەم ئایەتەی نارد: {مَا قَطَعْتُم مِّن لِّينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَائِمَةً عَلَى أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ اللَّهِ وَلِيُخْزِيَ الْفَاسِقِينَ - حشر — ٥٩/٥}.

واتە: هەرچی ئێوە بڕیتان لەباخە خورماکانی بەنی نەزیر، یا هێشتانەوە بەڕاوەستاوی لەسەر رەگو ریشەی خۆی، هەمووی بەفەرمانی خودابوو، هەتا بێباوەڕانی پێ چاوترسێن ببنو ئەو بەدکارو فاسقو لەپەیمان دەرچوانە، رەنجە رۆو ریسوابن، بەفەرمانی خودا).

بەم بۆنەیەوە حەسسانی کوڕی ثابیت دەفەرموێ (وافر):

وَهَانَ عَلَى سَرَاةِ بَنِي لُؤَيّ
حَرِيقٌ بِالبُوَيْرَةِ مُسْتَطِيرُ

واتە (وافیر):

بڵێسەی ئاگرێ لە بووەیرە بەرزە
سەرۆکی قوڕەیشی پێ کەوتۆتە لەرزە!

{تاج/٤، زنجیرە: ٤٢، ژمارە: ٤١٥٧ + تاج/٤، زنجیرە: ٧٥، ژمارە: ٤٥٥٣ ج/٤}.

## (١١) باب تحليل الغنائم لهذه الأمّة خاصّة

## دەستكەوتی تالانی حەڵاڵكراوە بۆ ئەم ئەتەوەی ئیسلامە بە تایبەتی

١١٤١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): «غزَا نَبِيٌّ مِنَ الأَنْبِيَاءِ فَقَالَ لِقَوْمِهِ لاَ يَتْبَعْنِي رَجُلٌ مَلَكَ بُضْعَ امْرَأَةٍ وَهْوَ يُرِيدُ أَنْ يَبْنِيَ بِهَا وَلَمَّا يَبْنِ بِهَا ، وَلاَ أَحَدٌ بَنَى بُيُوتًا وَلَمْ يَرْفَعْ سُقُوفَهَا ، وَلاَ أَحَدٌ اشْتَرَى غَنَمًا أَوْ خَلِفَاتٍ وَهْوَ يَنْتَظِرُ وِلاَدَهَا . فَغَزَا فَدَنَا مِنَ الْقَرْيَةِ صَلاَةَ الْعَصْرِ أَوْ قَرِيبًا مِنْ ذَلِكَ فَقَالَ لِلشَّمْسِ إِنَّكِ مَأْمُورَةٌ وَأَنَا مَأْمُورٌ ، اللَّهُمَّ احْبِسْهَا عَلَيْنَا . فَحُبِسَتْ ، حَتَّى فَتَحَ اللَّهُ عَلَيْهِ ، فَجَمَعَ الْغَنَائِمَ ، فَجَاءَتْ – يَعْنِي النَّارَ – لِتَأْكُلَهَا ، فَلَمْ تَطْعَمْهَا ، فَقَالَ إِنَّ فِيكُمْ غُلُولاً ، فَلْيُبَايِعْنِي مِنْ كُلِّ قَبِيلَةٍ رَجُلٌ . فَلَزِقَتْ يَدُ رَجُلٍ بِيَدِهِ فَقَالَ فِيكُمُ الْغُلُولُ . فَلْتُبَايِعْنِي قَبِيلَتُكَ ، فَلَزِقَتْ يَدُ رَجُلَيْنِ أَوْ ثَلاَثَةٍ بِيَدِهِ فَقَالَ فِيكُمُ الْغُلُولُ ، فَجَاءُوا بِرَأْسٍ مِثْلِ رَأْسِ بَقَرَةٍ مِنَ الذَّهَبِ فَوَضَعُوهَا ، فَجَاءَتِ النَّارُ فَأَكَلَتْهَا ، ثُمَّ أَحَلَّ اللَّهُ لَنَا الْغَنَائِمَ ، رَأَى ضَعْفَنَا وَعَجْزَنَا فَأَحَلَّهَا لَنَا»:

**ئەمەی ئێرە دەقی ژمارە (١٢٦٥)ی تەجریدی بوخارییە، ئەمەیش دەقی ژمارە (١١٣٧)ی پوختەی موسلیمە، هەندێ بەهرەی پتری تیایە!**

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قال: قال رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « غزَا نَبِيٌّ مِنَ الأَنْبِيَاءِ، فَقَالَ لِقَوْمِهِ لاَ يَتْبَعْنِي رَجُلٌ قَدْ مَلَكَ بُضْعَ امْرَأَةٍ وَهُوَ يُرِيدُ أَنْ يَبْنِيَ بِهَا، وَلَمَّا يَبْنِ، وَلاَ آخَرُ قَدْ بَنَى بُنْيَانًا، وَلَمَّا يَرْفَعْ سُقُفَهَا، وَلاَ آخَرُ قَد اشْتَرَى غَنَمًا أَوْ خَلِفَاتٍ وَهُوَ مُنْتَظِرٌ وِلاَدَهَا، قَالَ: فَغَزَا فَأَدْنَى لِلْقَرْيَةِ، حِينَ صَلاَةِ الْعَصْرِ، أَوْ قَرِيبًا مِنْ ذَلِكَ، فَقَالَ لِلشَّمْسِ: أَنْتِ مَأْمُورَةٌ، وَأَنَا مَأْمُورٌ، اللَّهُمَّ احْبِسْهَا عَلَيَّ شَيْئًا، قال: فَحُبِسَتْ عَلَيْهِ حَتَّى فَتَحَ اللَّهُ عَلَيْهِ، قَالَ: فَجَمَعُوا مَا غَنِمُوا، فَأَقْبَلَتِ النَّارُ لِتَأْكُلَهُ، فَأَبَتْ أَنْ تَطْعَمَهُ، فَقَالَ: فِيكُمْ غُلُولٌ، فَلْيُبَايِعْنِي مِنْ كُلِّ قَبِيلَةٍ رَجُلٌ، فَبَايَعُوهُ فَلَصِقَتْ يَدُ رَجُلٍ بِيَدِهِ، فَقَالَ: فِيكُمُ الْغُلُولُ، فَلْتُبَايِعْنِي قَبِيلَتُكَ فَبَايَعَتْهُ، قَالَ: فَلَصِقَتْ بِيَدِ رَجُلَيْنِ أَوْ ثَلاَثَةٍ، فَقَالَ: فِيكُمُ الْغُلُولُ، أَنْتُمْ غَلَلْتُمْ، قَالَ: فَأَخْرَجُوا لَهُ مِثْلَ رَأْسِ بَقَرَةٍ

مِنْ ذَهَبٍ، قَالَ: فَوَضَعُوهُ فِي الْمَالِ، وَهُوَ بِالصَّعِيدِ، فَأَقْبَلَتِ النَّارُ فَأَكَلَتْهُ، فَلَمْ تَحِلَّ الْغَنَائِمُ لأَحَدٍ مِنْ قَبْلِنَا، ذَلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى رَأَى ضَعْفَنَا وَعَجْزَنَا، فَطَيَّبَهَا لَنَا ». {الحديث: ٤٥٣٠ = ٤٥١٨ فم. تجريد بالكوردى/٣/٣٨٩، رقم: ١٢٦٥ = ٣١٢٤، ٥١٥٧. تحفة الأشراف: ١٤٦٧٧، ١٤٧٨}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (پێغەمبەرێ لە پێغەمبەران (دروودی خودای گەورە لەسەر هەموویان) ویستی بچێ بۆ غەزایێ، بە گەلەکەی خۆی فەرموو: ئەو پیاوەی کەژنی مارەبڕیوەو دەیەوێ کە بیگوێزێتەوە، وە نەیگوێزاوەتەوە، با ئەو جۆرە پیاوە لەگەڵمانا نەیەت بۆ ئەم غەزایە، هەروەها ئەو کەسەیش کە خانوویەکی دروست کردووە هێشتا سەری نەگرتووە، هەروەها ئەو کەسەیش کە وشترو بزنو مەڕوماڵیاتی ئاوسی لەسەر گوانی کڕیوەو چاوەڕوانی زایینیان دەکات.

فەرمووی: ئەوجا چوو بۆ غەزاکەو، دەمی نوێژی عەصر، یا نزیکی کاتی نوێژی عەسر، لەدێکە نزیکەوە بوو، پێغەمبەرەکە بەخۆری فەرموو: تۆیش فەرمانبەریو منیش فەرمانبەرم، خودایە! ئەم خۆرە رابگرە بۆمانو مەیەڵە ئاوا ببێ هەتا فەرمانی خۆمان ئەنجام دەدەینو ئەم گوندە ئازاد دەکەین، ئیتر خودا خۆرەکەی راگرت بۆیو خۆرەکە ئاوا نەبوو هەتا خودا شارەکەی فەتحکرد بۆی، فەرمووی: ئەنجا هەرچی تاڵانیان گرتبوو کۆیان کردەوەو لەسەر دەستووروو یاسای پێشینەی پێغەمبەران لەشوێنێکی بەرزی بەرچاودا خڕیان کردەوە، دایاننا هەتا ئاگر لە ئاسمانەوە بەفەرمانی خودا بێت بیخوا، بۆ دووپات کردنەوەی ئەوەی کە غەزاکەیان لەبەر خودا بووەو لەبەر تەمای ماڵی دنیا نەبووە، کەچی ئاگرەکە کەهات چەشکەی نەکرد!

ئـيتر پێغەمبەرەكـە زانـی كـە گـزیو دزیو دەسپیـسی لـە تالآنییەكـە كـراوە، بۆیە فەرمووی: گزیتان لە تالآنییەكە كردووە بۆیە ئاگرەكە نایخوا!

كەوایـە بـا لەهـەر خێڵـێ پیـاوێ پـەیمانم بـداتێ، جـا لـەكاتی پـەیمان بەستنەكەدا، دەستی پیـاوێ لەسـەر خێڵەكان نووسا بەدەسـتی پێغەمبەرەكەوە. فەرمووی: دزییەكە وا لەناو ئێوەدا، با خێڵەكەی تۆبێن یەكە یەكـە پـەیمانم پـێ بدەن، كاتێ ئەو خێڵە پەیمانیان پێدا، دەستی پیـاوێ یـا دوو پیـاو لكـا بەدەسـتی پێغەمبەرەكـەوەو دزەكـان دۆزرانـەوەو فـەرمووی: دزییەكـە ئێـوە كردووتانـە. ئەوجا پارچەیێ زێڕیان هێنـا بـۆ پێغەمبەرەكـە، لەسـەر شـێوەی سـەرەگا وابـوو، ئەویـشیان لەسـەر مـاڵی تالآنییەكـە دانـا، كـە لەسـەر زەوییەكـە دانرابـوو ئـەوجا ئاگرەكە لە ئاسمانەوە هاتو هەمووی خوارد!

حەزرەت فەرمووی: لەپێش ئێمەدا، خواردنی تالآنی بـۆ كەسـی تـر حـەڵاڵو ڕەوا نەبووە، بەڵام لەپاشدا خودای پاكو پیرۆزو گەورە، كەدی حاڵی ئێمەی گەلی ئیسلام كزەو بێ هێزەو زەبوونین، بەزەوی پیامانا هاتەوەو بۆی حەڵاڵ كردین). {تاج/٤، زنجیرە: ٥٦، ژمارە: ٤٤٨٩. چاپی چوارەم}.

## (١٢) بابُ الأنفالِ
## باسی ئەنفال، كە وشەیەكی قورئانییە

١١٤٢- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) بَعَثَ سَرِيَّةً فِيهَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ قِبَلَ نَجْدٍ فَغَنِمُوا إِبِلاً كَـثِيرَةً فَكَانَـتْ سِـهَامُهُمْ اثْنَـيْ عَشَرَ بَعِـيرًا أَوْ أَحَـدَ عَـشَرَ بَعِيرًا وَنُفِّلُـوا بَعِـيرًا بَعِـيرًا) (الحـديث ٣١٣٤، طرفُـهُ في: ٤٣٣٨):[1142]

---

[1142] تجریـد/٣، ژمـارە: ١٣٦٦ - ٣١٣٤ بخـاری. مـسلم. تـرقیم محمـد فـؤاد/١٧٤٩ - ٤٥٣٣ تـرقیم وتخریج الشیخ خلیل مأمون شیحا (بخاری رقم الكتاب/٥٧ رقم الباب/١٥).




ئیبنـو عومـەر (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خوای لەسەر بێ) پەلێ لەشکری نارد بەرەو نەجد بۆ غـەزا، مـن خـۆم لـەناویانا بـووم، رانـە وشـترو گەلەیـەکی زۆرمـان بـەتاڵان گـرت، گـشتمان هەریـەکی سـەرو دوازدە وشـتر، پـشکمان بەرکـەوت. پێغەمبـەریش هەریـەکی سـەرو وشـتری تـری بەزیادە بەش پێمان دا. (تاج/٨/١٣٦ز-٥٦ ف-٤+٥، ژمارە: ٤٤٩٢، ٤٤٩٣).

١١٤٣- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَدْ كَانَ يُنَفِّلُ بَعْضَ مَنْ يَبْعَثُ مِنَ السَّرَايَا لأَنْفُسِهِمْ خَاصَّةً سِوَى قَسْمِ عَامَّةِ الْجَيْشِ، وَالْخُمْسُ فِي ذَلِكَ وَاجِبٌ كُلِّهِ. {الحديث: ٤٥٤٠ = ٤٥٢٨ فم. بخاري. فرض الخمس: ٣١٣٥. أبو داود. جهاد: ٢٧٤٦} : [1143]

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: جاران پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) زیادە بەشـی تایبـەتی دەدا، بەهەنـدێ لـەو پـەل‌و لقانـەی کـە دەیناردن بۆ غەزا، سـەرەڕای ئـەو بەشـەیش کەدەیـدا بەگشت کەسـێ لەسوپاکە، دیارە کە پێنـج یـەك لەهـەموو تاڵانییەکـە لـەپێش دابەشـکردنیدا، پێویـستە کـە دەربکرێ، تەنانەت پێنـج یەك لەم زیادە بەشانەیش لـەپێش دابەشـکردندا دەبـێ دەربکرێ). {تاج/٤، زنجیرە: ٥٧، ژمارە: ٤٤٩٧}.

**ڕوونکردنەوە:**

بۆ ڕوونکردنەوەی باسی پێنـج یەك بڕوانە: {تاج/٤، زنجیرە: ٥٩، ژمارە: ٤٤٩٩ هـەتا ژمـارە: ٤٥٠٣ + تـاج/٤، لاپـەڕە: ٢٣٧، زنجـیرە: ٩ سـوورەتی ئـەنفال} +

---

[1143] بخاري. خمس/٣١٣٥ پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١١٤٠ = ٤٥٤٠ (بخاري رقم الكتاب/٥٧ رقم الباب/١٥).

{تەجریدی بوخاری، بەرگی سێیەم، لاپەڕە: ٣٧٩، زنجیرە: ٦١ باسەکانی پێنج یەك، لەژمارە: ١٢٥٨ەوە هەتا ژمارە: ١٢٧٥}.

لە دەوروبەری (١٩٩٣)ی زایینیدا، ئەم چامەیەم نووسیوە، بەبۆنەی ئەنفالە بەدناوەکەی صەددامی هەددام و حیزبی بەعثی خەبیثەوە، سوپاس بۆ خودا نزاکە گیرابوو، وەئەمە نموونەیەکی رەجەزی شەترکراوە، کە لەبەرگی دووی (عەرووزی کوردی)دا، بڵاوم کردۆتەوە، ئەمەیش شیعرەکانە:

تَبّــاً لبَعْــثُ آخــرِ الزَّمَــانِ   قَـــوْمٌ بِلَادِيـــنٍ وَلَا أمَـــانِ
هُـمْ غِلْمَـةٌ مِـنْ شِـيعَةِ الـشَّيْطانِ   شِــيمَتُهُمْ عَــدَاوَةُ الــرَّحْمنِ
قَـدْ غَلَـبَ اللُّـؤْمُ عَلَهِـمْ وَالحَسَدْ   مِنْهُمْ جَرى مَجرى الـدمَّاء مِنْ جَسَدْ
قَتلَـةٌ لهُـمْ جِبَـالُ مِـنْ مَسَدْ   لِـشَنْقِ مَنْ فِـي قَلْبِـهِ حُـبُّ الأحَـدْ
كبِيرُهُمْ عَلَى الفَسَادِ قَدْ مَرَدْ   وَفِـي الفُسُوقِ وَالـضَّلَالَةِ انْفَـرَدْ
قَـادَتُهُمْ حَـشَّاشَةُ الأفْيُـونِ   مَبْـدَؤُهُمْ تَمَـذْهُبُ المُجُـونِ
إنَّ العَمَـى أصْـلَحُ لِلْعُيُـونِ   مِـنْ رُؤْيَـةِ العَفْلَقِـي المَلْعُـونِ
سَمُّوا بِإسْـمِ أقْـدَسِ الأسْـمَاءِ   جَرِيمَـةً مِـنْ أنْكَـرِ النُّكْـرَاءِ!!
خَاضُـوا إلَـى الآذَنِ فِـي دِمَـاءِ   كُـــرْدٍ مُـــسَالِمِينَ أبْرِيَـــاءِ
يَـا مُنْـذِراً قَوْمَــهُ بِالأحْقَـافِ   يَـا هُـودُ يَـا مُقَـدَّمَ الأشْـرَافِ
يَـا تَـالِيَ الأنْعَـامِ وَالأعْـرَافِ   قُـلْ مَـعَنَا مَقُولَـةَ الإنْـصَافِ!:
قَـدْ حَـرَّفَ الكَلِمَ عَـنْ مَوَاضِـعِهْ   مَـنْ أنْفَـلَ الأكْـرَادَ فِـي شَـرائِعِهْ
الكُـــرْدُ لِلأنْفَـــالِ أصْـــدِقَاءُ   دَلَاهُمَـــا لِرَمْزِهَـــا سَـــوَاءُ
آيَاتُهَــا لِـــدَائِهِمْ شِـــفَاءُ   وَنُورُهَــا لِعَيْــنِهِمْ ضِــيَاءُ
وَمَــنْ رَأى مَظَــالِمَ الأكْــرَادِ   وَكُـلَّ مَـا لِلْكُـرْدِ فِـي الـبِلَادِ

حَتــىَّ قُبُــورِ صَــالحي العِبَــادِ وَمَــــدْفَنِ الآبَــــاءِ والأجْــــدَادِ
كَيْــفَ تَحَوَّلَــتْ إلــى الرَّمَــادِ عَلَــى يَــدِ البَعْــثِ ذَوِي الفَــسَادِ
نَــادِي مُنَادِيــاً بِكُــلِّ نَــادِي: قُولُــوا مَعِــي يــا مَعْــشَرَ الرَّشَــادِ:
تَبَّــتْ يَــدَا أبــي حَــلاَ البَغْــدَادي وَآلِــــهِ وَصَــــحْبِهِ الأوْغَــــادِ
أوْ غَــدْ مِــنْ صَــدَّامَ فــي اعْتِقَــادي كُــرْدُ أغَــانُوهُ عَلــى اضْــطِهَادِ
أبْنَــاءِ جِنْــسِهِمْ مِــنَ الأكْــرَادِ إعَانَــــةَ العَبِيــــدِ لِلأسْــــيَادِ
وَأنَّ رَبَّــــــكَ لَبِالمِرْصَــــــادِ لِمُكْثِــرِ الفَــسَادِ فِــي الــبِلاَدِ
وَأنَّ بَطْــــشَ رَبِّــــكَ شَــــدِيدُ وَاللَّـــــهُ فَعَّــــالٌ لِمَــــا يُرِيــــدُ
فَعَــــاجِلاً أوْ آجِـــــلاً يُبِيـــــدُ بَــــاطِلَهُمْ حَــــقٌّ، فَــــلاَ يُعِيــــدُ
هَــا قَــدْ نَــرى عَــارَ رِفَــاقِ عَــادِ لاَ حَقَّهُـــمْ لِـــدَاخِلِ الألْحَـــادِ
يَقْــدُمُهُمْ (هَــدَّامُ) كَالــشَّدَادِ يَلُفُّــهُ الخِــزْيُ، كَــسَيْلِ الــوَادِي
يَــا هَــالِكي، يــا أكبَــرَ الجَــلاَّدِ أشَــرُّ مِنْــكَ حَيْــدَرُ العَبَّــادِي!!

## (١٣) باب إستِحقَاقِ القَاتِلِ سَلَبَ القَتِيل

## کەسێ لە غەزادا، ناموسوڵمانێ بکوژێ، تفاق و کەلوپەلەکەی مافی خۆیەتی

١١٤٤- عَنْ أَبِي قَتَادَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) عَامَ حُنَيْنٍ، فَلَمَّا الْتَقَيْنَا كَانَتْ لِلْمُسْلِمِينَ جَوْلَةٌ، قَالَ: فَرَأَيْتُ رَجُلاً مِنَ الْمُشْرِكِينَ قَدْ عَلاَ رَجُلاً مِنَ الْمُسْلِمِينَ، فَاسْتَدَرْتُ إِلَيْهِ حَتَّى أَتَيْتُهُ مِنْ وَرَائِهِ فَضَرَبْتُهُ عَلَى حَبْلِ عَاتِقِهِ، وَأَقْبَلَ عَلَيَّ، فَضَمَّنِي ضَمَّةً وَجَدْتُ مِنْهَا رِيحَ الْمَوْتِ، ثُمَّ أَدْرَكَهُ الْمَوْتُ فَأَرْسَلَنِي، فَلَحِقْتُ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)، فَقَالَ: مَا لِلنَّاسِ؟ فَقُلْتُ: أَمْرُ اللَّهِ عز وجل، ثُمَّ إِنَّ النَّاسَ رَجَعُوا، وَجَلَسَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ: « مَنْ قَتَلَ قَتِيلاً، لَهُ عَلَيْهِ بَيِّنَةٌ فَلَهُ سَلَبُهُ »، قَالَ: فَقُمْتُ فَقُلْتُ: مَنْ يَشْهَدُ لِي؟

ثُمَّ جَلَسْتُ، ثُمَّ قَالَ مِثْلَ ذَلِكَ فَقَالَ: فَقُمْتُ فَقُلْتُ: مَنْ يَشْهَدُ لِي؟ ثُمَّ جَلَسْتُ، ثُمَّ قَالَ ذَلِكَ الثَّالِثَةَ، قال: فَقُمْتُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « مَا لَكَ يَا أَبَا قَتَادَةَ ». فَقَصَصْتُ عَلَيْهِ الْقِصَّةَ، فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ: صَدَقَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، سَلَبُ ذَلِكَ الْقَتِيلِ عِنْدِي فَأَرْضِهِ مِنْ حَقِّهِ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): لاَهَا اللَّهِ، إِذًا لاَ يَعْمِدُ إِلَى أَسَدٍ مِنْ أُسُدِ اللَّهِ يُقَاتِلُ عَنِ اللَّهِ، وَعَنْ رَسُولِهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَيُعْطِيكَ سَلَبَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « صَدَقَ، فَأَعْطِهِ إِيَّاهُ »، فَأَعْطَانِي قَالَ: فَبِعْتُ الدِّرْعَ فَابْتَعْتُ بِهِ مَخْرَفًا فِي بَنِي سَلِمَةَ، فَإِنَّهُ لأَوَّلُ مَالٍ تَأَثَّلْتُهُ فِي الإِسْلاَمِ. {الحديث: ٤٥٤٣ = ٤٥٣١ فم. بخاري. بيوع: ٢١٠٠، ٣١٤٢، ٤٣٢١، ٧١٧٠. ترمذي. سير: ١٥٦٢}: [١١٤٤]

ئەبو قەتادە (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: لەساڵی غەزای حونەیندا، کە لەگەڵ حەزرەتدا (دروودی خودای لەسەر بێ) دەرچووین بۆئەم غەزایە، کە ئەم غەزایە لەپاش ئازادکردنی مەککە روویدا، حونەین شیوێکە لەنێوانی مەککەو طائیفدا، لەپشت عەرەفاتەوە، دەوری دە دوازدە میلێ لە مەککەوە دوورە، کاتێ بەرەنگاری ناموسوڵمانەکان بووین، لەسەرەتاوە موسوڵمانەکان زاڵ بوونو سەرێ دووان سەرکەوتن، پیاوێکم بینی لەبت پەرستەکان پیاوێکی موسوڵمانی دابوو بەزەویداو لەسەری دانیشتبوو، دەیویست لە پەلو پۆی بخاتو بیکوژێ، منیش سوورێکم بۆ خواردو لەپشتییەوە بۆی چووەو شمشێرێکم ماڵی بەسەر نەرەی شانیدا، گەیاندمە سەرجێگەی کاریگەری، لەگەڵ ئەوەیشا پەلاماری دامو باوەشی پیاماکردو بە گوشینێکی وا گوشیمی مردنم بەچاوی خۆم دی، بەڵام ئیتر کەوتە گیانەڵاو تلیسایەوەو منی بەرداو مرد. بەرە بەرە سوپای ئیسلام شکستیان تێ

[١١٤٤] بخاری. بیوع: ٢١٠٠، ٣١٤٢ مختصر صحيح مسلم/٢، ژمارە: ١١٤١ - ٤٥٤٣ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٥٧ رقم الباب/١٨).

کەوت، منیش رامکرد، لەرێ گەیشتم بەعومەری کوڕی خەططاب (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەوە ئەو خەڵکە چییانە بۆوا شکان؟ گوتم: فەرمانی خودا وابوو، چارەنووسی خودایی رەتبوونەوەی نییە! لەپاشدا خەڵکەکە گەڕانەوەو شێرانەو مەردانە تێ هەڵچوونەوەو لەدەوری حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) وەك شووورای پۆڵایین ئاخڵەیان داو گۆی سەرکەوتنیان لەمەیدانا، بەهەڵمەتی پاڵەوانەیان، بەدوژمن بەجێ هێشتو، ئاڵای هەمیشە سەر بەرزو سەرکەوتووی موحەممەدیان دیسانەوە لەمەیدانا شەکانەوە، جا لەپاش سەرکەوتنی تەواو، حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) دانیشتو فەرمووی: (کەسێ لەغەزادا ناموسولمانێ بکوژێو بەڵگەی هەبێ لەسەر ئەوە کە ئەو کوشتوویەتی، ئەوە رووتی بکاتەوە بۆخۆیو کەلوپەلەکەیو تفاقەکەی هی خۆیەتی!). فەرمووی: منیش هەڵسام گوتم: کێ شایەتیم بۆ دەدا کەمن پاڵەوانێکی واوام کوشتووە، هەتا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تفاقەکەیم بداتێ؟ ئەوسا دانیشتمەوە، حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) سێجار ناو بەناو ئەم فەرمایشتەی فەرموو، هەموو جارێ منیش هەڵ دەسامو دەمگوت کێ شایەتییەکی واوام بۆ دەدا، هەتا لەجاری سێیەما کە هەڵسام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەوە ئەی ئەبو قەتادە! چیتە؟) منیش چیرۆکی کوشتنی پاڵەوانەکەم لەنووکەوە بۆی گێڕایەوە، جا پیاوێ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەبو قەتادە راست دەکا، تفاقو کەلوپەلەکەی ئەو کوژراوە وا لەلای من، دەی تۆ بفەرموو کە ئەو لەمن رازی بکە، شتێکی تر وەربگرێ لەجیاتی مافی خۆی. ئەبوبەکری صەدیقیش (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: نە بەخودا شتی وانابێ، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) شتی واناکا، کەبچێ پەلاماری دەسکەوتی شێرێ لەشێرانی خودابداو،

لەوی بستێنیۆ و بیدات بەتۆ، ئەمە لەکاتێکدا کە ئەو شێرە، لەپێناوی خوداو پێغەمبەری خودادا جەنگ دەکاو دەست بەفورگی شێردا دەکا!!

پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەبوبەکر راست دەکاو قسەکەی دروستە، کەوابوو تفاقو کەرەستەو کەلوپەلەکە گشتی بدە بە ئەبو قەتادە، هی ئەوە هی تۆ نییە). ئەبو قەتادەیش فەرمووی: کابراکەیش کەلوپەلەکەی دایەوە بەمن، زریەکەیم فرۆشتو بە پارەکەی لەناوچەی بەنی سەلەمە باخێکم پێی کڕی، وە ئەوباخە بوو بە بناخەی ماڵداری کردنی سەردەمی ئیسلامەتیم). {تاج/٤، زنجیرە: ٦٢، ژمارە: ٤٥١٣}.

١١٤٥- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ قَالَ: بَيْنَا أَنَا وَاقِفٌ فِي الصَّفِّ يَوْمَ بَدْرٍ، نَظَرْتُ عَنْ يَمِينِي وَشِمَالِي، فَإِذَا أَنَا بَيْنَ غُلاَمَيْنِ مِنَ الأَنْصَارِ حَدِيثَةٍ أَسْنَانُهُمَا، تَمَنَّيْتُ لَوْ كُنْتُ بَيْنَ أَضْلَعَ مِنْهُمَا فَغَمَزَنِي أَحَدُهُمَا فَقَالَ: يَا عَمِّ هَلْ تَعْرِفُ أَبَا جَهْلٍ؟ قَالَ: قُلْتُ: نَعَمْ، وَمَا حَاجَتُكَ إِلَيْهِ يَا ابْنَ أَخِي؟ قَالَ: أُخْبِرْتُ أَنَّهُ يَسُبُّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَئِنْ رَأَيْتُهُ لاَ يُفَارِقُ سَوَادِي سَوَادَهُ حَتَّى يَمُوتَ الأَعْجَلُ مِنَّا، قَالَ: فَتَعَجَّبْتُ لِذَلِكَ، فَغَمَزَنِي الآخَرُ، فَقَالَ مِثْلَهَا، قَالَ: فَلَمْ أَنْشَبْ أَنْ نَظَرْتُ إِلَى أَبِي جَهْلٍ يَزُولُ فِي النَّاسِ، فَقُلْتُ: أَلاَ تَرَيَانِ؟ هَذَا صَاحِبُكُمَا الَّذِي تَسْأَلاَنِ عَنْهُ، قَالَ: فَابْتَدَرَاهُ فَضَرَبَاهُ بِسَيْفَيْهِمَا حَتَّى قَتَلاَهُ، ثُمَّ انْصَرَفَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، فَأَخْبَرَاهُ، فَقَالَ: « أَيُّكُمَا قَتَلَهُ »؟ فَقَالَ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا: أَنَا قَتَلْتُه، فَقَالَ: « هَلْ مَسَحْتُمَا سَيْفَيْكُمَا »؟ قَالاَ: لاَ، فَنَظَرَ فِي السَّيْفَيْنِ، فَقَالَ: « كِلاَكُمَا قَتَلَهُ »، وَقَضَى بِسَلَبِهِ لِمُعَاذِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْجَمُوحِ، وَالرَّجُلاَنِ: مُعَاذُ بْنُ عَمْرِو




بْنِ الْجَمُوحِ، وَمُعَاذُ ابْنُ عَفْرَاءَ. {الحديث: ٤٥٤٤ = ٤٥٣٢ فم. تجريد/٣، رقم: ١٢٦٩ = ٣١٤١، ٣٩٦٤، ٣٩٨٨} :[1145]

عەبدورەحمانی کوڕی عەوف (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەڕۆژی غەزای بەدردا، وا لەڕیزی شەڕکردندا ڕاوەستاوم، کەسەیری ڕاستو چەپی خۆمم کرد، وا دوو کوڕی مێرد منداڵی ئەنصاری وان لەڕاستو چەپمەوە، لەدڵی خۆما گوتم: خۆزگە لەنێوانی دوو پیاوی لەمانە دلێرتردا بوومایە، کە کارامە بوونایەو ئەزموونی جەنگیان هەبوایە.

جا یەکێکیان تێوەی ژەندمو گوتی: مامەکە! ئایا ئەبوجەهل دەناسیت؟ گوتم: بەڵێ، بۆچیتە، ئەی کوڕی برام؟ گوتی: بیستوومە جمێن بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەدا، بەوکەسە کە گیانی منی والەدەستا، ئەگەر بیبینم لەکۆڵی نابمەوە، هەتا یادەمکوژێ یادەیکوژم، دیارە ئەوەمان دەکوژرێ کەزووتر ئاکامی دێت! منیش لەم قسەیە سەرسام بوومو لەلام سەیرو عەنتیکە بوو، ئەوی تریشیان هەروا.

جا ئەوەندەی نەبرد، تەماشام کرد ئەبوجەهل جێ بەخۆی ناگرێ، وەك سەگی هار دێتو دەچێ. جا بەدوو لاوەکەم گوت: وریابن! ئەمە یارۆکەتانە، ئەمە ئەوەیە کەئێوە بۆی دەگەڕێنو لەبارەیەوە لەمنتان پرسی، ئەوە ئەبوجەهلە، ئیتر هەردووکیان بە شمشێری ڕووتەوە پەلاماریاندا، وە دایانە بەرشیر، هەتا کوشتیان.

ئەوجا هەردووکیان چوون بۆ خزمەتی پێغەمبەرو پێیان گوت: ئەبو جەهلمان کوشت، فەرمووی: کامتان کوشتتان؟ هەردوکیان گوتیان: من کوشتم،

---

[1145] تجرید/٣، ژمارە: ١٢٦٩ = ٣١٤١ بخاری. پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١١٤٢ = ٤٥٤٤ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٥٧ رقم الباب/١٨).

فەرمووی: (ئایا شمشێرەکانتان سڕیوە؟ گوتیان: نـەء، کـە تەماشـای شمـشێرەکانی کردن، فەرمووی: ڕاست دەکەن بەهەردووکتان کوشتووتانە).

ئـەوجا تفـاق‌و کەلوپەلـە ڕووتکراوەکـەی ئەبوجـەهلی دا بـەموعازی کـوڕی جەمووح، وە ئەو دوو لاوەیش موعازی کوڕی عـەفراء بـوون!). {تـاج/٤، زنجیرە: ٨٦، ژمارە: ٤٥٨٦} .

## (١٥) باب حُكْمِ الفَيْئِ

## بڕیاری چۆنێتی دابەشکردنی فەیأ، کە ئەو دەستکەوتە تایبەتەیە کە لە کاتی ئازادکردنی شوێنێ، لە خاکی ناموسوڵمانەکان، بەبێ شەڕو شۆڕو کوشتار، دەست سوپای موسوڵمانان دەکەوێ، کە پێی دەگوترێ: (فەیأ) واتە: ماڵی مفتی بێ ئارەقی، بەرسێبەر

١١٤٦- عَنْ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ كَانَتْ أَمْوَالُ بَنِـي النَّـضِيرِ مِمَّـا أَفَـاءَ اللَّـهُ عَلَى رَسُولِهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِمَّا لَمْ يُوجِفْ الْمُسْلِمُونَ عَلَيْهِ بِخَيْلٍ وَلا رِكَـابٍ فَكَانَتْ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خَاصَّةً وكان يُنْفِقُ عَلَـى أَهْلِـهِ مِنْهَـا نَفَقَـةَ سَنَتِهِ ثُمَّ يَجْعَلُ مَا بَقِيَ فِي السِّلاحِ وَالْكُرَاعِ عُدَّةً فِـي سَـبِيلِ اللَّـهِ) (الحـديث ٢٩٠٤، أطرافُهُ في: ٣٠٩٤، ٤٠٣٣، ٤٨٨٥، ٥٣٥٧، ٥٣٥٨، ٦٧٢٨، ٧٣٠٥)[1146]:

عومەر (ڕەزای خوای لـێ بێ) فەرمووی: ئەو ماڵ‌و تالانییە کە لەماڵی هۆزی بـەنی نـەضیری جولەکە، دەسـتی پێغەمبـەر(دروودی خـوای لەسـەر بـێ) کـەوت خودا خۆی دەستی پێغەمبەری (دروودی خوای لەسەر بێ) خستبوو، موسوڵمانان بـەتاودانی مـایین‌و ئەسـپ‌و بـەغاردانی وشـتر و، بەجـەنگ پەیـدایان نـەکردبوو، وەئەو ماڵ‌و تالانییە بەر بڕیاری ئەم ئایەتە دەکەوێ ﴿وَمَا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَـى رَسُـولِهِ

[1146] تجریـد/٣، ژمـارە: ١١٩٥ = ٢٩٠٤ بخـاری. مـسلم تـرقیم محمـد فـؤاد/ ١٧٥٧ = ٤٥٥٠ شـیحا (بخاری رقم الكتاب/٣٤ رقم الباب/٨٠).

مِنْهُمْ فَمَا أَوْجَفْتُمْ عَلَيْهِ مِنْ خَيْلٍ وَلا رِكَابٍ﴾: ئەوەی کە خودا دەست پێغەمبەری خۆی خست، لەماڵی مفتی بێ ئارەقی هۆزی بەنی نەضیر، ئێوە - ئەی لەشکری ئیسلام! - بۆ بەدەستهێنانی ئەو ماڵو سامانە، هیچ ئەسپو وشترێکتان تاونەدابوو، بەڵکوو خودا بەبەخششی خۆی رەخساندبووی بۆی.

عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جا لەبەر ئەوە ئەو ماڵو سامانە بەتایبەتی بوو بوون بەهی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) ئازوقەو مەسرەفو خەرجی ساڵێکی خێزانو کەسو کاری خۆی لێ دادەناو، هەرچی لەوە دەمایەوە، دایدەنا بۆ ئیشو کارو پێویستی موسوڵمانانو خەرجی دەکرد بۆ ئامادەکردنی جەنگو تفاقی جەنگو وڵاخ، لەڕێگەی خودادا، دەیکرد بەکەرەستەی جەنگ. (تاج/٧/١٨٨ف-٣ز-٤٢-سوورەتی حەشر-ش/د/ت/ن).

١١٤٧- حديث عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ (رضى الله عنه) عن مَالِكُ بْنُ أَوْسِ بْنِ الْحَدَثَانِ النَّصْرِيُّ أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ (رضى الله عنه) دَعَاهُ إِذْ جَاءَهُ حَاجِبُهُ يَرْفَا فَقَالَ هَلْ لَكَ فِي عُثْمَانَ ، وَعَبْدِ الرَّحْمَنِ ، وَالزُّبَيْرِ وَسَعْدٍ يَسْتَأْذِنُونَ فَقَالَ نَعَمْ ، فَأَدْخِلْهُمْ . فَلَبِثَ قَلِيلاً ، ثُمَّ جَاءَ فَقَالَ هَلْ لَكَ فِي عَبَّاسٍ وَعَلِيٍّ يَسْتَأْذِنَانِ قَالَ نَعَمْ . فَلَمَّا دَخَلاَ قَالَ عَبَّاسٌ يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ ، اقْضِ بَيْنِي وَبَيْنَ هَذَا ، وَهُمَا يَخْتَصِمَانِ فِي الَّذِى أَفَاءَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ (صلى الله عليه وسلم) مِنْ بَنِي النَّضِيرِ ، فَاسْتَبَّ عَلِيٌّ وَعَبَّاسٌ ، فَقَالَ الرَّهْطُ يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ ، اقْضِ بَيْنَهُمَا وَأَرِحْ أَحَدَهُمَا مِنَ الآخَرِ . فَقَالَ عُمَرُ اتَّئِدُوا ، أَنْشُدُكُمْ بِاللَّهِ الَّذِى بِإِذْنِهِ تَقُومُ السَّمَاءُ وَالأَرْضُ ، هَلْ تَعْلَمُونَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « لاَ نُورَثُ ، مَا تَرَكْنَا صَدَقَةٌ » . يُرِيدُ بِذَلِكَ نَفْسَهُ . قَالُوا قَدْ قَالَ ذَلِكَ . فَأَقْبَلَ عُمَرُ عَلَى عَبَّاسٍ وَعَلِيٍّ فَقَالَ أَنْشُدُكُمَا بِاللَّهِ هَلْ تَعْلَمَانِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَدْ قَالَ ذَلِكَ قَالاَ نَعَمْ . قَالَ فَإِنِّي أُحَدِّثُكُمْ عَنْ هَذَا الأَمْرِ ، إِنَّ اللَّهَ سُبْحَانَهُ كَانَ خَصَّ رَسُولَهُ (صلى الله عليه وسلم) فِي هَذَا الْفَيْءِ بِشَىْءٍ لَمْ يُعْطِهِ

أَحَدًا غَيْرَهُ فَقَالَ جَلَّ ذِكْرُهُ ( وَمَا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ مِنْهُمْ فَمَا أَوْجَفْتُمْ عَلَيْهِ مِنْ خَيْلٍ وَلاَ رِكَابٍ ) إِلَى قَوْلِهِ ( قَدِيرٌ ) فَكَانَتْ هَذِهِ خَالِصَةً لِرَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) ، ثُمَّ وَاللَّهِ مَا احْتَازَهَا دُونَكُمْ ، وَلاَ اسْتَأْثَرَهَا عَلَيْكُمْ ، لَقَدْ أَعْطَاكُمُوهَا وَقَسَمَهَا فِيكُمْ ، حَتَّى بَقِيَ هَذَا الْمَالُ مِنْهَا ، فَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يُنْفِقُ عَلَى أَهْلِهِ نَفَقَةَ سَنَتِهِمْ مِنْ هَذَا الْمَالِ ، ثُمَّ يَأْخُذُ مَا بَقِيَ فَيَجْعَلُهُ مَجْعَلَ مَالِ اللَّهِ ، فَعَمِلَ ذَلِكَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) حَيَاتَهُ ، ثُمَّ تُوُفِّيَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ فَأَنَا وَلِيُّ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم). فَقَبَضَهُ أَبُو بَكْرٍ ، فَعَمِلَ فِيهِ بِمَا عَمِلَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَأَنْتُمْ حِينَئِذٍ . فَأَقْبَلَ عَلَى عَلِيٍّ وَعَبَّاسٍ وَقَالَ تَذْكُرَانِ أَنَّ أَبَا بَكْرٍ عَمِلَ فِيهِ كَمَا تَقُولاَنِ ، وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّهُ فِيهِ لَصَادِقٌ بَارٌّ رَاشِدٌ تَابِعٌ لِلْحَقِّ ثُمَّ تَوَفَّى اللَّهُ أَبَا بَكْرٍ فَقُلْتُ أَنَا وَلِيُّ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَأَبِي بَكْرٍ . فَقَبَضْتُهُ سَنَتَيْنِ مِنْ إِمَارَتِي أَعْمَلُ فِيهِ بِمَا عَمِلَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَأَبُو بَكْرٍ ، وَاللَّهُ يَعْلَمُ أَنِّي فِيهِ صَادِقٌ بَارٌّ رَاشِدٌ تَابِعٌ لِلْحَقِّ ، ثُمَّ جِئْتُمَانِي كِلاَكُمَا وَكَلِمَتُكُمَا وَاحِدَةٌ وَأَمْرُكُمَا جَمِيعٌ ، فَجِئْتَنِي - يَعْنِي عَبَّاسًا - فَقُلْتُ لَكُمَا إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « لاَ نُورَثُ ، مَا تَرَكْنَا صَدَقَةٌ » . فَلَمَّا بَدَا لِي أَنْ أَدْفَعَهُ إِلَيْكُمَا قُلْتُ إِنْ شِئْتُمَا دَفَعْتُهُ إِلَيْكُمَا عَلَى أَنَّ عَلَيْكُمَا عَهْدَ اللَّهِ وَمِيثَاقَهُ لَتَعْمَلاَنِ فِيهِ بِمَا عَمِلَ فِيهِ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَأَبُو بَكْرٍ ، وَمَا عَمِلْتُ فِيهِ مُنْذُ وَلِيتُ ، وَإِلاَّ فَلاَ تُكَلِّمَانِي ، فَقُلْتُمَا ادْفَعْهُ إِلَيْنَا بِذَلِكَ . فَدَفَعْتُهُ إِلَيْكُمَا ، أَفَتَلْتَمِسَانِ مِنِّي قَضَاءً غَيْرَ ذَلِكَ فَوَاللَّهِ الَّذِي بِإِذْنِهِ تَقُومُ السَّمَاءُ وَالأَرْضُ لاَ أَقْضِي فِيهِ بِقَضَاءٍ غَيْرِ ذَلِكَ حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ ، فَإِنْ عَجَزْتُمَا عَنْهُ ، فَادْفَعَا إِلَيَّ فَأَنَا أَكْفِيكُمَاهُ: [١١٤٧]

**لەژمارە (١١٤٧)ی پوختەی موسلیما ئاوایە:**

---

[١١٤٧] **تجريد/٣، ژمارە: ١٢٥٨ = ٢٠٩٤ پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ١١٤٧ = ٤٥٥٢ تخريج وترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا لصحيح مسلم (بخاری رقم الكتاب/٦٤ رقم الباب/١٤).**

عَنْ مَالِكِ بْنَ أَوْسٍ قَالَ: أَرْسَلَ إِلَيَّ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) فَجِئْتُهُ حِينَ تَعَالَى النَّهَارُ قَالَ: فَوَجَدْتُهُ فِي بَيْتِهِ جَالِسًا عَلَى سَرِيرٍ مُفْضِيًا إِلَى رِمَالِهِ مُتَّكِئًا عَلَى وِسَادَةٍ مِنْ أَدَمٍ، فَقَالَ لِي: يَا مَالُ! إِنَّهُ قَدْ دَفَّ أَهْلُ أَبْيَاتٍ مِنْ قَوْمِكَ، وَقَدْ أَمَرْتُ فِيهِمْ بِرَضْخٍ فَخُذْهُ فَاقْسِمْهُ بَيْنَهُمْ، قَالَ: قُلْتُ: لَوْ أَمَرْتَ بِهَذَا غَيْرِي، قَالَ: خُذْهُ يَا مَالُ! قَالَ: فَجَاءَ يَرْفَا فَقَالَ: هَلْ لَكَ يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ فِي عُثْمَانَ وَعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ وَالزُّبَيْرِ وَسَعْدٍ؟ فَقَالَ عُمَرُ: نَعَمْ، فَأَذِنَ لَهُمْ، فَدَخَلُوا، ثُمَّ جَاءَ فَقَالَ: هَلْ لَكَ فِي عَبَّاسٍ وَعَلِيٍّ؟ قَالَ: نَعَمْ، فَأَذِنَ لَهُمَا، فَقَالَ عَبَّاسٌ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ اقْضِ بَيْنِي وَبَيْنَ هَذَا (وذكر كلاماً) قَالَ: فَقَالَ الْقَوْمُ: أَجَلْ يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ فَاقْضِ بَيْنَهُمْ وَأَرِحْهُمْ (فَقَالَ مَالِكُ بْنُ أَوْسٍ: يُخَيَّلُ إِلَيَّ أَنَّهُمْ قَدْ كَانُوا قَدَّمُوهُمْ لِذَلِكَ) فَقَالَ عُمَرُ: اتَّئِدَا، أَنْشُدُكُمْ بِاللَّهِ الَّذِي بِإِذْنِهِ تَقُومُ السَّمَاءُ وَالأَرْضُ أَتَعْلَمُونَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «لاَ نُورَثُ، مَا تَرَكْنَا صَدَقَةٌ»؟ قَالُوا: نَعَمْ، ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَى الْعَبَّاسِ وَعَلِيٍّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) فَقَالَ: أَنْشُدُكُمَا بِاللَّهِ الَّذِي بِإِذْنِهِ تَقُومُ السَّمَاءُ وَالأَرْضُ أَتَعْلَمَانِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « لاَ نُورَثُ، مَا تَرَكْنَاهُ صَدَقَةٌ »؟ قَالاَ: نَعَمْ، فَقَالَ عُمَرُ: إِنَّ اللَّهَ جَلَّ وَعَزَّ كَانَ خَصَّ رَسُولَهُ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِخَاصَّةٍ لَمْ يُخَصِّصْ بِهَا أَحَدًا غَيْرَهُ، قَالَ: (مَا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ مِنْ أَهْلِ الْقُرَى، فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ) مَا أَدْرِي هَلْ قَرَأَ الآيَةَ الَّتِي قَبْلَهَا أَمْ لاَ؟ قَالَ: فَقَسَمَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَيْنَكُمْ أَمْوَالَ بَنِي النَّضِيرِ فَوَاللَّهِ مَا اسْتَأْثَرَ عَلَيْكُمْ، وَلاَ أَخَذَهَا دُونَكُمْ، حَتَّى بَقِيَ هَذَا الْمَالُ، فَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَأْخُذُ مِنْهُ نَفَقَةَ سَنَةٍ، ثُمَّ يَجْعَلُ مَا بَقِيَ أُسْوَةَ الْمَالِ، ثُمَّ قَالَ: أَنْشُدُكُمْ بِاللَّهِ الَّذِي بِإِذْنِهِ تَقُومُ السَّمَاءُ وَالأَرْضُ، أَتَعْلَمُونَ ذَلِكَ؟ قَالُوا: نَعَمْ، ثُمَّ نَشَدَ عَبَّاسًا وَعَلِيًّا بِمِثْلِ مَا نَشَدَ بِهِ الْقَوْمَ: أَتَعْلَمَانِ ذَلِكَ؟ قَالاَ: نَعَمْ، قَالَ: فَلَمَّا تُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ أَبُو بَكْرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَا وَلِيُّ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَجِئْتُمَا، تَطْلُبُ مِيرَاثَكَ مِنَ ابْنِ أَخِيكَ، وَيَطْلُبُ هَذَا مِيرَاثَ امْرَأَتِهِ مِنْ أَبِيهَا، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « مَا نُورَثُ،

مَا تَرَكْنَا صَدَقَةٌ ». فَرَأَيْتُمَاهُ كَاذِبًا آثِمًا غَادِرًا خَائِنًا! وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّهُ لَصَادِقٌ بَارٌّ رَاشِدٌ تَابِعٌ لِلْحَقِّ. ثُمَّ تُوُفِّيَ أَبُو بَكْرٍ وَأَنَا وَلِيُّ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَوَلِيُّ أَبِي بَكْرٍ، فَرَأَيْتُمَانِي كَاذِبًا آثِمًا غَادِرًا خَائِنًا! وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِنِّي لَصَادِقٌ بَارٌّ رَاشِدٌ تَابِعٌ لِلْحَقِّ، فَوَلِيتُهَا، ثُمَّ جِئْتَنِي أَنْتَ وَهَذَا، وَأَنْتُمَا جَمِيعٌ وَأَمْرُكُمَا وَاحِدٌ فَقُلْتُمَا: ادْفَعْهَا إِلَيْنَا، فَقُلْتُ: إِنْ شِئْتُمْ دَفَعْتُهَا إِلَيْكُمَا عَلَى أَنَّ عَلَيْكُمَا عَهْدَ اللَّهِ أَنْ تَعْمَلاَ فِيهَا بِالَّذِي كَانَ يَعْمَلُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَأَخَذْتُمَاهَا بِذَلِكَ، قَالَ: أَكَذَلِكَ؟ قَالاَ: نَعَمْ، قَالَ: ثُمَّ جِئْتُمَانِي لأَقْضِيَ بَيْنَكُمَا!؟ وَلاَ وَاللَّهِ لاَ أَقْضِي بَيْنَكُمَا بِغَيْرِ ذَلِكَ حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ، فَإِنْ عَجَزْتُمَا عَنْهَا فَرُدَّاهَا إِلَيَّ. {الحديث: ٤٥٥٢ = ٤٥٤٠. تجريد/٣، رقم: ١٢٥٨ = ٣٠٩٤، ٤٠٣٣، ٤٨٨٥، ٧٣٥٧، ٥٣٥٨، ٦٧٢٨، ٧٣٠٥. أبو داود. خراج: ٢٩٦٣. ترمذی. السير: ١٦١٠. نسائی. قسم الفيئ: ٤١٥٩. تحفة الأشراف: ٣٦٤٤، ٣٩١٤، ٥١٣٥، ٦٦١١، ٩٨٣٤، ١٠٦٣٢}:

مالیکی کوڕی ئەوسی کوڕی حەدەثان (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەماڵی خۆم لەناو کەسوکارم دانیشتبووم، چێشتەنگاوێکی درەنگ بوو، لەودەمەدا فروستادەی عومەری کوڕی خەطاب هات بەدواما، گوتی: فەرمانڕەوای موسوڵمانان منی ناردووە بەشوێنتا کەبچی بۆ خزمەتی، منیش لەگەڵیا چووم‌و چوومە خزمەتی، تەماشام کرد لەسەر تەختەیەکی بە پەلکە خورما چنراوی ڕووت دانیشتووە، دۆشەك‌و ڕایەخ‌و شتی وای لەسەر ڕانەخراوە، بەڵکوو لەسەر تەختە ڕەق‌و تەقەکە پاڵ کەوتووە‌و، لەسەر پشتییەکی چەرمین شانی داداوە، سڵاوو ڕۆژ باشیم لێکردو ئەوجا لەخزمەتیدا دانیشتم. فەرمووی: (مالە! چەند خێزانێ لەهۆزەکەی تۆ هاتوون بۆلام‌و هانایان هێناوە، منیش هەندێ یارمەتیم بڕیار داوە بۆیان، وەری بگرەو خۆت دابەشی بکە بەسەریانا. منیش گوتم: قوربان! خۆزگە فەرمانت دەکرد بەکەسێکی تر کە بەم کارە هەڵسێ. فەرمووی: دەبێ هەر وەری بگری ئەی پیاوی باش!

من هەر هێشتا لەخزمەتیدا دانیشتبووم، کە پەردەدار (دەرگاوان)ەکەی، کەناوی یەرفەء بوو، هات بۆ خزمەتیو عەرزی کرد: قوربان! عوسمانی کوڕی عەففانو عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفو زوبەیری کوڕی عەوامو سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص، لەدەرەوە چاوەڕوان دەکەن، کە جەنابتان ڕێگەیان پێ بدەن بێن بۆ خزمەتتان، فەرمانتان بەچییە؟ عومەر فەرمووی: بابێن، ئەویش فەرمووی لێ کردنو هاتنە ژوورەوەو سڵاویان کردو دانیشتن. ئەوجا یەرفەء کەمێ تر لەشوێنی خۆی دانیشتەوەو هاتەوەو گوتی: عەلیو عەبباسیش چاوەڕوانن ڕێگە خوازی دەکەن، فەرمانت بەچییە؟ فەرمووی: بەڵێ بابێنە ژوورەوە! ئەویش فەرمووی لەوانیش کردو ئەوانیش هاتنو سڵاویان کردو دانیشتن، جا عەبباس فەرمووی: ئەی فەرمانڕەوای موسوڵمانان دادگایی نێوانی منو نێوانی ئەمە بکە (لە صەحیحی موسلیما، دەقەکە ئاوایە، دانەری ئەم پوختەیە، ئەوەی لابردووە، لەبەر زەقیو ڕەقی: دادگایی نێوانی منو نێوانی ئەم درۆزنە، تاوانبارە، بێ پەیمانە، ناپاکە بکە. دیارە کە ئیمامی عەبباس، کە هەق مامەی ئیمامی عەلی بووە، لەرووی نازەوەو لەحاڵەتی تووڕەییو بێزاریدا ئەمەی بە عەلی گوتووە، نەوەك لەسەر شێوەی ڕاستەقینە).

عەبباسو عەلی کێشەیەکیان هەبوو، سەبارەت بەدابەش کردنی ئەو دەستکەوتەی کە لەم ئایەتەدا باسکراوە: {وَمَا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ مِنْهُمْ}. واتە: ئەوەی کەخودا دەست پێغەمبەری خۆی خست، لەماڵی مفتی بێ ئازەقی هۆزی بەنی نەضیر، ئێوە – ئەی لەشکری ئیسلام! بۆ بەدەستهێنانی ئەو ماڵو سامانە، هیچ ئەسپو وشترێکتان تاونەدابوو، بەڵکوو خودا بە بەخششی خۆی رەخساندبووی بۆ پێغەمبەری خۆی). {بڕوانە ئەم شوێنانە بۆ روونکردنەوەی ئەم ئایەتە: تەجرید/٣، ژمارە: ١١٩٥ = ٢٩٠٤ فتح الباری + تاج/٤، زنجیرە: ٤٢، ژمارە: ٤١٥٨ ج/٤}.

کۆمەڵەکەیش کە لەوێ بوون، واتە: عوسمان‌و هاوەڵەکانی فەرموویان: ئەی فەرمانڕەوای موسوڵمانان! بفەرموو دادگایی نێوانی ئەمانە بکەو رزگاریان بکە لەم کێشەیە. مالیکی کوڕی ئەوس دەیفەرموو: وادەزانم کە عوسمان‌و هاوڕێکانی، عەبباس‌و عەلی لەپێش خۆیانەوە ناردبوویانن بۆ ئەوێ، هەتا قسەیێ خێر لەم لایەنەوە بکەن‌و لەلای عومەر تکایان بۆ بکەن.

ئیمامی عومەریش (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەسەرەخۆ بن‌و کەمێ ئارام بن، ئەوجا روویکردە کۆمەڵەکەو فەرمووی: تووە ئەو خودایەی کە بەفەرمانی ئەو ئەرزو ئاسمان راوەستاوە، ئایا ئاگاتان لێیە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: (کەلەپوور لەئێمەی پێغەمبەران ناگیرێ، ئەوەی لەدارایی دنیا لەئێمە بەجێ بمێنێ لەپاش مەرگمان دەبێ بەخێرو خەرج دەکرێ، بۆ بەرژەوەندی ئیسلام) دیارە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆشی مەبەستە، بەم فەرموودەیە، ئایا ئێوە ئەمە دەزانن یانا؟ کۆمەڵەکە فەرموویان: بەڵێ ئەوەی فەرمووە، ئەوجا عومەر رووی کردە عەبباس‌و عەلی‌و پێی فەرموون تووە خودا ئایا ئێوەش ئەمە دەزانن؟ هەردوکیان گوتیان: بەڵێ ئەوەی فەرمووە. عومەر فەرمووی: دەبا با باسی ئەم کارەتان بۆبکەم، هەموومان دەزانین کە خودای گەورەو مەزن، لەم فەیئە، لەم مفتەماڵە، هەندێ شتی تایبەتی تەرخان کردووە بۆ پێغەمبەری خۆی، وە ئەو تایبەتمەندییەی بەکەسی تر نەداوە، ئەوەتا دەفەرموێ: {مَّا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ مِنْ أَهْلِ الْقُرَى فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ – حشر – ٧/٥٩}:

مالیك فەرمووی: نازانم ئیمامی عومەر ئایەتەکەی پێش ئەم ئایەتەشی خوێندەوە یانا؟ ئەوجا عومەر فەرمووی: (دەی ئەمە تایبەت بوو بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەڵام سوێندم بەخودا، گەرچی ئەمە وایەو خودا خۆی ئەم بەشەی تەرخان کردبوو بۆ پێغەمبەر، بەڵام پێغەمبەر (دروودی

خودای لەسەر بێ) هەر بۆخۆی بەتەنها ئەمەی خەرج نەدەکردو ئێوەی لێ بێ بەش بکا، بەڵکوو بەشی ئێوەیشی لێ دەداو پەخشی دەکردەوە بەناوتانا، ئائەم سامانەی کە ئێستا ئێوە کێشەتانە لەسەری مایەوە بۆ پێغەمبەر خۆی. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەژیانی خۆیدا ئازووقەی ساڵانەی خێزانەکانی، لەوماڵی فەیئە دابین دەکرد، وە ئەوەیشی لەوە دەمایەوە حیسابی ماڵی خودای بۆ دەکردو دایدەنا بۆ ئیش‌و کارو پێویستی موسوڵمانان، جا هەتا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆی مابوو، لەژیانی خۆیدا ئەم حاڵە بەردەوام بوو، ئەوجا فەرمووی بەکۆمەڵەکە: توو ئەو خودایەی کە ئەم ئاسمان‌و زەمینە بە فەرمانی ئەو راوەستاوە، ئایا ئێوە ئەوە دەزانن؟ کۆمەڵەکەیش فەرموویان: بەڵێ ئاگامان لەمە هەیە. ئەوجا ئیمامی عومەر بە عەباس‌و بە عەلیی فەرموو: (تووزاتی خودا ئێوەش وەك ئەوان ئەم باس‌و خواسە دەزانن یانا؟). ئەوانیش فەرموویان: بەڵێ دەیزانین.

عومەر فەرمووی: کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خودا بردیەوەو پیاڵەی مەرگی نۆشی، ئەبوبەکری صەدیق کەبوو بەجێنشینی ئەو، فەرمووی: من سەروەسێتی شەرعی پێغەمبەرم‌و لەجێی ئەو کارو بارەکانی ئەنجام دەدەم، ئەوەبوو ئێوە هاتن بۆلای ئەبوبەکر: تۆ ئەی عەبباس! داوای بەشە کەلەپووری خۆتت دەکرد، لە کەلەپووری پێغەمبەر، کە برازاتە، عەلیش داوای بەشە کەلەپووری ژنەکەیی دەکرد، لە کەلەپووری باوکی، چونکە فاطیمەی ژنی عەلی، کچی پێغەمبەری خودایە. ئەبوبەکریش فەرمووی: شتی وانییە، چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (پێغەمبەران کەلەپووریان لێ ناگیرێ، ئێمە لەپاش مەرگمان چی ماڵمان لێ بەجێ بمێنێ خێرو صەدەقەیە).

کەچی ئێوە باوەڕتان بە ئەبوبەکر نەکردو بەڵکوو ئەبوبەکرتان بەدرۆزن‌و تاوانبارو بێ پەیمان‌و گزیکار دانا، وە خودای گەورە بۆخۆی دەزانێ کە ئەبوبەکر راستگۆو چاکە کارو هەقناس‌و هەقخواو پەیڕەوی راستی بوو، بە پێچەوانەی بۆچوونی ئێوەوە، لەپاشا کە ئەبوبەکریش مەرگ بوو بەمیوانی‌و، من بووم بەجێگە نشینی پێغەمبەرو ئەبوبەکرو بووم بەسەر وەسێتی ئەوان‌و بڕیارمدا پەیڕەوی ئەوان بکەم‌و لە ڕێبازی ئەوان دەرنەچم، دیسان ئێوە منیشتان بەدرۆزن‌و تاوانکارو بێ پەیمان‌و گزیکار زانی، بەڵام خودای گەورە بۆخۆی باش باش دەزانێ کەمن راستگۆو چاکەکارو هەقناس‌و هەقخواو راستی خوازم، لەبەرئەوە ئەو بۆچوونە چەوتەی ئێوە بایەخی نەبوو، نە لەلای ئەبوبەکر، نە لەلای من!!

کاتێ من لەدوای ئەبوبەکر بووم بەسەروەسێتی‌و ئەوماڵەم وەرگرت، وە تاماوەی دوو ساڵ بەرنامەکەی پێغەمبەرو بەرنامەکەی ئەبوبەکرم، سەبارەت بەم ماڵە، کە ئێستا ئێوە کێشەتانە لەسەری، پەیڕەو دەکرد، دیسان تۆ ئەی عەبباس لەگەڵ ئەمەدا، واتە: لەگەڵ عەلی برازاتا، هاتن بۆلای من‌و بەوە رازی نەبوون‌و هەردوو لاتان قسەتان کردبوو بەیەك‌و هەرکەسەتان داوای بەشە کەلەپووری خۆیی لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەکرد، وەگوتتان: ئەم سامانە تەسلیمی ئێمە بکە. کاتێ بۆم دەرکەوت کە تەسلیمی ئێوەی بکەم، سەرم سوکتر دەبێ، ئەوەبوو بەم مەرجە ماڵەکەم تەسلیمی ئێوە کرد: (بەڵێن‌و پەیمان دەدەین بە خودای گەورە، سەبارەت بەم ماڵە، پەیڕەوی ئەو بەرنامەیە بکەین کە پێغەمبەر لەسەردەمی خۆیدا جێبەجێی دەکرد). ئێوەیش هەردوکتان بەمە رازی بوون‌و ئەم پەیمانەتاندا، ئایا ئەمە وایە؟ عەبباس‌و عەلی فەرموویان: بەڵێ چۆنی دەفەرمووی وابوو.

عومەر فەرمووی: (ئەی ئیتر چیتان لەمن دەوێ، دیارە بڕیارێکی ترتان لەمن دەوێ، دەی سوێندم بەخودای گەورە، بڕیاری تری جگە لەمە لەم بارەیەوە نادەم، هەتا قیامەت هەڵ دەستێ، چونکە هەر بڕیارێکی تر بدەم ناهەقەو منیش شتی ناهەق ناکەم، بەمە رازین ئەوا باشە خۆ ئەگەر ناتوانن ئەم بەرنامەیەی پێغەمبەرو ئەبوبەکرو من جێبەجێ بکەن‌و دەبێ بەکێشەو بەرەتان لەسەری، ئەوا روو بەرووی خۆمی بکەنەوە، من چارەسەری دەکەم بۆتان!!).

**روونکردنەوە:**

١- لە وەرگێڕانی ئەم فەرموودەیەدا، بەهرە لەگێڕانەوەی ئیمامی بوخاری وەرگیراوە، لەگەڵ شەرحەکانی، وە مەبەست لە فەرموودەکە ئەمەیە کە گوترا، تکایە فەرموودەی دوا ئەم فەرموودەش رەچاوبکەن، کە پەیوەندی بەهێزی هەیە بەم باسەوە.

٢- مالیکی کوڕی ئەوسی کوڕی حەدەسان هاوەڵی پێغەمبەر بوو، لەسەردەمی نەزانیدا، بەر لەهاتنی ئیسلام جەحێڵ بوو، وابوو کە سواری ماین ببێ، بەڵام دیارە درەنگ موسوڵمان بووە، لەبەرئەوە هەندێ لە پسپۆڕان بە پەیڕەو (تابیع)ی دادەنێن، بەپێی سەرچاوە باوەڕپێکراوەکان گێڕانەوەی هەیە لەخودی پێغەمبەرو ئەبوبەکرو عومەرو عوسمان‌و عەلی‌و کەسانی ترەوە، لەسەردەمی جێنشینی پێشەوا عومەردا، دەمڕاستی هۆزەکەی بوو، وەك لە فەرموودەکەدا ئاماژە بۆ ئەم کارە هەیە. لەتەمەنی نەوەدو چوارساڵیدا، لەساڵی نەوەدو دووی کۆچی، هەندێ دەڵێن: پەنجاو دووی کۆچی لەمەدینە ئەمری خودای کردووە (رەزاو رەحمەتی خودای لێ بێ) دوو فەرموودەی لە بوخاریدا هەیە، ئەگەر لەپەنجاو دووی کۆچیدا مردبێ‌و تەمەنیشی وەك گوتراوە نەوەدو چوار ساڵ

بووبێ، راسته كه لەسەردەمی نەزانیدا، زەلام بووەو وابووه كه بتوانێ سواری ولآخی بەرزه ببێ.

## (١٦) باب قَوْلِ النبی ﴿ﷺ﴾ لانُورِثُ مَا تَرَكْنَا فَهُوَ صَدَقَةٌ
## فەرمایشتی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) {لانُورِثُ مَا تَرَكْنَا فَهُوَ صَدَقَةٌ}

١١٤٨- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) أَنَّ أَزْوَاجَ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) حِينَ تُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَرَدْنَ أَنْ يَبْعَثْنَ عُثْمَانَ إِلَى أَبِى بَكْرٍ يَسْأَلْنَهُ مِيرَاثَهُنَّ . فَقَالَتْ عَائِشَةُ أَلَيْسَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « لاَ نُورَثُ مَا تَرَكْنَا صَدَقَةٌ»: [(١١٤٨)]

**له تەجریدی بوخاریدا ئاوایه:**

عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْها) زَوْجَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تَقُولُ: (ارْسَلَ ازْوَاجُ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عُثمَانَ الَى ابِي بَكْرٍ يَسْالْنَهُ ثُمنَهُنَّ مِمَّا افَاء اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَكُنْتُ انَا ارُدُّهُنَّ فَقُلْتُ لَهُنَّ الا تَتَّقِينَ اللَّهَ الَمْ تَعْلَمْنَ انَّ النَّبِيَ(صَلَّىاللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَقُولُ لا نُورَث مَا تَرَكْنَا صَدَقَةٌ يُرِيدُ بِذلِكَ نَفْسَهُ انَّمَا يَاكُلُ الُ مُحَمَّدٍ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْ هَذا الْمَالِ فَانْتَهَى ازْوَاجُ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الَى مَا اخْبَرتْهُنَّ) (الحديث:٤٠٣٤ ، طرفاه في: ٦٧٢٧، ٦٧٣٠):

عائیشه (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: هاوسەرەكانی پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) لەپاش مەرگی پێغەمبەر، عوسمانی كوڕی عەففانیان نارد بۆخزمەتی ئەبوبەكری صەدیق، كه ئەوكاته ئەوجێنیشین (خەلیفه)بوو،

---

(١١٤٨) تجرید/٤، ژمارە: ١٥٣٩ = ٤٠٣٩ بخاری. مسلم: ١٧٨٥ = پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١١٤٩ = ٤٥٤٨ شیحا + تجرید/٣، ژمارە: ١١٤٣ (بخاری رقم الكتاب/٨٥ رقم الباب/٣).

کەعەرزی بکا، هەشتیەکی خۆیان پێ بدا، لەو مفتە ماڵەی کە خودای گەورە ڕەخساندبووی بۆ پێغەمبەر(دروودی خودای لێ بێ) لەتالانی دێهاتی دەوروبەری مەدینەی پیرۆز ، منیش پەشیمانم دەکردنەوە پێیانم دەگوت: ئەوە بۆ لەخودا ناترسن، ئەدی نازانن کە پێغەمبەر(دروودی خودای لێ بێ) دەیفەرموو: (میرات و کەلەپوور لەئێمە ناگیرێ، کە دەستەی پێغەمبەرانین، ژێوزار ومەسرەفی کەسوکاری موحەممەد(دروودی خودای لێ بێ) لەسەربەیتولماڵە).

ئیتر هاوسەرەکانی تری پێغەمبەریش هاتنە سەر قسەکەی وداوای بەشەمیراتیان نەکرد، لەبەجێماوەی پێغەمبەر)، (تاج/٣ ل/٢٤ ف/٢).

لە پوختەی موسلیما ژمارە (١١٤٩) ئاوایە:

عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « لاَ يَقْتَسِمُ وَرَثَتِى دِينَارًا، مَا تَرَكْتُ بَعْدَ نَفَقَةِ نِسَائِى وَمَئُونَةِ عَامِلِى فَهُوَ صَدَقَةٌ ». {الحديث: ٤٥٥٨ = ٤٥٤٦ فـم. تجريد/٣، لاپەڕە: ٢٧٤، رقم: ١١٤٣ = ٢٧٧٦، ٣٠٩٦، ٦٧٢٩. أبو داود. خراج: ٢٩٧٤. تحفة الأشراف: ١٣٨٠٥} :

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کەسوکاری من، لەپاش مەرگی من، پارەو پوول دابەش ناکەن، هەرچیم لەپاش بەجێما خێرو خێراتە، تەنیا ژێواری ژنەکانم و ئازووخەی سەرکارەکەمی لێ دەرچێ). {تاج/٢، زنجیرە: ١٠، ژمارە: ١٩٩٥} .

١١٤٩- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ تعالى عَنْها): أَنَّ فَاطِمَةَ بِنْتَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَرْسَلَتْ إِلَى أَبِى بَكْرٍ الصِّدِّيقِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) تَسْأَلُهُ مِيرَاثَهَا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِمَّا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَيْهِ بِالْمَدِينَةِ وَفَدَكٍ وَمَا بَقِىَ مِنْ خُمْسِ خَيْبَرَ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « لاَ نُورَثُ، مَا تَرَكْنَا صَدَقَةٌ، إِنَّمَا يَأْكُلُ آلُ مُحَمَّدٍ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِى هَذَا الْمَالِ » وَإِنِّى وَاللَّهِ

لاَ أُغَيِّرُ شَيْئًا مِنْ صَدَقَةِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ حَالِهَا الَّتِى كَانَتْ عَلَيْهَا فِى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَلأَعْمَلَنَّ فِيهَا بِمَا عَمِلَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَأَبَى أَبُو بَكْرٍ أَنْ يَدْفَعَ إِلَى فَاطِمَةَ شَيْئًا، فَوَجَدَتْ فَاطِمَةُ عَلَى أَبِى بَكْرٍ فِى ذَلِكَ، قَالَ: فَهَجَرَتْهُ فَلَمْ تُكَلِّمْهُ حَتَّى تُوُفِّيَتْ، وَعَاشَتْ بَعْدَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) سِتَّةَ أَشْهُرٍ، فَلَمَّا تُوُفِّيَتْ دَفَنَهَا زَوْجُهَا عَلِيُّ بْنُ أَبِى طَالِبٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُم) لَيْلاً، وَلَمْ يُؤْذِنْ بِهَا أَبَا بَكْرٍ، وَصَلَّى عَلَيْهَا عَلِيٌّ. وَكَانَ لِعَلِيٍّ مِنَ النَّاسِ وِجْهَةٌ حَيَاةَ فَاطِمَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما)، فَلَمَّا تُوُفِّيَتِ اسْتَنْكَرَ عَلِيٌّ وُجُوهَ النَّاسِ فَالْتَمَسَ مُصَالَحَةَ أَبِى بَكْرٍ وَمُبَايَعَتَهُ، وَلَمْ يَكُنْ بَايَعَ تِلْكَ الأَشْهُرَ، فَأَرْسَلَ إِلَى أَبِى بَكْرٍ أَنِ ائْتِنَا، وَلاَ يَأْتِنَا مَعَكَ أَحَدٌ {كَرَاهِيَةَ مَحْضَرِ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)}، فَقَالَ عُمَرُ لأَبِى بَكْرٍ: وَاللَّهِ لاَ تَدْخُلْ عَلَيْهِمْ وَحْدَكَ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَمَا عَسَاهُمْ أَنْ يَفْعَلُوا بِى، إِنِّى وَاللَّهِ لآتِيَنَّهُمْ. فَدَخَلَ عَلَيْهِمْ أَبُو بَكْرٍ فَتَشَهَّدَ عَلِيُّ بْنُ أَبِى طَالِبٍ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّا قَدْ عَرَفْنَا يَا أَبَا بَكْرٍ فَضِيلَتَكَ، وَمَا أَعْطَاكَ اللَّهُ، وَلَمْ نَنْفَسْ عَلَيْكَ خَيْرًا سَاقَهُ اللَّهُ إِلَيْكَ، وَلَكِنَّكَ اسْتَبْدَدْتَ عَلَيْنَا بِالأَمْرِ وَكُنَّا نَحْنُ نَرَى لَنَا حَقًّا لِقَرَابَتِنَا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَلَمْ يَزَلْ يُكَلِّمُ أَبَا بَكْرٍ حَتَّى فَاضَتْ عَيْنَا أَبِى بَكْرٍ، فَلَمَّا تَكَلَّمَ أَبُو بَكْرٍ قَالَ: وَالَّذِى نَفْسِى بِيَدِهِ لَقَرَابَةُ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَحَبُّ إِلَيَّ أَنْ أَصِلَ مِنْ قَرَابَتِى، وَأَمَّا الَّذِى شَجَرَ بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ مِنْ هَذِهِ الأَمْوَالِ فَإِنِّى لَمْ آلُ فِيهِ عَنِ الْحَقِّ، وَلَمْ أَتْرُكْ أَمْرًا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَصْنَعُهُ فِيهَا إِلاَّ صَنَعْتُهُ، فَقَالَ عَلِيٌّ لأَبِى بَكْرٍ: مَوْعِدُكَ الْعَشِيَّةُ لِلْبَيْعَةِ، فَلَمَّا صَلَّى أَبُو بَكْرٍ صَلاَةَ الظُّهْرِ رَقِيَ عَلَى الْمِنْبَرِ، فَتَشَهَّدَ، وَذَكَرَ شَأْنَ عَلِيٍّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) وَتَخَلُّفَهُ عَنِ الْبَيْعَةِ وَعُذْرَهُ بِالَّذِى اعْتَذَرَ إِلَيْهِ ثُمَّ اسْتَغْفَرَ. وَتَشَهَّدَ عَلِيُّ بْنُ أَبِى طَالِبٍ فَعَظَّمَ حَقَّ أَبِى بَكْرٍ وَأَنَّهُ لَمْ يَحْمِلْهُ عَلَى الَّذِى صَنَعَ نَفَاسَةً عَلَى أَبِى بَكْرٍ وَلاَ إِنْكَارًا لِلَّذِى فَضَّلَهُ اللَّهُ عز وجل بِهِ وَلَكِنَّا كُنَّا نَرَى لَنَا فِى الأَمْرِ نَصِيبًا فَاسْتُبِدَّ عَلَيْنَا بِهِ، فَوَجَدْنَا فِى أَنْفُسِنَا،

فَسُرَّ بِذَلِكَ الْمُسْلِمُونَ، وَقَالُوا: أَصَبْتَ، فَكَانَ الْمُسْلِمُونَ إِلَى عَلِيٍّ قَرِيبًا، حِينَ رَاجَعَ الأَمْرَ الْمَعْرُوفَ. {الحديث: ٤٥٥٥ = ٤٥٤٣ فم. بخاري. فضائل الصحابة: ٣٧١١، ٣٧١٢، ٤٠٣٥، ٤٠٣٦، ٤٢٤٠، ٤٢٤١، ٦٧٢٥، ٦٧٢٦، أبو داود. خراج: ٢٩٦٨. نسائي. قسم الفيئ: ٤١٥٢. تحفة الأشراف: ٦٦٣٠} :[١١٤٩]

عائیشەی کچی ئەبوبەکری صەدیق (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: فاطیمەی کچی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ناردی بۆلای ئەبوبەکری صەدیق (رەزای خودای لێ بێ) کاتێ بوو بەجێنشینی پێغەمبەر، داوای بەشە کەلەپووری خۆیی لێ کرد، لە کەلەپووری پێغەمبەر لەهی ئەو مفتە ماڵەی کەخودا رەخساندی بۆ پێغەمبەری خۆی، لەمەدینە، لەدارایی‌و سامانی بەنی نەضیرو لەزەوی‌و زاری فەدەك، کە شارێکە سێ قۆناخ لەمەدینەوە دوورەو لەو بەشەی کە لەپێنج یەکی دەستکەوتی خەیبەر دەمایەوە.

ئەبوبەکریش فەرمووی: بۆخۆم لە پێغەمبەرم بیستووە دەیفەرموو: (میرات‌و کەلەپوور لەئێمە ناگیرێ، کە دەستەی پێغەمبەرانین، هەرچیمان لەپاش بەجێ بمێنێ خێرو خێراتە، بەلاّم بژێوی‌و گوزەرانی کەسوکاری موحەممەد لەم سامانە دەدرێ کە ئەم سامانەیش بەشێکە لەبەیتولمال).

ئینجا ئەبوبەکر فەرمووی: بەخودا خۆم چیم دیوە لە پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەر بێ) کە کردوویەتی لەم ماڵە، لەسەردەمی خۆیدا، لەخێرو لەژیواری ماڵ‌و منالی‌و لە یارمەتیدانی کەسوکاری لەم ماڵە، منیش هەروای لێ دەکەم‌و یەك شتی لێ ناگۆڕم).

---

[١١٤٩] بخاری. فضائل الصحابة: ٣٧١١ پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١١٤٨ = ٤٥٥٥ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٦٤ رقم الباب/٣٨).

ئیتر ئەبوبەکر قایل نەبوو کەهیچ شتێ لەوەی کە فاطیمە داوای دەکرد پێی بدات، لەبەرئەوە فاطیمە زوێربوو لە ئەبوبەکر. زوهری کە ئەم فەرموودەیە لە عوروەی کوڕی زوبەیرەوە، لە عائیشەی پووریەوە دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: ئیتر فاتیمە هەتا مرد نە هاموشۆی ئەبوبەکری کردو نە قسەی لەگەڵدا کرد، وە فاتیمە لەپاش مەرگی پێغەمبەر شەش مانگ ژیا، کاتێ فاتیمە مرد، عەلی مێردی بەشەو ناشتی، وەخۆی نوێژی تەرمی لەسەری کرد، وە ئەبوبەکری لەم بارەیەوە ئاگادار نەکردەوە.

لەسەردەمی ژیانی فاتیمەدا، ئیمامی عەلی (رەزای خودایان لێ بێ) لەناو خەڵکا، ریزو برەوێکی باشی هەبوو، کاتێ فاتیمە کۆچی دوایی کرد، عەلی هەستی کرد خەڵکەکە وەك جاران روویان خۆش نییە لەگەڵیا، لەبەرئەوە ویستی خۆی ئاشت بکاتەوە لەگەل ئەبوبەکرو پەیمانی لەسەر قەبووڵی جێنشینی (خەلافەت) بدا پێی، چونکە لەماوەی ئەو شەش مانگەی ژیانی فاتیمەدا پەیمانی نەدابوو پێی. جاوەلامی نارد بۆ ئەبوبەکر: کەسەردانێکمان بکە، بەلام باکەست لەگەڵدا نەبێ، کەدێیت بۆلامان، مەبادا کە عومەری کوڕی خەتابی لەگەڵدا بچێت! عومەریش بە ئەبوبەکری فەرموو: بەزاتی خودا نابێ بەتەنها خۆت بچیت بۆ ناویان، ئەبوبەکریش فەرمووی: قابیلە چیم لێ دەکەن، بەزاتی خودا دەڕۆم بۆلایان، جا ئەبوبەکر رۆیشت بۆلایان، جا ئیمامی عەلی کەسەری باسی کردەوە شایەتمانی هێنا، شایەتی دا لەسەر یەکتایی خوداو لەسەر قەبووڵی پێغەمبەرایەتی موحەممەد، ئەوجا فەرمووی: ئەی ئەبوبەکر! ئێمە باش دەزانین کەتۆ خاوەن قەدرو رێزی، وەدەزانین کەخودا خەلاتی گەورەی پێ بەخشیوی، قەت لەسەر ئەو خێرو خۆشییەی کەخودا بۆی رەخساندوویت بەخیلیو حەسوودیمان پێ نەبردووی، بەلام ئەوەندە هەیە، کەتۆ تاکڕەوانە، بەبێ راوێژ لەگەل ئێمەدا، کاروباری جێنشینیت قۆستەوە بۆ خۆت، لەڕاستیدا

ئێمە لەم ڕووەوە خۆمان بەخاوەن ماف دەزانین، لەبەر ئەو خزمایەتییەی کەهەمانە لەگەڵ موحەممەددا، کە پێغەمبەری خودایە (دروودی خودای لەسەر بێ) ئیتر عەلی هەر بەردەوام بوو لەسەر گفتوگۆ لەگەڵ ئەبوبەکردا، هەتا ئەبوبەکر دڵی پڕبوو، ئەسر بەچاوەکانیدا هاتە خوارەوە ئەبوبەکریش کە قسەی کرد فەرمووی: (سوێندم بەیەزدانی پاك کە گیانی منی والەدەستدا، حەزدەکەم کە لەگەڵ خزمو خوێشی حەزرەتدا (دروودی خودای لەسەر بێ) زیاتر چاکەو پیاوەتی بکەم هەتا لەگەڵ خزمانی خۆمدا، هەتا ئەوەی کەڕوویدا لەنێوانی منو لەنێوانی ئێوەدا، سەبارەت بەو سامانانەی کە لەپاش پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەجێ ماون، من لەو لایەنەوە درێغیم نەکردووەو لە شەقامە ڕێی هەق لام نەداوە، بۆ خەرج کردنی ئەو سامانانە، پێغەمبەرم کردووە بەسەر مەشق بۆ خۆم، هەرچی دیومە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کردوویەتی لەو سامانانە منیش هەمان شتم کردووە. جا عەلی بە ئەبوبەکری فەرموو: وادەمان پاش نوێژی نیوەڕۆبێ، بۆ دانی پەیمانو ئەوکاتە پەیمانی قبووڵی خەلافەتی تۆ ڕادەگەیەنم، جاکاتێ ئەبوبەکر بەرنوێژی نوێژی نیوەڕۆی لەمزگەوتی پێغەمبەر کرد، سەرکەوتە سەر دوانگە(مینبەر)ەکەی پێغەمبەرو شایەتمانی هێنا، وەباسی خۆیو عەلی کرد، وە هۆی چی بووە کە هەتا ئێستا لە پەیماندان دواکەوتووە، وە ئەو عوزرو پۆزشەی عەلی لەم لایەنەوە هێنایەوە قەبووڵی کرد پاشان داوای لێبوردنی تاوانی بۆ هەموان لە خودای گەورە کرد. جا عەلی کوڕی ئەبو طالیبیش شایەتمانی هێناو {أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلـهَ إِلاَّ اللّهُ وأشهد أَنَّ محمداً رَسُولُ اللّهِ}ی کردو مافو ڕێزی ئەبوبەکری بەرز نرخاندو باسی ئەوەی کرد کە ئەو هەڵوێستەی کەبوویەتی لەگەڵ ئەبوبەکردا، لەپاش مردنی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نە لەبەر بەخیلی بردن بووە بە

ئەبوبەكر، نەبۆ حاشاكردن بووە لەو قەدرو ڕێزەی كە خودای گەورەو بالآ دەست خەڵاتی كردووە بەو، بەلاّم ئێمە باوەڕمان وابوو كە بەشێكمان هەیە بەكاروباری جێنشینی پێغەمبەرەوە وەلێ ئەوەمان لێ زەوتكراوە، لەبەرئەوە لەدڵەوە دڵگران بووین. ئیتر موسوڵمانان بەم ئاشتبوونەوەیە شادمان بوون، وە فەرموویان بەعەلی: چاكت كرد، پێكات، ئیتر پاش ئەوە كە عەلی بەكارەكەدا چووەوە، بەرە بەرە موسوڵمانانیش لەعەلی نزیك دەبوونەوە). {تاج/٢، زنجیرە: ١٠، ژمارە: ١٩٩٦ + تاج/٣، زنجیرە: ١٩، ژمارە: ٣٣٦٢}.

١١٥٠- حديث عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ (رضى الله عنها) أَخْبَرَتْهُ أَنَّ فَاطِمَةَ (عَلَيْهَا السَّلاَمُ) ابْنَةَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) سَأَلَتْ أَبَا بَكْرٍ الصِّدِّيقَ بَعْدَ وَفَاةِ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَنْ يَقْسِمَ لَهَا مِيرَاثَهَا ، مَا تَرَكَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) مِمَّا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَيْهِ.

فَقَالَ لَهَا أَبُو بَكْرٍ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ « لاَ نُورَثُ مَا تَرَكْنَا صَدَقَةٌ». فَغَضِبَتْ فَاطِمَةُ بِنْتُ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَهَجَرَتْ أَبَا بَكْرٍ ، فَلَمْ تَزَلْ مُهَاجِرَتَهُ حَتَّى تُوُفِّيَتْ وَعَاشَتْ بَعْدَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) سِتَّةَ أَشْهُرٍ . قَالَتْ وَكَانَتْ فَاطِمَةُ تَسْأَلُ أَبَا بَكْرٍ نَصِيبَهَا مِمَّا تَرَكَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) مِنْ خَيْبَرَ وَفَدَكٍ وَصَدَقَتِهِ بِالْمَدِينَةِ ، فَأَبَى أَبُو بَكْرٍ عَلَيْهَا ذَلِكَ ، وَقَالَ لَسْتُ تَارِكًا شَيْئًا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَعْمَلُ بِهِ إِلاَّ عَمِلْتُ بِهِ ، فَإِنِّي أَخْشَى إِنْ تَرَكْتُ شَيْئًا مِنْ أَمْرِهِ أَنْ أَزِيغَ . فَأَمَّا صَدَقَتُهُ بِالْمَدِينَةِ فَدَفَعَهَا عُمَرُ إِلَى عَلِيٍّ وَعَبَّاسٍ ، فَأَمَّا خَيْبَرُ وَفَدَكٌ فَأَمْسَكَهَا عُمَرُ وَقَالَ هُمَا صَدَقَةُ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) كَانَتَا لِحُقُوقِهِ الَّتِي تَعْرُوهُ وَنَوَائِبِهِ ، وَأَمْرُهُمَا إِلَى مَنْ وَلِيَ الأَمْرَ . قَالَ فَهُمَا عَلَى ذَلِكَ إِلَى الْيَوْمِ. [١١٥٠]

---

[١١٥٠] بڕوانە: ژمارە: (١١٤٩). (بخاری رقم الكتاب/٥٧ رقم الباب/١).

له ژماره (١١٤٩)دا، كه يه‌كسه‌ر وا له‌پێش ئه‌م ژماره‌یه‌وه واتاو مه‌به‌ست‌و ته‌خریجه‌كه‌ی رۆیشت.

١١٥١- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ: « لاَ يَقْتَسِمُ وَرَثَتِى دِينَارًا، مَا تَرَكْتُ بَعْدَ نَفَقَةِ نِسَائِى وَمَئُونَةِ عَامِلِى فَهُوَ صَدَقَةٌ ». {الحديث: ٤٥٥٨ = ٤٥٤٦ فـم. تجريد/٣، لاپـه‌ڕه: ٢٧٤، رقـم: ١١٤٣ = ٢٧٧٦، ٣٠٩٦، ٦٧٢٩. أبو داود. خراج: ٢٩٧٤. تحفة الأشراف: ١٣٨٠٥} : [١١٥١]

ئه‌بو هوره‌یره (ره‌زای خودای لێ بێ) فه‌رمووی: خۆشه‌ویست (دروودی خودای له‌سه‌ر بێ) فه‌رمووی: (كه‌سوكاری من، له‌پاش مه‌رگی من، پاره‌و پوول دابه‌ش ناكه‌ن، هه‌رچیم له‌پاش به‌جێما خێرو خێراته‌، ته‌نیا ژێواری ژنه‌كانم‌و ئازووخه‌ی سه‌ركاره‌كه‌می لێ ده‌رچێ). {تاج/٢، زنجیره: ١٠، ژماره: ١٩٩٥} .

## (١٩) بابُ رَبْطِ الأَسِيرِ وَحَبْسِهِ وَجَوَازِ المَنِ عَلَيْهِ

## دروسته دیل ببه‌سترێته‌وه، یان به‌ند (حه‌پس) بكرێ، یان به پیاوه‌تی به‌ر بدرێ، به‌بێ به‌رابه‌ر

١١٥٢- عنْ ابي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ: بَعَثَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خَيْلا قِبَلَ نَجْدٍ فَجَاءَتْ بِرَجُلٍ مِنْ بَنِي حَنِيفَةَ يُقَالُ لَهُ: ثمامَةُ بْنُ اثالٍ فَرَبَطوهُ بِسَارِيَةٍ مِنْ سَوَارِي الْمَسْجِدِ فَخَرَجَ الَيْهِ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: مَا عِنْدَكَ يَا ثمامَةُ؟ فَقَالَ: عِنْدِي خَيْرٌ يَا مُحَمَّدُ انْ تَقْتُلْنِي تَقْتُلْ ذا دَمٍ وَانْ تُنْعِمْ تُنْعِمْ عَلَى شَاكِرٍ وَانْ كُنْتَ تُرِيدُ الْمَالَ فَسَلْ مِنْهُ مَا شِئْتَ فَتُرِكَ حَتَّى كَانَ الْغَدُ ثمَّ قَالَ لَهُ: مَا عِنْدَكَ يَا ثمامَةُ قَالَ:

---

[١١٥١] تجريد/٣، ژماره: ١١٤٣ = ٢٧٧٦ بخاری. پوخته‌ی موسلیم/٣، ژماره: ١١٤٩ = ٤٥٥٨ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٥٥ رقم الباب/٣٢).

مَا قُلْتُ لَكَ: انْ تُنْعِمْ تُنْعِمْ عَلَى شَاكِرٍ فَتَرَكَهُ حَتَّى كَانَ بَعْدَ الْغَدِ فَقَالَ: مَا عِنْدَكَ يَا ثُمَامَةُ فَقَالَ: عِنْدِي مَا قُلْتُ لَكَ فَقَالَ: اطلِقُوا ثُمَامَةَ.

فَانْطَلَقَ الَى نَخلٍ قَرِيبٍ مِنْ الْمَسْجِدِ فَاغْتَسَلَ ثمَّ دَخَلَ الْمَسْجِدَ فَقَالَ: اشْهَدُ انْ لا الَهَ الا اللّٰهُ وَاشْهَدُ انَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللّٰهِ يَا مُحَمَّدُ وَاللّٰهِ مَا كَانَ عَلَى الارْض وَجْهٌ ابْغَض الَيَ مِنْ وَجْهِكَ فَقَدْ اصْبَحَ وَجْهُكَ احَبَّ الْوُجُوهِ الَيَ وَاللّٰهِ مَا كَانَ مِنْ دِينٍ ابْغَض الَيَ مِنْ دِينِكَ فَاصْبَحَ دِينُكَ احَبَّ الدِّينِ الَيَ وَاللّٰهِ مَا كَانَ مِنْ بَلَدٍ ابْغَض الَيَ مِنْ بَلَدِكَ فَاصْبَحَ بَلَدُكَ احَبَّ الْبِلادِ الَيَ وَانَّ خَيْلَكَ اخَذتْنِي وَانَا ارِيدُ الْعُمْرَةَ فَمَاذا تَرَى فَبَشَّرَهُ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَامَرَهُ انْ يَعْتَمِرَ فَلَمَّا قَدِمَ مَكَّةَ قَالَ لَهُ قَائِلٌ صَبَوْتَ قَالَ لا وَلَكِنْ اسْلَمْتُ مَعَ مُحَمَّدٍ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَلا وَاللّٰهِ لا يَاتِيكُمْ مِنْ الْيَمَامَةِ حَبَّةُ حِنْطةٍ حَتَّى يَاذنَ فِيهَا النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (الحديث: ٤٣٧٢، اطرافه في: ٤٦٢٠، ٤٦٩، ٢٤٢٢، ٢٤٢٣): [١١٥٢]

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (درووودو سلاوی خوای گەورەی لەسەر بێ و سەرو ماڵو منداڵو هەستو نەست بەقوربانی گەردی سەر گۆڕی پیرۆزی) برکەیێ سواری بەرەو نەجد نارد، کەهاتنەوە پیاوێکی بەنی حەنیفەیی یان دیل کردبوو، لەگەڵ خۆیان هێنابوویان، ناوی سومامەی کوڕی ئوسال بوو، سەرگەورەی خەڵکی یەمامە بوو،جا لەبەر ئەوەی کەلەسەردەمی حەزرەتدا بەندیخانەیان نەبوو، چونکە حوکمیان تابڵێی سادەو پڕدادو عەداڵەت بوو، پێویستیان بە پۆلیس و کەلەبچە و زیندان نەبوو، لەبەر ئەوە پیاوەکەیان بە کۆڵەکەیێ لەکۆڵەکەکانی مزگەوتەوە بەستەوە...

---

[١١٥٢] تجرید/٤، ژمارە: ١٦٠٧ = ٤٣٧٢ بخاری. پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١١٥٢ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٦٤ رقم الباب/٧٠).

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چوو بۆلای و فەرمووی پێی: ئەی ثومامە! پێت وایە چیت لێ دەکەین؟) ئەویش گوتی: ئەی موحەممەد! ئومێدی خێرت لێ دەکەم: چونکە تۆ پیاوێکی حەققانیت، لەبەر ئەوە، ئەوەی کەتۆ بیکوژی شایانی کوشتنەنە وە ئەوەی کە تۆ پیاوەتی لەگەڵ بکەی مایەی سوپاس و شانازییە بۆی، خۆ ئەگەر پارەو ماڵیشت دەوێ، چەندە حەز دەکەی داوابکە دەتدەمێ،جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وازی لێ هێناو بۆ دووسبەی، فەرموویەوە پێی (ئەی سومامە! لات وایە کەچیت لێ دەکەم؟) ئەویش گوتی: هەرئەوەیە کە پێم گوتیت! پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەو ڕۆژەیش وازی لێ هێنایەوە و بۆسبەینێ فەرموویەوە: (ئەی سومامە! لات وایە چیت لێ دەکەم؟ گوتی : هەر ئەوەیە کە ئەو ڕۆژە پێم گوتووی، ئومێدی خێرت لێ دەکەم: چونکە ئەوەی تۆ دەیکوژی شایانی کوشتنە، وە ئەوەی کەتۆ پیاوەتی لەگەڵ بکەی مایەی سوپاسکردنە، کەواتە بۆ منیش چ بمکوژیت و چ پیاوەتیم لەگەڵ بکەی جێگەی خۆیەتی، خۆ ئەگەر دەتەوێ بە پارەو ماڵیش بەرم بدەیت چەنەدەت دەوێ داوا بکە دەیدەم پێت، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (سومامە بەردەن).

سومامە ڕۆیشت لەناو باخە خورمایەکا، کە لەنزیکی مزگەوتەوە بوو لەوێ خۆی شۆردو هاتەوە بۆ مزگەوت و گوتی: (اشهد ان لا الـه الاالله واشهد ان محمدا عبده ورسوله) ئەی موحەممەد! بەزاتی خودا لەمەوپێش کەس نەبوو لەسەر ڕووی زەوی، کە بەقەد تۆرقم لێی بێ، بەڵام ئێستاکە کەس نییە کە بەقەد تۆخۆشم بوێ هەروەها ئایینەکەت و ولاتەکەیشت، بەزاتێ کەزاتی خودایە، دین نەبووە کە بەقەد دینەکەی تۆ رقم لێی بێ بەڵام ئێستا دینەکەی تۆم لەهەموو دینێکی تر خۆشتر دەوێ، بەزاتێ کەزاتی خودایە، ولات نەبووە کە بەقەد وڵاتەکەی تۆرقم لێی بێ، بەڵام ئێستا ولاتەکەی تۆ خۆشەویست ترین ولاتە

بەلامەوە، من لەو کاتەدا کە سوارەکانی تۆ گرتمیان دەمویست عـەمرە بکـەم، بـۆ ئەمە چی دەفەرمووی؟ پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) مزگێنـی پـێ داو فەرمانی کرد، کەبچێ عەمرەکەی بکا. جاکە دەچێ بۆ مەککە، یەکێ پێی دەڵێ: ئەوە لەئایینی خۆت وەرگەڕاویت و بوویت بەصابیئی (واتە: بەموسوڵمان) سومامە پێی گوت: نـەخێر نـەبووم بەصابیئی، بـەڵام موسـوڵمان بـووم و دینـی پێغەمبەری ڕاست و دروستی خودام وەرگرتـووە، کە ئـاییـنی موحەممـەدە، دەسـا بەزاتی خودا، تا ئێوە لەسەر ئەم بارودۆخە ناحەزانەبن لەگـەڵ ئیسلام دا، یـەك دەنگ گەنم چییە، لەولاتی یەمامەوە بۆتان نایێ، مەگەر ڕەزامەندی پێغەمبەری لەسەربێ!. (تاج/٨ ل/١٧١ ز/٧٠ - باسی دییل).

**ئەو بەهرانەی لەم فەرموودە پیرۆزەیە وەردەگیرین:**

١- دروسـتە گومانبـار حـەپس بکـرێ، یابـە شـێوەیێ کـە لـەباربێ بۆحـاڵ ببەستڕێتەوە.

٢- بوونی بێباوەڕ لەناو مزگەوتا لەبەر پێویستی ڕەوا دروستە.

٣- لەکاتی ئیسلامبوونا غوسڵ کردن مەشرووع و ڕەوایە.

٤- سومامە یەکێکە لە گەورە پیاوانی هاوڕێیانی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) لـە پـێش ئـازاد کردنـی مەککـەدا ئیـسلام بـووە. فـەرموودەکانی لـە بوخاریدا لەڕێگەی سەعیدی مەقبورییەوە، لەئەبو هورەیرەوە گێـرد راونەتـەوە، کاتێ خەڵکی یەمامە لە ئیسلام هەڵگەڕانەوەو دوای موسەیلەمەی کەزاب کەوتن، سـومامە و ئـەو موسـوڵمانانەی بـە گوێیـان کـرد کۆچیان کـرد بـۆلای عـەلائی حـەزرەمی بـۆ بـەحرەین، وە لەگـەڵ ئـەوانا چـوون بەگـژ هەڵگـەڕاوەکانی موسویلەمەدا.

## (٢٠) بابُ إجْلاءِ اليَهُودِ مِنَ الحِجازِ
## چۆڵكردنی وڵاتی حیجاز له میللەتی جووله‌كه

١١٥٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: بَيْنَا نَحْنُ فِي الْمَسْجِدِ، إِذْ خَرَجَ إِلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، فَقَالَ: « انْطَلِقُوا إِلَى يَهُودَ »، فَخَرَجْنَا مَعَهُ، حَتَّى جِئْنَاهُمْ، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَنَادَاهُمْ، فَقَالَ: « يَا مَعْشَرَ يَهُودَ أَسْلِمُوا تَسْلَمُوا »، فَقَالُوا: قَدْ بَلَّغْتَ يَا أَبَا الْقَاسِمِ! فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): « ذَلِكَ أُرِيدُ، أَسْلِمُوا تَسْلَمُوا »، فَقَالُوا: قَدْ بَلَّغْتَ يَا أَبَا الْقَاسِمِ! فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): « ذَلِكَ أُرِيدُ»، فَقَالَ لَهُمُ الثَّالِثَةَ، فَقَالَ: « اعْلَمُوا أَنَّمَا الأَرْضُ لِلَّهِ وَرَسُولِهِ، وَأَنِّي أُرِيدُ أَنْ أُجْلِيَكُمْ مِنْ هَذِهِ الأَرْضِ، فَمَنْ وَجَدَ مِنْكُمْ بِمَالِهِ شَيْئًا فَلْيَبِعْهُ، وَإِلاَّ فَاعْلَمُوا أَنَّ الأَرْضَ لِلَّهِ وَرَسُولِهِ ». {الحديث: ٤٥٦٦ = ٤٥٥٤ فم. بخاري. جزية: ٣١٦٨. أبو داود. خراج: ٣٠٠٣} : [١١٥٣]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ لەمزگەوت بووین، حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) هات بۆ ناومانو فەرمووی: (ئادەی بابڕۆین بۆناو جوولەکەکان). جا لەخزمەتیدا ڕۆیشتینو چووینە ماڵی مالوومەکەیان. حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) لەوێ ڕاوەستاو بانگی کردنو فەرمووی: (ئەی کۆمەڵەی جوولەکە! موسوڵمان ببن، سەر ئاسوودەو سەلامەت دەبن).

ئەوانیش بۆ تەفرەدانو چەواشەکاری گوتیان: ئەی باوکی قاسم! تۆ بەئەرکی سەرشانی خۆت هەڵسایتو کارەکەت بەئێمە ڕاگەیاند، ئیتر بەرپرسیاریی دەکەوێتە سەرشانی ئێمە!! پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێیان: (دەی منیش مەبەستم ئەوەیە، کەئێوە دیان بەو ڕاستیەدا

[١١٥٣] بخاری. جزیە/٣١٦٨ پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١١٥٣ = ٤٥٦٦ شیحا.

بنێن‌و پێ لەوە بنێن کەمن پێم ڕاگەیاندوون، دەی موسوڵمان ببن سەر ئاسوودەو سەلامەت دەبن). دووبارە گوتیانەوە: ئەی باوکی قاسم تۆ بەئەرکی سەرشانی خۆت هەڵسایت‌و کارەکەت بەئێمە ڕاگەیاند، ئیتر بەرپرسیاری دەکەوێتە سەرشانی ئێمە، نەوەك سەرشانی تۆ! پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەوە: (دەی منیش ئەوەم دەوێ). لەسەری جاری سێیەما فەرمووی پێیان: (بزانن کە ئەم خاکە هی خوداو پێغەمبەری خودایەو مافی ئێوەی پێوە نییە، لەڕاستیدا من دەمەوێ ئەم وڵاتەتان پێ چۆڵ بکەم، لەبەرئەوە ئەگەر ماڵێ، شتێکتان هەیە ساخی بکەنەوەو بیفرۆشن‌و بەخۆشی بڕۆن‌و ئێرە چۆڵ کەن‌و سەری خۆتان بەلایەکا دەرکەن! ئەگینا باش باش لێتان ڕوون‌و ئاشکرابێ کە ئەم وڵاتە خاکی خوداو پێغەمبەری خودایەو فڕی ئێوەی بەسەرەوە نییەو ئەگەر بەخۆشی خۆتان نەڕۆن بە زەبری شیرو تیر پێتان چۆڵ دەکەین‌و ئەوسا تەواو حاڵتان شڕ دەبێ). {تاج/٤، زنجیرە: ٨١، ژمارە: ٤٥٦٦. چاپی چوارەم}.

١١٥٤- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: (حَارَبَتْ النَّضيرُ وَقُرَيْظَةُ فَاجْلَى بَنِي النَّضيرِ وَاقَرَّ قُرَيْظَةَ وَمَنَّ عَلَيْهِمْ حَتَّى حَارَبَتْ قُرَيْظَةُ فَقَتَلَ رِجَالَهُمْ وَقَسَمَ نِسَاءَهُمْ وَاوْلادَهُمْ وَامْوَالَهُمْ بَيْنَ الْمُسْلِمِينَ الا بَعْضَهُمْ لَحِقُوا بالنَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَامَنَهُمْ وَاسْلَمُوا وَاجْلَى يَهُودَ الْمَدِينَةِ كُلَّهُمْ بَنِي قَيْنُقَاعَ وَهُمْ رَهْط عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَلامٍ وَيَهُودَ بَنِي حَارِثَةَ وَكُلَّ يَهُودِ الْمَدِينَةِ). (الحديث: ٤٠٢٨)؛ [١١٥٤]

ئیبنوعومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: هۆزی نەوەی نەزیرو هۆزی نەوەی قوڕەیزە لە دژی پێغەمبەر شەڕیان کرد، لەئەنجاما

[١١٥٤] تجرید/٤، ژمارە: ١٥٣٧ - ٤٠٢٨ بخاری. مسلم. محمد فؤاد/١٧٦٦ - ٤٥٦٧ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٦٤ رقم الباب/١٤).

پێغەمبەر(دروودی خودای لێ بێ) مەدینەی بەنەوەی نەزیر چۆڵ کرد و نەوەی قورەیزەی لەشوێنیخۆیان لەوێ هێشتەوە و هیچی لێ نەسەندن و کردی بەپیاوەتی بەسەریانەوە، بەڵام دووبارە بەنی قورەیزە دەستیان کردەوە بەشەڕو پەیمانەکەیانیان شکان، بۆیە پێغەمبەریش (دروودی خودای لێ بێ) لەسەر ئەوە پیاوە جەنگاوەرەکانی کوشتن و ژن و منداڵ وماڵیشیانی بەسەر موسوڵماناندا دابەش کرد، وەلێ هۆزەکەی عەبدوڵلایکوڕی سەلام هاتنە لای پێغەمبەر(دروودی خودای لێ بێ) ئەویش ئەمانی دان و ئەوانیش موسوڵمان بوون. دواتر پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) مەدینەی چۆڵ کرد بە هەموو جوولەکەیی، وەك بەنی قەینو قاع و بەنی حاریسە و جوولەکەکانی تری مەدینە (تاج/ ٨ ل/٢٢٢ ف/٣ ز/٨٩ - غەزای بەنی نەزیر و بەنی قورەیزە- ش) .

## (٢٢) بابُ جَوَازِ قِتَالِ مَنْ نَقَضَ العَهْدَ، وَجَوَازِ إِنزالِ أَهْلِ الحِصْنِ عَلَى حُكْمِ حَاكِمٍ عَدْلٍ أَهْلٍ للحكم

## جەنگ دروستە لەگەڵ ئەوانەی کە پەیمان دەشکێنن، هەروا لە یاسانامەدا دروستە کە خەڵکی ناو قەڵایێ، لە قەڵاکەیان دابەزن، لەسەر بەڵێنی حوکمدارێکی دادپەروەر، کە شایانی بڕیاردان بێت

١١٥٥- عنْ ابَي سَعِيدٍ الْخُدْرِيَ (رَضيَ اللهُ عنهُ) يَقُولُ: (نَـزَلَ اهْـلُ قُرَيْظَـةَ عَلَـى حُكْمِ سَعْدِ بْنِ مُعَاذ فَارْسَلَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الَى سَعْدٍ فَـاتَى عَلَـى حِمَـارٍ فَلَمَّا دَنَا مِنْ الْمَسْجِدِ قَالَ لِلانْصار: قُومُوا الَى سَيِّدِكُمْ اوْ خَيْرِكُمْ فَقَالَ: هَـؤُلاء نَزَلُـوا عَلَى حُكْمِكَ فَقَالَ تَقْتُلُ مُقَاتِلَتَهُمْ وَتَسْبِي ذرَارِيَهُمْ قَالَ: قَضيْتَ بِحُكْمِ اللّهِ وَرُبَّمَا قَالَ: بِحُكْمِ الْمَلِكِ). (الحديث: ٤١٢١، طرفه في: ٣٠٤٣، ٣٨٠٤، ٦٢٦٢)؛ [١١٥٥]

---

[١١٥٥] تجريد/٤، ژمارە: ١٥٥٣ = ٤١٢١ بخاری. مسلم/محمد فؤاد/١٧٦٨ = پوختەی موسلیم/١١٥٤ - ٤٥٧٣ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٥٦ رقم الباب/١٦٨).

ئـەبو سـەعیدی خـودری (رەزای خـودای لـێ بـێ) فـەرمووی: هـۆزی بـەنی قورەیزە، کـاتێ لەشـکری ئـیسلام دەورەیـان دان و، بیـست و پێـنج رۆژ گـەمارۆی قەلاکانیان دان چاریان نەما ڕازی بوون بەوە کەسەعدی کوڕی موعاز هەر بڕیـار و حوکمێ دەربارەی ئەوان دەرکا، ئەوان پێی قایل بن، جا لەسەنگەرو قەلاکانیان هاتنە دەرەوە، بەڵام لەودەمەدا سەعد لـەوێ نـەبوو، چونکە لەغـەزای خەنـدەقا زامـار بـوو، پێغەمبـەر(دروودی خـودای لـێ بـێ) نـاردی بەشـوێنیدا، سـەعد بەسواریی گوێدرێژێ هـات، جـا کـە گەیـشتە نزیکـی مزگـەوت (واتـە: نوێژگاکـە) پێغەمبـەر(دروودی خـودای لـێ بـێ) بەئەنـصاری فـەرموو: (بـچن بـەپیری ئاغاتانەوە) یا پێی فەرموون: (بچن بەپیری پیاوە باشەکەتانەوە).

ئـەوجا فـەرمووی: (ئـەی سـەعد! ئەمانـە تۆیـان کـردووە بـە حەکـەم و فـەرمانڕەواو بـەبڕیاری تـۆ ڕازی بـوون). سـەعدیش فـەرمووی: (دەوا مـن ئـەم بڕیارەیان بۆ دەدەم: کە جەنگاوەرەکانیان بکوژرێن و خاوو خێزانیشیان بەتالانی بگیرێن!) پێغەمبەر(دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (بە پێـی فـەرمانی خـودا فەرمانت دا) یا فەرمووی: (بەپێی فەرمانی پادشای گەورە کە خودایـە فـەرمانت دەرکرد(تـاج/٥ ل/١٧٥ ف/٤ ز/٤٥- باسـی گـەورەیی سـەعدی کـوڕی موغـاز+تـاج/٨- ل/٢٢٢- ٤ ز/٨٩- غەزای بەنی نەزیر ...).

١١٥٦- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) قَالَـتْ: أُصِـيبَ سَـعْدٌ يَـوْمَ الْخَنْـدَقِ، رَمَـاهُ رَجُلٌ مِنْ قُرَيْشٍ يُقَالُ لَهُ ابْنُ الْعَرِقَةِ، رَمَاهُ فِي الأَكْحَلِ، فَضَرَبَ عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّـهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) خَيْمَةً فِي الْمَسْجِدِ يَعُودُهُ مِنْ قَرِيبٍ، فَلَمَّا رَجَعَ رَسُولُ اللَّـهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) مِنَ الْخَنْدَقِ وَضَعَ السِّلاَحَ فَاغْتَـسَلَ، فَأَتَـاهُ جِبْرِيـلُ (عليـه الـسلام) وَهُـوَ يَنْفُضُ رَأْسَهُ مِنَ الْغُبَارِ، فَقَالَ: وَضَعْتَ السِّلاَحَ؟ وَاللَّهِ مَا وَضَـعْنَاهُ، اخْـرُجْ إِلَـيْهِمْ، فَقَـالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): « فَأَيْنَ »؟ فَأَشَارَ إِلَى بَنِي قُرَيْظَةَ، فَقَـاتَلَهُمْ رَسُـولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، فَنَزَلُوا عَلَى حُكْمِ رَسُـولِ اللَّـهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَمَ)،

فَرَدَّ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) الْحُكْمَ فِيهِمْ إِلَى سَعْدٍ قَالَ: فَإِنِّي أَحْكُمُ فِيهِمْ أَنْ تُقْتَلَ الْمُقَاتِلَةُ وَأَنْ تُسْبَى الذُّرِّيَّةُ وَالنِّسَاءُ وَتُقْسَمَ أَمْوَالُهُمْ، (قال هِشَامٌ: قَالَ أَبِي: فَأُخْبِرْتُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ: « لَقَدْ حَكَمْتَ فِيهِمْ بِحُكْمِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ ». وفي رواية: «حَكَمْتَ بِحُكْمِ اللَّهِ »، وَقَالَ مَرَّةً: « لَقَدْ حَكَمْتَ بِحُكْمِ الْمَلِكِ ». {الحديث: ٤٥٧٣ = ٤٥٥٩ فم. تجريد/٤، لاپەڕە: ٢٩٣، رقم: ١٥٥٣ = ٤١٢١، ٣٠٤٣، ٣٨٠٤، ٦٢٦٢ فتح الباري. أبو داود. أدب: ٥٢١٦} : [١١٥٦]

عائیشەی دایکی باوەڕداران (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەرۆژی غەزای خەندەقا، سەعدی کوڕی موعاز پێکرا، پیاوێ لە قورەیش ناوی ئیبنولعەریقە بوو، تیرێکی دا لەرەگی ژیانی، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چاتۆڵێکی لەناو مزگەوتدا بۆ هەڵدا تا لەنزیکەوە خۆی زوو زوو سەردانی بکا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کاتێ غەزای خەندەق تەواو بوو، گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، چەکی داناو خۆی شۆرد، حەزرەتی جوبرائیل (سلاوی لێ بێ) تەشریفی هات بۆلای، تەپوتۆزی بەشداریی کردنی لەشەڕی غەزای خەندەقا لەسەرو گوێلاکی خۆی دەتەکاند، بە پێغەمبەری فەرموو: (ئەوە تۆ چەکت داناوە، گوایە غەزا تەواو بووە؟ سوێندم بەخودا ئێمەی فریشتە هێشتا چەکمان دانەناوەو ئەو چەکەی هەڵمان گرتووە بۆ بەشداری لەجەنگی خەندەقا، هێشتا هەروا پێمان، ئادەی خۆتو سوپاکەت دەرچن بۆیان!).

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بۆکێ دەرچین‌و بۆ کوێ؟؟). جوبرائیل ئاماژەی کرد بۆ جوولەکەکانی بەنی قورەیظە، کەبچێ بۆ سەریان.

---

[١١٥٦] تجرید/٤، ژمارە: ١٥٥٣ = ٤١٢١ بخاری + تجرید/١، ژمارە: ٢٨٣، پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١١٥٤ = ٥٥٧٣ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٦٤ رقم الباب/٣٠).

هۆزی بەنی قورەیظە لەکاتی غەزای خەندەقا، ئەو پەیمانەی کە هەیانبوو لەگەڵ موسوڵمانانا، پەیمانەکەیان شکان، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەفەرمانی خودا، کە جوبرائیل بۆیهێنابوو، لەشکری بردە سەریان‌و بیست‌و پێنج رۆژ لەشکری ئیسلام دەورەیان دان‌و گەمارۆی قەڵاکانیان دان، پاش شەڕێکی قورس، چاریان نەماو رازی بوون بەوە کە سەعدی کوڕی موعاز هەر بڕیارو حوکمێ دەربارەی ئەوان دەربکا، ئەوان پێی قاییل بن، چونکە ئەوسی هۆزی سەعدی کوڕی موعاز هاوپەیمانی جوولەکەکانی بەنی قورەیزە بوون، جا جوولەکەکان لەسەنگەرو قەڵاکانیان هاتنە دەرەوەو بەهەر بڕیارو حوکمێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەربارەی ئەوان دەری بکا پێی رازی بن، پێغەمبەریش بڕیارو حوکمەکەی هەواڵەی سەعدی کوڕی موعاز کردو ئەوی کرد بەسەرپشك، کەهەرچی بڕیارێ، لەبارەی ئەوانەوە دەربکا، موسوڵمانان جێبەجێی بکەن‌و پابەندی ئەو بڕیارەی سەعدبن. بەڵام لەو دەمەدا سەعد لەوێ نەبوو، ناردیان بەدوایا هات، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (ئەی سەعد! ئەمانە تۆیان کردووە بە حەکەم‌و سەرپشك‌و بە فەرمانڕەواو بەبڕیاری تۆ سەبارەت بە چارەنووسی ئەوان لەم شەڕەدا قاییل‌و رازین‌و ئێمەیش هەروا).

سەعدیش فەرمووی: دەوا من ئەم بڕیارەیان بۆ دەدەم: کە جەنگاوەرەکانیان بکوژرێن‌و خاوو خێزانیان بکرێن بەدیل‌و کۆیلەو سامانەکانیشیان بکرێن بەتاڵانی جەنگ‌و دابەش بکرێن بەسەر لەشکری ئیسلاما!).

هیشامی کوڕی عوروەی خوشکەزای عائیشە فەرمووی: باوکم فەرمووی: هەواڵم پێدرا، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەسەعد دەفەرموێ: (بەپێی فەرمانی خودای گەورەو سەرومر ئەم فەرمانەت دەرکرد سەبارەت بەوان!) لەگێڕانەوەیەکا: (بەپێی فەرمانی خودا، فەرمانت دا) لەگێڕانەوەیەکی

تردا: (بەپێی فەرمانی پادشای گەورە کە خودایە فەرمانت دەرکرد). {تاج/٣، زنجیرە: ٤٥، ژمارە: ٣٤٦٨، ٣٤٦٩}.

١١٥٧- عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ سَعْدًا قَالَ اللَّهُمَّ إِنَّكَ تَعْلَمُ أَنَّهُ لَيْسَ أَحَدٌ أَحَبَّ إِلَيَّ أَنْ أُجَاهِدَهُمْ فِيكَ مِنْ قَوْمٍ كَذَّبُوا رَسُولَكَ (صلى الله عليه وسلم) وَأَخْرَجُوهُ، اللَّهُمَّ فَإِنِّي أَظُنُّ أَنَّكَ قَدْ وَضَعْتَ الْحَرْبَ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ، فَإِنْ كَانَ بَقِيَ مِنْ حَرْبِ قُرَيْشٍ شَيْءٌ، فَأَبْقِنِي لَهُ حَتَّى أُجَاهِدَهُمْ فِيكَ، وَإِنْ كُنْتَ وَضَعْتَ الْحَرْبَ فَافْجُرْهَا، وَاجْعَلْ مَوْتَتِي فِيهَا. فَانْفَجَرَتْ مِنْ لَبَّتِهِ، فَلَمْ يَرُعْهُمْ وَفِي الْمَسْجِدِ خَيْمَةٌ مِنْ بَنِي غِفَارٍ إِلاَّ الدَّمُ يَسِيلُ إِلَيْهِمْ فَقَالُوا يَا أَهْلَ الْخَيْمَةِ مَا هَذَا الَّذِي يَأْتِينَا مِنْ قِبَلِكُمْ فَإِذَا سَعْدٌ يَغْذُو جُرْحُهُ دَمًا، فَمَاتَ مِنْهَا (رضي الله عنه): [١١٥٧]

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لەهەموو هاوەڵانو هاوسەرانی بێ) فەرمووی: سەعدی کوڕی موعاز، لەغەزای خەندەقا زامار بوو، بەم بۆنەیەوە، ئەم نزایەی فەرموو: (ئەی خودایە! تۆ خۆت باش باش دەزانی، کە کەسێ نییە، کە حەز بکەمو پێم خۆش بێ کە جەنگیان لەگەڵدا بکەم، لەپێناوی تۆدا، وەك هۆزی قورەیش، کە باوەڕیان بە پێغەمبەرەکەی تۆ نەکردو لە مەککەی زێدیشی دەریانکردو لەوێ هەڵیانفڕاند، دەی ئەی خودایە! گەرچی من گومانم وایە کەتۆ کۆتاییت بەجەنگ هێناوە لەنێوانی ئێمەو ئەوانا، بەڵام ئەگەر شەڕێ لەنێوانی ئێمەو ئەوانا ماوە، ئەوا بمهێڵە بۆ ئەو شەڕە، هەتا لەو جەنگەیشدا بەشداری بکەم، لەپێناوی ئایینەکەی تۆدا، وەڵێ ئەگەر کۆتاییت بەشەڕ هێناوە لەنێوانی ئێمەو ئەوانا، ئەوا زامەکەم بتەقێنەو بیکە بەهۆی شەهیدبوونم!).

---

[١١٥٧] لە ژمارە: (١١٥٦)دا تەخریج کرا (بخاری رقم الکتاب/٦٤ رقم الباب/٣٠).

فــەرمووی: ئــیتر هــەر ئــەو شــەوە زامەکــەی تــەقی‌و بەهۆیــەوە شەهیدبوو........ تاکۆتایی فەرموودەکە، کە لەگێڕانـەوەی تەجریـدی بوخاریـدا، تۆمارکراوە، کە لەژمارە (١١٥٥)دا رابورد.

## (٢٣) بابُ مَنْ لَزِمَهُ أمْرُ فَدَخَلَ عَلَيهِ أمرُ آخَرُ
## کەسێ کارێ بگرێتە ئەستۆی خۆی‌و کارێ تری بێ بەسەردا چی بکا باشە

١١٥٨- عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ قَالَ النَّبِيُّ (صلی الله علیـه وسـلم) لَنَـا لَمَّـا رَجَـعَ مِـنَ الأَحْزَابِ « لاَ يُصَلِّيَنَّ أَحَدٌ الْعَصْرَ إِلاَّ فِي بَنِـي قُرَيْظَـةَ»: فَـأَدْرَكَ بَعْـضُهُمُ الْعَـصْرَ فِـى الطَّرِيقِ فَقَالَ بَعْضُهُمْ لاَ نُصَلِّى حَتَّى نَأْتِيَهَا ، وَقَالَ بَعْضُهُمْ بَلْ نُصَلِّى لَمْ يُرَدْ مِنَّا ذَلِـكَ . فَذُكِرَ لِلنَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) فَلَمْ يُعَنِّفْ وَاحِدًا مِنْهُمْ: [١١٥٨]

له تەجریدی بوخاریدا ژمارە (٤٩٧ = ٩٤٦) ئاوایە:

عَنْ نَافِعٍ عَنْ ابْنِ عُمَرَ قَالَ قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَنَـا لَمَّـا رَجَـعَ مِـنْ الْأَحْزَابِ (لَا يُصَلِّيَنَّ أَحَدٌ الْعَصْرَ إِلَّا فِي بَنِي قُرَيْظَةَ). فَأَدْرَكَ بَعْضهُمْ الْعَصْرُ فِي الطريق، فَقَالَ بَعْضهُمْ: لَا نُصَلِّي حَتَّى نَأْتِيَهَا وَقَالَ بَعْضهُمْ: بَلْ نُصَلِّي، لَمْ يُرَدْ مِنَّا ذلِـكَ، فَـذكِرَ لِلنَّبِـيِّ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ فَلَـمْ يُعَنِّـفْ وَاحِـدًا مِـنْهُمْ (الحـديث:٩٤٦–أطرافـه في:٤١١٩):

دیـسان ئیبنوعومــەر (ڕەزای خودایــان لــێ بــێ) فــەرمووی: لــەڕۆژی غــەزای خەنــدەقا، کەپێـشی دەگـوترێ: غـەزای ئـەحزاب،ئاموسـوڵمانەکان بەنائومێـدی گەرانـەوەو پێغەمبـەرو موسـوڵمانەکانیش سـەنگەرەکانیان چـۆڵ کـردو بەسـەر بەرزی گەرانەوە بۆماڵەوە، پێغەمبەر بـەیارانی خـۆی فـەرموو: (خـۆ دیتـان ئـەم

[١١٥٨] تجرید/١، ژمـارە: ٤٩٧ = ٩٤٦ بخـاری. مـسلم: ١٧٧٠ = پوختـەی موسـلیم/١١٧٥ = ٤٥٧٧ شـیحا (بخاری رقم الكتاب/١٢ رقم الباب/٥).

جوولەکە نامەردانەی هۆزی نەوەی قورەیزە چی نامەردییەکیان لەگەڵ کردین‌و چۆن لەم کاتە ناسکەدا دەستیان خستە ناودەستی دوژمنی سەروماڵ‌و ئاینی ئێمەوەو پەیمانی نێوانی ئێمەوخۆیان شکاند، کەواتە: کەس نوێژی عەصرنەکا هەتا نەچینە ناو بەنی قورەیظە ونەدەین بەسەریاندا).

کەدەکەونە ڕێ بەرەوبەنی قورەیظە، دەستەیێ لەیاران لەڕێ نوێژی عەصریان لێ دەبێ، دەبن بەدوو دەستەوە، لایەکیان دەڵێن: ئێمە نوێژ ناکەین تانەچینە ئەوێ، لاکەی تردەڵێن: ئێمە نوێژی خۆمان دەکەین، چونکە مەبەستی پێغەمبەر(دروودی خودای لەسەر بێ) لەو قسەیە ئەمە نەبوو، کەلەرێ نوێژ نەکەین تانەگەینە ئەوێ، بەڵکو مەبەستی ئەوەبوو کەدەست‌و بردکەین‌و زوو بڕۆین بۆسەریان، جاکاتێ کەئەمەیان عەرزی پێغەمبەر کردسەرزەنشتی کەسیانی نەکرد(تاج/٨/٢٢١-ش).

لە ژمارە (١١٧٥)ی موختەصەری صەحیحی موسلیمدا ئاوایە:

عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن عمر (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: نَادَى فِينَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَوْمَ انْصَرَفَ عَنِ الأَحْزَابِ « أَنْ لاَ يُصَلِّيَنَّ أَحَدٌ الظُّهْرَ إِلاَّ فِي بَنِي قُرَيْظَةَ ». فَتَخَوَّفَ نَاسٌ فَوْتَ الْوَقْتِ فَصَلُّوا دُونَ بَنِي قُرَيْظَةَ، وَقَالَ آخَرُونَ: لاَ نُصَلِّي، إِلاَّ حَيْثُ أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) وَإِنْ فَاتَنَا الْوَقْتُ قَالَ: فَمَا عَنَّفَ وَاحِداً مِنَ الْفَرِيقَيْنِ. {الحديث: ٤٥٧٧ = ٤٥٦٥ فم. تجريد/١/٤٧٤، رقم: ٤٩٧ = ٩٤٦، ٤١١٩. تحفة الأشراف: ٧٦١٥}:

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: لەڕۆژی غەزای خەندەقا، کەپێشی دەگوترێ: غەزای ئەحزاب، ناموسوڵمانەکان بەنائومێدی گەڕانەوەو پێغەمبەرو موسوڵمانەکانیش سەنگەرەکانیان چۆڵکردو بەسەر بەرزی گەڕانەوە بۆ ماڵەوە، جا وەك لەپێشەوە لەژمارە: ١١٥٦دا، حەزرەتی

جوبرائیل (دروودو سڵاوی خودای لەسەر بێ) هات بۆلای پێغەمبەرو پێی فەرموو برۆ بۆسەر جوولەکەی بەنی قورەیزە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەناو یارانیدا جاریدا: (خۆدیتان ئەم جوولەکە نامەردانەی هۆزی نەوەی قورەیزە چی نامەردییەکیان لەگەڵ کردین‌و چۆن لەم کاتە ناسکەدا دەستیان خستە ناو دەستی دوژمنی سەروماڵ‌و ئاینی ئێمەوەو، پەیمانی نێوانی ئێمەو خۆیان شکاند، کەواتە: کەستان نوێژی نیوەڕۆ نەکا، هەتا نەچینە ناو بەنی قورەیزەو نەدەین بەسەریاندا). کە دەکەونە ڕێ بەرەو بەنی قورەیزە، دەستەیێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەڕێ نوێژی نیوەڕۆیان لێ دەبێ، دەبن بەدوو دەستەوە، لایەکیان دەڵێن: ئێمە نوێژی خۆمان دەکەین، دەترسین کاتی نوێژ بەسەربچێ‌و نوێژەکەمان بفەوتێ، بەرلەوە بگەینە بەنی قورەیزە، چونکە مەبەستی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەو فەرمایشتە ئەوە نەبوو: کە لەڕێ ئەگەر نوێژمان لێ بوو، نوێژ نەکەین تا نەگەینە ئەوێ، بەڵکوو مەبەستی ئەوەبوو کە دەست‌و برد بکەین‌و زوو بڕۆین بۆسەریان، لایەکەی تریان دەڵێن: ئێمە نوێژ ناکەین، تانەگەینە ناو بەنی قورەیزە، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێمانی فەرمووە کەلەوێ نوێژ بکەین، با کاتەکەشمان بەسەربچێ. جاکاتێ ئەمەیان عەرزی حەزرەت کرد، کە لەسەر کردنی نوێژ بوون بەدوو لایەنەوە، سەرزەنیشتی کەسیانی نەکرد).

{تاج/٤، زنجیرە: ٨٩، ژمارە: ٤٦٠٨ چ/٤} .

## (٢٤) بابُ رَدُّ المُهَاجِرينَ إلَى الأنصارِ مَنَائِحَهُمْ مِنَ الشَّجَرِ والثَّمَرِ حِينَ اسْتَغْنَوا عَنْهَا بالفُتُوحِ

## کۆچکاران بەخشراوەکان دەگێڕنەوە بۆ یاریدەدەران لە پاش نازادکردنی وڵات

١١٥٩- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: لَمَّا قَدِمَ الْمُهَاجِرُونَ مِنْ مَكَّةَ الْمَدِينَةَ، قَدِمُوا وَلَيْسَ بِأَيْدِيهِمْ شَيْءٌ، وَكَانَ الأَنْصَارُ أَهْلَ الأَرْضِ وَالْعَقَارِ، فَقَاسَمَهُمُ الأَنْصَارُ عَلَى أَنْ أَعْطَوْهُمْ أَنْصَافَ ثِمَارِ أَمْوَالِهِمْ كُلَّ عَامٍ، وَيَكْفُونَهُمُ الْعَمَلَ وَالْمَئُونَةَ، وَكَانَتْ أُمُّ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، وَهْيَ تُدْعَى أُمَّ سُلَيْمٍ، وَكَانَتْ أُمَّ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ كَانَ أَخًا لأَنَسٍ لأُمِّهِ، وَكَانَتْ أَعْطَتْ أُمُّ أَنَسٍ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عِذَاقًا لَهَا فَأَعْطَاهَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أُمَّ أَيْمَنَ مَوْلاَتَهُ أُمَّ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ، قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: فَأَخْبَرَنِي أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَمَّا فَرَغَ مِنْ قِتَالِ أَهْلِ خَيْبَرَ، وَانْصَرَفَ إِلَى الْمَدِينَةِ، رَدَّ الْمُهَاجِرُونَ إِلَى الأَنْصَارِ مَنَائِحَهُمُ الَّتِي كَانُوا مَنَحُوهُمْ مِنْ ثِمَارِهِمْ، قَالَ: فَرَدَّ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِلَى أُمِّي عِذَاقَهَا، وَأَعْطَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أُمَّ أَيْمَنَ مَكَانَهُنَّ مِنْ حَائِطِهِ، قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: وَكَانَ مِنْ شَأْنِ أُمِّ أَيْمَنَ أُمِّ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُم) أَنَّهَا كَانَتْ وَصِيفَةً لِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، وَكَانَتْ مِنَ الْحَبَشَةِ، فَلَمَّا وَلَدَتْ آمِنَةُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَعْدَ مَا تُوُفِّيَ أَبُوهُ فَكَانَتْ أُمُّ أَيْمَنَ تَحْضُنُهُ، حَتَّى كَبِرَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَأَعْتَقَهَا، ثُمَّ أَنْكَحَهَا زَيْدَ بْنَ حَارِثَةَ، ثُمَّ تُوُفِّيَتْ بَعْدَ مَا تُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِخَمْسَةِ أَشْهُرٍ. {الحديث: ٤٥٧٨ = ٤٥٦٦ فم. تجريد/٣/١١٣، رقم: ١٠٢٣ = ٢٣٢٥، ٢٧١٩، ٣٧٨٢ + ١١١٦. فتح الباري + رقم: ١١١٦ = ٢٦٣٠، ٣١٢٨، ٤٠٣٠، ٤١٢٠}: [١١٥٩]

---

[١١٥٩] تجريد/٣، ژمارە: ١٠٢٣ = ٢٣٢٥ بخاری. پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١١٨١ = ٤٥٦٦٠ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٥١ رقم الباب/٣٥).

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ کۆچکاران لە مەککەوە، لەتاو ستەمو ئازاری ناموسوڵمانەکان کۆچیان کرد بۆ مەدینە، هیچیان بەدەستەوە نەمابوو، ئەو ماڵو سامانەی کە هەیان بوو، لەمەککە بەجێ مابوو، وە یاریدەدەران (أنصار)یش خاوەنی زەویو زارو ڕەزو باخ بوون، جا یاریدەدەران کۆچکارەکانیان کرد بەهاوبەشی خۆیان، لەبەروبوومی باخو ڕەزو داهاتی سامانەکانیاندا، بەمەرجێ ئەوانیش لەباتی خۆیان، سەرەوکاری باخو دێبەرو سامانەکانیان بکەنو ساڵانە بەرهەمیان بهێنِنو بنکەکان بۆ خاوەنەکانیان بێ، بەڵام بەروبوومەکەیان بەنیوەیی بۆ هەردوولا بێ. {بڕوانە: بەرگی/٣. تەجرید ژمارە: ١٠٢٣} . دایکیشم (کەناسراو بوو بە ئوم سولەیم، واتە: دایکی سولەیم) کە دایکی عەبدوڵڵای دایك برام بوو، کە کوڕی ئەبو طەلحەی باوە پیارەی من بوو، چونکە ئەبو طەلحە مێردی دایکم بوو، ئوم سولەیمی دایکم بەری چەند دار خورمایەکی خۆی بەخشیبوو بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە ساڵانە بەرەکانیان بۆ پێغەمبەر بێ، بەڵام خودی دارەکان بمێننەوە بۆ دایکم، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) بەری ئەو دار خورمایانەی بەخشیبوو بە ئوم ئەیمەنی ئازادکراوی خۆی، کەدایکی ئوسامەی کوڕی زەید بوو، وە دایکی شیریی پێغەمبەریش بوو. ئیمامی زوهری کە ناسراوە بە ئیبنو شەهاب دەفەرموێ: ئەنەسی کوڕی مالیك هەواڵی داپێم، کە کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەشەڕی غەزای خەیبەر دەگەڕێتەوە بۆ مەدینە، کۆچکاران ئەو ڕەزو باخانەیان گێڕایەوە بۆ یاریدەدەران، کە لەوەوپێش لێیان وەرگرتبوونو بەنیوەیی بەخێویان دەکردن، جا پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) دارە خورماکانی لەئوم ئەیمەن سەندەوەو دایەوە بەدایکم، وە لە باخەکەی خۆی پێغەمبەر تۆڵەی کردەوە بۆ ئوم ئەیمەن. ئیمامی زوهری

دەفەرموێ: هەندێ هەواڵ کە پەیوەندی بە ئوم ئەیمەنەوە هەیە، کە دایکی ئوسامەی کوڕی زەیدیشە (رەزای خودا لەهەموویان بێ) ئوم ئەیمەن لەپێشا کەنیزەکی عەبدوڵڵای کوڕی عەبدولموطەلیب بوو، کە باوکی پێغەمبەر بوو، بە رەگەزو نەژاد حەبەشەیی بوو، پێغەمبەر لەسکی ئامینەی دایکیدا دەبێ، کە عەبدوڵڵای باوکی دەمرێ، کە لەدایك دەبێ ئوم ئەیمەن دەبێ بە لەلەیی‌و بەدایەنی‌و گەورەی دەکا، جا کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گەورە دەبێ چاکەی ئوم ئەیمەن دەداتەوەو ئازادی دەکا، ئەوجا مارەی دەکا لە زەیدی کوڕی حاریثە، ئوم ئەیمەن بە پێنج مانگ، لەپاش مەرگی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) مەرگ دەبێ بەمیوانی‌و دەمرێ).

## روونکردنەوە:

ئوم ئەیمەن (رەزاو رەحمەتی خودای لێ بێ) لەلەو دایەنی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بوو، ناوی بەرەکە بوو، یەکێ بوو لەو چوار ژنانەی کە مەمکیان داوە بە پێغەمبەر: ١- ئامینەی دایکی. ٢- ثوومیبەی ئەسلەمی. ٣- حەلیمەی سەعدییە. ٤- ئوم ئەیمەن. لە مەککەوە کۆچی کرد بۆ مەدینە، ئیبنو عەبدولبەرر لە ئیستیعابا دەفەرموێ: دوو کۆچی کردووە: یەکێ بۆ حەبەشەو یەکێ بۆ مەدینە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە ئوم ئەیمەنی دەفەرموو: دایە! وە دەیفەرموو: (بەرەکە لەدوای دایکم ئەو دایکمە). پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەژیانیدا رێزی ئوم ئەیمەنی دەگرت، مووچەو بەراتی بۆ دەبڕییەوە، دێنی ئەوی دەکرد، ئەبوبەکرو عومەریش بەسەریان دەکردەوەو سەردانی ئەویان دەکرد، گەلێ جار ئوم ئەیمەن نازی بەسەر پێغەمبەردا دەکرد، چونکە دایەنی بووەو پەروەردەو گەورەی کردووەو دایکی

شیریی بووه، ئوم ئەیمەن لەزەیدی کوڕی حاریثە ئوسامەی بوو. {تاج/٣/٦٨٥، زنجیرە: ٤٣، ژمارە: ٣٤٤٧، ٣٤٤٨}.

ئەمەیش یەکێکە لە گێڕانەوەکانی تەجریدی بوخاری بۆ ئەم فەرموودەیە:

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَتْ الأَنْصَارُ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : اقْسِمْ بَيْنَنَا وَبَيْنَ إِخْوَانِنَا النَّخِيلَ قَالَ: (لا) فَقَالُوا: تَكْفُونَا الْمَئُونَةَ وَنَشْرَكْكُمْ فِي الثَّمَرَةِ قَالُوا: سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا). (الحديث ٢٣٢٥، طرفاهُ في: ٢٧١٩، ٣٧٨٢):

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: یاریدەدەران عەرزی پێغەمبەریان کرد: قوربان! بەبۆنەی کۆچکردنی کۆچکارانەوە لەخزمەت جەنابتا لە مەککەوە بۆ مەدینە، کێشەی نەبوونیو ئاتاجی دروست بووە، جا ئێمە بۆ چارەسەریئەم کێشەیە پێشنییار دەکەین کە جەنابت باخو بێستانەکانی ئێمەی یاریدەدەران (أنصار) دابەش بکەی بەسەر ئێمەو ئەوانا تا ئەوانیش وەك ئێمە ببن بەخاوەنی ماڵو سامانو مایەی ژیواریان بۆ دابین بکرێ؟

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (نابێ) جایاریدەدەران فەرموویان: دەی ئەی پێغەمبەری خودا! ئێوەی کۆچکاران باخو بێستانەکانمان بۆ بەخێوبکەنو بۆمان بەرهەم بهێنن، ئێمەیش دەتانکەین بەهاوبەشی خۆمان لەبەروبوومەکەی دا؟ فەرمووی: (باشە) کۆچکارانیش کە بینیان پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) وا بۆ ئەمەیان موافقە بەیەك دەنگ فەرموویان: (سَمِعْنا وأطَعْنا = ئەمەیان زۆر بەجێیە بۆ ئەمەیان بەگوێتان دەکەین).

١١٦٠- عَنْ أَنَسٍ (رضى الله عنه) قَالَ كَانَ الرَّجُلُ يَجْعَلُ لِلنَّبِىِّ (صلى الله عليه وسلم) النَّخَلاَتِ حَتَّى افْتَتَحَ قُرَيْظَةَ وَالنَّضِيرَ ، وَإِنَّ أَهْلِى أَمَرُونِى أَنْ آتِىَ النَّبِىَّ (صلى الله عليه وسلم) فَأَسْأَلَهُ الَّذِينَ كَانُوا أَعْطَوْهُ أَوْ بَعْضَهُ . وَكَانَ النَّبِىُّ (صلى الله عليه وسلم) قَدْ أَعْطَاهُ أُمَّ أَيْمَنَ ، فَجَاءَتْ أُمُّ أَيْمَنَ فَجَعَلَتِ الثَّوْبَ فِى عُنُقِى تَقُولُ كَلاَّ وَالَّذِى لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ لاَ يُعْطِيكَهُمْ وَقَدْ أَعْطَانِيهَا ، أَوْ كَمَا قَالَتْ ، وَالنَّبِىُّ (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ « لَكِ كَذَا». وَتَقُولُ كَلاَّ وَاللَّهِ . حَتَّى أَعْطَاهَا ، حَسِبْتُ أَنَّهُ قَالَ « عَشَرَةَ أَمْثَالِهِ » . أَوْ كَمَا قَالَ: [١١٦٠]

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەرلەوە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەتحی هۆزی بەنی قوڕەیظەو هۆزی بەنی نەضیر بکا، کە دوو خێڵی جوولەکەی ناسراوبوون، لەشاری مەدینە، کە باخە خورمای زۆریان هەبوو، باخەکان بوون بەهی موسوڵمانان، بەر لەم فەتحانە، پیاو هەبوو، لە ئەنصار، واتە: لە یاریدەدەران، بەری چەند بنکە خورمایەکی دەبەخشی بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)، هەتا دابەشیان بکا بەسەر کۆچکارانا، ماڵی ئێمەیش بۆ ئەم مەبەستە بەری چەند دارخورمایەکمان بەخشی بە پێغەمبەر، پێغەمبەریش دارە خورمایەکانی ئێمەی دا، بە دایەنەکەی خۆی کە ناوی ئوم ئەیمەن بوو!

جا کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وڵاتی هۆزی بەنی قوڕەیزەو هۆزی بەنی نەزیری ئازادکردو ڕەزو باخەکانیان بوون بەهی پێغەمبەر، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەو دارە خورمایانەی گێڕایەوە بۆ خاوەنەکانیان، کە لەپێش ئەم ڕزگارکردنەدا، یاریدەدەران

---

[١١٦٠] بخاری: ٣١٢٨، ٤٠٣٠، ٤١٢٠ مسلم ترقیم الشیخ خلیل مأمون شیحا: ٤٥٧٩ (بخاری رقم الکتاب/٦٤ رقم الباب/٣٠).

بەخشیبوونیانن بە پێغەمبەر. کەسوکاری منیش بەمنیان گوت: بچۆ بۆ خزمەتی پێغەمبەر، داوای ئەوەی لێ بکا، کە وەك ئەو خەڵکەی تر دارەخورمایەکانی ئێمەیش بداتەوە پێمان، منیش چووم بۆ خزمەتیو ئەویش رازی بوو دارە خورمایەکانی گێڕایەوە بۆمان. جا کە ئوم ئەیمەن بەمەی زانی رازی نەبوو، هات بۆلای منو جلەکەی خستە ملمو بەکێشی کردم بۆلای پێغەمبەرو فەرمووی پێم: (من پێغەمبەر خۆی ئەم دارە خورمایانەی پێم داوە، بەخودا نایاندەمەوە پێت!).

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەی ئوم ئەیمەن! وازی لێ بهێنە، هەقت بۆ دەکەمەوە، ئەوەندەو ئەوەندەت پێ دەدەم لەباتی ئەو دارەخورمایانەی ئەوان). ئوم ئەیمەنیش دەیفەرموو: نەخەیر بەخودا شتی وا ناکەم، هەتا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ئەوەندەی دا پێی! یا وەك ئەو فەرمووی!

## (٢٥) باب أَخْذُ الطَّعامِ مِنْ أَرْضِ العَدُوِ
## بردنی خواردەمەنی خاکی دوژمن

١١٦١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُغَفَّلٍ (رضى الله عنه) قَالَ: كُنَّا مُحَاصِرِينَ قَصْرَ خَيْبَرَ ، فَرَمَى إِنْسَانٌ بِجِرَابٍ فِيهِ شَحْمٌ ، فَنَزَوْتُ لآخُذَهُ ، فَالْتَفَتُّ فَإِذَا النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) فَاسْتَحْيَيْتُ مِنْهُ. [١١٦١]

عەبدوڵلای کوڕی موغفەل (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: گەمارۆی تەلارەکەی خەیبەرمان دابوو، مرۆڤێ هەمانەیێ پیوی فڕەدا، پەلامارم دا کە

[١١٦١] بخاری. فرج الخمس: ٣١٥٣، ٤٢١٤، ٥٥٠٨. پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١١٣٦ - ٤٥٨٠ شیحا (بخاری رقم الکتاب/ ٥٧ رقم الباب/٢٠).

بیبەم بۆ خۆم، کە ئاوڕم دایەوە روانیم وا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەماشا دەکا، ئیتر شەرمم لێی کرد.

ئەمەیش دەقی ژمارە: (١١٣٦)ی پوختەی موسلیمە، کە گێڕانەوەیەکی تری ئەم فەرموودەیە:

عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُغَفَّلٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَصَبْتُ جِرَابًا مِنْ شَحْمٍ يَوْمَ خَيْبَرَ قَالَ: فَالْتَزَمْتُهُ، فَقُلْتُ: لاَ أُعْطِي الْيَوْمَ أَحَدًا مِنْ هَذَا شَيْئًا، قَالَ: فَالْتَفَتُّ فَإِذَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) مُتَبَسِّمًا. {الحديث: ٤٥٨٠ = ٤٥٦٨ فم. بخاري. فرض الخمس: ٣١٥٣، ٤٢١٤، ٥٥٠٨. أبو داود. جهاد: ٢٧٠٢، نسائي. ضحايا: ٤٤٤٧}:

عەبدوڵلای کوڕی موغەففەل (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەڕۆژی غەزای خەیبەردا هەمانەیێ پیوم چنگ کەوت، هەڵمگرت بۆ خۆم و گوتم: ئەمە ئەمڕۆ بۆ خۆم و بەشی کەسی تری لێ نادەم، گوتی: کە ئاوڕم دایەوە سەیرمکرد وا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەوێ بوو، گوێی لەقسەکەم بوو پێدەکەنی). {تاج/٤، زنجیرە: ٧٣، ژمارە: ٤٥٤٧}.

## (٢٦) باب كِتَابِ النَّبِيِّ (ﷺ) إِلَى هِرَقْلَ يَدْعُوهُ إِلَى الإِسْلاَمِ

## نامەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە ناردی بۆ هەرقل، داوای لێ کرد کە ئیسلام ببێ

١١٦٢- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما): أَنَّ أَبَا سُفْيَانَ أَخْبَرَهُ مِنْ فِيهِ إِلَى فِيهِ قَالَ: انْطَلَقْتُ فِي الْمُدَّةِ الَّتِي كَانَتْ بَيْنِي وَبَيْنَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: فَبَيْنَا أَنَا بِالشَّأْمِ إِذْ جِيءَ بِكِتَابٍ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) إِلَى هِرَقْلَ يَعْنِي عَظِيمَ الرُّومِ، قَالَ: وَكَانَ دِحْيَةُ الْكَلْبِيُّ جَاءَ بِهِ فَدَفَعَهُ إِلَى عَظِيمِ بُصْرَى، فَدَفَعَهُ عَظِيمُ بُصْرَى إِلَى هِرَقْلَ، فَقَالَ هِرَقْلُ: هَلْ هَا هُنَا أَحَدٌ مِنْ قَوْمِ هَذَا الرَّجُلِ الَّذِي يَزْعُمُ أَنَّهُ نَبِيٌّ؟ قَالُوا: نَعَمْ، قَالَ: فَدُعِيتُ فِي نَفَرٍ مِنْ قُرَيْشٍ، فَدَخَلْنَا عَلَى هِرَقْلَ، فَأَجْلَسَنَا

بَيْنَ يَدَيْه، فَقَالَ: أَيُّكُمْ أَقْرَبُ نَسَبًا مِنْ هَذَا الرَّجُلِ الَّذِى يَزْعُمُ أَنَّهُ نَبِىٌّ؟ فَقَالَ أَبُو سُفْيَانَ: فَقُلْتُ أَنَا، فَأَجْلَسُونِى بَيْنَ يَدَيْه، وَأَجْلَسُوا أَصْحَابِى خَلْفِى ثُمَّ دَعَا بِتَرْجُمَانِه، فَقَالَ لَهُ: قُلْ لَهُمْ إِنِّى سَائِلٌ هَذَا عَنِ الرَّجُلِ الَّذِى يَزْعُمُ أَنَّهُ نَبِىٌّ، فَإِنْ كَذَبَنِى فَكَذِّبُوهُ، قَالَ: فَقَالَ أَبُو سُفْيَانَ: وَايْمُ اللَّهِ لَوْلاَ مَخَافَةَ أَنْ يُؤْثَرَ عَلَىَّ الْكَذِبُ لَكَذَبْتُ، ثُمَّ قَالَ: لِتَرْجُمَانِه: سَلْهُ كَيْفَ حَسَبُهُ فِيكُمْ؟ قَالَ: قُلْتُ: هُوَ فِينَا ذُو حَسَبٍ، قَالَ: فَهَلْ كَانَ مِنْ آبَائِه مَلِكٌ؟ قُلْتُ: لاَ، قَالَ: فَهَلْ كُنْتُمْ تَتَّهِمُونَهُ بِالْكَذِبِ قَبْلَ أَنْ يَقُولَ مَا قَالَ؟ قُلْتُ: لاَ، قَالَ: وَمَنْ يَتَّبِعُهُ، أَشْرَافُ النَّاسِ أَمْ ضُعَفَاؤُهُمْ؟ قَالَ: قُلْتُ: بَلْ ضُعَفَاؤُهُمْ، قَالَ: أَيَزِيدُونَ أَمْ يَنْقُصُونَ؟ قَالَ: قُلْتُ: لاَ، بَلْ يَزِيدُونَ، قَالَ: هَلْ يَرْتَدُّ أَحَدٌ مِنْهُمْ عَنْ دِينِه بَعْدَ أَنْ يَدْخُلَ فِيهِ سَخْطَةً لَهُ، قَالَ: قُلْتُ: لاَ، قَالَ: فَهَلْ قَاتَلْتُمُوهُ؟ قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: فَكَيْفَ كَانَ قِتَالُكُمْ إِيَّاهُ؟ قَالَ: قُلْتُ: تَكُونُ الْحَرْبُ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُ سِجَالاً: يُصِيبُ مِنَّا وَنُصِيبُ مِنْهُ، قَالَ: فَهَلْ يَغْدِرُ؟ قُلْتُ: لاَ، وَنَحْنُ مِنْهُ فِى مُدَّةٍ لاَ نَدْرِى مَا هُوَ صَانِعٌ فِيهَا، قَالَ: فَوَاللَّهِ مَا أَمْكَنَنِى مِنْ كَلِمَةٍ أُدْخِلُ فِيهَا شَيْئًا غَيْرَ هَذِه، قَالَ: فَهَلْ قَالَ هَذَا الْقَوْلَ أَحَدٌ قَبْلَهُ؟ قَالَ: قُلْتُ: لاَ. قَالَ لِتَرْجُمَانِه: قُلْ لَهُ: إِنِّى سَأَلْتُكَ عَنْ حَسَبِه، فَزَعَمْتَ أَنَّهُ فِيكُمْ ذُو حَسَبٍ، وَكَذَلِكَ الرُّسُلُ تُبْعَثُ فِى أَحْسَابِ قَوْمِهَا، وَسَأَلْتُكَ هَلْ كَانَ فِى آبَائِه مَلِكٌ، فَزَعَمْتَ: أَنْ لاَ، فَقُلْتُ: لَوْ كَانَ مِنْ آبَائِه مَلِكٌ، قُلْتُ رَجُلٌ يَطْلُبُ مُلْكَ آبَائِه، وَسَأَلْتُكَ عَنْ أَتْبَاعِه أَضُعَفَاؤُهُمْ أَمْ أَشْرَافُهُمْ؟ فَقُلْتَ: بَلْ ضُعَفَاؤُهُمْ، وَهُمْ أَتْبَاعُ الرُّسُلِ، وَسَأَلْتُكَ: هَلْ كُنْتُمْ تَتَّهِمُونَهُ بِالْكَذِبِ قَبْلَ أَنْ يَقُولَ مَا قَالَ؟ فَزَعَمْتَ أَنْ لاَ، فَقَدْ عَرَفْتُ أَنَّهُ لَمْ يَكُنْ لِيَدَعَ الْكَذِبَ عَلَى النَّاسِ، ثُمَّ يَذْهَبَ فَيَكْذِبَ عَلَى اللَّهِ، وَسَأَلْتُكَ: هَلْ يَرْتَدُّ أَحَدٌ مِنْهُمْ عَنْ دِينِه بَعْدَ أَنْ يَدْخُلَهُ سَخْطَةً لَهُ فَزَعَمْتَ أَنْ لاَ، وَكَذَلِكَ الإِيمَانُ إِذَا خَالَطَ بَشَاشَةَ الْقُلُوبِ، وَسَأَلْتُكَ هَلْ يَزِيدُونَ أَوْ يَنْقُصُونَ؟ فَزَعَمْتَ أَنَّهُمْ يَزِيدُونَ، وَكَذَلِكَ الإِيمَانُ حَتَّى يَتِمَّ، وَسَأَلْتُكَ هَلْ قَاتَلْتُمُوهُ؟ فَزَعَمْتَ أَنَّكُمْ قَدْ قَاتَلْتُمُوهُ فَتَكُونُ الْحَرْبُ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُ سِجَالاً: يَنَالُ مِنْكُمْ وَتَنَالُونَ مِنْهُ، وَكَذَلِكَ الرُّسُلُ تُبْتَلَى، ثُمَّ تَكُونُ لَهُمُ الْعَاقِبَةُ،

وَسَأَلْتُكَ: هَلْ يَغْدِرُ؟ فَزَعَمْتَ أَنَّهُ لاَ يَغْدِرُ، وَكَذَلِكَ الرُّسُلُ لاَ تَغْدِرُ، وَسَأَلْتُكَ: هَلْ قَالَ هَذَا الْقَوْلَ أَحَدٌ قَبْلَهُ؟ فَزَعَمْتَ أَنْ لاَ، فَقُلْتُ: لَوْ قَالَ هَذَا الْقَوْلَ أَحَدٌ قَبْلَهُ، قُلْتُ: رَجُلٌ ائْتَمَّ بِقَوْلٍ قِيلَ قَبْلَهُ. قَالَ: ثُمَّ قَالَ: بِمَ يَأْمُرُ كُمْ؟ قُلْتُ: يَأْمُرُنَا بِالصَّلاَةِ وَالزَّكَاةِ وَالصِّلَةِ وَالْعَفَافِ، قَالَ: إِنْ يَكُنْ مَا تَقُولُ فِيهِ حَقًّا فَإِنَّهُ نَبِيٌّ، وَقَدْ كُنْتُ أَعْلَمُ أَنَّهُ خَارِجٌ وَلَمْ أَكُنْ أَظُنُّهُ مِنْكُمْ، وَلَوْ أَنِّي أَعْلَمُ أَنِّي أَخْلُصُ إِلَيْهِ لأَحْبَبْتُ لِقَاءَهُ، وَلَوْ كُنْتُ عِنْدَهُ لَغَسَلْتُ عَنْ قَدَمَيْهِ، وَلَيَبْلُغَنَّ مُلْكُهُ مَا تَحْتَ قَدَمَيَّ، قَالَ: ثُمَّ دَعَا بِكِتَابِ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَقَرَأَهُ، فَإِذَا فِيهِ: «بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ، مِنْ مُحَمَّدٍ رَسُولِ اللَّهِ إِلَى هِرَقْلَ عَظِيمِ الرُّومِ، سَلاَمٌ عَلَى مَنِ اتَّبَعَ الْهُدَى. أَمَّا بَعْدُ فَإِنِّي أَدْعُوكَ بِدِعَايَةِ الإِسْلاَمِ أَسْلِمْ تَسْلَمْ، وَأَسْلِمْ يُؤْتِكَ اللَّهُ أَجْرَكَ مَرَّتَيْنِ، وَإِنْ تَوَلَّيْتَ فَإِنَّ عَلَيْكَ إِثْمَ الأَرِيسِيِّينَ، وَ (يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْا إِلَى كَلِمَةٍ سَوَاءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَنْ لاَ نَعْبُدَ إِلاَّ اللَّهَ، وَلاَ نُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا وَلاَ يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ فَإِنْ تَوَلَّوْا فَقُولُوا اشْهَدُوا بِأَنَّا مُسْلِمُونَ). فَلَمَّا فَرَغَ مِنْ قِرَاءَةِ الْكِتَابِ، ارْتَفَعَتِ الأَصْوَاتُ عِنْدَهُ، وَكَثُرَ اللَّغَطُ وَأَمَرَ بِنَا فَأُخْرِجْنَا، قَالَ: فَقُلْتُ لأَصْحَابِي، حِينَ خَرَجْنَا: لَقَدْ أَمِرَ أَمْرُ ابْنِ أَبِي كَبْشَةَ إِنَّهُ لَيَخَافُهُ مَلِكُ بَنِي الأَصْفَرِ! قَالَ: فَمَا زِلْتُ مُوقِنًا بِأَمْرِ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَنَّهُ سَيَظْهَرُ حَتَّى أَدْخَلَ اللَّهُ عَلَيَّ الإِسْلاَمَ. {الحديث: ٤٥٨٣ = ٤٥٧١ فم. تجريد/١، رقم: ٧ = ٧، ٥١، ٢٦٨١، ٢٨٠٤، ٢٩٤١، ٢٩٧٨، ٣١٧٤، ٤٥٥٣، ٥٩٨٠، ٦٢٦٠، ٧١٩٦، ٧٥٤١}: [١١٦٢]

عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) كەناسراوە بە ئیبنو عەبباس، دەفەرموێ: ئەبو سوفیان بەزمانی خۆی بۆی گێڕامەوە، فەرمووی: لەكاتی ڕێكەوتنەكەی حودەیبییەدا كە لەنێوانی منو پێغەمبەردا كرابوو، چووم

---

[١١٦٢] تجريد/١، ژمارە: ٧ = ٧، ٥١ بخاری. پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ١١٢٢ = ٤٥٨٣ شيحا (بخاری رقم الكتاب/٦٥ رقم الباب/٣).

بۆ شام لەوکاتەدا کەمن لەشام بووم لەکۆتایی ساڵی شەشەمی کۆچیدا، دیحیەی کەلبی نامەیەکی هێنا لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) نووسرابوو بۆ قەیصەری رۆم کە هەرقلە، دیحیە کاغەزەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەداتە دەست سەرداری بوصرا، سەرداری بوصرایش دەیداتە دەستی هیرەقل خۆی، هیرەقل لەشکری فارس دابووی بەسەریداو تەنگی پێ هەڵچنی بوو، شامو هەموو دەوروبەری شام تا جزیرەو گەلێ وڵاتی تری لێ داگیرکردبوو، خۆی پەنای بردبوو بۆ قوستەنتەنییە، لەویشدا ماوەیەکی دوورو درێژ گەمارۆی دابوو، کە خودا لەشکری فارسی لەکۆڵ کردەوە بۆ سوپاسی ئەو بەهرە گەورەیە، لە حیمصەوە بە پێیان چوو بۆ قودس.

(زوهری (رەحمەتی خودای لێ بێ) کە یەکێکە لە گێرەرەوەکانی ئەم فەرموودەیە دەگێڕێتەوە، کە لەحیمصەوە تا قودس مافووریان بۆ راخستبوو، گوڵو رەیحانەیان لەسەر دانابوو بەسەریا دەرۆیی، هەتا بەیتولمەقدیس - خانەی پیرۆز).

جاکاتێ نامەکەی پێغەمبەری پێدەگا، دەڵێ: ئادەی بگەرێن، بزانن لێرە کەسێ هەیە، کە لەهۆزی ئەم پیاوەبێ کە ئەم کاغەزەی بۆمن نووسیوەو خۆی بە پێغەمبەر دەزانێ؟ دەڵێن: بەڵێ. گوتی: جا منو چەند کەسێکی تری قورەیشیان بانگ کرد، کە دەوری (٣٠) سیی کەس دەبووین، بردینیان تاچووینە لای هیرەقل لە قودس، لەبەردەمیا دایان نیشاندین، قەیسەر لەسەر تەختی پاشایی دانیشتبوو، تاجی لەسەردا بوو، گەورە گەورەی رۆمو بەتریقو قەشەو راهیبی زۆری لەدەوردا بوو، گوتی: کامتان بەخزمایەتی بەم پیاوە نزیکترە کە گوایە خۆی بە پێغەمبەر دەزانێ؟ ئەبو سوفیان گوتی: گوتم: من، ئیتر منیان لەبەردەم قەیسەر خۆیدا دانیشانو هاورێکانمیان لە پشتمەوە دانیشاند، ئینجا زبانزان (تەرجمان)ەکەی خۆی بانگ کردو گوتی: پێیان بڵێ: ئەوا من لەم پیاوە

پرسیار دەکەمو هەواڵی ئەو پیاوەی لێ دەپرسم کە دەڵێ من پێغەمبەرم، جا ئەگەر ئەم لەم بارەیەوە بەدرۆ وەڵامی منی دایەوە، ئێوە بەدرۆی بخەنەوە. ئەبو سوفیان گوتی: بەخوا لەبەرئەوە نەبوایە کەپێم شەرم بوو درۆم لێ دەربکەوێ، ئەگینا ئەو رۆژە درۆم دەکردو قەیسەرم چەواشە دەکرد، لەبارەی هەواڵی پێغەمبەرەوە، چونکە ئەو سەردەمە منو حەزرەت هاوداوای یەکتری بووین. ئینجا هیرقەل بە زبانزانەکەی گوت: لێی بپرسە: بنەچەو رەسەنی لەناوتانا چۆنە، خانەدانە یان نا؟ گوتم: هەتا بڵێیت خانەدانو وەجاخزادەیە، گوتی: ئایا لەناو باوو باپیرانیا پادشایان تیادا هەڵکەوتووە؟ گوتم: نەخەیر، پادشایان تیانەبووە، گوتی: باشە ئەم پیاوە لەپێش ئەوەدا کە بڵێ من پێغەمبەرم درۆتان لێ دیوە؟ گوتم: نەء، گوتی: باشە ئەوانەی کە پەیڕەوی دەکەنو دەچنە سەر ئایینی ئەو، لەخانەدانەکانی خەڵکن، یا لە لازەبوونو بێ نەواکانیانن؟ گوتم: نەء، هەر لە لازەبوونو مسکێنەکانیان پەیڕەوی دەکەن، گوتی: بەرە بەرە زۆر دەبن یا کەم دەکەن؟ گوتم: نەخەیر، بەڵکوو رۆژ بەرۆژ زۆر دەبن، گوتی: باشە کەس هەیە لەوانەی کەدەچنە سەر ئەو ئایینە، لەپاشا لێی بێزار ببێو پاشگەز ببێتەوەو وەرگەڕێو وازی لێ بێنێ؟ گوتم: نەء، گوتی: ئەی پەیمان دەشکێنێو بێ پەیمانە یان نا؟ گوتم: تا ئێستا بێ پەیمانیمان لێ نەدیوە، بەڵام ئێستاکە پەیمانێکمان لەنێواندا هەیە، رێکەوتووین لەسەر شەڕ وەستانو شەڕنەکردن بۆ ماوەیەکی ناوبراو، جا نازانین دەیباتە سەر یانا.

ئەبو سوفیان گوتی: بەخودا تەنیا ئەم وشەیە نەبێ مەودای تری نەدام، کە تێچێنێکی تێ چێنمو نەنگێ لە پێغەمبەر بگرم. گوتی: ئەی باشە کەسی تر لەپێش ئەمەوە، قسەی وای کردووە لەناوتانا؟ گوتم: نەء، ئەنجا بە زوبانزانەکەی خۆیی گوت: پێی بڵێ: کەمن لێم پرسیت لەلایەنی بنەچەو رەسەنی ئەم پیاوەوە، تۆ وەڵامت دایەوە گوتت: کە هەتا بڵێیت خانەدانو

وەجاخزادەیە لەناومانا، ئەوەیش ئاداب‌و نەریتی هەموو پێغەمبەرێ بووە، هەموویان وانە، هەرکاتێ خودا ویستبێتی پێغەمبەرێ بنێرێ، کەسێکی خانەدان‌و وەجاخزادەی هەڵبژاردووەو کردوویەتی بە پێغەمبەرو ناردوویەتی بۆسەر هۆزەکەی خۆی، لێشم پرسیت کە ئایا باوو باپیرانی ئەم پیاوە شایان تیابووە یانا، تۆ گوتت نەء، منیش لەدڵی خۆما گوتم: ئەگەر لەباوك‌و باپیرانیا پادشا ببوایە دەمگوت پیاوێکە داوای موڵك‌و دەوڵەتی باوك‌و باپیرانی دەکاتەوە، پرسیاریشم لێ کردیت ئایا پەیڕەوانی ئەم پیاوە ڕەشە خەڵك‌و کۆمەڵەی مسکێنەکانن، یا ئاغاو بەگزادەکانن، ئەوەبوو تۆ گوتت لازەبوون‌و مسکێنەکان پەیڕەوی دەکەن.

لەڕاستیدا هەمیشە زۆربەی پەیڕەوانی هەموو پێغەمبەرێ ئەو جۆرە کەسانەن. لێشم پرسیت ئایا لەپێش ئەوەدا کە بڵێ من پێغەمبەرم درۆتان لێ دیبوو، تۆ گوتت نەء، منیش گوتم: چۆن دەبێ لەگەڵ خەڵکا درۆنەکا، بەلام لەپاشا بچێ درۆ لەگەڵ خودادا بکا، شتی وانابێ، من لەتۆم پرسی ئایا کەسێ هەیە لەشوێنکەوتوانی، کە بچێتە سەر دینەکەی‌و کە شارەزایی لێ پەیداکرد وازی لێ بهێنێ‌و بەدڵی نەبێ؟ تۆ گوتت نەء، لەڕاستیدا هەرکاتێ دڵ کە خۆشیی باوەڕو ئیمان بچێژێ‌و تام‌و چێژی لێ وەربگرێ، ئیتر هەتا هەتایە ئەو فێنکی باوەڕە لەو دڵە ئارامە دەرناچێ‌و دەبێ بەگوڵ‌و بوڵبوڵ؟ من لەتۆم پرسی ئایا پەیڕەوانی ئەو لەزۆرین، یا لەکەمین؟ تۆ گوتت هەتا دێ زۆرتر دەبن! هەموو ئایین‌و بیرو باوەڕێکی دروست ئاوایە، هەر لەزیادبوونە، هەتا لەئەنجاما سەردەگرێ‌و تەواو دەبێ، من لەتۆم پرسی ئایا شەڕو شۆڕو جەنگتان لەگەڵدا کردووە، تۆ گوتت جەنگ‌و شەڕمان لەگەڵدا کردووەو تا ئێستا جەنگی نێوانمان دوو بەختی بووە، جارێ ئەو دەیباتەوەو جارێ ئێمە دەیبەینەوە، لەڕاستیدا ئەمە ڕەوشتی هەموو پێغەمبەرێ بووە، لەسەرەتاوە تاقی دەکرێنەوەو دووچاری

سەراسیێو ئێش‌و ئازار دەبن، بەڵام لەئەنجامدا ئەوان سەردەکەون، کەخۆر هەڵهات بەرە بەرە سوپای زۆرو ستەم‌و ناهەقی ئاو دەکرێتە ژێری‌و گوڵوڵەی دەکەوێتە لێژی، من لەتۆم پرسی ئایا پەیمان دەشکێنێ یانا؟ تۆ گوتت: خاوەن پەیمانەو پەیمان ناشکێنێ، ئەمەیش شێوەو رەفتاری گشت پێغەمبەرانە، پێغەمبەران (علیهم الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ) قەت پەیمان ناشکێنن‌و بەڵێن دەبەنە سەر، من لەتۆم پرسی ئایا کەسێکی تر لەپێش ئەمدا ئەم داوایەی ئەوی کردووە لەناوتاناو گووتویەتی من پێغەمبەرم، تۆ گوتت نەء، منیش لەدڵی خۆما گوتم ئەگەر کەسێکی تر لەپێش ئەمدا ئەم قسەیەی بگوتبایە دەمگوت: ئەم پیاوەیش لاسایی ئەو قسە کۆنەیە دەکاتەوە!!

ئەبو سوفیان گوتی: ئەنجا هیرقەل گوتی: فەرمانتان بەچی پێدەکاو دەڵێ چی بکەن‌و چی مەکەن؟ گوتم: پێمان دەڵێ: نوێژ بکەن، زەکات بدەن، خزم دۆست بن‌و بۆ خزم باش بن‌و مافی خزمایەتی بەجێ بهێنن، دەست پاك بن، داوێنپاك بن، دەم‌و دڵپاك بن، بەندەیی ساغ بەس بۆ خودای گەورە بکەن، هیچ شتێ نەکەین بە هاوەڵ‌و هاوبەش بۆ خودا، واز لەوبت‌و خودا درۆینانە بهێنن کە باوك‌و باپیرانمان لەکۆنا دەیانپەرستن.

هیرقەل گوتی: ئەمەی تۆ دەیڵێیت لەبارەی ئەو پیاوەوە ئەگەر راست‌و دروست بێ‌و ئاوابێ وەك دەیڵێیت، ئەوە پێغەمبەرە، من دەمزانی کە ئەم پێغەمبەرە بەزوویی پەیدا دەبێ‌و دێ، بەڵام نەمدەزانی کە لەئێوەیە ئەی کۆمەڵی عەرەب!

وەمن بەش بەحاڵی خۆم ئەگەر بزانم قوتار دەبم‌و دەگەمە لای، حەزدەکەم بچم بۆ خزمەتی، ئەگەر لەلای دەبووم قاچەکانیم دەشۆرد، بەخودا، قەڵەمڕەوو دەستەڵاتی ئەو دەگاتە ئەم شوێن پایانەی منیش، وەخاکی بەیتولمەقدیس‌و هەموو وڵاتی شام‌و رۆم داگیردەکا، ئەبو سوفیان گوتی: لەپاشا داوای نامەکەی

پێغەمبـــەری کـــردو خوێندیـــەوە، ناوەڕۆکەکـــەی ئەمـــەبوو: بـــەناوی خـــودای بەخشندەی میهرەبان، لە موحەممەدەوە کە بەندەو پێغەمبەری خودایە، بۆلای هیرقەلی مەزنی رۆم، سڵاوو درووود لە پەیڕەوانی رێگەی راستی، سڵاو لەڕاستی خـوازان! لـەپاش ئەمـە مـن داوات لێ دەکـەم کـە ئیـسلام ببیـت، ئیـسلام ببـە لەهەردوو جیهاندا، سەلامەت دەبیت، ئیـسلام ببـە خـودا لـەباتی جارێ دووجـار پاداشت دەداتێ، چونکە هەموو خاوەن نامەیەکی نۆ موسوڵمان دوو پاداشی باشی بۆهەیە، سەرەڕای ئەوەیش کـەدەبی بـە مامۆسـتای نیـشاندەری خێـر بـۆ هـەموو دەسـتو پێوەندەکـەی خـۆتو دەبـی بەسـەر مەشـق بۆیـان، ئەگـەر سەرپێـچیش دەکـەیو گەردنکەچـی بـۆ ئیـسلام ناکـەی ئـەوە بزانـە کـە هـەم ئۆبـاڵو گونـاهی خۆتو هەم ئۆباڵو گوناهی مسکێنو وەرزێرەکانیش لـە ئەسـتۆی تۆیـە، چـونکە ئەوان ژێردەستی تۆنو چاویان لـەدەمی تۆیـە، هـەروەها داوات لێ دەکـەم بـەهۆی ئەم ئایەتەیشەوە کە دەفەرموێ: {يَا أَهْلَ الْكِتَـابِ تَعَـالَوْاْ إِلَـى كَلَمَـةٍ سَـوَاء بَيْنَنَـا وَبَيْنَكُمْ أَلاَّ نَعْبُدَ إِلاَّ اللّهَ وَلاَ نُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا وَلاَ يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضاً أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللّهِ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَقُولُواْ اشْهَدُواْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ – بقرة/٢/٦٤}.

واتە: ئەی ئـەهلی کیتـاب! ئـەی خـاوەن نامـەکان! ئـەی کۆمەڵـەیێ کـە خـودا پەیامو نامەی خۆی بەهۆی پێغەمبەرێ لە پێغەمبەرەکانی خۆیەوە بۆ ناردوون! وەرن بۆسەر وەرگرتنی تاقە فەرمایشتێ، کەبۆ ئێمەو بـۆ ئێـوە یەکسانەو چون یەکە، بەبێ جیاوازیی، کە برێتییە لەنیاز پاکیو ساخی لەگـەڵ خـودادا، وە ئـەم مەبەستەیش بەم چەن یاسایە دێتەجێ:

**یەکەم:** عیبادەتو پەرستنو خودا پەرستی بۆ کەسی تر نەکەین بۆ خـودای گەورە نەبێ.

**دووەم:** هاوەڵو کوڕو کچو باوكو دایكو کەسوکار بۆ خودا بڕیار نەدەین.

**سێیەم:** لەناو خۆمانا یەکتری نەکەین بەخوداو وەك خودا بیکەین بەخاوەن فەرمانو شت حەڵاڵو حەرام بکا بۆمان، بەبێ وەرگرتنی فەرمان لەخوداوە.

جائەگەر ئەو خاوەن نامانە پشتیان لەم پەندو ئامۆژو فەرمایشتە راستو دروستە کرد، وە سەرپێچییان لەیەکتایی پەرستی کرد، وە نەهاتن بەدەم ئەم جۆرە پێشنیارە جوانەوە، ئەوا تۆ ئەی پێغەمبەر! هەم خۆتو هەم پەیرەوەکانت، پێیان بڵێن: حەقو راستی دیارو ئاشکرایەو بەڵگە نەویستە ئێمە قەبووڵمانە، ئێوە قەبووڵی ناکەن، کەواتە: ئێوە ئاگاداربنو بەشایەت بن کە ئێمە گوێڕایەڵی فەرمانی خوداینو موسوڵمانو ملکەچی فەرمانی ئەوین.).

ئەبو سوفیان فەرمووی: کە هیرقەل لە خوێندنەوەی نامەکە بۆوە، لەدەوری بوو بە زڵە زڵو قاوو قیژو قرەقرِ، ئیتر دەستووردرا ئێمە کراینە دەرەوە، کەچووینە دەرەوە بە هاوڕیکانی خۆمم گوت: بەڕاستی کاری کوڕەکەی ئەبو کەبشە تەواو گەورە بووە، خۆ ئەوەتا پادشای رۆمیش لێی دەترسێ!

(ئەبو کەبشە باوکی شیریی پێغەمبەرە، مێردی حەلیمەی سەعدی یەیە کە دایەنی پێغەمبەر بوو).

ئەبو سوفیان فەرمووی: ئیتر هەر لەوکاتەوە، من دەمزانی کە کاروباری پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) سەردەکەوێو گومانم لەوەدا نەبوو، تا ئەو رۆژەی خودا کردمی بە موسوڵمانو چوومە سەر ئایینی ئیسلام!

**روونکردنەوە:**

ئەبو سوفیان ناوی صەخری کوڕی حەربە، لەپێش ئیسلام بوونا، دوژمنێکی سەرسەختی ئیسلامو موسوڵمانان بوو، دایکی ئەبو سوفیان ناوی صەفییەی کچی حەربی ئەلهیلالییەیە، لە باوکەوە پووری مەیمونەی هاوسەری پێغەمبەرە

(دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لەسەر هەموو هاوەڵو هاوسەرو پەیڕەوانی بێ). ئەبو سوفیان بەتەمەن دەساڵ لە پێغەمبەر گەورەتر بوو، ساڵی ئازادکردن (فەتح)ی مەککە ئیسلام بوو، لەغەزای حونەینا لەگەڵ موسوڵمانانا بوو، هەروا لەغەزای تائیفا، لەرۆژی ئوحودو لەرۆژی ئەحزابا، سەرۆکی بتپەرستەکان بوو، بەرلەوە ئەبو سوفیان ئیسلام ببێ، پێغەمبەر ئوم حەبیبەی کچی ئەبو سوفیانی مارەکرد بۆ خۆی، ئەم زاتانە فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە: ئیبنو عەبباسو قەیسی کوڕی حازیمو موعاوییەی کوڕی. لەڕۆژی غەزای طائیفا چاوێکی پێکرا، چوو بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزیکرد، دەبینی چاوم لەڕێگەی خوادا ئاوا پێکراوە، فەرمووی: (ئەگەر ئارەزوو دەکەیت لەخودا دەپاڕێمەوە چاوت چاك دەکاتەوە، حەزیش دەکەیت لەباتی چاوت خودا بەهەشتت پێ دەدا). فەرمووی: بەهەشت هەڵ دەبژێرم.

لەئاخرو ئۆخری تەمەنیدا کوێربوو بوو، خولامەکەی دەستی رادەکێشاو چاو ساغی دەکرد، لەسەردەمی جێنشینی پێشەوا عوثمان دا، بە دەردی خودا، لەتەمەنی هەشتاو هەشت ساڵیدا، لەشاری مەدینەی نازدار، لەساڵی (٣٠) سیی کۆچیدا، کۆچی دوایی کرد.

دەڵێن: وەك پێی دەگوترێ ئەبو سوفیان، پێشی دەگوترێ: ئەبو حەنظەلە، بەناوی کوڕێکی تریەوە کەناوی حەنظەلە بووە، گوایە لەغەزای بەدرا، بەکافری، بەدەستی ئیمامی عەلی کوژراوە. بڕوانە ئەم جێگەیانە:

١- پوختەی صەحیحی موسلیم، ژیاننامەی ئوممولـوئمنین، مەیموونەی هاوسەری پێغەمبەر، ژمارە: (١١٧).

٢- ئوم حەبیبەی هاوسەری پێغەمبەر، کچی ئەبو سوفیان ژمارە: (٣٧٠) لە پوختەی موسلیم.

**٣- موعاوییەی کوڕی ئەبو سوفیان، ژمارە: (١٩٧) لە پوختەی موسلیم.**

**٤- تەجرید بوخاری بەکوردی، بەرگی یەکەم، ژمارە: (٧) ئەبو سوفیان.**

**٥- تەجرید بوخاری بەکوردی، بەرگی یەکەم، ژمارە: (٦٣) معاویە.**

**٦- تەجرید بوخاری بەکوردی، بەرگی یەکەم، ژمارە: (١٥٤) مەیموونە.**

**٧- تەجرید بوخاری بەکوردی، بەرگی دووەم، ژمارە: (٦١٤) ئوم حەبیبە.**

**٨- تاج بەرگی سێیەم تەرجەمە کوردییەکەی زنجیرە: (٣٣)، ژمارە: (٣٤٢٢) موعاوییە.**

**٩- تاج بەرگی/٣، زنجیرە: ٣٤، ژمارە: ٣٤٢٤. أبو سوفیان.**

**١٠- تاج/٢، زنجیرە: ٣٣، ژمارە: ٢٠٩٤ ئوم حەبیبە کەشووی کرد بە پێغەمبەر.**

## (٢٨) باب في غَزْوَةِ حُنَيْنٍ
## باسی غەزای حونەین

١١٦٣- عَنْ أَبِى إِسْحَاقَ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى الْبَرَاءِ فَقَالَ: أَكُنْتُمْ وَلَّيْتُمْ يَوْمَ حُنَيْنٍ يَا أَبَا عُمَارَةَ؟ فَقَالَ: أَشْهَدُ عَلَى نَبِيِّ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أنه مَا وَلَّى وَلَكِنَّهُ انْطَلَقَ أَخِفَّاءُ مِنَ النَّاسِ، وَحُسَّرٌ إِلَى هَذَا الْحَيِّ مِنْ هَوَازِنَ وَهُمْ قَوْمٌ رُمَاةٌ فَرَمَوْهُمْ بِرِشْقٍ مِنْ نَبْلٍ كَأَنَّهَا رِجْلٌ مِنْ جَرَادٍ، فَانْكَشَفُوا، فَأَقْبَلَ الْقَوْمُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَبُو سُفْيَانَ بْنُ الْحَارِثِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) يَقُودُ بِهِ بَغْلَتَهُ، فَنَزَلَ وَدَعَا وَاسْتَنْصَرَ وَهُوَ يَقُولُ: « أَنَا النَّبِيُّ لاَ كَذِبْ أَنَا ابْنُ عَبْدِ الْمُطَّلِبْ. اللَّهُمَّ نَزِّلْ نَصْرَكَ». قَالَ الْبَرَاءُ: كُنَّا وَاللَّهِ إِذَا احْمَرَّ الْبَأْسُ نَتَّقِي بِهِ، وَإِنَّ الشُّجَاعَ مِنَّا لَلَّذِي يُحَاذِي بِهِ، يَعْنِي النَّبِيَّ

(صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). {الحديث: ٤٥٩٢ = ٤٥٨٠ فم. تجريد/٣/ ٣١٠، رقم: ١١٨٣ = ٢٨٦٤، ٢٨٧٤، ٢٩٣٠، ٣٠٤٢، ٤٣١٥، ٤٣١٦، ٤٣١٧}:[١١٦٣]

ئەبو ئیسحاق (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ هات بۆلای بەرائی کوڕی عازیب، عەرزی کرد: ئەی باوکی عومارە! ئایا راستە ئێوەی هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە رۆژی غەزای حونەیندا هەڵهاتوونو دەوری پێغەمبەرتان چۆڵ کردووە؟ فەرمووی: ئەگەر ئێمە هەموو هەڵهاتبین، دیارە پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) لەگەڵمان بووە، نەبەخودا شتی وا نەبووە، نە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەڵهاتو نەئێمە لەدەوری هەڵهاتین، بەڵام مەسەلەکە خۆی ئاوا بوو: (جەهێڵو هەرزەکارە بزێوو بێ ئەزموونەکان، لە یارانو هاوڕێیانی پێغەمبەر (دروودی خودا لە پێغەمبەرو رەزای خودا لە یارانی بێ) بەدەستی رووتی بێ چەك، بەبێ زریەو قەڵغان هاتبوون بۆ ئەو شەڕە سەختە، جا لەناکاو لووتیان تەقی بەلووتی کۆمەڵەی لەشکری هەوازینو بەنی نەسرەوە، ئەوانیش هۆزێکی تیر ئەندازی چاك بوون، دەست راست بوون، مەگەر بەدەگمەن تیریان بەهەڵە بچوایەو نیشانی نەپێکایە، دەنا تیریان لەزەوی نەدەدا، ئیتر لەپڕ بوو بەشەڕ، ئێمە لەسەرەتاوە هەر کەپێیان گەیشتین شاڵاومان بۆ بردنو هێرشمان بردە سەریان، ئیتر ئەوان شکان، بەڵام پێش ئەوەی بەتەواوی پەکیان بکەوێ، موسوڵمانەکان ئاڵان بەتاڵان کۆکردنەوەوە، ئیتر ئەوانیش هەلیان بۆ رەخساو لەپڕ تیر بارانێکی وایان کردین، مەگەر چۆنها دەنا تیریان بەزایە نەدەچوو، بەتیر دەسڕێژی وایان لێ دەکردین،

---

[١١٦٣] تجرید/٣، ژمارە: ١١٨٣ = ٢٨٦٤ بخاری. پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١١٩٠ = ٤٥٩٢ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٥٦ رقم الباب/٩٧).

دەتگوت پۆلە کوللە زەردەیە، کە لەئاسمانەوە ببارێ، ئیتر ئەمەبوو بەهۆی ئەوە کە لەپاش ئەو سەرکەوتنە لەشکرەکەی پێغەمبەر شکست بهێنن.

بەڵام پێغەمبەرو بەشێ لەیارانی خۆیان راگرتو نەبەزینو حەزرەت فەرمانی کرد بە عەبباسی مامەی بانگی هاوەڵان بکاتەوە بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەوجا هاوەڵانو موسوڵمانان بەرەو پێغەمبەر گەڕانەوەو لەدەوری کۆبوونەوە لەوکاتەدا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەسواری هێسترە ماچە سپییەکەی خۆی بوو، هەر باکیشی لەبێباوەڕەکان نەبوو، وە ئەبو سوفیانی کوڕی حاریثی کوڕی عەبدولموطەلیب، کە هەق ئامۆزای خۆی بوو، هێسترەکەیی بۆ رادەکێشا، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دابەزیو نزای کردو پاڕایەوەو داوای پیرۆزیو سەرکەوتنی لەخودا کردو فەرمووی:

**أَنَـــا النَّبِـــيُّ لاَ كَـــذِبْ   أَنَـــا ابْـــنُ عَبْـــدِ الْمُطَّلِـــبْ**

واتە:

**مـن پێغەمبـەرم نـەوەک درۆزن   عەبدولموتتەلیب بابە گەورەی من!!**

وە دەشی فەرموو: (اللَّهُـمَّ نَـزِّلْ نَـصْرَكَ: ئەی خودایە! سەرکەوتنو پیرۆزی خۆت ببەخشە بە خۆشەویستانی خۆت).

بەراء (رەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: سوێندم بەخودا، ئێمەی یارانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کاتێ شەڕ گەرم دەبوو، خۆمان دەدایە پاڵ پێغەمبەرو لەپەنا ئەودا خۆمان دەپاراست، پیاوی ئازامان ئەو کەسەمان بوو، کە لەشانی ئەوەوە بوایە!!).

**ڕوونكردنەوە:**

واتای (كُنَّا وَاللَّهِ إِذَا احْمَرَّ الْبَأْسُ نَتَّقِي بِهِ) أي جَعَلْنَاهُ بَيْنَنَا وَ بَيْنَ العَدُوِّ وَقُمْنَا خَلْفَهُ نَحْتَمِي بِهِ}. واتە: لەشەڕا پێغەمبەرمان دەخستە نێوانی خۆمانو نێوانی دوژمنەوەو ئێمە لەپشتیەوە دەوەستاینو لەپەنا ئەودا خۆمان دەپاراست. {بڕوانە: رفع الخفا شرح الشفا لابن الحاج الكردى مجلد/٢، ص٦٥}.

١١٦٤- قَالَ رَجُلٌ لِلْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهما) أَفَرَرْتُمْ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَوْمَ حُنَيْنٍ؟ قَالَ: لَكِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَمْ يَفِرَّ إِنَّ هَوَازِنَ كَانُوا قَوْمًا رُمَاةً وَإِنَّا لَمَّا لَقِينَاهُمْ حَمَلْنَا عَلَيْهِمْ فَانْهَزَمُوا فَأَقْبَلَ الْمُسْلِمُونَ عَلَى الْغَنَائِمِ وَاسْتَقْبَلُونَا بِالسِّهَامِ فَأَمَّا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَلَمْ يَفِرَّ فَلَقَدْ رَأَيْتُهُ وَإِنَّهُ لَعَلَى بَغْلَتِهِ الْبَيْضَاءِ وَإِنَّ أَبَا سُفْيَانَ آخِذٌ بِلِجَامِهَا وَالنَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ:

أَنَا النَّبِيُّ لاَ كَذِبْ    أَنَا ابْنُ عَبْدِ الْمُطَّلِبْ

(الحديث ٢٨٦٤، أطرافُهُ في: ٢٨٧٤، ٢٩٣٠، ٣٠٤٢، ٤٣١٥، ٤٣١٦، ٤٣١٧):[1164]

پیاوێ عەرزی بەرائی كوڕی عازیبی كرد: ئەی ئەبو عومارە! ئایا ڕاستە ئێوەی هاوەڵانی پێغەمبەر لەڕۆژی غەزای حونەین دا هەڵهاتوونو دەوری پێغەمبەرتان چۆڵ كردووە؟ فەرمووی: ئەگەر ئێمە هەموو هەڵهاتبین دیارە پێغەمبەریش(دروودی خوای لەسەر بێ) لەگەڵمان بووە، نەبە خودا شتیوا نەبووە، نەپێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) هەڵهاتو نەئێمە لەدەوری هەڵهاتین، بەلام مەسەلەكە خۆی ئاوا بوو:

---

[1164] لە ژمارە: (١١٦٣)دا تەخریج كرا (بخارى رقم الكتاب/٦٤ رقم الباب/٥٤).

(جەهێڵو هەرزەکارە بێ ئەزموونەکان لەیاران و هاوڕێیانی پێغەمبەر – درودی خودا لەپێغەمبەرو ڕەزای خودا لەیاران بێ – بەدەستی رووتی بێ چەك هاتبوون بۆ ئەو شەڕە سەختە جا لەناکاو لووتیان تەقی بەلووتی کۆمەڵەی لەشکری هەوازین و بەنی نەسرەوە، ئەوانیش هۆزێکی تیرئەندازی چاك بوون، دەست راست بوون، مەگەر بەدەگمەن تیریان بەهەڵە بچوایەو نیشانی نەپێکایە، دەنا تیریان لەزەوی نەدەدا، ئیتر لەپڕ بوو بەشەڕ، ئێمە لەسەرەتاوە هەرکەپێیان گەیشتین شاڵاومان بۆ بردن و هێرشمان بردنە سەریان ئیتر ئەوان شکان، بەڵام پێش ئەوەی بەتەواوی پەکیان بکەوێ، موسوڵمانەکان ئالان بەتالان کۆکردنەوەوە، ئیتر ئەوانیش هەلیان بۆ رەخساو لەپڕ تیربارانێکی وایان کردین، مەگەر چۆنها دەنا تیریان بەزایە نەدەچوو، ئیتر ئەمە بوو بەهۆی ئەوە کە لەپاش ئەو سەرکەوتنە سەرەتاییە، لەشکرەکەی پێغەمبەر– درودی خودا لەپێغەمبەرو ڕەزای خودا لە لەشکرەکەی بێ – شکست بهێنن.

بەڵام پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) و زۆرێ لەیارانی خۆیان راگرت و نەبەزین و هەڵنەهاتن، حەزرەت(درودی خوای لەسەر بێ) فەرمانی کرد بەعەبباسی مامەی، بەو دەنگە گەورەی خۆی بانگی یاران بکاتەوە بۆلای پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) ئەوجا یاران و موسوڵمانان گەڕانەوە بۆلای پێغەمبەرو لەدەوری کۆبوونەوە، وەهەڵمەتی شێرانەیان بردە سەر ناموسوڵمانەکان،و لەگەڵیاندا پێك هەڵپڕژان، لەودەمەدا بەچاوی خۆم خودی پێغەمبەرم دی، بەسواریی هێسرە ماچە سپیەکەی خۆی بوو، هەر باکی لەکافران نەبوو، ئەوەندە پشتی بەسەرکەوتنی خوایی ئەستوور بوو، وەئەبوسوفیانی کوڕی حاریثی عەبولوطەلیب کە ئامۆزای خۆی بوو، وەبرای شیریشی بوو جڵەوی وڵاخەکەی بۆ رادەکێشا، جا حەزرەت(درودی خوای لەسەر

بێ) دابەزیو پاڕایەوە داوای پیرۆزیو سەرکەوتنی لەخودا کرد،و مشتێ چەوی هەڵگرتو وەشاندی بەڕووی ناموسوڵمانەکانداو فەرمووی: (شاهتِ الوُجوهُ: روویان بشێوێ) ئەوجا خۆش خۆش دەیفەرموو:

أَنَـــا النَّبِـــيُّ لاَ كَـــذِبْ   أَنَـــا ابْـــنُ عَبْـــدِ الْمُطَّلِـــبْ

واتە:

مـن پێغەمبـەرم نـەوەک درۆزن   عەبدولموتتەلیب بابە گەورەی من!!

فەرمووی: ئینجا پێغەمبەر هاوڕێکانی خۆی ریز کردەوەو سەرلەنوێ هەڵمەتی شێرانەیان بردەوەو دوژمنیان تێكو پێك شکاند) (تاج/١٢٥/٨ز-٤٩ +ل-٢٣٨ز-٩٦. غەزای حونەین).

## (٢٩) باب غَزْوَةِ الطَّائِفِ
## باسی غەزای تائیف

١١٦٥- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: لَمَّا حَاصَرَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الطائِفَ فَلَمْ يَنَلْ مِنْهُمْ شَيْئًا قَالَ: (انَّا قَافِلُونَ انْ شَاء اللَّهُ) فَثقُلَ عَلَيْهِمْ وَقَالُوا: نَذهَبُ وَلا نَفْتَحُهُ وَقَالَ مَرَّةً: (نَقْفُلُ) فَقَالَ: (اغْدُوا عَلَى الْقِتَالِ فَغَدَوْا فَاصَابَهُمْ جِرَاحٌ) فَقَالَ: (انَّا قَافِلُونَ غَدًا انْ شَاء اللَّهُ) فَاعْجَبَهُمْ فَضحِكَ النَّبِيُّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). (الحديث: ٤٣٢٥، طرفاه في: ٦٠٨٦، ٧٤٨٠): [١١٦٥]

عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لەپاش غەزای حونەین و ئەوتاس پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) دەورەی خەڵکی قەلای تاییفی دابەلام زەبەری پێ نەبردن، فەرمووی: (خودا حەزکا

---

[١١٦٥] تجرید/٤، ژمارە: ١٥٩٢ = ٤٣٢٥ بخاری. مسلم: ١٧٧٨ - پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١١٩٢ - ٤٥٩٦ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٦٤ رقم الباب/٥٦).

دەگەڕێینەوە) یارانیش (ڕەزای خودایان لێ بێ) لەبەریان گران بوو، فەرموویان: (چۆن بگەڕێینەوە، خۆ ئێمە هێشتا قەلاکەمان ئازاد نەکردووە!؟). فەرمووی (درووودی خودای لێ بێ) (دەسبەینێ سەر لەبەیانی بڕۆن بۆ شەڕو هەڵکوتنە سەریان) جا بۆ سبەینێ کەچوون، بۆ شەڕو هەرا، لەسەر لێواری شوورەی قەلاکەوە بە دوورەتیر هەندێ لە موسوڵمانان زامار بوون وەهیچیشیان پێ نەکردن، پێغەمبەر (درووودی خودای لێ بێ) دیسان پێی فەرموونەوە: (خوا حەزکا سبەێنێ دەگەڕێینەوە!) فەرمووی: کەچی ئەمجارە یاران گەڕانەوەیان بەدڵ بوو، ڕەخنەیان نەبوو، پێغەمبەر (درووودی خودای لێ بێ) کەبینی وا ڕایان گۆڕی و ئەوانیش لەپاش ئەزموون و تاقیکردنەوە هاتنە سەرقسەکەی ئەو، لەم حاڵەیان پێکەنی). (تاج/٨ ل/٢٤٢ ز/٩٨ - غەزای تائیف).

## (٣٢) بابُ إِزَالَةِ الأَصْنَامِ مِنْ حَوْلِ الكَعْبَةِ
## لابردنی بتەکان لە دەوری کابەی پیرۆز

١١٦٦- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مسعود (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: دَخَلَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) مَكَّةَ، وَحَوْلَ الْكَعْبَةِ ثَلاَثُمِائَةٍ وَسِتُّونَ نُصُبًا فَجَعَلَ يَطْعُنُهَا بِعُودٍ كَانَ بِيَدِهِ، وَيَقُولُ: « (جَاءَ الْحَقُّ وَزَهَقَ الْبَاطِلُ إِنَّ الْبَاطِلَ كَانَ زَهُوقًا) (جَاءَ الْحَقُّ وَمَا يُبْدِئُ الْبَاطِلُ وَمَا يُعِيدُ)، زَادَ ابْنُ (أَبِي) عُمَرَ يَوْمَ الْفَتْحِ. {الحديث: ٤٦٠١ = ٤٥٨٩ فم. تجريد/٤/٣٣٠، رقم: ١٥٨٧ = ٤٢٨٧، ٤٧٢٠} :[١١٦٦]

عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەڕۆژی ئازادکردنی شاری مەککەدا، کەناودارە بە فەتحی مەککە، کاتێ پێغەمبەر

[١١٦٦] تجرید/٤، ژمارە: ١٥٨٧ = ٤٢٨٧ بخاری. پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١١٨٣ = ٤٦٠١ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٤٦ رقم الباب/٣٢).

(دروودی خودای لەسەر بێ) هاتە ناو شاری مەککەوە، لەوکاتەدا بەگرد (دەور)ی ماڵی بەیتا سێ سەدو شەست بتی لێ بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) داردەستێکی بەدەستەوە بوو، دەیژەند بەچاوی یەك بەیەکی پەیکەری بتەکانداو بتەکان بە فەرمانی خودا، گەرچی چەسپ کرابوون بەزەوییەکەوە، دەکەوتن بە پشتداو قنگەو تلوور دەکەوتن‌و پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: {جَاءَ الْحَقُّ وَزَهَقَ الْبَاطِلُ إِنَّ الْبَاطِلَ كَانَ زَهُوقًا – الإسراء – ١٧/١٨}. واتە:

هەق‌و راستی‌و دروستی واهات، ئایینی پیرۆزی ئیسلام سەرکەوت، جێگەی بەشتی هیچ‌و پووچ‌و ئایینی پڕوپووچی بتپەرستی لەق کردو راپێچ‌و رامالّی کرد، لەڕاستیدا سەردەمی پڕوپووچی بەسەرچوو، شتی وا باوی نەما، رۆژ رۆژی ئیسلامە کەڕێکی هۆشی ساخە، رۆژی کوفرو بتپەرستی‌و شتی وا تەواو).

وە هەروەها خۆشەویست (دروودی خودای گەورەی لەسەر بێ) دوا بەدوای ئەمە، ئەم ئایەتەی تریشی دەخوێندەوە: {جَاءَ الْحَقُّ وَمَا يُبْدِئُ الْبَاطِلُ وَمَا يُعِيدُ -سَبَاء- ٣٤/٤٩}. واتە:

ئەی موحەممەد! بفەرموو: وا رۆژی حەق هەڵهات‌و نوورو تیشکی ئایینی پیرۆزی ئیسلام بلاّو بۆوە بەهەموو جیهاندا، ئیتر ئایینی بتپەرستی‌و شتی‌وا هیچ‌و پووچ، باوی نەماو، سەردەم‌و کاتی بەسەر چووەو بنەبڕ بووە، وە بڕای بڕای جارێکی تر رێز پەیدا ناکاتەوەو سەر هەڵ ناداتەوە!). {تاج/٤/٣٢٤، زنجیرە: ١٨، ژمارە: ٣٩٦٨ – سوورەتی ئیسراء – ج/٤}.

**ڕوونكردنەوە:**

**١- ئیمامی موسلیم (ڕەحمەتی خودای گەورەی لێ بێ) لەسێ مامۆستای خۆیەوە، ئەم فەرموودەیە دەگێڕێتەوە، كە بەڕێز ئەم سێ بەڕێزەن: ١- ئەبوبەكری كوڕی ئەبو شەیبە. ٢- عەمری ئەلناقید. ٣- ئیبنو ئەبی عومەر، وەك خۆی لەسەرەتای ڕشتەی ئەم فەرموودەیەوە، دەفەرموێ: (حَدَّثَنَا أَبُوبَكْرِ بْـنُ أَبِى شَيْبَةَ، وَ عَمْرٌ النَّاقِدُ، وَ ابْنُ أَبِـي عُمَـرَ... تادوایی) جا ئیمامی موسلیم بۆمان ڕوون دەكاتەوە، كە كەمێ جیاوازی لەنێوانی گێڕاوەكانی ئەم سێ مامۆستایەیدا هەیە، مامۆستای یەكەمو دووەمی، لەسەرەتای دەقی فەرموودەكەوە ئاوایان فەرمووە:**

**(دَخَلَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) مَكَّةَ وَحَوْلَ الْكَعْبَـةِ ثَلاَثُمِائَـةٍ وَسِـتُّونَ نُـصُبًا فَجَعَلَ يَطْعُنُهَا بِعُودٍ كَانَ بِيَـدِهِ وَيَقُـولُ « (جَـاءَ الْحَـقُّ وَزَهَـقَ الْبَاطِـلُ إِنَّ الْبَاطِـلَ كَـانَ زَهُوقًا) ، (جَاءَ الْحَقُّ وَمَا يُبْدِئُ الْبَاطِلُ وَمَا يُعِيدُ).**

**بەڵام مامۆستای سێیەمی، كەناوی موحەممەدی كوڕی یەحیای كوڕی ئەبو عومەری ئەلعەدەنییە، وشەیەكی لەم سەرەتایە پتر كردووەو ئاوای گێڕاوەتەوە:**

**{دَخَلَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) مَكَّةَ، يَـوْمَ الفَـتْحِ، وَحَـوْلَ الْكَعْبَـةِ ثَلاَثُمِائَـةٍ وَسِتُّونَ نُصُبًا فَجَعَلَ يَطْعُنُهَا بِعُودٍ كَـانَ بِيَـدِهِ وَيَقُـولُ « (جَـاءَ الْحَـقُّ وَزَهَـقَ الْبَاطِـلُ إِنَّ الْبَاطِلَ كَانَ زَهُوقًا) (جَاءَ الْحَقُّ وَمَا يُبْدِئُ الْبَاطِلُ وَمَا يُعِيدُ) زَادَ ابْـنُ أَبِـى عُمَـرَ يَـوْمَ الْفَتْحِ}.**

**ئەمەی عەرزكرا واتای ئەو ڕستەیەیە كە ئیمامی موسلیم لە كۆتایی لەفزی ئەم فەرموودەیەوە، بەدەق دەفەرموێ: {زَادَ إِبْنُ أَبِي عُمَرَ: يَوْمَ الْفَتْحِ}.**

**ئەم جۆرە وردەكارییەو واتای وشەكانو مەبەست لەڕستەكان، لەسەرەتاوە، لەناو زانا بەڕێزەكانا، زانراونو خەڵكەكە بەئاسانی لەم هێماو ئامازانە حاڵی**

دەبوون‌و ڕۆژانە مامۆستاکانیان بۆیان ڕوون دەکردنەوە، بەڵام ئێستا، بەتایبەت لەوڵاتی ئێمە، شتەکە وەك مەتەڵ‌و یانسیبی لێ هاتووە، هەرکەسێ شتێ دەڵێ، گرتی ئەوا باشە، نەیگرت ئەوا تۆ موجتەهیدی، نابێ تەماعی زۆرت هەبێ، بادوو ئەجر نەبێ یەك ئەجربێ!!

بەڕاستی زۆربەی موتەرجیمەکانی کوردستانی خۆمان موجتەهیدن، نەوەك وەرگێڕ، چونکە دەقەکە بەپێی اجتهادو بۆچوونی چەوتی خۆیان وەردەگێڕن، جا ئەگەر ڕاست دەرچوو ئەوە تەقلەی مامە حەمەیە، خۆ ئەگەر هەڵە دەرچوو ئەوە جێگەی خۆیەتی، چونکە لەچەوت هەر چەوت دەبێ.

٢- لەڕاستیدا، ئەوەی کە لەبەرچاوە، ئەم فەرمایشتە ڕاست‌و دروستە، ئەوەتانێ ڕۆژ بەڕۆژ، ڕۆشنبیری نوێ‌و زانستی ڕاست‌و دروست، پەرە دەستێنن‌و ئایینی ڕاست سەردەکەوێ‌و دڵی مەردووم ڕۆشن دەکاتەوەو جێ بەبیرو باوەڕی ڕزیوی گەندەڵی کۆن لەق دەکا، ئەگەر بێتو فیرعەونانی سەردەم، کە ئەم پارتە ئیلحادی‌و عیلمانییانە باشترین نموونەن بۆ فیرعەون‌و نەمروودو قاروونەکانی سەردەمەکان، ئەگەر بێتو ئەم فیرعەون‌و دەستەو بەستەکەیان، مەودای نووکی خامەی ڕۆشنبیران بدەن‌و بەڕەشەبای سەبوونی ئەتۆم‌و بەچڕە دووکەڵی شەڕو شۆڕ، بڵێسەی چراکانیان نەکوژێننەوە، لەماوەیەکی زۆرکەما، بەرە بەرە سەر ڕووی زەوی دەبێ بە باخی بەهەشت. ئیتر پەنا بەخودا.

## (٣٤) باب صُلْحِ الحُدَيبِيَّةِ في الحُدَيبِةِ
## بەستنی پەیمانی ڕێککەوتنی حودەیبییە لە گوندی حودەیبییە

١١٦٧- عَنِ الْبَرَاءِ بن عازب (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: لَمَّا أُحْصِرَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) عِنْدَ الْبَيْتِ صَالَحَهُ أَهْلُ مَكَّةَ عَلَى أَنْ يَدْخُلَهَا فَيُقِيمَ بِهَا ثَلاَثًا، وَلاَ يَدْخُلَهَا إِلاَّ بِجُلُبَّانِ السِّلاَحِ: السَّيْفِ وَقِرَابِهِ، وَلاَ يَخْرُجَ بِأَحَدٍ مَعَهُ مِنْ أَهْلِهَا، وَلاَ يَمْنَعَ

أَحَدًا يَمْكُثُ بِهَا مِمَّنْ كَانَ مَعَهُ، قَالَ لِعَلِيٍّ: « اكْتُبِ الشَّرْطَ بَيْنَنَا بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ، هَذَا مَا قَاضَى عَلَيْهِ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ »، فَقَالَ لَهُ الْمُشْرِكُونَ: لَوْ نَعْلَمُ أَنَّكَ رَسُولُ اللَّهِ تَابَعْنَاكَ، وَلَكِنِ اكْتُبْ مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، فَأَمَرَ عَلِيًّا أَنْ يَمْحَاهَا، فَقَالَ عَلِيٌّ: لاَ وَاللَّهِ لاَ أَمْحَاهَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « أَرِنِي مَكَانَهَا »، فَأَرَاهُ مَكَانَهَا، فَمَحَاهَا وَكَتَبَ ابْنُ عَبْدِ اللَّهِ، فَأَقَامَ بِهَا ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ، فَلَمَّا أَنْ كَانَ يَوْمُ الثَّالِثِ، قَالُوا لِعَلِيٍّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): هَذَا آخِرُ يَوْمٍ مِنْ شَرْطِ صَاحِبِكَ فَأْمُرْهُ فَلْيَخْرُجْ، فَأَخْبَرَهُ بِذَلِكَ، فَقَالَ: «نَعَمْ»، فَخَرَجَ. {الحديث: ٤٦٠٧ = ٤٥٩٥ فـم. تجريد/٣/٢٣٣، رقم: ١١٢٨ = ٢٦٩٩ فتح الباري} : [١١٦٧]

بەراء (ڕەزای خودای مەزنی لێ بێ) دەفەرموێ: ساڵی ڕێکەوتنی حودەیبییە، کە ناموسوڵمانەکان ڕێگەی پێغەمبەرو هاوەڵانیان نەدا، کەبچن بۆ کردنی عەمرە، لەئەنجامدا خەڵکی مەککە لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕێکەوتن لەسەر ئەمە: کە پێغەمبەرو یارانی بچنە ناو مەککەوەو سێ ڕۆژ لەوێ بمێننەوە، بەو مەرجە کە چەكو شمشێرەکانیان بە کێلانەوە لەناو هەگبەدا بێ، وە کەسیش لە خەڵکی مەککە لەگەڵ خۆیاندا نەبەن بۆ مەدینە، وە ئەگەر کەسێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ویستی لەمەککە بمێنێتەوە، ڕێگەی بدەنو ڕێگەی مانەوەی لێ نەگرن.

حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) بە عەلی فەرمووو: (مەرجەکە لەنێوانمانا لەسەر ئەم شێوەیە بنووسە: بەناوی یەزدانی بەخشندەی میهرەبان، ئەمە ئەو ڕێکەوتن نامەیەیە کە موحەممەدی پێغەمبەری خودا ڕێکەوتووە لەسەری... ناموسوڵمانەکان گوتیان: ئێمە ئەگەر بزانین کەتۆ پێغەمبەری

---

[١١٦٧] تجرید/٣، ژمارە: ١١٢٨ = ٢٦٩٩ بخاری. پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١١٧٧ = ٤٦٠٧ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٥٣ رقم الباب/٦).

خودایـت، ئیـسلام دەبـین‌و پـەیڕەویت دەکـەین، کەواتـە شـتی وا نابـێ، بـەڵام بنووسە: (موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلا).

حـەزرەت (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: بەعـەلی کـە وشـەی (پێغەمبـەری خـودا) بکوژێنێتـەوەو لەشـوێنی ئـەوە وشـەی (کـوڕی عەبـدوڵلا) بنووسێ. بەڵام عەلی (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: نـا، بـەخودا نایـسڕمەوە، فەرمووی (درودی خـودای لەسـەر بـێ): جێگەکـەیم پـێ نیـشان بـدە، مـن خـۆم دەیکوژێنمـەوە، ئـەویش پێـی نیـشاندا، جـا پێغەمبـەر خـۆی (درودی خـودای لەسەر بێ) وشەی (پێغەمبەری خودا)ی کوژاندەوەو فەرمانی بـە عـەلی فـەرموو، نووسـی: ئەمـە ئـەو ڕێکەوتننامەیـە کـە موحەممـەدی کـوڕی عەبـدوڵلا لەگـەڵ قوڕەیـشدا لەسـەری ڕێکـەوتوون، جـا لەسـاڵی ئاییـنـدەدا بـەپێی بەنـدەکانی ئـەم ڕێکەوتننامەیە، پێغەمبەرو هاوڕێیـانی هاتنـەوەو عـەمرەیان بـەجێ هێنـاو سێ ڕۆژ لەناو مەککەدا مانەوە، لەسەری ڕۆژی سێیەمدا خەڵکەکە بە عەلییان گوت: بەپێی مەرجەکە، هاوڕێکەت ئەمڕۆ دوا ڕۆژیەتی، دەی پێی بڵێ بـابڕوا، عـەلیش پێـی گـوت، ئـەویش فـەرمووی: بـەڵێ باشـە! ئینجـا پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسەر بێ) لەشار دەرچوو. {تاج/٤، زنجیرە: ٧٦، ژمارە: ٤٥٥٤}.

ئەمە دەقی ژمارە: (١١٧٧)ی پوختەی موسلیم بـوو، بـۆ ئـەم فەرموودەیـە، کە باسی چۆنێتی پەیمانی حودەیبییە دەکا، ئەمەیش ژمارە: (١١٢٨)ی تەجریـدی بوخارییە، کە لایەنێکی تری ئەم باس‌و بابەتە روون دەکاتەوە:

عَنْ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ اعْتَمَرَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي ذِي الْقَعْدَةِ فَأَبَى أَهْلُ مَكَّةَ أَنْ يَدَعُوهُ يَدْخُلُ مَكَّةَ حَتَّى قَاضَاهُمْ عَلَى أَنْ يُقِيمَ بِهَا ثَلاثَةَ أَيَّامٍ فَلَمَّا كَتَبُوا الْكِتَابَ كَتَبُوا هَذَا مَا قَاضَى عَلَيْهِ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللّٰهِ فَقَالُوا: لا نُقِرُّ بِهَا فَلَوْ نَعْلَمُ أَنَّكَ رَسُولُ اللّٰهِ مَا مَنَعْنَاكَ لَكِنْ أَنْتَ مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللّٰهِ، قَالَ: (أَنَا

رَسُولُ اللّٰهِ وَأَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللّٰهِ) ثُمَّ قَالَ: (لِعَلِيٍّ امْحُ رَسُولُ اللّٰهِ) قَالَ: لا وَاللّٰهِ لا أَمْحُوكَ أَبَدًا فَأَخَذَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْكِتَابَ فَكَتَبَ: هَذَا مَا قَاضَى عَلَيْهِ مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللّٰهِ لا يَدْخُلُ مَكَّةَ سِلاحٌ إِلاّ فِي الْقِرَابِ وَأَنْ لا يَخْرُجَ مِنْ أَهْلِهَا بِأَحَدٍ إِنْ أَرَادَ أَنْ يَتَّبِعَهُ وَأَنْ لا يَمْنَعَ أَحَدًا مِنْ أَصْحَابِهِ أَرَادَ أَنْ يُقِيمَ بِهَا).

فَلَمَّا دَخَلَهَا وَمَضَى الأَجَلُ أَتَوْا عَلِيًّا فَقَالُوا قُلْ لِصَاحِبِكَ اخْرُجْ عَنَّا فَقَدْ مَضَى الأَجَلُ فَخَرَجَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَتَبِعَتْهُمْ ابْنَةُ حَمْزَةَ يَا عَمِّ يَا عَمِّ فَتَنَاوَلَهَا عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) فَأَخَذَ بِيَدِهَا وَقَالَ لِفَاطِمَةَ عَلَيْهَا السَّلام دُونَكِ ابْنَةَ عَمِّكِ احْمِلِيهَا فَاخْتَصَمَ فِيهَا عَلِيٌّ وَزَيْدٌ وَجَعْفَرٌ فَقَالَ عَلِيٌّ: أَنَا أَحَقُّ بِهَا وَهِيَ ابْنَةُ عَمِّي وَقَالَ جَعْفَرٌ: ابْنَةُ عَمِّي وَخَالَتُهَا تَحْتِي وَقَالَ زَيْدٌ: ابْنَةُ أَخِي فَقَضَى بِهَا النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) : لِخَالَتِهَا وَقَالَ: (الْخَالَةُ بِمَنْزِلَةِ الأُمِّ) وَقَالَ لِعَلِيٍّ: (أَنْتَ مِنِّي وَأَنَا مِنْكَ) وَقَالَ لِجَعْفَرٍ: (أَشْبَهْتَ خَلْقِي وَخُلُقِي) وَقَالَ لِزَيْدٍ: (أَنْتَ أَخُونَا وَمَوْلانَا) (الحديث ٢٦٩٩):

بەرائی کوڕی عازیب (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ساڵی ڕێکەوتنی حودەیبییە، کە ناموسوڵمانەکان ڕێگەی پێغەمبەرو یارانیان نەدا کە بچن بۆ عەمرە، ئەوە بوو پێغەمبەرو هاوڕێکانی لەمانگی ناوجەژنانا، لە مەدینەوە کەوتنەڕێ بۆ مەککە بۆ عەمرە کردن. بەلاّم لەئەنجاما خەڵکی مەککە لەگەڵ پێغەمبەردا(دروودی خوای لەسەر بێ) لەحودەیبییە، کەناوی بیرێکە لەمەککەوە قۆناغێ دوورە، ڕێکەوتن لەسەر ئەوە کە پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) و هاوڕێکانی ئەمساڵ کە ساڵی شەشی کۆچییە عەمرە نەکەن‌و بگەڕێنەوە بۆ مەدینەو ساڵی ئایندە بێنەوە بۆ عەمرە بۆ مەککە، لەوێ سێ ڕۆژ بمێننەوە.

جا كاتێ پەیمانەكەیان نووسی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) بە ئیمامی عەلی(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموو: مەرجەكە لە نێوانمانا لەسەر ئەم شێوەیە بنووسە: بەناوی یەزدانی بەخشندەی میهرەبان، ئەمە ئەو ڕێكەوتن نامەیە كە موحەممەدی پێغەمبەری خودا ڕێك كەوتووە لەسەری.... ناموسوڵمانەكان گوتیان: شتیوا ناسەلمێنین چونكە ئەگەر ئێمە بزانین كە تۆ پێغەمبەری خودا یت ئیسلام دەبین‌و پەیڕەویت دەكەین، نەوەكوو قەدەغەمان دەكردی لەعەمرە. كەواتە شتیوا نابێ، بەڵام بنووسە: موحەممەدی كوڕی عەبدوڵڵا تۆ لەلای ئێمە موحەممەدی كوڕی عەبدوڵڵای وبەس. پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (من پێغەمبەری خوداشم‌و موحەممەدی كوڕی عەبدوڵڵاشم).

ئەوجا پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) بەعەلی فەرموو: (وشەی پێغەمبەری خودا بكوژێنەوەو لەشوێنی ئەوە وشەی (كوڕی عەبدوڵڵا بنووسە) عەلی فەرمووی: نا، بەخودا هەرگیز شتیوا ناكەم‌و تۆ ناسڕمەوە، جا پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) بەعەلی فەرموو: جێگەكەیم پێنیشان بدە من خۆم دەیكوژێنمەوە، ئەویش پێی نیشان دا، جا پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) نامەكەی وەرگرت‌و (پێغەمبەری خوای) كوژاندەوەو، ئەوجا فەرمانی بەعەلی فەرموو: نووسی: (ئەمە ئەوەیە كە موحەممەدی كوڕی عەبدوڵڵا لەگەڵ قورەیشدا لەسەری ڕێكەوتوون: لەساڵی ئاییندەدا كە موحەممەدو هاوەڵەكانی دێنەوە بۆ عەمرە، دەبێ كە دێنە ناو مەككەوە چەكەكانیان لەكێلانا بێ لەناو هەبگەدا، وەهەر كەسێكیش لەخەڵكی مەككە ویستی شوێنی بكەوێ نابێ بیبات، وەهەر كەسێكیش لەشوێنكەوتوانی موحەممەد ویستیان لە مەككە بمێننەوە نابێ ڕێگەی ئەوەی لێ بگرێ).

جا لەساڵی ئایندەدا بەپێی بەندەکانی ئەم ڕێکەوتنە لە مانگی ناوجەژنانا پێغەمبەرو هاوەڵانی هاتنەوە عەمرەیان بەجێ هێناو سێ ڕۆژ لەناو مەککەدا مانەوە. لەسەری ڕۆژی سێیەم دا خەڵکەکە بەعەلییان گوت: بەپێی مەرجەکە هاوڕێکەت ئەمڕۆ دوارۆژیەتی، دەی پێی بڵێ بابڕوا، عەلیش پێی گوت، ئەویش فەرمووی: (بەڵێ باشە!) ئەوجا پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) خۆی‌و سوپاکەی لەشار دەرچوون‌و بەرەو مەدینە گەڕانەوە.

کچەکەی حەمزەی مامی پێغەمبەریش کە لەغەزای ئوحوددا شەهید بوو، بەمامە مامە دوایانکەوت، عەلیش پەلاماری داو دەستی گرت‌و دایە دەست فاطیمەی هاوسەری، پێی گوت: کچی مامەت بگرەو هەڵی بگرە.

جا عەلی‌و زەیدو جەعفەر لەسەر ئەم کچە کەهی کامیانە، بوو بەکێشەو بەرەیان، عەلی دەیگوت: کچی مامەو بەمن لەپێشترە، جەعفەریش دەیگوت: کچی مامەی منیشەو پووریشی ژنمە، خوشکی دایکی خێزانی منە، زەیدیش فەرمووی: هی منە چونکە باوکی بەپێی بەیاننامەی برایەتی بەستن، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) کردوویەتی بەبرای من، کەواتە ئەم کچۆڵەیە برازای منەو هی خۆمە.

پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێ) بڕیاری دا کە بەر پوورەکەی دەکەوێ‌و شەرع دەیدا بەو، وەفەرمووی: (پور لەجێگەی دایکە) وەبەعەلی فەرموو: (تۆ لەمنی‌و من لەتۆم) بەجەعفەریشی فەرموو: (تۆ هەم لەشێوەداو هەم لەرەفتاری بەرزدا لەخۆم دەکەیت). وەبەزەیدیشی فەرموو: (تۆ هەم برامانی‌و هەم دۆستی ئازادکراومانی!). (تاج/٨/١٨١ز-٧٦. باسی ڕێکەوتن+تاج/٥/١٠٥ز-١٨).

١١٦٨- حديث سهل بن حُنَيْفٍ عَنْ أَبِي وَائِلٍ قَالَ كُنَّا بِصِفِّينَ فَقَامَ سَهْلُ بْنُ حُنَيْفٍ فَقَالَ أَيُّهَا النَّاسُ اتَّهِمُوا أَنْفُسَكُمْ فَإِنَّا كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)

يَوْمَ الْحُدَيْبِيَةِ ، وَلَوْ نَرَى قِتَالاً لَقَاتَلْنَا ، فَجَاءَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ ، أَلَسْنَا عَلَى الْحَقِّ وَهُمْ عَلَى الْبَاطِلِ فقَالَ « بَلَى » . فَقَالَ أَلَيْسَ قَتْلاَنَا فِي الْجَنَّةِ وَقَتْلاَهُمْ فِي النَّارِ قَالَ « بَلَى » . قَالَ فَعَلَى مَا نُعْطِي الدَّنِيَّةَ فِي دِينِنَا أَنَرْجِعُ وَلَمَّا يَحْكُمِ اللَّهُ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ فَقَالَ « ابْنَ الْخَطَّابِ ، إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ ، وَلَنْ يُضَيِّعَنِي اللَّهُ أَبَدًا » . فَانْطَلَقَ عُمَرُ إِلَى أَبِي بَكْرٍ فَقَالَ لَهُ مِثْلَ مَا قَالَ لِلنَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ إِنَّهُ رَسُولُ اللَّهِ ، وَلَنْ يُضَيِّعَهُ اللَّهُ أَبَدًا . فَنَزَلَتْ سُورَةُ الْفَتْحِ ، فَقَرَأَهَا رَسُولُ اللَّهِ – صلى الله عليه وسلم – عَلَى عُمَرَ إِلَى آخِرِهَا . فَقَالَ عُمَرُ يَا رَسُولَ اللَّهِ ، أَوَفَتْحٌ هُوَ قَالَ «نَعَمْ»: (١١٦٨)

ئەبو وائیل (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: لە صەففین بووین، پیاوێ گوتی: ئایا تەماشای ئەمانە ناکەی، بانگ دەکرێن بۆ حوکم کردن بە پێی نامەی خودا کە قورئانی پیرۆزە کە دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا – الحجرات/٩﴾ کەچی ڕازی نابن؟ عەلی (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: بەڵێ، من بەم پێشنیارەی دەستەی موعاوییە ڕازیم، کە قورئان لە بەینا بێ، چونکە ئەگەر نیاز پاك بێو مەبەست ئەوەبێ کە خوێنی موسوڵمان بە دەستی برای موسوڵمانی نەڕێژرێو کردارو ڕەفتار بە نامەی خودا بکرێ من بۆ ئەمە لە پێشەوەمو سەرم پێوە نیە، وەلێ هەندێ کەس ڕەخنەیان لە سوڵحو ڕێککەوتن دەگرت، لەبەر ئەوە سەهلی کوڕی ئەحنەف گوتی: زۆر لە ڕای خۆتان ڕازی مەبنو گومان لە خۆتان بکەن، چونکە مەرج نیە کە هەرچی ئێوە بە باشی بزانن ئەوە باش بێ، لە ڕۆژی ڕێکەوتنی حودەیبییەدا ئێمەیش زۆر ڕازی نەبووین بەو ڕێکەوتنەی کە لە نێوانی پێغەمبەرو هاوبەشپەیداکەرەکاندا ڕووی

---

(١١٦٨) بخاری: ٣١٨١، ٣٢٨٢، ٤١٨٩، ٤٨٤٤، ٧٣٠٨ مسلم: ٤٦٠٩ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٥٨ رقم الباب/١٨).

دا، وه حەزمان لە شەڕ بوو بە ڕادەیەك عومەر چوو گوتی: باشە ئەدی ئێمە لەسەر هەق نین‌و ئەوان لەسەر باطیل‌و بۆش‌و هیچ‌و پووچ نین؟ ئایا کوژراوەکانی ئێمە لە بەهەشتدا نین‌و کوژراوەکانی ئەوان لە دۆزەخدا نین؟ حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: با، چۆنی دەڵێی وایە، عومەر گوتی: کەوایە ئیتر بۆچی سووکایەتی بەسەر ئایینی خۆمان بێنین‌و بەرلەوە کە خودا لە نێوانی ئێمەو ئەواندا بڕوانێ‌و حوکم بکا، بگەڕێینەوەو ئەم هەموو مەرجە ناقۆڵایانەی ئەوان کە نیشانەی دەستەوسانی ئێمەیە قەبووڵ بکەین؟ حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەی کوڕی خەططاب! من پێغەمبەرو ڕەوانەکراوی خودام‌و پشت ئەستوورم لە یارمەتی خودای خۆم‌و هەرگیز خودا فەرامۆشم ناکا! جا عومەر بە تووڕەیی گەڕایەوەو ئۆقرەی نەگرت: هەتا چوو بۆلای ئەبو بەکرو پێی گوت: باشە ئێمە لەسەر هەق نین‌و ئەوان لەسەر باطیل؟ ئەویش گوتی ئەی کوڕی خەططاب! ئەو خۆی پێغەمبەری خودایە، خودا خۆی ڕەوانەی کردووە، کەواتە قەت خودا بە گورگان خواردووی نادا! ئیتر سورەتی فەتح هاتە خوارەوە، لە ڕێگەی مەدینە، کاتی گەڕانەوەی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) لە حودەیبییە.

جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سوورەتەکەی بەتەواوی لەسەرەتاوە هەتا کۆتایی خوێندەوە بۆ عومەر، عومەر فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! فەتحەکە ئەم صوڵحی حودەیبیە بوو؟ فەرمووی: (بەڵێ).

چونکە ئەم ڕێکەوتنی حودەیبییە بوو بەکلیل بۆ کۆمەڵێ بەهرەی گەورە، بۆ گەلی ئیسلام، وەك: هاموشۆی نێوانی موسوڵمانان‌و ناموسوڵمانان لەنێوانی خۆیان‌و تێگەیشتنی ناموسوڵمانەکان لە کرۆکی بنەماکانی ئیسلام‌و

سەرەنجام بوو بەهۆی فەتحی مەککەو پەخشی نووری ئیسلام بەجیهانا، ئیتر عومەر شادمان بوو، وە رەخنەی نەماو تەسلیم بوو.

## (٣٧) باب غَزْوَةِ أُحُد
## باسی غەزای ئوحود

١١٦٩- عَنْ أَبِي حَازِمٍ: أَنَّهُ سَمِعَ سَهْلَ بْنَ سَعْدٍ الساعدي يُسْأَلُ عَنْ جُرْحِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَوْمَ أُحُدٍ؟ فَقَالَ: جُرِحَ وَجْهُ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَكُسِرَتْ رَبَاعِيَتُهُ وَهُشِمَتِ الْبَيْضَةُ عَلَى رَأْسِهِ، فَكَانَتْ فَاطِمَةُ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) بِنْتُ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تَغْسِلُ الدَّمَ، وَكَانَ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) يَسْكُبُ عَلَيْهَا بِالْمِجَنِّ، فَلَمَّا رَأَتْ فَاطِمَةُ أَنَّ الْمَاءَ لاَ يَزِيدُ الدَّمَ إِلاَّ كَثْرَةً، أَخَذَتْ قِطْعَةَ حَصِيرٍ فَأَحْرَقَتْهُ حَتَّى صَارَ رَمَادًا، ثُمَّ أَلْصَقَتْهُ بِالْجُرْحِ فَاسْتَمْسَكَ الدَّمُ).
{الحديث: ٤٦١٨ – ٤٦٠٦ فم. بخاري. جهاد: ٢٩١١، ٤٠٧٥، ٥٧٢٢}:[١١٦٩]

ئەبو حازم (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: لەسەهلی کوڕی سەعدی ئەل‌ساعیدیم بیست، کاتێ پرسیاری برینداربوونی پێغەمبەریان لەرۆژی ئوحوددا لێ کرد، فەرمووی: لەرۆژی هەراکەی ئوحوددا، دەموچاوی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) زامدار بوو، خوێن بەدەموچاویا هاتە خوارەوەو ددانە چوارینە (روباعییە)کەی لەریزی لای راستی، لە خوارەوە شکا، خوودەکەی لەسەریدا شکا، کاتێ شەڕ تەواو بوو، لەشکری بێباوەڕەکان بەسەرکەوتوویی گەڕانەوە بۆ مەککە، ژنان لەمەدینە دەرچوون، چوون بۆ کۆمەکی هاوەڵان، فاتیمەی کچی پێغەمبەریش لەگەڵیانا بۆ ئەم مەبەستە دەرچوو، جا عەلی لە قەڵغانێکا ئاوی دەهێناو دەیکرد بەدەستی فاتیمەداو فاتیمەیش خوێنەکەی

---

[١١٦٩] تجرید/٤، ژمارە: ١٥٤٥ = ٤٠٦٨. پوختەی موسلیم: ١١٦١ = ٤٦٢١ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٥٦ رقم الباب/٨٥).

دەشۆری، کاتێ فاتیمە (ڕەزای خودای لێ بێ) کەڕوانی وا خوێنەکە بە ئاوەکە زیاتر دەبێ، چوو پڕ زۆڵێ حەسیری هێناو سووتاندیو کردی بەسووتوو، ئەوجا سووتووەکەی دانا لەسەر زامەکە، ئیتر خوێنەکە وەستایەوە). {تاج/٣، زنجیرە: ٧٠، ژمارە: ٣٠١٣ چاپی چوارەم} + {تاج/٤، زنجیرە:٤، ژمارە: ٣٧٧٧}.

ئەمەیش دەقێکی تری ئەم ڕووداوەیە:

عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) كُسِرَتْ رَبَاعِيَتُهُ يَوْمَ أُحُدٍ، وَشُجَّ فِي رَأْسِهِ فَجَعَلَ يَسْلُتُ الدَّمَ عَنْهُ، وَيَقُولُ: « كَيْفَ يُفْلِحُ قَوْمٌ شَجُّوا نَبِيَّهُمْ، وَكَسَرُوا رَبَاعِيَتَهُ، وَهُوَ يَدْعُوهُمْ إِلَى اللَّهِ»؟ فَأَنْزَلَ اللَّهُ تعالى: (لَيْسَ لَكَ مِنَ الأَمْرِ شَيْءٌ). {الحديث: ٤٦٢١ = ٤٦٠٩ فم. تجريد/٤، رقم: ١٥٤٥ = ٤٠٦٨، ٤٠٦٩}:

ئەنەس (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەڕۆژی هەرای ئوحوددا، ددانی چوارینەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەلای ڕاستی ڕیزی خوارەوەی شکا، وە سەری شکاو ناوچەوانی شکاو خوێن بەڕوویدا هاتە خوارەوە، خۆش خۆش خوێنەکەی لەخۆی دەسڕیو دەیفەرموو: (هۆزێ کە نارەوایی ئاوا لە پێغەمبەری خۆیان بکەن، سەری بشکێننو ڕووی زامار بکەنو ددانە چوارینەکەی بشکێنن، چۆن چۆنی سەر دەکەونو ڕزگاری دابین دەکەن، ئەمەیش لەکاتێکدا بێ کەئەو بانگیان بکا بەدڵسۆزانە بۆلای ڕەحمەتو بەهرەو نیعمەتی باوەڕ بەخوداو ڕێگەی ڕاستیان پێ نیشان بدا، کەچی ئەوان بە پێچەوانەوە ئەو بانگ بکەن بۆناو ئاگری دۆزەخ).

جا بەم بۆنەیەوە خودا ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: {لَيْسَ لَكَ مِنَ الأَمْرِ شَيْءٌ – ئالی عیمران – ٣/١٢٨}. {تاج/٤، زنجیرە: ٤، ژمارە: ٣٧٧٧، ٣٧٧٦}.

بڕوانە نەخشەی ددان لەژمارە: ١٥٤٥ تەجرید، لاپەڕە: ٢٨٣، بەرگی: ٤}.

١١٧٠- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مسعود (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): قَالَ كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَحْكِي نَبِيًّا مِنَ الأَنْبِيَاءِ ضَرَبَهُ قَوْمُهُ، وَهُوَ يَمْسَحُ الدَّمَ عَنْ وَجْهِهِ وَيَقُولُ: « رَبِّ اغْفِرْ لِقَوْمِي فَإِنَّهُمْ لاَ يَعْلَمُونَ ». {الحديث: ٤٦٢٢ = ٤٦١٠ فم. تجريد/٤/٧٤، رقم: ١٣٨٧ = ٣٤٧٧، ٦٩٢٩} : [(١١٧٠)]

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: (دەڵێی هەر لەبەر چاومە، کەچۆن چۆنی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لاسکایی پێغەمبەرێ لە پێغەمبەرەکانی دەکردەوە، کە گەلەکەی لێیان دابوو، وە سەریان شکاندبوو، وە دەموچاویان خوێناوی کردبوو، خوێنەکە بەدەمو چاویا هاتبووە خوارەوە، حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) بە پەنجەی خۆی روخساری خۆی دەسڕی‌و تەمسیلی ئەو پێغەمبەرەی دەکرد، کە لەپاش دەسدرێژی هۆزەکەی، خوێنەکەی لەرووی خۆی دەسڕی، کەچی لەباتی ئەوەی نزای خراپیان لێ بکا، بۆیان دەپاڕایەوەو دەیفەرموو: (رَبِّ اغْفِرْ لِقَوْمِي فَإِنَّهُمْ لاَ يَعْلَمُونَ: خودایە! ئەی پەروەردگارم! لێیان مەگرە، لەبەر نەزانی خۆیانە کە ئەمە حاڵی منە بەدەستیانەوە!). {ریاض/١، لاپەڕە: ٥٦، زنجیرە: ٣، ژمارە: ٣٦ + تاج/٤، زنجیرە: ٨٧، ژمارە: ٤٥٩٦ ج/٤}.

---

[(١١٧٠)] تجرید/٤، ژمارە: ١٥٢٦ = ٣٩٦٢ بخاری. پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١١٦٩ = ٤٦٣٨ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٦٠ رقم الباب/٥٤).

## (٣٨) باب إشْتِداد غَضَبِ اللهِ عَلَى مَنْ قَتَلَهُ رَسُولُ اللهِ (ﷺ)
## خودای گەورە رِقی زۆر سەختی لەو کەسەیە کە بە دەستی پێغەمبەری خودا بکوژرێ

١١٧١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): « اشْتَدَّ غَضَبُ اللَّهِ عَلَى قَوْمٍ فَعَلُوا هَذَا بِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) »، وَهُوَ حِينَئِذٍ يُشِيرُ إِلَى رَبَاعِيَتِهِ، وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): « اشْتَدَّ غَضَبُ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ عَلَى رَجُلٍ يَقْتُلُهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فِي سَبِيلِ اللَّهِ». {الحديث: ٤٦٢٤ = ٤٦١٢ فم. تجريد/٤/٢٨٨، رقم: ١٥٤٨ = ٤٠٧٣ فتح الباري} : [١١٧١]

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرموویـ: پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویـ: (رقو تووڕەیی خودا تەواو تاوی سەندووە دژی ئەو کۆمەڵەی کە ئاوایان لە پێغەمبەری خودا کردووە) پێغەمبەر ئاماژەی کرد بۆ ددانە چوارینەکەی خۆی کە لەغەزای ئوحوددا هاوبەش پەیداکەرەکان شکاندبوویان. هەروا فەرموویشیـ: (گەورەی رقو قینو قاری خودا، جۆش دەسەنێت لەئاستی ئەو کەسە کە پێغەمبەری خودا بەدەستی خۆی بیکوژێ، لەپێناوی سەرکەوتنی ئایینی خودادا).

### روونکردنەوە:

١- لەغەزای ئوحوددا کۆمەڵێ پێکان لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کرا، چەند زامێکی گەورە گەورە، لەچەند جێگەیەکی لەشی کرا، دەموچاوی زامار بوو، ددانە چوارینەی لەلای راستی ریزی خوارەوەی شکا، سەری شکا، لێوی

---

[١١٧١] تجرید/٤، ژمارە: ١٥٨٤ = ٤٠٧٣ بخاری. پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١١٦٤ = ٤٦٢٤ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٦٤ رقم الباب/٢٤).

خوارەوەی زامار بوو، تەوێڵی زامار بوو، دوو ئەڵقەی کڵاو زریەکەی هەڵچەقێنە کوڵمی، کڵاو زریەکەی لەسەریا شکا، توێخی کڵاوەی ئەژنۆی لێبوّوە، دەوری حەفتا شمشێر بەر رووی کەوت خودا لەهەموویان پاراستی، ئوبەییەی کوڕی خەلەف هەڵی کوتایە سەری‌و هێرشی بۆیبردو سوێندی خوارد، کە ناگەڕێتەوە هەتا موحەممەد نەکوژێ. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەو ناتوانێ من بکوژێ بەڵکوو من ئەو دەکوژم).

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەدرزی زریەکەیەوە رمێکی تێ سرەواند، بەرشوێنی کاریگەری کەوت‌و وەك گا کەوتە سەر زەوی‌و دەستی کرد بە بۆرە بۆڕ، کۆمەڵەکەی هەڵیان گرت‌و بردیان، رۆژێکی نەبرد کەتۆپی‌و گیانی بە دۆزەخ شادبوو. {بڕوانە: تەجرید/٤، لاپەڕە: ١٨٨. روونکردنەوە. فتح الباری رقم: ٤٠٧٣}.

### (٣٩) بابُ مَا لَقِىَ النَّبِىُّ ﴿ﷺ﴾ مِنْ أذَى المُشرِكينَ وَالمُنَافِقِينَ
### باسی ئەو گشتە ئێش‌و ئازارەی کە بێباوەڕان‌و ناپاکەکان گەیاندیان بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)

١١٧٢- عنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ مَسْعُودٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) (أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُصَلِّي عِنْدَ الْبَيْتِ وَأَبُو جَهْلٍ وَأَصْحَابٌ لَهُ جُلُوسٌ إِذ قَالَ بَعْضهُمْ لِبَعْض أَيُّكُمْ يَجِيءُ بِسَلَى جَزُورِ بَنِي فُلَان فَيَضعُهُ عَلَى ظَهْرِ مُحَمَّدٍ إِذا سَجَدَ؟ فَانْبَعَث أَشْقَى الْقَوْمِ فَجَاءَ بِهِ فَنَظرَ حَتَّى سَجَدَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَضعَهُ عَلَى ظَهْرِهِ بَيْنَ كَتِفَيْهِ وَأَنَا أَنْظرُ لَا أُغْنِي شَيْئًا لَوْ كَانَ لِي مَنَعَةٌ قَالَ فَجَعَلُوا يَضحَكُونَ وَيُحِيلُ بَعْضهُمْ عَلَى بَعْض وَرَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَاجِدٌ لَا يَرْفَعُ رَأْسَهُ حَتَّى جَاءَتْهُ فَاطمَةُ فَطرَحَتْ عَنْ ظهْرِهِ فَرَفَعَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَأْسَهُ ثمَّ قَالَ: اللَّهُمَّ عَلَيْكَ بِقُرَيْشٍ ثلَاث مَرَّاتٍ فَشَقَّ عَلَيْهِمْ إِذ دَعَا عَلَيْهِمْ قَالَ وَكَانُوا يَرَوْنَ أَنَّ الدَّعْوَةَ فِي ذلِكَ الْبَلَدِ

مُسْتَجَابَةٌ ثمَّ سَمَّى اللَّهُمَّ عَلَيْكَ بِأَبِي جَهْلٍ وَعَلَيْكَ بِعُتْبَةَ بْنِ رَبِيعَةَ وَشَيْبَةَ بْنِ رَبِيعَةَ وَالْوَلِيدِ بْنِ عُتْبَةَ وَأُمَيَّةَ بْنِ خَلَفٍ وَعُقْبَةَ بْنِ أَبِي مُعَيْط وَعَدَّ السَّابِعَ فَلَمْ يَحْفِظْهُ الراوي قَالَ فَوَالَّذي نَفْسِي بِيَدِهِ لَقَدْ رَأَيْتُ الَّذينَ عَدَّ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَرْعَى فِي الْقَلِيبِ قَلِيبِ بَدْرٍ). (الحديث ٢٤٠- أطرافه في: ٥٢٠، ٢٩٣٤، ٣١٨٥، ٣٨٥٤، ٣٦٦٠):[١١٧٢]

عەبدوللای کوڕی مەسعود (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جارێ لەلای کەعبەدا نوێژی دەکرد، ئەبوجەهلو چەند هاوڕێ یەکی لەوێ دانیشتبوون، ڕۆژی پێشووتریش وشترێ سەربڕابوو، ئەبوجەهل گوتی: ئادەی یەکێکتان بچن پرزانگی ئەو وشترە سەربڕاوە بێنن، کەدوێنێ ئەو ماڵە سەریان بڕیوە پرزانگەکەیان لەلاماڵان فڕێ داوە، جاکاتێ هێنای کەموحەممەد سەری دانا لەناو کوڕنوش دا، ئەو پرزانگە پیسو پۆخڵە لەگەڵ خوێنو خوڕو سیخوڕەکەیدا، لەسەر بۆتەقەی ملی دابنێ، بەدترین کەسی کۆمەڵەکە دەرپەڕیو، چوو پرزانگو خوڕو خوێنەکەی هێناو، کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کڕنووشی برد، لەناو شانیدا دایناو، فەرمووی: ئیتر کردیان بەفشەو پێکەنینو، لەبەر لاقرتیو پێکەنین لاڵو پاڵ کەوتن بەسەر یەکتردا! بەیەکتریان دەگوت: ئەمە کەتنی تۆ بوو کردت بەموحەممەد!

منیش هەر سەیرم دەکردو دەسەڵاتی هیچیشم نەبوو، ئەگینا پرزانگەکەم لەسەر پشتی فڕێدەدا، حەزرەت لەسەر ئەوحاڵە لەناو سەجدەدا مایەوەو سەری هەڵنەبڕی، تامرۆڤێ چوو بەفاطیمەی کچی گوت حاڵەکە وایە، ئەوکاتە فاطیمە منالکار بوو. کەهات فڕێ ی داو، دەستی کرد بەجنێودان پێیان، پێغەمبەر

---

[١١٧٢] تجرید/١، ژمارە: ١٧٢ - ٢٤٠ بخاری. پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ١١٦٧ = ٤٦٢٥ پوختەی موسلیم (بخاری رقم الکتاب/٤ رقم الباب/٦٩).

(دروودی خودای لەسەر بێ) کاتێ نوێژەکەی تەواو کرد، دەنگی هەڵبڕیو نزای شەڕی لێ کردن، دەستووری حەزرەت (ڕەزای خوای لێ بێ) وابوو کەنزای دەکرد سێ جار نزاکەی دووبارە دەکردەوە، کەشتێکیشی لەخودا داوا دەکرد سێ جار داواکردنەکەی دووبارە دەکردەوە.

جا حەزرەت (ڕەزای خوای لێ بێ) سێ جار لەسەریەك بەدەنگی بەرز فەرمووی: (خودایە قوڕەیشم هەواڵەی قینو قاری تۆ کرد!) ئەوانیش کەگوێیان لەمە بوو لەپێکەنین کەوتنو، زۆر لەنزاو سکاڵاکەی ترسان. دوا ئەوە فەرمووی: (خودایە! ئەم زەلامانەم هەواڵە بەخەشمو قاری تۆ کرد: ئەبوجەهلی کوڕی هیشامو عوتبەی کوڕی ڕەبیعەو شەیبەی کوڕی ڕەبیعەو وەلیدی کوڕی عوقبەو ئومەییەی کوڕی خەڵەفو عوقبەی کوڕی ئەبوموعەیطو....) فەرمووی: (ئەو حەوتەمیشی ژمارد بەڵام من ناوی حەوتەمم لەبەر نەماوە) (حەوتەم عەمارەی کوڕی وەلید بوو. عەینی). ئیبنومەسعود فەرمووی: (دەی بەوکەسەی گیانی منی بەدەستە، ئەو بەدبەختانەی کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) یەکەیەکە ناوی هێنانو نزای شەڕی لێ کردن بەچاوی خۆم چاوم پێیان کەوت لەڕۆژی بەدردا کوژرابوون، لەدوایی دا کەلاکەکانیان بەکێش کردنو تووڕیان دانە ناو کۆنە بیرەکەی بەدرەوە!) (ت/ ٨/١٩٠/ ١ تاج-٤ ز-٨٢ ژ-٤٥٦٨).

بۆ بەراوردو بەهرەی پترو شارەزابوون لەجیاوازی گێڕانەوەکانی موسلیم لە گێڕانەوەکانی بوخاری، دەقی ژمارە (١١٦٧)ی پوختەی موسلیم دەگوێزینەوە:

عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: بَيْنَمَا رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُصَلِّي عِنْدَ الْبَيْتِ وَأَبُو جَهْلٍ وَأَصْحَابٌ لَهُ جُلُوسٌ، وَقَدْ نُحِرَتْ جَزُورٌ بِالأَمْسِ، فَقَالَ أَبُو جَهْلٍ: أَيُّكُمْ يَقُومُ إِلَى سَلاَ جَزُورِ بَنِي فُلاَنٍ فَيَأْخُذُهُ فَيَضَعُهُ فِي كَتِفَيْ مُحَمَّدٍ إِذَا سَجَدَ؟ فَانْبَعَثَ أَشْقَى الْقَوْمِ، فَأَخَذَهُ، فَلَمَّا سَجَدَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَضَعَهُ بَيْنَ

كَتِفَيْهِ، قَالَ: فَاسْتَضْحَكُوا، وَجَعَلَ بَعْضُهُمْ يَمِيلُ عَلَى بَعْضٍ، وَأَنَا قَائِمٌ أَنْظُرُ. لَوْ كَانَتْ لِي مَنَعَةٌ طَرَحْتُهُ عَنْ ظَهْرِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، وَالنَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) سَاجِدٌ مَا يَرْفَعُ رَأْسَهُ، حَتَّى انْطَلَقَ إِنْسَانٌ فَأَخْبَرَ فَاطِمَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا)، فَجَاءَتْ وَهِيَ جُوَيْرِيَةٌ فَطَرَحَتْهُ عَنْهُ، ثُمَّ أَقْبَلَتْ عَلَيْهِمْ تَشْتِمُهُمْ، فَلَمَّا قَضَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) صَلَاتَهُ رَفَعَ صَوْتَهُ ثُمَّ دَعَا عَلَيْهِمْ، وَكَانَ إِذَا دَعَا دَعَا ثَلَاثًا، وَإِذَا سَأَلَ سَأَلَ ثَلَاثًا، ثُمَّ قَالَ: « اللَّهُمَّ عَلَيْكَ بِقُرَيْشٍ »، ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، فَلَمَّا سَمِعُوا صَوْتَهُ ذَهَبَ عَنْهُمُ الضِّحْكُ، وَخَافُوا دَعْوَتَهُ، ثُمَّ قَالَ: « اللَّهُمَّ عَلَيْكَ بِأَبِي جَهْلِ بْنِ هِشَامٍ، وَعُتْبَةَ بْنِ رَبِيعَةَ، وَشَيْبَةَ بْنِ رَبِيعَةَ، وَالْوَلِيدِ بْنِ عُقْبَةَ وَأُمَيَّةَ بْنِ خَلَفٍ، وَعُقْبَةَ بْنِ أَبِي مُعَيْطٍ (وَذَكَرَ السَّابِعَ وَلَمْ أَحْفَظْهُ) فَوَالَّذِي بَعَثَ مُحَمَّدًا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِالْحَقِّ لَقَدْ رَأَيْتُ الَّذِينَ سَمَّى صَرْعَى يَوْمَ بَدْرٍ، ثُمَّ سُحِبُوا إِلَى الْقَلِيبِ قَلِيبِ بَدْرٍ، قَالَ أَبُو إِسْحَاقَ: الْوَلِيدُ بْنُ عُقْبَةَ غَلَطٌ فِي هَذَا الْحَدِيثِ. {الحديث: ٤٦٢٥ = ٤٦١٣ فم. تجريد البخاري/١/١٩٠، رقم: ١٧٢ = ٢٤٠، ٢٩٣٤، ٥٢٠، ٣١٨٥، ٣٦٦٠، ٣٨٥٤، ٣٩٦٠. نسائي. جهاد: ٢٠٦}:

ئیبنو مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درוודی خودای لەسەر بێ) جارێ لە مەککە لەلای کەعبەدا نوێژی دەکرد، ئەبو جەهلو چەند هاوڕێیەکی لەوێ دانیشتبوون، ڕۆژی پێشوو تریش وشترێ سەربڕا بوو، ئەبو جەهل گوتی: کامتان دەچێ پرزانگی ئەو وشترە سەربڕاوە کە دوێنێ ئەو ماڵە سەریان بڕیوەو پرزانگەکەیان لەلا ماڵان فڕێ داوە، ئەو پرزانگە دەهێنێو کاتێ کە موحەممەد سەردادەنێ لە کوڕنووشدا، ئەو پرزانگە لەسەر بۆتەقەی ملی دابنێ؟

بەدترین کەسی ئەو کۆمەڵە دەرپەڕیو، چوو پرزانگو خوڕو خوێنەکەی هێناو، کاتێ پێغەمبەر (درוודی خودای لەسەر بێ) کوڕنووشی برد لەناو شانیدا

داینا، فەرمووی: ئیتر کردیان بەفشەو پێکەنینو لەبەر لاقرتێو پێکەنین لاڵو پاڵ کەوتن بەسەر یەکتردا!!

بەیەکتریان دەگوت: ئەمە کەتنی تۆ بوو کردت بە موحەممەدا! منیش هەر سەیرم دەکردنو دەسەڵاتی هیچیشم نەبوو، ئەگینا پرزانگەکەم لەسەر پشتی فڕێ دەدا، حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەر ئەو حاڵە لەکوڕنووشدا مایەوەو سەری هەڵنەبڕی، تا مرۆڤێ چوو بە فاطیمەی کچی پێغەمبەری گوت حاڵەکە وایە، فاتیمە ئەوکاتە منالکار بوو، کەهات فڕێی داو، دەستی کرد بەجنێودان پێیان، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کاتێ نوێژەکەی تەواوکرد، دەنگی هەڵبڕیو نزای شەڕی لێ کردن، دەستووری حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو کە نزایەکی دەکرد سێ جار نزاکەی دووبارە دەکردەوە، کە شتێکیشی لەخودا داوا دەکرد سێجار داواکردنەکەی دووبارە دەکردەوە.

جا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) سێجار لەسەر یەك بەدەنگی بەرز فەرمووی: (خودایە! قورەیشم هەواڵەی قینو قاری تۆ کردا). ئەوانیش کە گوێیان لەمەبوو لە پێکەنین کەوتنو زۆر لەنزاو سکاڵاکەی ترسان، دوا ئەوە فەرمووی: (خودایە! ئەم زەلامانەم هەواڵە بەخەشمو قاری تۆ کرد: ئەبو جەهلی کوڕی هیشامو عوتبەی کوڕی رەبیعەو شەیبەی کوڕی رەبیعەو وەلیدی کوڕی عوقبەو ئومەییەی کوڕی خەلەفو عوقبەی کوڕی ئەبو موعەیطو...). فەرمووی: (ئەو حەتەمیشی ژمارد بەڵام من ناوی حەوتەمم لەبەرنەماوە). (حەوتەم: عەمارەی کوڕی وەلید بوو - عەینی).

ئیبنو مەسعوود (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: (دەی بەو خودایەی کە بەحەق پێغەمبەری رەوانە کردووە، ئەو بەدبەختانەی کە پێغەمبەر یەکە یەکە ناوی هێنانو ئەو نزای شەڕەی لێ کردن، بەچاوی خۆم چاوم پێیان کەوت

لەڕۆژی بەدردا کوژرابوون، لەئەنجاما کە لاکەکانیان بەکێش کردن و تووڕیان دانە ناو بیرەکەی بەدرەوە!

ئەبو ئیسحاق کە ئەم فەرموودەیە دەگێڕێتەوە لە عەمری کوڕی مەیموونەوە، لە ئیبنو مەسعوودەوە، ئەبو ئیسحاق دەفەرموێ: (لەم فەرموودەیەدا بە وەلیدی کوڕی عوتبە، بە هەڵە گوتراوە: وەلیدی کوڕی عوقبە، ڕاستیەکەی وەلیدی کوڕی عوتبەیە، نەوەك وەلیدی کوڕی عوقبە. واتە: بەتێ، نەوەك بەقاف). {تاج/٤، زنجیرە: ٨٢، ژمارە: ٤٥٦٨}.

١١٧٣- عَنِ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) زَوْجَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): أَنَّهَا قَالَتْ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): يَا رَسُولَ اللَّهِ! هَلْ أَتَى عَلَيْكَ يَوْمٌ كَانَ أَشَدَّ مِنْ يَوْمِ أُحُدٍ؟ فَقَالَ: « لَقَدْ لَقِيتُ مِنْ قَوْمِكِ، وَكَانَ أَشَدَّ مَا لَقِيتُ مِنْهُمْ يَوْمَ الْعَقَبَةِ، إِذْ عَرَضْتُ نَفْسِي عَلَى ابْنِ عَبْدِ يَالِيلَ بْنِ عَبْدِ كُلاَلٍ، فَلَمْ يُجِبْنِي إِلَى مَا أَرَدْتُ، فَانْطَلَقْتُ وَأَنَا مَهْمُومٌ عَلَى وَجْهِي، فَلَمْ أَسْتَفِقْ إِلاَّ بِ(قَرْنِ الثَّعَالِبِ) فَرَفَعْتُ رَأْسِي، فَإِذَا أَنَا بِسَحَابَةٍ قَدْ أَظَلَّتْنِي، فَنَظَرْتُ فَإِذَا فِيهَا جِبْرِيلُ، فَنَادَانِي، فَقَالَ: إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ قَدْ سَمِعَ قَوْلَ قَوْمِكَ لَكَ وَمَا رَدُّوا عَلَيْكَ، وَقَدْ بَعَثَ إِلَيْكَ مَلَكَ الْجِبَالِ، لِتَأْمُرَهُ بِمَا شِئْتَ فِيهِمْ، قَالَ: فَنَادَانِي مَلَكُ الْجِبَالِ، وَسَلَّمَ عَلَيَّ، ثُمَّ قَالَ: يَا مُحَمَّدُ إِنَّ اللَّهَ قَدْ سَمِعَ قَوْلَ قَوْمِكَ لَكَ، وَأَنَا مَلَكُ الْجِبَالِ، وَقَدْ بَعَثَنِي رَبُّكَ إِلَيْكَ لِتَأْمُرَنِي بِأَمْرِكَ فَمَا شِئْتَ؟ إِنْ شِئْتَ أَنْ أُطْبِقَ عَلَيْهِمُ الأَخْشَبَيْنِ »؟ فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): « بَلْ أَرْجُو أَنْ يُخْرِجَ اللَّهُ مِنْ أَصْلاَبِهِمْ مَنْ يَعْبُدُ اللَّهَ وَحْدَهُ لاَ يُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا ». {الحديث: ٤٦٢٩ = ٤٦١٧ فـم. تجريد/٣/٤٢٤، رقـم: ١٣٠٣ = ٣٢٣١، ٧٣٨٩ فـتح الباري}:[١١٧٣]

---

[١١٧٣] تجرید/٣، ژمارە: ١٣٠٣ = ٣٢٣١ بخاری. پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١١٦٥ = ٤٦٢٩ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٥٩ رقم الباب/٧).

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (درورودی خودای گەورە لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەهەموو هاوسەرە پاکیزەکانی) دەفەرموێ: عەرزی خۆشەویستم کرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! هیچ ڕۆژێکت بەسەرهاتووە کە لەڕۆژی ئوحود سەختتر بێت؟ فەرمووی: (لەم هۆزەی تۆوە، کە هۆزی قورەیشە، تووشی دەردی سەری‌و ئێش‌و ئازارێکی ئێجگار زۆر بووم، بەتایبەتی لە ڕۆژەکەی عەقەبەدا، تەواو سەخڵەتیان کردم، مەبەستم ئەو ڕۆژەیە کە لەعەقەبەی مینادا خۆم پێشکەشی عەبدو یالیلی برای عەبدو کولال کرد، لەپاشا چووم بۆلایان بۆ طائیف‌و دە ڕۆژ لەناویانا لە طائیف مامەوە، لەوێش دیسان داوام لەخۆی‌و لەهۆزەکەی کەهۆزی ثەقیف بوو کرد، کە ئیسلام ببن‌و ببن بەپشت‌و پەنای ئیسلام، بەڵام مرازمیان نەداو بەگوێیان نەکردم‌و وەڵامێکی زۆر ناشیرین‌و نالەباریان دامەوە، ئیتر منیش بەخەمباری‌و بە پەرێشانی، کەوتمەڕێ‌و بەبێ ئاگا ڕێگەم گرتە بەرو ڕۆیشتم، کاتێ هۆشم هاتەوەو بەئاگا هاتمەوە، تەماشام کرد وام لە قەرنولثەعالیب، کەسەرم هەڵبڕی تەماشام کرد وا پەڵەیێ هەور بەرا سەرمەوە ڕاوەستاوەو بووە بە سێبەر بۆم، کە سەرنجمدا جوبرائیلم لەناویدا بینی، جوبرائیل بانگی لێ کردم‌و فەرمووی: ئەی موحەممەد! یەزدانی هێژاو سەرومر ئاگای لێ بوو، کە هۆزەکەت چییان پێ گوتیت‌و چۆنیان وەڵام دایتەوە، ئەوا فریشتەی کێوانی بۆ ناردوویت، چی فەرمانێکت هەیە پێی بفەرموو، چۆن تۆ حەزدەکەیت ئاوایان لێ دەکا، جا فریشتەی کێوانیش بانگی لێ کردم‌و سڵاوی لێ کردم‌و فەرمووی: ئەی موحەممەد! خودا گوێی لێ بوو کە هۆزەکەت چۆن بەناشیرینی وەڵامیان دایتەوەو داڵدەیان نەدایت، ئەوە من فریشتەی سەرکاری سەرچیاکانم‌و هەموو کێوو چیاکان بەدەستی منەو من بەرپرسم لێیان‌و بەفەرمانی خودا لە فەرمانی من دەرناچن، پەروەردگاری تۆ منی ناردووە بۆلای

تۆ، کە فەرمانت بەچییە من جیبەجێی دەکەم، ئەگەر ئارەزوو دەکەی هەردوو کێوەکە تەبخ دەکەم بەسەریاندا، کێوی ئەبو قوبەیس و کێوی قەیقوعان، کەشاری مەککە دەکەوێتە نێوانیانەوە دەدەم بەیەکا، هەتا تاقیان لێ دەرنەچێ).

پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (خەیر! من شتی وا داوا ناکەم، بەڵکوو من ئومێد دەکەم کەخودا لەپشتی ئەمانە، کە دانیشتووی شاری مەککەن، نەوەیێ بخاتەوە، وەچەیێ پەیدا ببێ کە ئەوان خودا بپەرستن و، بەتاک و تەنیای بزانن و هیچ هاوبەشی بۆ دانەنێن). {تاج/٤، زنجیرە: ٨٢، ژمارە: ٤٥٧٠}.

١١٧٤- عَنْ جُنْدُبِ بْنِ سُفْيَانَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: دَمِيَتْ إِصْبَعُ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي بَعْضِ تِلْكَ الْمَشَاهِدِ، فَقَالَ:

هَلْ أَنْتِ إِلاَّ إِصْبَعٌ دَمِيتِ
وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ مَا لَقِيتِ

{الحديث: ٤٦٣٠ = ٤٦١٨ فم. تجريد/٣/٢٨٥، رقم: ١١٥٤ = ٢٨٠٢ فتح الباري. ترمذي. تفسير: ٣٣٤٥. تحفة الأشراف: ٣٢٥٠} : [١١٧٤]

جوندوبی کوڕی سوفیان (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەتی حەزرەتدا بووم، لە غەزایەکا، لەناو ئەشکەوتێکا، پەنجەیەکی حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) زامار بوو، خوێنی لێ هات، پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەر بێ) بۆ دڵدانەوەی پەنجەی، هەتا ئۆقرە بگرێ، لەسەر ئێش و ئازارەکەی فەرمووی:

---

[١١٧٤] تجرید/٢، ژمارە: ١١٤٤ - ٢٨٠٢ بخاری. پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ١١٦٦ = ٤٦٣٠ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٥٦ رقم الباب/٩).

هَــــلْ أنْــــتِ إلاَّ إصْـــبَعٌ دَمِيــــتِ

وَفِـــي سَـــبِيلِ اللَّـــهِ مَـــا لَقِيـــتِ

واته بەشیعر لەدەریاکەی خۆی کەرە جەزە:

نــــەی پەنجــــە وایــــە پایــــەوو شــــوێنت

لـــــــەرێی خــــوادادا وا ڕژا خوێنـــــــت

مەبەستی خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) ئەوەیە: کە لەسەر شێوەی موعجیزە، دڵی پەنجەی خۆی بداتەوەو، تێی بگەیەنێ کە ئەو ئێش و ئازارەی کە پێی گەیشتووە، لەچاو هی تردا هەر زۆر کەمە، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا بەخۆڕایی ناڕوا، خوا بۆی حسیب دەکا بە تێکۆشان لەرێگەی خۆیدا).
{تاج/٤، زنجیرە: ٧٦، ژمارە: ٤٢١٧} .

**ڕوونکردنەوە:**

گەرچی لەسەرچاوەکاندا بۆم روون نەبوویەوە، کە پەنجەی دەستی زامار بووە، یا هی قاچی، بەڵام لەهەندێ گێڕانەوەدا ئاماژەی واتیادا، کە پەنجەی پێی بووبێ، وەك لەژمارە (٦١٤٦)ی صەحیحی بوخاریدا، بەدەق دەفەرموێ:
سَمِعْتُ جُنْدَبًا يَقُولُ: بَيْنَمَا النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَمْشِي إِذْ أَصَابَهُ حَجَرٌ فَعَثَرَ فَدَمِيَتْ إِصْبَعُهُ فَقَالَ: « هَلْ أَنْتِ إِلاَّ إِصْبَعٌ دَمِيتِ وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ مَا لَقِيتِ » .

١١٧٥- عَنِ الأَسْوَدِ بْنِ قَيْسٍ قَالَ: سَمِعْتُ جُنْدُبَ بْنَ سُفْيَانَ يَقُولُ: اشْتَكَى رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- فَلَمْ يَقُمْ لَيْلَتَيْنِ أَوْ ثَلاَثًا، فَجَاءَتْهُ امْرَأَةٌ فَقَالَتْ: يَا مُحَمَّدُ إِنِّي لأَرْجُو أَنْ يَكُونَ شَيْطَانُكَ قَدْ تَرَكَكَ، لَمْ أَرَهُ قَرِبَكَ مُنْذُ لَيْلَتَيْنِ أَوْ ثَلاَثٍ. قَالَ فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: ( وَالضُّحَى وَاللَّيْلِ إِذَا سَجَى مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَى). (الحديث ٤٦٣٣ حسب ترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا = ٤٦٢١ حسب ترقيم فتح الملهم بشرح صحيح

الإمام مسلم. تجريد البخاري = مختصر صحيح البخاري = الترجمة الكردية = المجلد الأول، الرقم: ٥٦٠ = ١١٢٤، ١١٢٥، ٤٩٥٠، ٤٩٨٣ فتح الباري): [١١٧٥]

ئەسوەدى كوڕى قەيس (ڕەحمەتى خوداى لێ بێ) دەيفەرموو: خۆشەويست (درودو صەڵاوات‌و سەلام‌و ڕەحمەت‌و بەرەكات‌و پيرۆزيى خوداى گەورەى لەسەربێ‌و سەرو ماڵ‌و مناڵ‌و رۆح‌و چاوو دڵ‌و كەسوكارو هەست‌و نەست گشتى بەقوربانى گەردى بەرپێى دێنيكارانى ئارامگاى پيرۆزى بێ) تۆزێ ناساخ بوو، دووشەو يا سێ شەو هەڵنەسا بۆ شەونوێژ، جا عەوراى ژنى ئەبو لەهەبى لەعنەتى، هاتە گيانى حەزرەت‌و گوتى: ئەى موحەممەد! دەنگت نييە، ئەمە دوو سێ شەوە نابينم شەيتانەكەت سەرت لێ بدات، ئومێد دەكەم كەوازى لێ هێنابيت. ئيتر خودا ئەمەى نارد: {وَالضُّحَى، وَاللَّيْلِ إِذَا سَجَى، مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَى} (الضحى-٩٢/١-٢).

واتە: سوێند بەكاتى چێشتەنگاو كە جوانترين كاتە، وە سوێند بەشەو كەتەواو دەزرنگێتەوەو، بەتاراى ڕەشى تاريكى خۆى هەموو شت دادەپۆشێ‌و كاتى ئەوە دێ ماندوو بحەسێتەوەو هەموو شت ئارام بگرێ. ئەى موحەممەد! خوداى تۆ كەتۆى پەروەردە كردووە، هەميشە هەتا هەتايە وازت لێ ناهێنێ‌و دەست بەردارت نابێ، تۆ خۆشەويستى منى، قەت لێت زيزو دلگير نابم، چجاى ئەوەى رقم لێت بێ). (تاج/ ژ/٤ ژ/٧٦ ژ/٤٢١٦ - سوورەتى ضوحا).

---

[١١٧٥] تجريد/١، ژمارە: ٥٦٠ - ١١٢٤ بخارى. پوختەى موسليم/٥، ژمارە: ٢١٧٧ - مسلم: ٤٦٣٣ شيحا (بخارى رقم الكتاب/٦٥ رقم الباب/٩٢).

## (٤٠) بابُ في دُعاءِ النَّبِي ﴿ﷺ﴾ إلَى اللهِ وَصَبْرِهِ علَى أذَىَ المُنَافِقِين
## بانگەوازی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بۆ قەبووڵی پەیامی خودای گەورەو حەوسەڵەو نارامگرتنی لەسەر ئێشو نازاری دوو ڕووەکان

١١٧٦- عَـنْ أُسَـامَةَ بْـنَ زَيْـدٍ (رَضِـيَ اللهُ عَنهُمـا): أنَّ النَّبِـيَّ (صـلى الله عليـه وسلم) رَكِبَ حِمَارًا عَلَيْهِ إكَافٌ، تَحْتَهُ قَطِيفَـةٌ فَدَكِيَّـةٌ، وَأَرْدَفَ وَرَاءَهُ أُسَـامَةَ وَهُـوَ يَعُـودُ سَعْدَ بْنَ عُبَادَةَ فِى بَنِى الْحَارِثِ بْنِ الْخَزْرَجِ، وَذَاكَ قَبْلَ وَقْعَةِ بَدْرٍ حَتَّى مَرَّ بِمَجْلِسٍ فِيـهِ أَخْلاَطٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ وَالْمُشْرِكِينَ عَبَدَةِ الأَوْثَانِ وَالْيَهُودِ، فِيهِمْ عَبْدُ اللَّـهِ بْـنُ أُبَـىٍّ وَفِـى الْمَجْلِسِ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ رَوَاحَةَ، فَلَمَّا غَشِيَتِ الْمَجْلِسَ عَجَاجَةُ الدَّابَّةِ، خَمَّرَ عَبْـدُ اللَّـهِ بْـنُ أُبَىٍّ أَنْفَهُ بِرِدَائِهِ، ثُمَّ قَالَ: لاَ تُغَبِّرُوا عَلَيْنَا، فَسَلَّمَ عَلَيْهِمُ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم)، ثُمَّ وَقَفَ، فَنَزَلَ، فَدَعَاهُمْ إِلَى اللَّهِ، وَقَرَأَ عَلَيْهِمُ الْقُرْآنَ، فَقَالَ عَبْـدُ اللَّـهِ بْـنُ أُبَـىٍّ: أَيُّهَـا الْمَرْءُ لاَ أَحْسَنَ مِنْ هَذَا، إِنْ كَانَ مَا تَقُولُ حَقًّـا فَـلاَ تُؤْذِنَـا فِـى مَجَالِـسِنَا وَارْجِـعْ إِلَـى رَحْلِكَ، فَمَنْ جَاءَكَ مِنَّا فَاقْصُصْ عَلَيْهِ، فَقَالَ عَبْـدُ اللَّـهِ بْـنُ رَوَاحَـةَ (رَضِـيَ اللهُ عَنْـهُ): اغْشَنَا فِى مَجَالِسِنَا، فَإِنَّا نُحِبُّ ذَلِكَ، قَالَ: فَاسْـتَبَّ الْمُـسْلِمُونَ وَالْمُـشْرِكُونَ وَالْيَهُـودُ، حَتَّى هَمُّوا أَنْ يَتَوَاثَبُوا، فَلَمْ يَزَلِ النَّبِيُّ (صـلى الله عليـه وسـلم) يُخَفِّـضُهُمْ، ثُـمَّ رَكِـبَ دَابَّتَهُ، حَتَّى دَخَلَ عَلَى سَعْدِ بْنِ عُبَادَةَ، فَقَالَ: « أَىْ سَعْدُ أَلَمْ تَـسْمَعْ إِلَـى مَـا قَـالَ أَبُـو حُبَابٍ؟ (يُرِيدُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ أُبَىٍّ) قَالَ: كَذَا وَكَذَا ». قَـالَ: اعْـفُ عَنْـهُ يَـا رَسُـولَ اللَّـهِ، وَاصْفَحْ، فَوَاللَّهِ لَقَدْ أَعْطَاكَ اللَّـهُ الَّـذِى أَعْطَـاكَ، وَلَقَـدِ اصْـطَلَحَ أَهْـلُ هَـذِهِ الْبُحَيْـرَةِ أَنْ يُتَوِّجُوهُ، فَيُعَصِّبُوهُ بِالْعِصَابَةِ، فَلَمَّا رَدَّ اللَّهُ ذَلِكَ بِالْحَقِّ الَّذِى أَعْطَاكَهُ شَرِقَ بِذَلِكَ فَـذَلِكَ فَعَلَ بِهِ مَـا رَأَيْـتَ، فَعَفَـا عَنْـهُ النَّبِـيُّ (صـلى الله عليـه وسـلم). {الحـديث: ٤٦٣٥ = ٤٦٢٣ فـم. تجريـد/٣، رقـم: ١٢٢٢ = ٢٩٨٧، ٤٥٦٦، ٥٦٦٣، ٥٩٦٤، ٦٢٠٧ فـتح البارى}: [١١٧٦]

---

[١١٧٦] تجريـد/٣، ژمـارە: ١٢٢٢ - ٢٩٨٧ بخـاری. پوختـەی موسـلیم/٢، ژمـارە: ١١٢٣ = ٤٦٣٥ شـیحا (بخاری رقم الكتاب/٧٩ رقم الباب/٢٠).

ئوسامەی کوڕی زەید (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سواری گوێ درێژی بوو، کورتانێکی پێوە بوو، سەر کورتانەکەی قەیفەی فەدەکی بوو، منیشی لەپاشکۆی خۆیەوە سوارکرد، تەشریفی چوو بۆ سەردانی سەعدی کوڕی عوبادە، کە نەخۆش بوو، لەگەڕەکی بەنی حاریثەی کوڕی خەزرەج، کە هۆزەکەی سەعد بوون، ئەمە بەر لەرووداوی بەدربوو، کۆمەڵێ لە موسوڵمانانی لەخزمەتدا بوو، لەرێگە دایان بەلای کۆڕێکا، تێکەڵبوون لە موسوڵمانانو هاوبەش پەیداکەرانو جوولەکە، یەکێ لەوان عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی بوو، کە سەرۆکی ناپاکەکان (موونافیقەکان) بوو، یەکێ تر لەدانیشتوانی کۆڕەکە عەبدوڵڵای کوڕی رەواحە بوو، رێگەکە شۆرەکات بوو، لەبەرئەوە کەمێ تۆزو خۆڵی هەبوو، تۆزو خۆڵی سمی گوێ درێژەکە چوو بەسەر کۆڕی دانیشتنەکەیانا، عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی، بەچمکی پۆشاکەکەی لووتی خۆیی گرتو ئەوجا گوتی: تۆز مەکە بەسەرمانا، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سڵاوی لێ کردنو گوێ درێژەکەی وەستانو دابەزیو داوای لێیان کرد کەرووبکەنە خوداو باوەڕ بهێنن بەیەزدانی پاك!! هەندێ قورئانی بۆ خوێندن، کە شایانی ئەم بارودۆخە بێ، جا عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی تەنگە گرتیو گوتی: ئەی پیاوەکە! ئەمەی تۆ دەیڵێیت ئەگەر هەقو دروست بێ، لێی باشتر نییە، بەڵام پێویست بەوەناکا کەتۆ لەکۆڕی دانیشتنی خۆمانا، بەم جۆرە هەڵسوکەوتە ئازارمان بدەی، بچۆ لەبارەگای خۆت دانیشە، هەرکەسێ لەئێمە هات بۆلات ئەم جۆرە چیرۆکانەی بۆبکە.

عەبدوڵڵای کوڕی رەواحەیش (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: (ئەی پێغەمبەری خودا! بەم فەرمایشتانە کۆڕەکانمان گوڵاو پەرژێن بفەرموو، ئێمە ئەوەمان زۆر پێ خۆشە!).

فـەرمووی: جـا قـسەیێ لـەمو قـسەیێ لـەو، لـەنێوانی موسـوڵمانەکانو بتپەرستەکانو جوولەکەکانا بوو بەشەڕە جنێو، تەنانەت خەریکبوون پەلاماری یـەکتری بـدەن، پێغەمبـەریش (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) بـەردەوام خـاوی دەکردنەوە، هەتا بەرە بەرە دامرکان. ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسـەر بێ) سواری ولاخەکەی بـوو، رۆیـشت بـۆلای سـەعدی کوڕی عوبـادە، فـەرمووی: (ئەی سەعد! گوێت لێ نەبوو کە ئـەبو حوبـاب چـی دەڵێ؟! (مەبەسـتی لـە ئـەبو حوباب عەبدوڵڵای کوڕی ئوبـەیی بـوو، چونکە (ئـەبو حوبـاب: بـاوکی حوبـاب) کەسناوی ئەوبوو فەرمووی: ئەبو حوباب! ئاواو ئاوا دەڵێ). سەعدیش فەرمووی: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! لێـی ببـوورەو چاوپۆشـی لێ بکـە، هـۆی ئـەم هەڵوێـستە ناحەزانـەی ئەمەیـە کـەمن عـەرزتی دەکـەم، بـە خـودای گـەورە ئـەم بـەهرەو خەلاتانەی خودا رەخساندی بۆ تۆو مەدینەی نازداری کرد بـە ڕەوگـەو کۆچـگای تۆ لەکاتێکا بوو، کە خەڵکی ئەم ولاتی مەدینەیـە رێکـەوتبوون کـە ئـەو کابرایـە بکەن بە پاشای خۆیانو تاجی شاهی لەسەر بکەنو مێزەری تایبەت بەپادشایانی لەسەر بنێن!

جاکاتـێ ئـەم کابرایـە بـەهۆی ئـەم بـەهرەو خەلاتـە دروسـتەی کـە خـودا بەخشی بەتۆ، ئەم پلەو پایەی لەکیس چوو، شەقی بردو لەتاوانا ئەو هەڵوێـستە نامەردانەی پیشاندا کـەدیت! جـا پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) چاو پۆشی لێ کرد.

١١٧٧- حديث أَنَسٌ (رضى الله عنه) قَالَ قِيلَ لِلنَّبِيِّ (صلى الله عليـه وسـلم) لَـوْ أَتَيْتَ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ أُبَيّ. فَانْطَلَقَ إِلَيْهِ النَّبِـيُّ (صـلى الله عليـه وسـلم) وَرَكِـبَ حِمَـارًا ، فَانْطَلَقَ الْمُسْلِمُونَ يَمْشُونَ مَعَهُ ، وَهْيَ أَرْضٌ سَبِخَةٌ ، فَلَمَّا أَتَاهُ النَّبِـيُّ (صـلى الله عليـه وسلم) فَقَالَ إِلَيْكَ عَنِّى ، وَاللَّهِ لَقَدْ آذَانِى نَتْنُ حِمَارِكَ . فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ مِـنْهُمْ

وَاللَّهِ لَحِمَارُ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَطْيَبُ رِيحًا مِنْكَ . فَغَضِبَ لِعَبْدِ اللَّهِ رَجُلٌ مِنْ قَوْمِهِ فَشَتَمَا ، فَغَضِبَ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا أَصْحَابُهُ ، فَكَانَ بَيْنَهُمَا ضَرْبٌ بِالْجَرِيدِ وَالأَيْدِي وَالنِّعَالِ ، فَبَلَغَنَا أَنَّهَا أُنْزِلَتْ ( وَإِنْ طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا): [١١٧٧]

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: عەرزی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کرا: خۆزگە دەچوویت بۆلای عەبدوڵلای کوڕی ئوبەیی کوڕی سەلوول، پێغەمبەیش (دروودی خودای لەسەر بێ) بەسواریی گوێدرێژێ بەرەولای عەبدوڵلا، لەگەڵ کۆمەڵێ لە موسوڵمانان کەوتنەڕێ، ڕێگەکە کرێن بوو، تەپو تۆزی هەبوو، چونکە شۆرەکات، واتە: خوێداربوو، کە پێغەمبەرو هاوەڵەکانی گەیشتنە لای عەبدوڵلا، بە پێغەمبەری گوت: بچۆ بەولاوە، دوورکەوە لەمن، بەخودا بۆگەنی کەرەکەت ئازارم دەدا).

پیاوێکی ئەنصاری فەرمووی: (بەخودا بۆنی گوێدرێژەکەی پێغەمبەر لەبۆنی تۆ خۆشترە). جا پیاوێ لەهۆزەکەی عەبدوڵلا، هەڵیدایەو لەسەر عەبدوڵلای کردەوەو لەگەڵ ئەنصارییەکەدا بوو بەشەڕە جنێویان، جا کۆمەڵەی ئەنصارییەکە لەسەر ئەنصارییەکەیان کردەوەو کۆمەڵەی پیاوەکەی تریش لەسەر برادەرەکەی خۆیان کردەوەو بوو بەشەڕ لەنێوانیاندا، بە پەلکە خورماو بەدەستو بە سۆڵو کەوش‌و کلاش لەیەکتریان دا، جا بەئێمە گەیشتۆتەوە کە سەبارەت بەم چیرۆکە، ئەم ئایەتە هاتۆتە خوارێ ﴿وَإِنْ طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا﴾ واتە: (ئەگەر دوو دەستە لە موسوڵمانان بوو بەشەڕیان، لەناو خۆیانا، ناوبژییان بکەن‌و نێوانیان ڕێکبخەن!).

---

[١١٧٧] بخاری. الصلح: ٢٦٩١ مسلم: ٤٦٣٦ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٥٣ رقم الباب/١).

**روونكردنەوە:**

ئێستا بۆ روونكردنەوەی تەواو لەم داستانە، فەرموودەی ژمارە (١٦٣٦)ی پوختەی موسلیم بەرگی چوارەم دەنووسین، لەگەڵ ژمارە (٦٠٩)و ژمارە (٢١٠٣)ی تەجریدی بوخاری:

عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: لَمَّا تُوُفِّيَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أُبَيِّ ابْنُ سَلُولَ، جَاءَ ابْنُهُ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَسَأَلَهُ أَنْ يُعْطِيَهُ قَمِيصَهُ أَنْ يُكَفِّنَ فِيهِ أَبَاهُ، فَأَعْطَاهُ، ثُمَّ سَأَلَهُ أَنْ يُصَلِّيَ عَلَيْهِ، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) لِيُصَلِّيَ عَلَيْهِ، فَقَامَ عُمَرُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)، فَأَخَذَ بِثَوْبِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَتُصَلِّي عَلَيْهِ وَقَدْ نَهَاكَ اللَّهُ أَنْ تُصَلِّيَ عَلَيْهِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «إِنَّمَا خَيَّرَنِيَ اللَّهُ فَقَالَ: (اسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْ لاَ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ إِنْ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً فَلَنْ يَغْفِر الله لَهُمْ)، وَسَأَزِيدُ عَلَى سَبْعِينَ». قَالَ: إِنَّهُ مُنَافِقٌ، فَصَلَّى عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، وَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: (وَلاَ تُصَلِّ عَلَى أَحَدٍ مِنْهُمْ مَاتَ أَبَدًا وَلاَ تَقُمْ عَلَى قَبْرِهِ). {الحديث: ٦١٥٧ = ٦١٦٣ فم. تجريد البخاري بالكوردي/٢، رقم: ٦٠٩ = ١٢٦٩، ٤٦٧٠، ٤٦٧٢، ٥٧٩٦. تحفة الأشراف: ٧٨٢٦}:

ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: كە عەبدوڵڵای كوڕی ئوبەیی كوڕی سەلوول (سەرۆكی ناپاكانی مەدینە) مرد، عەبدوڵڵای كوڕی ئەم عەبدوڵڵایە، كە یەكێ بوو لە هاوەڵە راستو دروستەكانی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) هات بۆلای حەزرەت، عەرزیكرد: ئەی پێغەمبەری خودا! كراسێكی خۆتم پێ بدە، تا بیكەم بەكفن بۆ باوكم، بەڵكوو بە پیرۆزی ئەو كراسەی تۆ سزای لەسەر سووك ببێ، ئەویش كراسێكی خۆیی پێدا، لەپاشا داواشی لێ كرد كە نوێژی مردووشی لەسەر بكا. پێغەمبەریش (دروودی خودای

لەسەر بێ) هەڵسا کەبچێ نوێژی لەسەر بکا، عومەر هەڵسا جلەکەی پێغەمبەری گرتو عەرزیکرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! تۆ خودا رێگەی ئەمەی نەداویت، ئیتر نوێژی چی لەسەر دەکەیت!

فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): خودا منی کردووە بەسەرپشكو خاتر خۆی کردووەو دەفەرموێ: {اسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْ لاَ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ إِن تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً فَلَن يَغْفِرَ اللّهُ لَهُمْ ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ كَفَرُواْ بِاللّهِ وَرَسُولِهِ وَاللّهُ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ – التوبة – ٩/٨٠}.

واتە: ئارەزووی خۆتە، داوای لێ خۆشبوون بکە بۆیان، یان مەیکە، ئێمە رێگەی ئەوەت لێ ناگرین، بەڵام ئەوە بێ سوودە، نەك جارو دووجار، ئەگەر حەفتا جاریش داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکەی، خودا لێیان خۆش نابێ).

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (دەی من لە حەفتا جار زیاتر داوای لێخۆشبوونی بۆ دەکەم!!).

عومەر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئاخر ئەمە ناپاكو مونافیقە. قسەبەر (راوی) دەڵێ: جاکاتێ کە حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی لەسەری کرد، خودا ئەم ئایەتەی تری ناردە خوارەوە کە دەفەرموێ: {وَلاَ تُصَلِّ عَلَى أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلاَ تَقُمْ عَلَىَ قَبْرِهِ – التوبة – ٩/٨٤}.

واتە: بەهیچ شێوەیێ، نابێ نوێژی مردوو بکەی لەسەر هیچ کامێ لەوان کاتێ کە دەمرن، وە لەسەر گۆڕەکەی رامەوەستە بۆ نزاکردن بۆی). {تاج/٤، زنجیرە: ١٠، ژمارە: ٣٩٠٧ – سوورەتی تەوبە}.

**روونكردنەوە:**

١- لـــه تەجريـــدى بوخاريـــدا، بـــەكوردى، لـــەژمارە: (٦٠٩ = ١٢٦٩)دا روونكردنەوەيەكى زۆر دوورو درێژم لەسەر ئەم باسەى وا لەم فەرموودەيەدا نووسيوە، ئەگەر بفەرمووى رەچاوى بكەى جێگەى خۆيەتى.

٢- عەبدوللاَى كورِى عەبدوللاَى سەلوول (رەزاى خوداى لێ بێ) يەكێكە لەهاورِێ زۆر بەرِێزەكانى پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) لەهۆزى خەزرەجە، كە خەزرەج يەكێكە لەدوو هۆزە گەورەكەى مەدينە، كە ناسراون بە ئەوس‌و خەزرەج، لەپێش كۆچكردنى پێغەمبەر بۆ مەدينە، ئەم دوو هۆزە كێشەى گەورەو شەرِو شۆرِى زۆرو دوورو درێژيان لەنێوانا بوو، خودا بەهۆى ئايينى پيرۆزى ئيسلامەوە كردنى بەدۆست‌و براى يەكترى‌و ناوى نان: (أنصار: ياريدەدەران).

كەواتە: عەبدوللاَ ئەنصارييە، لەپێشدا ناوى حوباب بوو، پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) ناوەكەى گۆرِى‌و ناوى نا عەبدوللاَ، ئامادەى غەزاى بەدرو ئوحودو گشت غەزەواتەكانى ترى پێغەمبەر بووە، لەخزمەت پێغەمبەر خۆيدا، عەبدوللاَ يەكێ بوو لە نووسەرانى سرووش، وە لەغەزاى تەبووكا عەبدوللاَى باوكى، كە ناودارە بە عەبدوللاَى كورِى ئوبەيى كورِى سەلوول، كە سەرۆكى ناپاكەكان بوو، هەرِەشەى لە پێغەمبەر (دروودى لەسەر) كردو گوتى: (من‌و موحەممەد كاتێ گەرِاينەوە بۆشارى مەدينە، من‌و موحەممەد كاممان بەدەسەلاَتترو تواناتر بوو بەوى ترمانى چۆلّ دەكات مەدينە يابۆ من دەبێ يابۆ ئەو!).

جا كاتێك قورئانى پيرۆز، پەردەى لەسەر ئەم قسە ژەهراوييەى ئيبنو سەلوول هەلّمالّى، عەبدوللاَى كورِى، پشتى پێغەمبەرى گرت‌و لەدژى باوكى

وەستاو بە پێغەمبەری فەرموو: (سوێندم بەخودا ئەی پێغەمبەری خودا! داماوو ناتەوان ئەوە، عەزیزو دلێرو توانا تۆی!

هەروەها فەرمووی: (ئەی پێغەمبەری خودا! ئەگەر ڕێگەم پێ بدەی بەدەستی خۆم دەیکوژم!).

بەڵام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕێگەی پێ نەداو پێی فەرموو: (بەڵام بەجوانی هاوڕێتی بکە!). پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) زۆر لێی ڕازی بوو، وە گەلێ جار پەسنو مەتحی ئەوی کردووە، لەشەڕی هەڵگەڕاوەکاندا (ئەهلی ڕیددەدا) لەکاتی جێنشینی ئەبوبەکری صەدیقا، لەساڵی دوازدەی کۆچیدا، لە وڵاتی یەمامە شەهید بوو.

٣- ئەم عەبدوڵڵای کوڕی سەلووله، باوکی ناوی ئوبەیی کوڕی مالیکە، سەلوول نەنکییەتی، دایکی باوکیەتی، ژنێ بوو لەهۆزی خوزاعە، ئیبنو سەلوول یەکێك بوو، لەسەرۆك هۆزەکانی هۆزی خەزرەج لەمەدینە، هۆزی خەزرەج، لەپێش کۆچی پێغەمبەر بۆ مەدینە، بڕیاریاندابوو کە ئیبنو سەلوول بکەن بە پادشای خۆیان، بەڵام کە پێغەمبەرو موسوڵمانان دەوڵەتی ئیسلامییان لەمەدینە دامەزراند، ئەم هەلەی لەدەست چوو لەبەرئەوە ئەم کابرایە هەتا مرد، ئەو کۆنە قینەی لەدڵدا بوو، وەرقی لە پێغەمبەر بوو، ناسراوە بە سەرۆکی ناپاکەکان، کە لەزاراوەی سوننەتدا ناودارە بە سەرۆکی ناپاکەکان، واتە: سەرۆکی مونافیقەکان! ئیبنو سەلوول لەساڵی نۆی کۆچیدا مرد.

ئەمە دەقی ژمارە (١٦٣٦)ی پوختەی موسلیم بوو، ئەمەیش دەقی ژمارە (٦٠٩)ی تەجریدی بوخارییە، بەرگی دووەم:

عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ أُبَيّ لَمَّا تُوُفِّيَ جَاءَ ابْنُهُ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ: أَعْطِنِي قَمِيصَكَ أُكَفِّنْهُ فِيهِ وَصَلِّ عَلَيْهِ

وَاسْتَغْفِرْ لَهُ، فَأَعْطَاهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَمِيصَهُ، فَقَالَ (آذِنِّي أُصَلِّي عَلَيْهِ) فَآذَنَهُ فَلَمَّا أَرَادَ أَنْ يُصَلِّيَ عَلَيْهِ جَذَبَهُ عُمَرُ رَضِي اللَّهُ عَنْهُ فَقَالَ: أَلَيْسَ اللَّهُ نَهَاكَ أَنْ تُصَلِّيَ عَلَى الْمُنَافِقِينَ ؟ فَقَالَ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَنَا بَيْنَ خِيَرَتَيْنِ، قَالَ: (اسْتَغْفِرْلَهُمْ أَوْلاَ تَسْتَغْفِرْلَهُمْ إِنْ تَسْتَغْفِرْلَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً فَلَنْ يَغْفِرَاللَّهُ لَهُمْ). فَصَلَّى عَلَيْهِ، فَنَزَلَتْ: (وَلَا تُصَلِّ عَلَى أَحَدٍ مِنْهُمْ مَاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَى قَبْرِهِ). (الحديث ١٢٦٩ – اطرافه في: ٤٦٧٠، ٤٦٧٢، ٥٧٩٦):

ئیبنو عومەر -رەزای خوایان لێ بێ- فەرمووی: (کە عەبدولای کوڕی سەلوول ـ سەرۆکی ناپاکەکان ـ مرد، عەبدوللای کوڕی ئەم عەبدولایە، کە یەکێك بوو لەهاوڕێ ڕاست و باشەکانی پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! کراسێکی خۆتم بدەرێ، تا بیکەم بە کفن بۆ باوکم، ئەویش کراسێکی خۆیی داپێی، لە پاشا داواشی لێکرد کە نوێژی مردووشی لەسەر بکاو بۆشی بپارێتەوە، پێغەمبەریش -دروودی خوای لەسەر بێ- بەڵێنی ئەوەی پێداو فەرمووی: (ئاگادارم بکە نوێژی لەسەر دەکەم) جا کە لەشۆرین و کفن کردنی بوونەوە، عەبدوللا پێغەمبەری ئاگادارکردەوە، کە تەشریفی بچێ نوێژی مردوو لەسەر تەرمەکەی باوکی بکا، پێغەمبەریش -دروودی خوای لەسەر بێ- هەڵسا کە نوێژی لەسەر بکا، عومەر -رەزای خوایان لێ بێ- هەڵسا جلەکەی پێغەمبەری گرت و کێشایە دواوەو عەرزی کرد: قوربان ! ئەی پێغەمبەری خودا ! تۆ خودا ڕێگەی ئەمەی نەداویت، ئیتر نوێژی چی لەسەر دەکەی! ئەوەتا بەئاشکرا قورئان دەفەرموێت: ﴿اسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْ لاَ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ..﴾؟ پێغەمبەریش -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (ئەمەی تۆ دەیڵێی وایە، بەڵام من هێشتا ئومێدم ماوەو بەتەواوی ڕێگەی ئەوە نەگیراوە، چونکە لەم ئایەتەدا، کە سەبارەت بەم بابەتەن، خودا منی کردووە بەسەر پشك و خاتر خۆی کردووم و دەفەرموێ: ﴿اسْتَغْفِرْ

لَهُمْ أَوْ لاَ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ إِن تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً فَلَن يَغْفِرَ اللّهُ لَهُمْ – تەوبە /٩/٨٠﴾ واتە: ئەی پێغەمبەری ! ئارەزووی خۆتە داوای لێخۆش بوون بکە بۆیان یا مەکە، ئێمە ڕێگەی ئەوەت لێناگرین، بەلاّم ئەوە بێ سوودە، ئەگەر نەك جارو دووجار، تەنانەت حەفتا جاریش داوای لێخۆش بوونیان بۆ بکەی خودا لێیان خۆش نابێ). ئەوجا پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (دەی من لە حەفتا جار زیاتر داوای لێخۆش بوونی بۆ دەکەم). عومەر -ڕەزای خوای لێ بێ-: فەرمووی ئاخر ئەمە ناپاك و موناففە.

جا قسەبەر فەرمووی: جاکاتێ پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- نوێژی لەسەر ئیبنو سەلوول کرد، خودا ئەم ئایەتەی تری ناردە خوارەوە کەدەفەرموێت: ﴿وَلاَ تُصَلِّ عَلَى أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلاَ تَقُمْ عَلَىَ قَبْرِهِ - تەوبە/٩/٨٤﴾. واتە: بە هیچ جۆرێ نوێژمەکە لەسەر هیچ کامێ لەوان، کاتێ کە دەمرن، وە لەسەر گۆڕەکەی ڕامەوەستە بۆ نزاکردن بۆی) (بڕوانە: تاج /٦/٢٠٧/١٦-ش/ت).

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

**یەکەم:** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیەکی روون و ئاشکرایە بۆ چەندبابەتێکی تازە بابەتی هاوچەرخ، کە بەزەقیو مەترەقی لەم سەردەمەی ئێمەدا روودەدەن، بەتایبەتی لەو ناوچەو ولاّتانەی کە بەناوی ئازادی و سەربەستییەوە ڕێگەی ئیلحاد دراوە، وەهەندێ گرووپ و لایەن و کۆمەڵ و پارت پەیدابوون، بەدەق لەبەرنامەی نوسراوی خۆیاندا جاردەدەن: (ئێمە باوەڕمان بەهیچ ئایینێ نییە). وە زۆر کەسیش لە خەڵکی ولاّت، دەچنە سەر ئەم بیرو باوەڕانە، وەناوی خۆیان لەلیستی ئەوانا دەنوسن و ناسنامەی ئەو گرووپانە وەردەگرن، کە ئەمانە

لەپێش ئەم گۆڕانکارییەدا سەر بەئایینێ لەئایینەکان بوون. ئەمە لەلایێ. لەلایەکی تریشەوە زۆرینەی کات هەتا کاتی مردن، ئەوەی پێی بڵێی بۆنی ئایین لێیان نایێ، بگرە زۆرینەی کات بەئاشکراش دژی ئایین دەوەستن، وەکی تریش کاتێ دەمرن، بەشێوەیەکی گشتی، هەموو مەراسیم و پێویستیە ئایینیەکانیان بۆ دەکرێ، بە وێنە ئەگەر لە پێشدا بەئیسلام ناسرابن ئەوا وەك موسوڵمانانی تر دەشۆرێن و کفن دەکرێن و نوێژی مردوویان لەسەر دەکرێ و تەڵقینیان دائەدرێ و پرسەیان بۆ دادەنرێ و سەرخۆشی لە کەس و کاریان دەکرێ و لە پرسەکەیاندا فاتیحەو قورئان دەخوێنرێ و پاداشەکەیان دەنێررێ بۆ گیانیان و نزای باشیان بۆ دەکرێ و داوای لێخۆشبوونی گوناهیان لە خودا بۆ دەکرێ !!.

دەی بڕیاری شەرعی پیرۆز سەبارەت بەم مەراسیم و دەستووره ئایینیانە کە بۆ ئەم زەندیق و بێ بڕوا ڕەسمییانە دەکرێن چییە؟!

لەوەڵامدا دەڵێین: بەپێی بنەما شەرعییەکان و فەرموودەی زانا گەورەکان و فەرمایشتی پەڕاوە ناودارەکانی شەریعەت، دەبێ لەم جۆرە بابەتانەدا، ئەم بنەماو ڕێسا سەرەکییانە بەووردی ڕەچاو بکرێن:

١- هەرکەسێ ساغ بوویەوە کە بەشێوەیەکی شەرعی لەئایین پاشگەز بووەتەوە ئەوە لە یاسانامەی خودادا کۆمەڵێ بڕیاری چەسپاوی ناسراو، لەبارەیەوە هەیە. ئێمە لێرەدا مەبەستمان ڕوونکردنەوەی ئەو بڕیارە زانراوانە نییە، کە لە یاسانامە (شەریعەت)دا سەبارەت بە ملحدیین و مورتەددی شەرعی هەیە.

٢- بڕیاردان لەسەر وەرگەڕان لە ئایین کاری موفتیو قازییە، ئیشی ڕەشەخەڵك و عەوام نییە، وە ئەوانیش لەکاتی وادا دەبێ ئەوپەڕی دووربینی بکەن و بەکوێرانە بڕیاری کافر بوونی کەسێ نەدەن کە نیسبەتی گوفتارو

کرداری پاشگەز بوونەوەیان لێ دەدرێ وەك ئەم کەسانەی کە گووتمان.

٣- هەموو ئادەمیزادێ بە زیندوویی و بە مردوویی، بەشی خۆی رێزی هەیە، وە هەموو رێزێکی پارێزراوە، مەگەر رێزێ کە شەرع ئیسقاتی بکاو پووچی بکاتەوە.

٤- وەك لە شەرحەکانی ئەم فەرموودەیەدا هاتووە، حیکمەتی ئەم ئاسانکارییە کە پێغەمبەر خۆی -دروودی خوای لەسەر بێ- بۆ سەرۆکی مونافقەکانی ڕەوا دیوە ئەم چەند مەبەستەیە:

أ- ئومێد نەبڕاوە، دەگونجێ کابرا تەوبە بکا، یا تەوبەی کردبێ، خاتیمە مەجهووله، ئیمان پەنهانە، زۆر لەمانە لە سەرەمەرگ و نەخۆشینی مەرگا، پاش ئەوەی کە لە جاهو دەستەلات و خۆشی دنیا نائومێد دەبن، مل بۆ هەق دادەنەوێنن و دین لەکانگای دڵەوە قەبووڵ دەکەن، ئیمان هێنانی فرعەون لەکاتی نووقم بوونیدا ڕاسترین بەڵگەیە بۆ ئەم بابەتە.

وەك قورئان بەدەق دەفەرموێ: ﴿..حَتَّى إِذَا أَدْرَكَهُ الْغَرَقُ قَالَ آمَنتُ أَنَّهُ لا إِلَهَ إِلاَّ الَّذِي آمَنَتْ بِهِ بَنُو إِسْرَائِيلَ وَأَنَاْ مِنَ الْمُسْلِمِينَ. (١٠/٩٠)﴾. واتە: کاتێ فیرعەون لەدەریاکەدا غەرق بوو، ئیمانی هێناو گوتی: (واباوەڕم هێنا بەو خوایەی کەنەوەی ئیسرائیل دەیپەرستن، وە من یەکێکم لە موسوڵمانان).

ب- (استصلاحا للقلوب المؤلفة) ئیتر شتەکە سوودی هەیە بۆ مردووەکە یا نییەتی ئەوە زۆر کاریگەر نییە لەکارەکەدا. دەڵێن: بەهۆی ئەم هەڵوێستەی پێغەمبەرەوە لەگەڵ ئیبنوسەلوولدا، ئەو ڕۆژە هەزارکەس لە هۆزەکەی ئیسلام دەبن.

ج- بۆ ڕێزلێنان لە عەبدوڵڵای کوڕی، کە موسوڵمانێکی زۆر زۆرباش بووە، وەك لە ژیاننامەکەیدا کەمێ لەمەودوا ڕوونی دەکەینەوە، زۆر لەشوێنکەوتوانی

ئەم پارتە ئیلحادییانە ساویلکەو هەژارۆکەو رەشە خەڵکن، لەکارەکە بەباشی حاڵی نەبوون، پارتە زەندیقەکانیش بۆ تەفرەدانی جەماوەرە دیندارەکە تەقیە بەکاردەهێنن و زۆر بە زەقی شالآو نابەنە سەر ئایین و پەیڕەوانی. بگرە زۆرکەس لەپەیڕەوانی رەسمی ئەم پارتە زەندیق و بێ ئایینانە نوێژ دەکەن، ڕۆژو دەگرن، حەج دەکەن، هامۆشۆی مزگەوت دەکەن، خێر دەکەن.

نموونەی زۆر هەیە لەسەرئەوە کە مرۆڤ گای ڕەش نییە کە هەتا مردن لەیەك پێستا بمێنێتەوە. ئەوەتا ڕۆژانە دەبینین کەسانی تاوانبارو فاسق و زەندیق و بێ دین تەوبە دەکەن و دەگەڕێنەوە بۆ باوەشی ئایین، کێ دەڵێ ئەمانەیش تەبەڕایان لەو لایەنانە نەکردووە؟!

تەکفیری شەخصێ بەتایبەتی ـ واتە: لەپاش مردن ـ جگە لەوانەی کە لە قورئان و سوننەتدا ناو براون، کارێکی باش نییە، بگرە دروست نییە، لەپاش ڕەچاوکردنی ئەم خالآنە، بەدڵنیاییەوە دەڵێین:

أ- کردنی ئەم جۆرە شتانە، بۆ ئەم جۆرە کەسانە، بەم جۆرە نیازانەی کەباسمان کردن، قەیدی نییە، بەر مەرتەبەی عەفو دەکەون، وەبەر ئەو شتانە دەکەون، کە قورئان لەبارەیانەوە دەفەرموێت: ﴿یاایها الذین امنوا لاتسألوا عن اشیاء ان تبدلکم تسؤکم﴾. وە پێغەمبەریش ـدروودی خوای لەسەر بێ- دەفەرموێ: ﴿..وَعَفَا عَنْ أَشْيَاءَ رَحْمَةً بِكُمْ لا عَنْ نِسْيَانٍ فَلا تَسْأَلُوا عَنْها..﴾.

وەکی تریش شتەکە گەیشتوەتە ڕادەی بەلوا عاممە، لەبەرئەوە چاوپۆشی کردن و خۆ گێل کردن لێی کارێکی خراپ نییە. ئەوەندە هەیە ئەگەر کەسێ ئاگاداری تەواوی هەبێ بەسەر حاڵی مردووەکەدا، کە هەتا کاتی گیان دەرچوون، هەر بەردەوام بووە لەسەر پاشگەز بوونەوە لە ئیسلام، ئەوە باشترو چاکتر ئەوەیە، کە وەك پاشگەزو مورتەدد مامەڵەی لەگەڵدا بکا، بەلآم لە سنووری ئەم

فەرموودەیەی پێغەمبەردا، کە هاتمان دەدا لەسەر سڕ قایمی کە بەدەق دەفەرموێ: (استعینوا علی قضاء حوائجکم بالکتمان).

ب- وەك لەم فەرموودە پیرۆزەوە دەردەکەوێ، مردوو ـ گەرچی لە ژیانیدا خراپیش بێ ـ بەڵام کاتێ دەمرێ، لەلای کەسوکاری شیرین دەبێ، نەنگییەکانی دەشارێتەوە، لەبەرئەوە کەسوکاری بەپێی توانا، هەوڵ دەدەن مایەی چاوپۆشی لێکردنی خودای بۆ دابین بکەن، وە بەهۆی سەرەتای خورپە لێکەوتنەوەو سامی مەرگەوە، لەمەدا تاڕادەیێ عوزریان هەیە. سەرنج بفەرموون: ئەوەتا عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی سەلوول، لەژیانی باوکیدا، زۆر توندوتیژ بووە دەرهەقی، تەنانەت داوای لەپێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- کرد کە ڕێگەی بدات خۆی بەدەستی خۆی بدا لەگەردنی باوکی، لەسەر ئەو هەڵوێستە ناشیرینانەی کە بەرامبەر بەپێغەمبەر هەیبوو، بەڵام پێغەمبەر ڕێگەی ئەوەی نەدا، چونکە ئاگای لەو ئایەتانە بوو کە سەبارەت بە ئیبنوسەلوولی باوکی هاتبوون، لەگەڵ ئەوەیشا، ئەوەتا کاتێ ئیبنوسەلوول دەمرێ، لەبەر چاوی عەبدوڵڵای کوڕی شیرین دەبێ، مەرگ خراپەکانی دادەپۆشێ، شلۆقی هەڵوێست کارێکی وادەکا، کە ڕەحمی بۆی بجووڵێ، چونکە کاتی گلەیی و تانەو تەشەر نییە بەڵکو کاتی لێقەومان و فریاکەوتن و نزای باشە.

ئەم دیدو بۆچوونە نوێیە بوو کە وای لەعەبدوڵلا کرد داوا لە پێغەمبەر بکاو ئەو شتانە بۆ باوکی بکا، کە لە فەرموودەکەدا باس کراوون.

ج- پێغەمبەری خودا -درودی خوای لەسەر بێ- بەنهێنی، ناوی مونافق و ناپاکەکانی بە حوزەیفەی کوڕی یەمان فەرموو بوو، لەبەرئەوە کاتێ کەسێ دەمرد، پێشەوا عومەر -ڕەزای خوایان لێ بێ- لەلای خۆیەوە سەرنجی حوزەیفەی دەدا، ئەگەر ئامادەی سەر تەرمی ئەو مردووە ببوایەو نوێژی لەسەر بکردایە،

ئەوا حەزرەتی عومەریش دەیزانی کە ئەوە مونافق نییە، لەبەرئەوە ئامادەی سەر تەرمەکەی دەبوو، وەنوێژی لەسەری دەکرد، بەڵام ئەگەر حوزەیفە ئامادەی سەر تەرمەکەی نەبووایە، ئەوا عومەریش ئامادەی نەدەبوو، وە لەوەوە ئەوەی وەردەگرت خاوەن ئەو تەرمە لەو ناپاکانەیە، کەپێغەمبەر ناوەکانیانی بەنهێنی بەحوزەیفە ووتووە، دەی ئەمە بەڵگەی ئەوەیە کە ئەم جۆرە بابەتانە هەتا لەژێر پەردەوە بن باشە، وەشەرع ئاشکرا بیینە، لەبەرئەوە بڕیاری شەرع بەپێی رواڵەتە، وەئەصڵ لەم جۆرە کاتانەدا، بەرائەتە، چونکە ئەصڵ بەقای ئەصڵە کەئیمانە، وە بەرائەتە لە کوفر هەتا بەبەڵگەی دامەزراو کوفری کابرا دەچەسپێ.

د- فەرمایشتی ڕاست و دروست ئەوەیە: (کە موسوڵمان هەتا بۆی دەکرێ لەدنیاو لەقیامەتدا لەم جۆرە کەسانە دوور بێ، لە دونیادا هاوڕێتی یان نەکات و، لە گۆڕستان گۆڕی لەگەڵ گۆڕیاندا نەبێ، چونکە نزیکی مرۆڤی خراپ لە هەردوو دنیادا مایەی سەراسێیە).

هـ- لەبابەتی نیکاح و تەڵاق و میرات و شتی تری وایشدا هەمان حسابیان بۆ بکرێ.

**دووەم:** عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی سەلوول (رەزای خوای لێ بێ) یەکێکە لە هاورێ زۆر بەرێزەکانی پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- خەزرەجییە، ئەنصارییە، لەپێشدا ناوی حوباب بوو، پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- ناوەکەی گۆڕی و ناوی نا عەبدوڵڵا ئامادەی غەزای بەدرو ئوحودو گشت غەزاواتەکانی تری پێغەمبەر بووە، لەخزمەت پێغەمبەر خۆیدا وەیەکێ بوو لەنووسەرانی سرووش، وە لەغەزای تەبووکا عەبدوڵڵای باوکی، کە ناودارە بە ئیبنوسەلوول، کە سەرۆکی ناپاکەکان بوو، هەڕەشەی لەپێغەمبەر کردو

گوتی: (من و موحەممەد کاتێ گەڕاینەوە بۆ شاری مەدینـە، کامـمان بەدەسـەڵات و تواناتر بوو، بەوی ترمانی چۆڵ دەکات، مەدینە یا بۆ من دەبێ یا بۆ ئەو) جا کاتێك قورئـانی پـیرۆز، پـەردەی لەسـەر ئـەم قـسە ژەهراوییـەی ئـیبن سـەلوول هـەڵمالی، عەبـدوڵڵای کـوڕی، پـشتی پێغەمبـەری گـرت و لـەدژی بـاوکی وەسـتاو بەپێغەمبـەری فـەرموو: (سـوێندم بـە خـودا ئـەی پێغەمبـەری خـودا ! دامـاوو ناتەوان ئەوە، عەزیزو دلێروتوانا تۆی!) هـەروەها فـەرمووی: (ئـەی پێغەمبـەری خوا ! ئەگەر ڕێگەم پێ بدەی بەدەستی خۆم دەیکوژم) بەڵام پێغەمبـەر -دروودی خوای لەسەر بێ- ڕێگەی پێ نەدا، پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- زۆر لێی ڕازی بوو، وەگەڵێ جار پەسنو مەدحی ئەوی کردووە، لـە شـەڕی هەڵگەڕاوەکانـدا (ئــەهلی ریــددە) دا، لــەکاتی جێنــشینی ئــەبوبکری ســدیقدا، لەســاڵی دوانــزەی کۆچییدا، لە یەمامە شەهیدبوو، (ڕەزای خوای لێ بـێ) (بـڕ: شـەریعەتی ئـیسلام، مغنی موحتاج، فیقهی ئاسان، باسی تەرم).

ئەمەیش بەشێکە لە فەرموودەی ژمارە (٢١٠٣)ی تەجرید، کە تەواوکەری ئەم بابەتەیە:

یـارەببی خودایـە سـەرمان لێ نەشـێوێنی، وەڕێگـەی ڕاسـتمان نـیشان بـدەی، وەبـەهۆی نـەفامیو سەرلێشێواویی هەنـدێ لایەنـەوە، گـەلی کـوردی سـتەمدیدە تووشی ئاشووبو فەرتەنەو ئاژاوەی نوێ نەکەی وە نـەبین بـەو هۆزانـە، کـەخوا لەبارەیانەوە دەفەرموێ: ﴿وَاتَّقُوا فِتْنَةً لاَتُصِيبَنَّ الَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْكُمْ خَاصَّةً﴾.

جێگـەی داخـە، کەئێمـەی گـەلی کـورد، بەتایبـەتی لـەعێراقی بـەعـث دا، لەسـێبەری عوروبـەو عونـصورییەتدا، حاڵمـان لەکۆیلـە زۆر خـراپتر بـوو، ژێـر دەستەو ژێر چەپۆکە بووین، هـەتا کاسـەی زۆروسـتەم پـڕ بـوو، وەخـوای گـەورە بەمیهرەبانی خـۆی دەرووی ڕەحمـەتی لێ کردینـەوە، وەئـازادیو سەربەسـتی پـێ

بەخشین، وەبووین بەخاوەنی نامووس‌و قەوارەو کیان‌و ولآتی خۆمان، وەخودا دوژمنەکەمانی کرد بەپەندی بسات، سەد هەزار خوزگەی بەجاری جارانی ئێمە، کەچی هێشتا بەتەواوی پڕ بەسینگی خۆمان هەوای ئازادیمان هەڵ نەمژی بوو، بەدەنکە جۆێی زەڕین، لەباتی ئەوەی کەبەپێ ی یاسای دەستووری خودایی: ﴿لئن شكرتم لأزيدنكم﴾ سوپاسی خودا بکەین‌و هەوڵ بدەین کەئەم نیعمەتی سەربەستی‌و ئازادی یە، ئەمجارەش وەك لەمەوپێش لەکیس نەدەین، وەخۆمان لەناوچەکەدا لەبەر چاوی دۆست‌و دوژمن شیرین بکەین، وەبیسەلمێنین ئێمە گەلێکی باوەڕ داری خاوەن نامووس‌و حیثیەت و رەفتاری بەرزین، دورترین گەلین لەبێ دینی‌و بێ ڕەوشتی کەچی لەجیاتی ئەوە، ئێستا ڕاگەیاندنی کوردستانی ئازاد، شەوو ڕۆژ، نالآی دژەدینی‌و زەندیقی هەڵکردووە، هەر خەریکی پەخشی بێ ڕەوشتی‌و گۆرانی خەلاعی‌و بلآوکردنەوەی بەربەرەلآیی نێرومێیە، تەنانەت زۆریان بۆ قوتابی‌و خوێندکارە کان هێناوە، کەفێرگەکان بکەن بەجێگەی عیشقبازی‌و زانکۆ بکەن بەگانکۆ، وەبۆ ئەم مەبەستە گلآوەی خۆیان، کۆمەڵێ کۆلکە میرزاو نیمچە ئەفەندی‌و خوێنەوارانی دەرباری خۆیان کردووە بە (پەڕو فیسۆرو مەلا چڵکاو خۆر!).

وەلەسەر شاشەو کەناڵەکانی ڕاگەیاندن، وەك مێکی ماوس‌و بووکەڵە دارینە، بەردەوام قوتیان دەکەنەوەو فوویان تێ دەکەن‌وسەرو مڕ ڕەف‌و بێ ڕێزی بەبیرو باوەڕی پیرۆزی ئایینی‌و ڕەوشتی گەلی کورد دەکەن‌و بەزۆری زۆرداری دەیانەوێ ئەو خەڵکەیش وەك ئەوان زەندیق‌و بەرەلآو بێ ڕەوشت‌و بێ نامووس‌و حیزو سەفیل‌و ترۆو هێبی بن، کورت‌و پوخت مەبەستی سەرەکی یان ئەوەیە کەئەو خەڵکەش وەك خۆیان بەرەلآو لەزەتپەرست بێ‌و هەموو لەکین‌و چون یەکین بێ، نەبادا خەڵك ڕێزدار ئەوان بێ ڕێز، وەك قورئان بەدەق دەفەرموێ: ﴿ودوا

لو تكفرون كما كفروا فتكونون سـواء﴾ بـەڵێ کەناڵەکانی ڕاگەیانـدنیان کـردووە بەبلوێری شەیتان لەباتی ئـەوەی کەئـەم ڕاگەیاندنـە بەهێزانـە رەحمـەتی خـودا بـڵاو بکەنـەوەو ڕەفتـاری شـیرین پـەخش بکەنـەوەو نـاوی جـوان بـۆ کـوردو کوردستان دروست بکەن‌و بیانووی چەوسێنەرەوەکانی کوردو کوردسـتان ببڕن، کەگوایـە کـورد بـێ دیـن‌و هـۆزێکی خێڵەکی‌و شـەڕانی‌و دوور لەنـەریت‌و بـاوو کەلتووری جوانی ناوچـەکەن، لـەباتی ئـەوەی کـەدەرزی مەردایـەتی‌و ئازایـەتی‌و دلێـری لـەلاو و گەنجـەکانمان بـدەن، بـەکوڕو کـچیانەوە، هـەتا کاتـێ کوردسـتان پێویـستی بـەخوێنی گەشـی ئـاڵی ئـەوان بـوو، بـەرخی نێـر بـن بـۆ سـەربڕین‌و بیچەسپێنن: شێر کە لەلانە دەرچوو، چ نێر چ مێ! لەجیاتی ئەوەی ڕاگەیانـدنی هـەرێم ببـێ بەمەشـخەڵ لەناوچـەکەداو ببـێ بەمینبـەرێکی جوان بـۆ پەخـشی خووی جوان‌و عادەتی شیرین‌و ژیانی پڕ لەشەرم‌و شکۆو سەربەرزی دیـن‌و دنیـا، خەڵکی فێری نیشتمان پەروەری بکا، فێری خەبات‌و تێکۆشان‌و نەبەرد بکا، وەك هـەموو ڕاگەیانـدنێکی بەرپرسـی جیهانی پێشکەوتوو، بەتایبـەتی لەناوچـەکەی خۆماندا، کەچی لەجیاتی ئـەوە، ڕاگەیانـدنی کوردی بـووە بەنوێنـەری هۆلیـۆدو لەپەخشی بەر بەرەڵایی دا، شان لەشانی کەناڵە جنسی یەکان دەدا، کارگەیشتۆتە ئەوە، بەپێچەوانەی ڕاگەیاندنی هـەموو جیهـان، ڕاگەیانـدنی چەواشـەی کـوردی، چلەی مردوو لەسەر گۆڕەکەی بەئامادەبوونی کەسوکارەکەی ناو دەنێ ئاهـەنگ‌و وەك خۆیـان دەڵـێن: (ئاهـەنگی چـلەی پێـشمەرگەی دێـرین لەسـەر گۆڕەکـەی بەچەند گۆرانییەك لەلایەن فلانـە گـۆرانی چییەوە رازایـەوە!!) مـن لـەم جێگـە پیرۆزەدا، بەنوری فیراسەی ئیمانی، لەسەر زمانی ئەو جەماوەرە سـتەمدیدە بـێ ئـاوو نـان‌و بـێ کارەبـاو نـەوت‌و غـازو بـەنزین‌و بـێ خانـەو لانـەو رەشـو رووتـە، عـەرزی ئـەم ڕاگەیاندنـە چەواشـەیە دەکـەم: (... بـەڵێ دەتـوانن یـەك دووسـاڵی

تریش بەم جۆرە بەنگو تلیاکە، خەڵکێکی زۆر سڕو چەواشە بکەن، وەسوودو بەهرە لەرقو غەزەبی گەلی کورد لەسەدامو ڕژێمەکەی وەربگرنو نانو پیازی پێوە بخۆنو ئەم دیاردەیە بەرهەم بهێننو بۆ چەند ساڵێکی تریش بۆ خۆیان بخۆنو بدزنو گیرفان پڕکەن، تەنانەت مەلای (وُعَّاظ السَّلاَطين) یش فەتوای ئەوەیان بۆ بدەنو ژنی دووەمو سێیەمو چوارەمیان لێ مارە ببڕنو تەلاقنامە بۆ ژنە دێرینەکانیان بنووسن، وەڕێك وەك ڕژێمە داپلۆسنەرەکان، کۆمەڵێ کاسەلیسو چڵکاو خۆر لەخۆیان کۆبکەنەوەو، خەڵکێکی زۆریش، لەبەر دڵسافیو خۆشباوەڕیو ساویلکەیی خۆیان باوەڕیان پێ بکەن وەك گەنەی گونی گا بلکێن پێتانەوە، بەلاّم خەیاڵیان خاوە، هاکا قاری خوداو رقو تووڕەیی ملەت، دەق وەك زبڵو خاشاك، خۆیانو بێ ڕەوشتیو گەندەڵیو زەندیقی کەیانیان تووڕ دایە ناو زبڵدانی مێژووەوە!!

ئێمە ڕووی دەممان لەجەماوەری گەلی کوردستانە، دەنا ئەو لەرێدەر چوانە، وشترەکەی هۆزی ثەموود، بەخۆیو بەچکەکەیەوە لەشاشەی کەناڵەکەیان دەربچێ باوەڕی پێ ناکەنو بگرە سەریشی دەبڕن، ئەمانە لەو جۆرە لەخوا دوورە بەدرەوشتانەن، ئەگەر بشتۆپنو لەقەبرو قیامەتا حسابو کتابو دۆزەخو سزابە چاوی خۆیان ببینن، ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ دنیا لەبێ دینی تێ هەڵ دەچنەوە! وەك قوورئان بەدەق دەفەرموێ: (ولو ردوا لعادوا لما نهوا عنه).

## (٤١) باب قتل أبي جهل
## باسی کوشتنی ئەبو جەهل

١١٧٨- عَنْ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ (رَضِـيَ اللهُ عَنْـهُ) قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اللَّـهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): « مَنْ يَنْظُرُ لَنَا مَا صَنَعَ أَبو جَهْـلٍ »؟ فَـانْطَلَقَ ابْـنُ مَـسْعُودٍ فَوَجَـدَهُ قَـدْ ضَرَبَهُ ابْنَا عَفْرَاءَ حَتَّى بَرَدَ، قَالَ: فَأَخَذَ بِلِحْيَتِهِ فَقَالَ: آنْتَ أَبُـو جَهْـلٍ؟! قَـالَ: وَهَـلْ فَـوْقَ رَجُلٍ قَتَلْتُمُوهُ أَوْ قَالَ: قَتَلَهُ قَوْمُهُ؟ (قَالَ: وَقَالَ أَبو مِجْلَزٍ: قَالَ أَبو جَهْلٍ: فَلَوْ غَيْـرُ أَكَّـارٍ قَتَلَنِـي). {الحـديث: ٤٦٣٨ = ٤٦٢٦ فـم. تجريـد/٤، رقـم: ١٥٢٦ = ٣٩٦٢، ٣٩٦٣، ٤٠٢٠}: [١١٧٨]

ئەنــەس (ڕەزای خــودای لێ بــێ) دەفــەرموێ: پێغەمبــەر (دروودی خــودای لەسەر بێ) فـەرمووی: (کێ دەچێ بزانـێ کـە ئـەبو جـەهل مـاوە یـا کـوژراوە؟) ئیبنو مەسعوود دەچێ تەماشا دەکا وا دوو کوڕەکەی عـەفراء کەناویان مـەعازو موعەوویز بوو، بەشمشێر لێیان داوەو لەپـەل و پۆیـان خـستووەو خەریکە سـارد دەبێتەوەو دەمرێ. جا ئیبنـو مەسـعوود (ڕەزای خـودای لێ بـێ) ڕیـشی دەگـرێ و پێی دەڵێ: تـۆ ئـەبو جـەهلیت؟ دەڵـێ: بـەڵێ ئـەوم، جا چی تیایـە، پیـاوێ ئێـوە بیکوژن، نەبۆ ئـەو شوورەییەو نـەبۆ ئێوە شـانازییە، یا دەڵـێ: چی تیایـە پیـاو هـۆزی خـۆی بیکـوژێ، بـەڵام خۆزگـا پیـاوێکی پیاوانـە بیکوشـتمایەو، بەدەسـتی وەرزێـرو سـەپان نەکوژرامایـە، کـە مەبەسـتی دوو کوڕەکـەی عـەفراء بـوو، کـە لەئەنصار بوون ئەنصاریش خاوەن دەغڵ و دان و باخ و بۆلاخ بوون.

---

[١١٧٨] تجریـد/٤، ژمـارە: ١٥٢٦ = ٣٩٦٢ بخـاری. پوختـەی موسـلیم/٣، ژمـارە: ١١٦٩ = ٤٦٣٨ شـیحا (بخاری رقم الكتاب/٦٤ رقم الباب/٨).

به ئیبنو مەسعوود دەڵێ: لەوکاتەدا کەپێ دەنێتە سەر ڕێسی ملی هەتا سەری لەلاشەی جیابکاتەوە، لەوکاتەدا پێی دەڵێ: ئەی شوانە بچکۆڵەی ران! ئەی بەرخە لەوان! بەڕاستی چوویتە سەر جێگەیەکی بەرزی سەخت! دواتر ئیبنو مەسعوود هەندێ قسەی تری لەگەڵدا دەکاو ئەوجا بەتەواوی دەیکوژێو بەدۆزەخی شاد دەکاو، سەرەکەیی لێ دەکاتەوەو دەیهینێ بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ). {تاج/٤، زنجیرە: ٨٦، ژمارە: ٤٥٨٦، چ/٤}.

## (٤٢) باب قتل كعب بن الأشرف طاغوت اليهود

## کوشتنی کەعبی کوڕی ئەشرەف، کە ستەمکارێکی سەرکەشی جوولەکەکان بوو

١١٧٩- عنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللّهِ (رَضيَ اللهُ عَنْهُما) يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): (مَنْ لِكَعْبِ بْنِ الاشْرَفِ فَانَّهُ قَدْ اذى اللّٰهَ وَرَسُولَهُ فَقَامَ مُحَمَّدُ بْنُ مَسْلَمَةَ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللّٰهِ: اتُحِبُّ انْ اقْتُلَهُ؟ قَالَ: نَعَمْ قَالَ: فَاذنْ لِي انْ اقُولَ شَيْئًا قَالَ: قُلْ: فَاتَاهُ مُحَمَّدُ بْنُ مَسْلَمَةَ فَقَالَ: انَّ هَذا الرَّجُلَ قَدْ سَالَنَا صَدَقَةً وَانَّهُ قَدْ عَنَّانَا وَانّي قَدْ اتَيْتُكَ اسْتَسْلِفُكَ قَالَ: وَايْضا وَاللّٰهِ لَتَمَلُّنَّهُ قَالَ انَّا قَدْ اتَّبَعْنَاهُ فَلا نُحِبُّ انْ نَدَعَهُ حَتَّى نَنْظرَ الَى ايِّ شَيْءٍ يَصِيرُ شَانُهُ وَقَدْ ارَدْنَا انْ تُسْلِفَنَا وَسْقًا اوْ وَسْقَيْنِ فَقَالَ: نَعَمِ ارْهَنُونِي قَالُوا: ايَ شَيْءٍ تُرِيدُ؟ قَالَ: ارْهَنُونِي نِسَاءكُمْ قَالُوا: كَيْفَ نَرْهَنُكَ نِسَاءنَا وَانْتَ اجْمَلُ الْعَرَبِ قَالَ: فَارْهَنُونِي ابْنَاءكُمْ ، قَالُوا: كَيْفَ نَرْهَنُكَ ابْنَاءنَا فَيُسَبُّ احَدُهُمْ فَيُقَالُ: رُهِنَ بِوَسْقٍ اوْ وَسْقَيْنِ هَذا عَارٌ عَلَيْنَا وَلَكِنَّا نَرْهَنُكَ اللامَةَ قَالَ سُفْيَانُ: يَعْنِي السِّلاحَ فَوَاعَدَهُ انْ يَاتِيَهُ.

فَجَاءهُ لَيْلا وَمَعَهُ ابُو نَائِلَةَ وَهُوَ اخُو كَعْبٍ مِنْ الرَّضاعَةِ فَدَعَاهُمْ الَى الْحِصْنِ فَنَزَلَ الَيْهِمْ فَقَالَتْ لَهُ امْرَاتُهُ: ايْنَ تَخْرُجُ هَذهِ السَّاعَةَ فَقَالَ: انَّمَا هُوَ مُحَمَّدُ بْنُ مَسْلَمَةَ وَاخِي ابُو نَائِلَةَ ،قَالَتْ: اسْمَعُ صَوْتًا كَانَّهُ يَقْطرُ مِنْهُ الدَّمُ . قَالَ: انَّمَا هُوَ اخِي مُحَمَّدُ

بْنُ مَسْلَمَةَ وَرَضِيعِي ابُو نَائِلَةَ انَّ الْكَرِيمَ لَوْ دُعِيَ الَى طَعْنَةٍ بِلَيْلٍ لاجَابَ قَالَ: وَيُدْخِلُ مُحَمَّدُ بْنُ مَسْلَمَةَ مَعَهُ رَجُلَيْنِ.

وفي رواية: ابُو عَبْسِ بْنُ جَبْرٍ وَالْحَارِث بْنُ اوْسٍ وَعَبادُ بْنُ بِشْرٍ ،فَقَالَ: اذا مَا جَاء فَانِّي قَائِلٌ بِشَعَرِهِ فَاشَمُّهُ فَاذا رَايْتُمُونِي اسْتَمْكَنْتُ مِنْ رَاسِهِ فَدُونَكُمْ فَاضرِبُوهُ وَقَالَ مَرَّةً: ثمَّ اشِمُّكُمْ فَنَزَلَ الَيْهِمْ مُتَوَشِّحًا وَهُوَ يَنْفَحُ مِنْهُ رِيحُ الطيبِ فَقَالَ: مَا رَايْتُ كَالْيَوْمِ رِيحًا ايْ اطيَبَ ، قَالَ: عِنْدِي اعْطرُ نِسَاء الْعَرَبِ وَاكْمَلُ الْعَرَبِ ،فَقَالَ: اتَاذنُ لِي انْ اشُمَّ رَاسَكَ؟ قَالَ: نَعَمْ فَشَمَّهُ ثمَّ اشَمَّ اصْحَابَهُ ثمَّ قَالَ: اتَاذنُ لِي؟ قَالَ:نَعَمْ فَلَمَّا اسْتَمْكَنَ مِنْهُ قَالَ: دُونَكُمْ فَقَتَلُوهُ ثمَّ اتَوْا النَّبِيَ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَاخْبَرُوهُ)، (الحديث: ٤٠٣٧، اطرافه في: ٢٥١٠، ٣٠٣١، ٣٠٣٢، ٤٠٣٢): [١١٣٩]

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (کێ دەتوانێ چارەی کەعبی کوڕی ئەشرەف بکاو لەناوی ببات، چونکە بەڕاستی ئازاری خواو پێغەمبەری خودا ئەدا؟). موحەممەدی کوڕی مەسلەمەش دەفەرموێ: ئەی پێغەمبەری خودا! حەزدەکەی کە بیکوژم، فەرمووی: (بەڵێ) فەرمووی: بەڵام ڕێگەم پێ بدە کەشتێ لەبارەی تۆوە بڵێم، کەببێ بەهۆی ئەوە کە بەو فێڵە بیخەڵەتێنم؟ فەرمووی: (بیڵێ) جا موحەممەدی کوڕی مەسلەمەش چوو بۆلای و پێی گوت: ئەم پیاوە هەر ڕۆژەی داوای شتێکمان لێ دەکا، ڕۆژێ داوای زەکاتمان لێ دەکا، بەڕاستی ڕەنجاندووینی و بێزاری کردووین وە منیش هاتووم بۆلات یەك دوو وەسقمان بەقەرز بدەیتێ .

---

[١١٣٩] تجرید/٤، ژمارە: ١٥٤٠ - ٤٠٣٧ بخاری. مسلم: ١٨٠١ - پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١١٧٠ - ٤٦٤٠ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٦٤ رقم الباب/١٥).

کەعبیش دەڵێ: بەخوا دیسانیش لێی بێزارتریش دەبن، ئەویش گوتی: تازە ئێمە شوێنی کەوتووین و تووشبووین، حەزیش ناکەین هەروا بەبێ مەهانە وازی لێ بێنین، جارێ هەروا دەمێنین هەتا بزانین کاروباری ئەم پیاوە دەگات بەچی، وە دەشمانەوێ وەسقێ دوو وەسق خۆراکمان بەقەرز پێ بدەیت؟ کەعب گوتی: بەڵێ باشە، بەڵام دەبێ بارمتەم پێ بدەن، وتیان: چیت دەوێ کە لەبارمتەدا دای بنێین؟ گوتی: ژنەکانتانم بەبارمتە لەلا دانێن، گوتیان: تۆ جوانترین عەرەبی، چۆن ژنت بەبارمتە لەلا دابنێین؟ تووشی سەرشۆڕی دەبین. گوتی: دەی کوڕی خۆتانم بدەنێ بەبارمتە . گوتیان: ئەویش هەر زەحمەتە، سبەی جنێویان پێ دەدەن و پێیان دەڵێن: ئەی بارمتەی تەغارێ خۆراك! شتی وا ریسواییە بۆ ئێمە، بەڵام زریە واتە: چەك و شتی وات لەلا بەبارمتە دادەنێین.

ئەویش بەڵێنی پێ دا کەبچی بۆلای، ئەویش شەوێ چوو بۆلای، ئەبونائیلەیشی لەگەڵ خۆیدا برد، کەبرای شیری کەعب بوو، جا ئەویش بانگی کردن بۆ ناوقەلاکەو هاتە خوارەوە بۆ لایان، ژنەکەی پێی دەڵێ: بەم ناوەختە بۆ کوێ دەچیت؟ گوتی: خۆمانن: تەنیا موحەممەدی کوڕی مەسلەمەو ئەبو نائیلەی برامە، ژنەکەی گوتی: دەی من دەنگێ دێتە گوێم خوێنی لێ دەتکێ، کەعب گوتی: خۆمانن، هەرموحەممەدی کوڕی مەسلەمەی برام و ئەبو نائیلەی هاوشیرمە، پیاوی مەردیش بەشەو ئەگەر خۆلك بكرێ بۆپەتی سێدارەش دەچێ بەپیریەوە! دەڵێ: موحەممەدی کوڕی مەسلەمەش لەگەڵ خۆیدا دوو پیاویتریش دەباتە ژوورەوە، لەگێرانەوەیەکا: ئەم سێ کەسەی لەگەڵ خۆی بردە ناو قەلاکە: ئەبوعەبس کوڕی جەبرو حاریسی کوڕی ئەوس و عەببادی کوڕی بیشر.

موحەممەدی کوڕی مەسلەمە تەگبیر بۆ هاوڕێکانی دەکاو دەڵێ: کاتێ هات من قژەکەی دەگرم و بۆنی دەکەم، جا کە ئێوە من تان دی کەدەستم لە قژەکەی

گیربووەو سەریم توند گرتووە، ئیتر خۆکەون و دایگرن بە شمشێر جارێکیان گوتی: بە ئێوەش دەڵێم ئادەی بۆنی بکەن.

جا کەعب خۆی لەبەرکردو خۆی پرچەك کردو هاتەخوارەوە بۆلایان‌بۆن و بەرامەی پرشوێنەکەی کرد، موحەممەدی کوڕی مەسلەمەیش بۆ فێڵ گوتی: قەت بۆنی وا خۆشم نەدیوە . کەعب بەشانازییەوە گوتی: بۆنخۆشترین و جوانترین ژنی عەرەبانم لەلایە، لەگەڵیان کەیف دەکەم، ئەم بۆنەهی ئەوەیە ، موحەممەدیش دەڵێ: ڕێگەم نادەی کەبۆنی ئەم بۆنە خۆشەی سەرت بکەم؟ کەعب گوتی: بفەرموو، ئەویش خۆی بۆنی کردو، ئەوجا هاوڕێکانیشی بۆنیان کرد، دیسان گوتیەوە: ڕێگەم دەدەیتەوە کەبۆنی سەرت بکەمەوە؟ گوتی: بەڵێ:جا کەچنگی لەسەری گیربوو، گوتی: ئادەی دایگرن، ئەوانیش کوشتیان، لە پاشا گەڕانەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەرو هەواڵەکەیان پێ ڕاگەیاند).

## (٤٣) باب غَزْوَةِ خَيْبَرَ
## باسی غەزای خەیبەر

١١٨٠- عَنْ أَنَسٍ (رضى الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) غَزَا خَيْبَرَ، قَالَ: فَصَلَّيْنَا عِنْدَهَا صَلاَةَ الْغَدَاةِ بِغَلَسٍ، فَرَكِبَ نَبِيُّ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، وَرَكِبَ أَبُو طَلْحَةَ، وَأَنَا رَدِيفُ أَبِي طَلْحَةَ، فَأَجْرَى نَبِيُّ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فِي زُقَاقِ خَيْبَرَ، وَإِنَّ رُكْبَتِي لَتَمَسُّ فَخِذَ نَبِيِّ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، وَانْحَسَرَ الإِزَارُ عَنْ فَخِذِ نَبِيِّ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَإِنِّي لأَرَى بَيَاضَ فَخِذِ نَبِيِّ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، فَلَمَّا دَخَلَ الْقَرْيَةَ قَالَ: « اللَّهُ أَكْبَرُ خَرِبَتْ خَيْبَرُ إِنَّا إِذَا نَزَلْنَا بِسَاحَةِ قَوْمٍ فَسَاءَ صَبَاحُ الْمُنْذَرِينَ »، قَالَهَا ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، قَالَ: وَقَدْ خَرَجَ الْقَوْمُ إِلَى أَعْمَالِهِمْ فَقَالُوا: مُحَمَّدٌ وَاللَّهِ! (قَالَ عَبْدُ الْعَزِيزِ: وَقَالَ بَعْضُ أَصْحَابِنَا: مُحَمَّدٌ

وَالْخَمِيسُ). قَالَ وَأَصَبْنَاهَا عَنْوَةً، وَجُمِعَ السَّبْيُ، فَجَاءَهُ دِحْيَةُ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ: أَعْطِنِي جَارِيَةً مِنَ السَّبْيِ؟ فَقَالَ: اذْهَبْ فَخُذْ جَارِيَةً، فَأَخَذَ صَفِيَّةَ بِنْتَ حُيَيٍّ، فَجَاءَ رَجُلٌ إِلَى نَبِيِّ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، فَقَالَ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ أَعْطَيْتَ دِحْيَةَ صَفِيَّةَ بِنْتَ حُيَيٍّ سَيِّدِ قُرَيْظَةَ وَالنَّضِيرِ؟. مَا تَصْلُحُ إِلاَّ لَكَ، قَالَ: « ادْعُوهُ بِهَا »، قَالَ: فَجَاءَ بِهَا، فَلَمَّا نَظَرَ إِلَيْهَا النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: خُذْ جَارِيَةً مِنَ السَّبْيِ غَيْرَهَا، قَالَ: وَأَعْتَقَهَا وَتَزَوَّجَهَا، فَقَالَ لَهُ ثَابِتٌ يَا أَبَا حَمْزَةَ مَا أَصْدَقَهَا؟ قَالَ: نَفْسَهَا، أَعْتَقَهَا وَتَزَوَّجَهَا، حَتَّى إِذَا كَانَ بِالطَّرِيقِ جَهَّزَتْهَا لَهُ أُمُّ سُلَيْمٍ، فَأَهْدَتْهَا لَهُ مِنَ اللَّيْلِ، فَأَصْبَحَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) عَرُوسًا، فَقَالَ: « مَنْ كَانَ عِنْدَهُ شَيْءٌ فَلْيَجِئْ بِهِ »، قَالَ: وَبَسَطَ نِطَعًا، قَالَ: فَجَعَلَ الرَّجُلُ يَجِيءُ بِالأَقِطِ، وَجَعَلَ الرَّجُلُ يَجِيءُ بِالتَّمْرِ، وَجَعَلَ الرَّجُلُ يَجِيءُ بِالسَّمْنِ فَحَاسُوا حَيْسًا، فَكَانَتْ وَلِيمَةَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم).

{الحديث: ٤٦٤١ = ٤٦٢٩ فـم. تجريد/١، رقم: ٢٣٥ = ٣٧١، ٦١٠، ٩٤٧، ٢٢٢٨، ٢٢٣٥، ٢٨٨٩، ٢٨٩٣، ٢٩٤٣، ٢٩٤٤، ٢٩٤٥، ٢٩٩١، ٣٠٨٥، ٣٠٨٦، ٣٣٦٧، ٣٦٤٧، ٤٠٨٣، ٤٠٨٤، ٤١٩٧، ٤١٩٨، ٤١٩٩، ٤٢٠٠، ٤٢٠١، ٤٢١١، ٤٢١٢، ٤٢١٣، ٥٠٨٥، ٥١٥٩، ٥١٦٩، ٥٣٨٧، ٥٤٢٥، ٥٥٢٨، ٥٩٦٨، ٦١٨٥، ٦٣٦٣، ٦٣٦٩، ٧٣٣٣. نسائي. نكاح: ٣٣٨٢. أبو داود. خراج وفيئ} :[١١٨٠]

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سوپای ئامادەکردو بەرەو خەیبەر کەوتەڕێ، تاریکو لێڵەکە لەپاڵ قەڵای خەیبەردا نوێژی بەیانیمان کرد، ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سواری وڵاخەکەی بۆوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وڵاخەکەی خۆی بەناو کووچەو کۆڵانەکانی خەیبەردا غاردەدا، منو ئەبو

---

[١١٨٠] تجرید/١، ژمارە: ٣٧١ - ٦١٠ بخاری. پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ٨٠٦ = ٤٦٤١ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٨ رقم الباب/١٢).

طەلحەی زڕبابم لەنزیکی پێغەمبەرەوە بووین، من لەپاشکۆی ئەبو طەلحەدا بووم، تەنانەت کەشکەژنۆم لەپاشکۆی ئەبو طەلحەوە دەیدا لەڕانی پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ) جا لەئەنجامی ولاخ تاودانو جەنجاڵیو پاڵە پەستۆدا رانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) رووت بوو، تەنانەت من بەچاوی خۆم سپیدەی رانی پێغەمبەرم بینی.

کاتێ پێغەمبەرو سوپاکەی هەڵڕژانە ناو گوندەکەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (اللّٰهُ أَكْبَرُ خَرِبَتْ خَيْبَرُ إِنَّا إِذَا نَزَلْنَا بِسَاحَةِ قَوْمٍ فَسَاءَ صَبَاحُ الْمُنْذَرِينَ): ئەڵلاهوئەکبەر، وێران بوو خەیبەر، لەراستیدا ئێمە هەرکاتێ بۆ هۆزێ بچینە مەیدان، ئیتر ئەو تۆقیوانە بەیانی رۆژی رەشیانە!) وە ئەم فەرمایشتەی سێجار دووبارە کردەوە، کە ئیقتیباسە لەم ئایەتە پیرۆزە: {فَإِذَا نَزَلَ بِسَاحَتِهِمْ فَسَاءَ صَبَاحُ الْمُنذَرِينَ – ٣٧/١٧٧}. واتە: کاتێ تۆڵەی سەختی خودا بەردەرگا بەهۆزی بێبڕوا دەگرێو، لەهەموو لاوە گەمارۆیان دەدا، ئیتر ئەو گەلە تۆقیوانە سەر لەبەیانی رۆژی رەشیانە). فەرمووی: لەولایشەوە جوولەکەکان ئاگایان لەم هەڵمەتە نەبوو، سەر لەبەیانی وەك رۆژانی تر وەدەرکەوتن بۆسەر مەزراو ئیشو کاری رۆژانەی خۆیان، لەپڕ لووتیان تەقی بەلووتی لەشکری ئیسلاما، جا هاواریان لێ هەڵساو گوتیان: ئای! ئەمە موحەممەدو لەشکرەکەیەتی، هاتوون بۆسەرمان.

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: قەڵای خەیبەرمان بەزەبری بازوو، لەچنگی دوژمن رزگارکرد. کاتێ ژنە دیلەکان کۆکرانەوە، دەحیەی کەلبی هاتە خزمەتی حەزرەت، عەرزی کرد ئەی پێغەمبەری خودا! لەم ژنە تاڵانییانە کەنیزەکێکم پێ بدە، فەرمووی: (برۆ کەنیزەکێ ببە). دەحیە پیاوێکی قۆز بوو، زۆرجاران جوبرەئیل لە شێوەی ئەودا دەهات بۆ خزمەتی پێغەمبەر (درورودی

خودای لەسەر بێ)و سرووشی بۆ دەهێنا، دەحیە چوو صەفییەی کچی حویەیی برد بۆ خۆی، بەڵام پیاوێ هات گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! صەفییەی کچی حویەی، کە خانمی ژنانی هۆزی بەنی قورەیظەو بەنی نەضیرە داوتە بە دەحیە، چۆن شتی وا دەگونجێ، ئەو خانمە خانەدانە بۆ کەسی تر دەست نادا، مەگەر بۆ تۆی پێغەمبەری خودا!).

ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئادەی دەحیە بانگ کەن ئەو ژنە بهێنێ). دەحیە هاتەوەو صەفییەی هێنایەوە، کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەماشای صەفییەی کرد، بە دەحیەی فەرموو: (برۆ لەو ژنگەلە بەتاڵانی گیراوانە کەنیزەکێکی تر بەرە بۆخۆت).

فەرمووی: ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) صەفییەی ئازادکردو مارەی کرد بۆ خۆی، ثابیتی بەنانی بە ئیمامی ئەنەسی فەرموو: ئەی باوکی حەمزە! چی کرد بەمارەیی بۆی؟ فەرمووی: خودی خۆی کرد بەمارەیی بۆی، لەپێشا لەباتی مارەیی ئازادی کردو ئەوسا مارەی کرد لەخۆی، جاکاتێ گەڕانەوە بۆ مەدینە، لەڕێگە شەوێ، ئومموسولەیمی دایکم تەدارەکی بووکی بۆ صەفییە خستو جیازیی بووکی بۆ کردو کردی بە بووكو پێشکەشی کرد بە پێغەمبەر، بۆ بەیانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) زاوا بوو، ئەوسا فەرمووی: (هەرکەسێ خۆراکی هەیە بابچێ بیهێنێ).

نانی شاییەکەی برێتی بوو لەوە، کە حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی کرد، سفرەیەکیان ڕاخست، ئیتر هەرکەس لەلای خۆیەوە هەنێ خورما، یا ڕۆن، یا قاوت، یا کەشکی هێناو هەڵیان ڕشتە سەری‌و کردیان بەخورماو ڕۆنو کەشكو ڕۆنو قاوتو ڕۆنو دەستیان کرد بە نۆشکردنی، ئیتر هەرئەوە

نـانی شـاییەکەی بـوو). {تـاج/٢، زنجـیرە: ٤٠، ژمـارە: ٢١٢٤ + تـاج/٤، زنجـیرە: ٤٦، ژمارە: ٤٤٦٣} .

**روونکردنەوە:**

١- خەیبەر قەڵایەکی قایم بوو، بەدەستی هۆزی جوولەکەوە بوو، جێگەی هۆزی بەنی قورەیظەو بەنی نەضیر بوو، لەخۆرهەڵاتی باکوری مەدینەوەیە، شەش قۆناغ لە مەدینەوە دوورە، باخە خورمای زۆر بوو، ساڵی حەوتی کۆچی ئازادکرا.

٢- ئەبو طەلحە مێردی ئوممو سولەیمی دایکی ئەنەسی کوڕی مالیکە، کە نۆکەری پێغەمبەر بوو، ناوی زەیدی کوڕی سەهلی ئەنصارییە، ئامادەی شەوی پەیمانی عەقەبە بووە، یەکێکە لە (نوقەباکان)ی ئەو پەیمانە، نەوەدو دوو فەرموودەی هەیە، بوخاری سیانیانی گێڕاوەتەوە، ئەنەس زڕ کوڕی بوو، لەپاش مەرگی پێغەمبەر، ئەبو طەلحە چل ساڵ لەسەر یەك بەڕۆژوو بوو، بەس لەدوو جەژنەکانا رۆژووی دەشکان. ئەبو تەلحە خەزرەجییە، لەهەموو غەزەواتەکانی پێغەمبەردا ئامادە بووە، پێغەمبەر لە وەسفی دلێری ئەودا دەفەرموێ: (تەنها دەنگی ئەبو تەلحە لەناو سوپادا لەسەد پیاو باشترە) لەرۆژی شەڕی حونەیندا بیست پیاوی لە بێبڕواکان کوشتو چەكو کەلوپەلەکانیانی گشت بە تاڵان گرت، لە شەڕو غەزاکاندا خۆی دەکرد بە سوپەرو پەردە بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وە دەیفەرموو: (ئەی پێغەمبەری خودا! رۆحم دەکەم بە قوربانی رۆحی تۆ). {بڕوانە: تەجریدی بوخاری ژمارە: ٦١٧ = ١٢٨٥ فتح الباری + تاج/٣، زنجیرە: ٤٩، ژمارە: ٣٤٧٧ + تاج/٢، زنجیرە: ١٨٢، ژمارە: ١٩٥٢} .

٣- شەوی عەقەبە:

أ/ عەقەبەی یەکەم لەکاتی حەجدا، شەش کەس لە خەڵکی مەدینە، واتە: لە ئەنصار، لەمینا، لە عەقەبە، ئیسلام بوون، هەر شەشیان لە هۆزی ئەوس بوون، کە گەڕانەوە بۆ مەدینە بوون بە نوێنەری ئیسلام‌و هەوڵی بڵاوکردنەوەی بانگەشەی ئیسلامیاندا، جا لەپاش ساڵێ لەم سەرەتایە، دیسان لە وەرزی حەجدا، لەهەمان شوێنی ساڵی پێشوودا دوازدە پیاو لە ئەنصار، کە دەیان خەزرەجی‌و دوانیان ئەوسی بوون پەیمانی عەقەبەی یەکەمیان لەگەڵ پێغەمبەردا بەست، کە پەیمانێ بوو لە چەشنی ئەو پەیمانەی کە پێغەمبەر لەژیانیدا، لە ژنانی وەردەگرت، کە ئەمە پوختەکەیەتی: (عوبادەی کوڕی صامیت کە خۆی یەکێ بووە لە ئەندامانی ئەم پەیمانە، دەفەرموێ: دەستەیێ لەیارانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەدەوری بوون، فەرمووی پێیان: پەیمانم لەگەڵدا ببەستن لەسەر ئەوە: کە هاوبەش (شەریك) بۆ خودا دانەنێن‌و دزی‌و حیزی نەکەن‌و دەسپاك‌و داوێنپاك بن‌و منداڵی خۆتان لەبەر نەبوونی نەکوژن‌و لەخۆتانەوە لە خوت‌و خۆڕایی بوختیان هەڵنەبەستن، وە لەکردنی چاکەو پیاوەتی‌و مەردایەتی سەرپێچی نەکەن‌و لاریتان نەبێ لەکاری خێر) عوبادە دەفەرموێ: پێغەمبەر موژدەی بەهەشتی دا بەو کەسەی کە پابەندبێ بەم پەیمانەو بیباتە سەر، بەندەکانی ئەم پەیمانە لەم ئایەتەدا هاتووە، کە پەیمانی لە ژنان پێ وەردەگیرێ، کە دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا جَاءَكَ الْمُؤْمِنَاتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَى أَن لَّا يُشْرِكْنَ بِاللَّهِ شَيْئًا وَلَا يَسْرِقْنَ وَلَا يَزْنِينَ وَلَا يَقْتُلْنَ أَوْلَادَهُنَّ وَلَا يَأْتِينَ بِبُهْتَانٍ يَفْتَرِينَهُ بَيْنَ أَيْدِيهِنَّ وَأَرْجُلِهِنَّ وَلَا يَعْصِينَكَ فِي مَعْرُوفٍ فَبَايِعْهُنَّ وَاسْتَغْفِرْ لَهُنَّ اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ - ١٢/٦٠}. {بڕوانە تاجول ئوصول بەکوردی، بەرگی یەکەم، زنجیرە: ٨، لاپەڕە: ٤٠، ژمارە: ٥٥ + ٦٠، هەروا تەجریدی بوخاری بەکوردی، بەرگی یەکەم ژمارە: ١٨ = ١٨، ٣٨٩٢، ٣٨٩٣ فتح الباري، هەروا مسلم.

حدود، ژمارە: ٤٤٣٦. ترمذی. حدود: ١٤٣٩. نسائی. بیعە: ٤١٨٩ + تاج/٣، زنجیرە: ١٠١، ژمارە: ٢٤٠٠}.

ب/ پەیمانی عەقەبەی دووەم: لەساڵی سیازدەی ڕەوانەکردنی (بیعثەت)ی پێغەمبەردا، لەکاتی حەجدا، لەشەوی دوازدەی مانگی قورباندا، لەلای جەمرەی یەکەم لەمینا، حەفتاو سێ پیاوو دوو ژن، لە موسوڵمانانی مەدینە، پەیمانیاندا بە پێغەمبەر، کە بەسەرو بەماڵ پارێزگاریی لەخۆیو ئاییننەکەی بکەن، لەدوا وەرگرتنی ئەم پەیمانە، پێغەمبەر دوازدە نەقیبی بۆدانان، نۆیان لە خەزرەجو سیانیان لە ئەوس بوون.

٤- صەفییەی کچی حویەیی کوڕی ئەخطەب (ڕەزای خودای لێ بێ) بە ڕەگەز لە جوولەکەی بەنی نەضیرە، لەنەوەی حەزرەتی هاروونی برای حەزرەتی مووسایە (سڵاوی خودا لەسەر پێغەمبەری خۆمانو ئەوان بێ) لە غەزای خەیبەردا یەخسیر کرا، چۆنێتی شووکردنی بە پێغەمبەر لە فەرموودەکەدا باسکرا، مێردەکەی لەم جەنگەدا کوژرا، لەپاش إستبرای شەرعی، بە پاکبوونەوە، لە بێنوێژی، پێغەمبەر ئازادی کردو مارەی کرد لەخۆی، ساڵی حەوتی کۆچی بوو، صەفییە خاتوون دە فەرموودەی گێڕاوەتەوە، یەك فەرموودەی لە بوخاریدا هەیە، صەفییە زۆر هێمنو بەڕێزو سەلارو هۆشمەندو جوان بوو، پێغەمبەری زۆر خۆش دەویست، لەسەرە مەرگا عەرزی پێغەمبەری کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! سوێندم بەخودا حەزدەکەم کە ئەم ئێشو ئازارەی تۆ بەمنەوە بوایە، نەوەك بەتۆوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ڕاست دەکەیت!).

قسە دەگاتەوە بە دایە صەفییە خان کە حەزرەتی خاتوو عائیشەو حەزرەتی خاتوو حەفصە دەڵێن: صەفییە بنەجووە، ئێمە لەو باشترین، ئێمە

ئامۆزاو خزمی پێغەمبەرین، ئەو کچە جوولەکەیە، ئەویش لەداخا دەست دەکا بەگریان، پێغەمبەر دەچێ بەسەریا، دەڕوانێ دەگری، دەفەرموێ: (ئەوە بۆچی دەگری؟) دەفەرموێ حەفصەی ژنت و عائیشەی ژنت پێم دەڵێن: خۆیان خانەدانن و من کچە جوولەکەم و تانەی بنەجوویم لێ دەدەن. پێغەمبەر دەفەرموێ: دەبوو پێت بگوتنایە: منێ کە باوکم هاروون بێ و مامەم مووسا بێ و مێردم موحەممەد پێغەمبەر بێ، ئیتر چۆن ئێوە لەمن باشتر دەبن).

تەمەنی صەفییە حەڤدە ساڵ بووە کە شووی کردووە بە پێغەمبەر، دەوری سێ ساڵ لەلای پێغەمبەر دەمێنێ و پێغەمبەر وەفات دەکا، لەتەمەنی شەست ساڵیدا، لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی پەنجای کۆچیدا، لە سەردەمی موعاوییەدا خاتوو صەفییە گیانی پاکی سپارد (ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێ بێ). {بڕوانە: تاج/٢، زنجیرە: ٤٠، ژمارە: ٢١٢٤ + تاج/٣، زنجیرە: ٤١، ژمارە: ٣٤٤٤ + تاج/٤، زنجیرە: ٩٠، ژمارە: ٤٦١١ هەتا: ٤٦١٤ ج/٤}.

ئەمە دەقی ژمارە (٨٠٦)ی پوختەی موسلیم بوو، بەهرەی زۆری واتیادا بۆیە نووسیمان، بڕوانە: ژمارە (٢٣٥)ی تەجریدی بوخاری.

١١٨١- عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الاكوَع (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ خَرَجْنَا مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الَى خَيْبَرَ فَسِرْنَا لَيْلا فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ الْقَوْمِ لِعَامِرٍ يَا عَامِرُ (رَضيَ اللهُ عنهُ) الا تُسْمِعُنَا مِنْ هُنَيْهَاتِكَ وَكَانَ عَامِرٌ رَجُلا شَاعِرًا حدّاء فَنَزَلَ يَحْدُو بِالْقَوْمِ يَقُولُ:

اللَّهُمَّ لَوْلا انْتَ مَا اهْتَدَيْنَا　وَلا تَصَدَّقْنَا وَلا صَلَّيْنَا
فَاغْفِرْ فِدَاءٌ لَكَ مَا ابْقَيْنَا　وَثَبِّتْ الاقْدَامَ انْ لاقَيْنَا
وَالْقِيَنْ سَكِينَةً عَلَيْنَا　انَّا اذا صِيحَ بِنَا ابَيْنَا
وَبالصِّيَاحِ عَوَّلُوا عَلَيْنَا

فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): مَنْ هَذا؟ السَّائِقُ قَالُوا: عَامِرُ بْنُ الاكوَعِ قَالَ يَرْحَمُهُ اللَّهُ قَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ وَجَبَتْ يَا نَبِيَ اللَّهِ لَوْلا امْتَعْتَنَا بِهِ؟ فَاتَيْنَا خَيْبَرَ فَحَاصَرْنَاهُمْ حَتَّى اصَابَتْنَا مَخْمَصَةٌ شَدِيدَةٌ ثمَّ انَّ اللَّهَ تَعَالَى فَتَحَهَا عَلَيْهِمْ فَلَمَّا امْسَى النَّاسُ مَسَاءَ الْيَوْمِ الَّذي فُتِحَتْ عَلَيْهِمْ اوْقَدُوا نِيرَانًا كَثِيرَةً فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): مَا هَذهِ النِّيرَانُ عَلَى ايِّ شَيْءٍ تُوقِدُونَ قَالُوا: عَلَى لَحْمٍ قَالَ: عَلَى ايِّ لَحْمٍ قَالُوا: لَحْمِ حُمُرِ الانْسِيَةِ قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): اهْرِيقُوهَا وَاكْسِرُوهَا فَقَالَ:رَجُلٌ يَا رَسُولَ اللَّهِ اوْ نُهَرِيقُهَا وَنَغْسِلُهَا قَالَ اوْ ذاكَ فَلَمَّا تَصَافَّ الْقَوْمُ كَانَ سَيْفُ عَامِرٍ قَصِيرًا فَتَنَاوَلَ بِهِ سَاقَ يَهُودِيّ لِيَضرِبَهُ وَيَرْجِعُ ذبَابُ سَيْفِهِ فَاصَابَ عَيْنَ رُكْبَةِ عَامِرٍ فَمَاتَ مِنْهُ قَالَ فَلَمَّا قَفَلُوا قَالَ سَلَمَةُ رَاني رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُوَ اخِذ بِيَدِي قَالَ مَا لَكَ قُلْتُ لَهُ: فَدَاكَ ابِي وَامِّي زَعَمُوا انَّ عَامِرًا حَبِط عَمَلُهُ قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): كَذبَ مَنْ قَالَهُ انَّ لَهُ لاجْرَيْنِ وَجَمَعَ بَيْنَ اصْبَعَيْهِ انَّهُ لَجَاهِدٌ مُجَاهِدٌ قَلَّ عَرَبِيٌّ مَشَى بِهَا مِثلَهُ حَدَّثنَا قُتَيْبَةُ حَدَّثنَا حَاتِمٌ قَالَ:نَشَا بِهَا).

(الحديث: ٤١٩٦، اطرافه في: ٢٤٧٧، ٥٤٩٧، ٦١٤٨، ٦٣٣١، ٦٨٩١): [١١٨١]

سەلەمەی کوڕی ئەکوەع (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەت پێغەمبەردا، دەرچووین بۆ غەزای خەیبەر، شەو بوو دەڕۆیشتین، پیاوێ لە لەشکرەکە بە عامیری مامەمی گوت: ئەی عامیر! نەختێ وورەوورمان بۆ ناکەیت، ئادەی کەمێ هۆرەو سۆزمان بە دەنگە خۆشەکەت بۆبکە.

فەرمووی: عامیر پیاوێکی شاعیر بوو، هۆرەو سۆزی خۆشی دەکرد، جا ئەویش دابەزی وە دەستی کرد بە سۆز کردن و گوتی:

---

[١١٨١] تجرید/٤، ژمارە: ١٥٦٨ = ٤١٩٦ بخاری. مسلم: ١٨٠٢ = ٤٦٤٤ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٦٤ رقم الباب/٣٨).

اللـهم لـولا انـت مـا اهتـدينا
ولا تـــصدقنا ولا صلينــــا
فـاغفر فـداء لـك مَـا القينـا
وثبــت الاقــدام ان لاقينـــا
والقـــين سكيـــنة علينـــا
انـــا اذا صيـــح بنـــا ابينـــا
وبالـــصياح عـــولوا عليــــنا

(بڕوانە: بەرگی سێ، لاپەڕە: ٣٠٠ = ١١٦٨ تەجرید).

جا خۆشەویست (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (ئەم دەنگخۆشەکێ یەکە بەدەنگی خۆشی وشترەکان لێ دەخوڕێ؟) گوتیان: عامری کوڕی ئەکوەعە، فەرمووی: (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) پیاوێ لەیاران کە ئیمامی عومەر بوو، عەرزی پێغەمبەری کرد: شەهید بوونی مسۆگەر بوو، خۆزگەپێمانت دەهێشت، بۆیە عومەر وایفەرموو، چونکە بە ئەزموون بۆیان دەرکەوتبوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) بەهەرکەسێ وابڵێ‌و ئەم نزای (رحمە اللە)ی بۆ بکا، شەهید دەبێ و بەهەشتی بۆ مسۆگەر دەبێ.

جا ڕۆیشتین هەتا گەیشتینە خەیبەرو گەمارۆمان داو دەورەمان گرت، تووشی برسێتییەکی سەخت بووین، لە پاش ماوەیێ خودای گەروە بۆی فەتح کردین و قەلاکەمان ئازاد کرد، جالە ئێوارەی ئەو ڕۆژەدا کە قەلاکەیان ئازاد کرد، مەردو مەکە ئاگرێکی زۆریان کردەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (ئەم ئاگرانە چین؟ وەلەژێر چیدا دەگرێن؟) گوتیان: گۆشتیان وابەسەرەوە، فەرمووی: (گۆشتی چی؟) گوتیان: گۆشتی کەری ماڵی، پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (گۆشتەکە برێژن و مەنجەڵەکان بشکێنن)

پیاوێکیش گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەی بۆ گۆشتەکە نەرێـژین و مەنجەڵەکان بشۆین؟ فەرمووی: (یاوابکەن ئەوەیش دەبێ).

جا کاتێ جەنگاوەرەکان لە هەردوو بەرەی شەڕ، ریزبوون و بەرابەر وەستان، مەرحەبی شای خەیبەر خۆی چووە مەیدان و دەستی کرد بە هەڕەشە کردن و تەحەددا کردن، عامیریش بۆیچووە مەیدان، شمشێرەکەی عامیر کورت بوو، دەستی کرد بەلێدانی قاچی کابرایەکی جوولەکە، کەمەرحەب بوو، بەلام نووکی شمشێرەکەی گەڕایەوە بۆ خۆی و دای لە کەشکە ئەژنۆی خۆی و بەوە شەهید بوو.

سەلەمە فەرمووی: کاتێ شەڕ تەواو بوو، گەڕاینەوە بۆ مەدینە، لەرێ پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) بینیمی، دەستی گرتم و فەرمووی: (ئەوە چیتە بۆ وابرسکاوی؟) عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خوا باوك ودایکم بەقوربانت بێ، پەستی ئەوەم کە دەڵێن: عامیری مامەم کردەوەی بەفیڕۆ چووە، گوایە خۆی خۆی کوشتووە؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (ئەوەی وادەڵێ درۆ دەکا، بەڵکوو بە پێچەوانەوە عامیر لەسەر ئەم شەهید بوونەی دوو پاداشتی گەورەی بۆهەیە) پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) دوو پەنجەی خۆی نووسان بەیەکەوە، ئەوجا فەرمووی: (ئەو دوو پاداشە هی ئەم دووشتەیە: یەکەم عامیر لە عیبادەتا خۆی دەرمنجان و پەرستکارێکی چاك بوو، دووەم عامیر تێکۆشەر و غەزاکارێکی کەم مانەندبوو، بەدەگمەن وا بووە هەتا ئێستا لەناو عەرەبانا، کەلەم ڕۆژگارەدا زۆرینەی موسوڵمان عەرەبن، پیاوی وەك عامیر هەبێ کە ئەم دوو رەفتارە شیرینەی تیادابێ!).

## (٤٤) باب غَزْوَةُ الأحزَاب وَهِيَ الخَنْدَقُ

## غەزای ئەحزاب، واتە: جەنگی خەندەقو غەزای حەندەق

١١٨٢- عَنْ الْبَرَاءِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْـهُ) قَـالَ رَأَيْـتُ رَسُولَ اللَّـهِ (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) يَوْمَ الأحْزَابِ يَنْقُلُ التُّرَابَ وَقَدْ وَارَى التُّرَابُ بَيَاضَ بَطْنِهِ وَهُوَ يَقُولُ:

والله لَـوْلا أَنْـتَ مَـا اهْـتَدَيْنَا وَلا تَـصَدَّقْنَا وَلا صَـلَّيْنَا
فَأَنْـزِلَنْ سَـكِينَةً عَلَيْنَـا وَثَبِّـتْ الأقْـدَامَ إِنْ لاقَـيْنَا
إِنَّ الأُلَـى قَـدْ بَغَـوْا عَلَيْنَـا إِذَا أَرَادُوا فِتْـنَةً أَبَـيْنَا

(الحـديث ٢٨٣٧، أطرافُـهُ في: ٢٨٣٦، ٣٠٣٤، ٤١٠٤، ٤١٠٦، ٦٦٢٠، ٧٢٣٦):[١١٨٢]

بۆ تێگەیشتنی تەواو، بۆ روونکردنەوە: ی ئەم گێڕانەوەیە، ئەم گێڕانـەوەی تـاجول ئوصـول راگوێز دەکـەین، کـە دەفـەرموێ: بـەراء(ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فەرمووی: لەرۆژی غەزای خەندەقا کە پێشی دەگوترێ: غەزای ئەحزاب، چونکە لـەو غەزایـەدا ناموسـوڵمانەکان عێلجاڕیـان کردبـوو، گەلـە کۆمـەیان لـە موسوڵمانەکان کردبوو، پێغەمبەرم(دروودی خوای لەسەر بێ) دی لەگەڵ ئێمـەدا بەکۆڵ خۆڵی دەگواستەوەو لە خەندەکەکە دووری دەخستەوە، خۆڵو تەپو تـۆز سـپێتیی سـەر سـینگی داپۆشـیبوو، لـەو حەلـەدا خۆشەویـست (درروودی خـوای لەسەر بێ) بەسۆزەوە لەسەرشێوەی سروود خوێندنەوە دەیفەرموو:

والله لَـوْلا أَنْـتَ مَـا اهْـتَدَيْنَا وَلا تَـصَدَّقْنَا وَلا صَـلَّيْنَا
فَأَنْـزِلَنْ سَـكِينَةً عَلَيْنَـا وَثَبِّـتْ الأقْـدَامَ إِنْ لاقَـيْنَا
إِنَّ الأُلَـى قَـدْ بَغَـوْا عَلَيْنَـا إِذَا أَرَادُوا فِتْـنَةً أَبَـيْنَا

---

[١١٨٢] تجریـد/٣، ژمـارە: ١١٦٨ = ٢٨٣٧ بخـاری. پوختـەی موسـلیم/٢، ژمـارە: ١١٧٣ = ٤٦٤٦ شـیحا (بخاری رقم الكتاب/٥٦ رقم الباب/٣٤).

بەشیعر لەبەحرەکەی خۆی کەرەجەزە، واتە:

خــــودا بـــــە تـــــۆ قەســــــەم، لەفــــەضـــــلی تۆیــــــەوا
نێـــــژو زەکـــــاتو خێــــر دەکـــــــەینو ڕێــــــی ڕەوا
دەگرینەبــــــەر کـــــــە بـــــــوو بەشـــــەڕ ناسایـــــشت
بکەینـــــــە بـــــەر، وەکـــــوو ســــــوپەر، یاســـــەرکەوا
قـــــەت نایەڵـــــین قـــــین لەدلــــــی نــــاژاوە گـــــێڕ
دووبەرەکـــــــی بەرپـــــــا بــــــــکا لــــــــەنێوا!

بەراء(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) لەکۆتایی شیعرەکاندا، لەبەر خۆیەوە دەنگی لەئاخر سەروا بەرز دەکردەوەو خۆش خۆش دەیفەرموو: (ئەبەینا... ئەبەینا = قەت نایەڵین قەت نایەڵین... تاد) (تاج/٨/٢١٨ف-٣ز-٨٨. غەزای خەندەق).

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

ڕاستتر ئەوەیە کە ئەم چەند هەڵبەستەی کەوان لەم فەرموودەیەدا هی هەستیار عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحەیە. بۆ زانینی حوکمی شیعرو گوتنیو خوێندنەوەی لەلایەنی پێغەمبەرەوە. (بڕوانە: تاج/١٠/١٧٠-ز-٦٨ هەتا ز-٧١ل-١٨٠).

١١٨٣- عَنْ سَهْلِ بن سعد قَالَ: جَاءَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَنَحْنُ نَحْفِرُ الْخَنْدَقَ وَنَنْقُلُ التُّرَابَ عَلَى أَكْتَافِنَا ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) « اللَّهُمَّ لاَ عَيْشَ إِلاَّ عَيْشُ الآخِرَهْ فَاغْفِرْ لِلْمُهَاجِرِينَ وَالأَنْصَارِ »: [١١٨٣]

---

[١١٨٣] بخاری. مناقب الأنصار/٣٧٩٧، مسلم: ٤٦٤٨ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٦٣ رقم الباب/٩).

سەهلی کوڕی سەعد فەرمووی: لە غەزای ئەحزابا، کە ناموسوڵمانەکان، گەلەکۆمەیان کردبوو لە موسوڵمانان، کە پێشی دەگوترێ: غەزای خەندەق، ئێمە سەرگەرمی هەڵکەندنی خەنەکەکە (خەندەقەکە) بووین، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەشریفی هات بۆلامان، ئێمە خەریك بووین بەکۆڵ خۆڵی خەندەقەکەمان دەگواستەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەم بۆنەیەوە ئەم نزایەی کرد بۆمان و فەرمووی:

اللَّهُـــمَّ لا عَـــيْشَ إلاَّ عَـــيْشُ الآخِـــرَهْ

فَـــاغْفِرْ لِلْمُهَـــاجِرِينَ وَالأَنْـــصَارِ

١١٨٤- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رضى الله عنه) قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم: « لاَ عَيْشَ إِلاَّ عَيْشُ الآخِرَةِ ، فَأَصْلِحِ الأَنْصَارَ وَالْمُهَاجِرَةَ»:[١١٨٤]

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەم نزایەی کرد بۆمان:

اللَّهُـــمَّ لا عَـــيْشَ إلاَّ عَـــيْشُ الآخِـــرَهْ

فَـــاغْفِرْ لِلْمُهَـــاجِرِينَ وَالأَنْـــصَارِ

١١٨٥- عَنْ أَنَسٍ (رضى الله عنه) يَقُولُ كَانَتِ الأَنْصَارُ يَوْمَ الْخَنْدَقِ تَقُولُ نَحْنُ الَّذِينَ بَايَعُوا مُحَمَّدَا عَلَى الْجِهَادِ مَا حَيِينَا أَبَدَا فَأَجَابَهُمُ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ اللَّهُمَّ لاَ عَيْشَ إِلاَّ عَيْشُ الآخِرَهْ فَأَكْرِمِ الأَنْصَارَ وَالْمُهَاجِرَهْ: [١١٨٥]

---

[١١٨٤] بخاری. مناقب الأنصار: ٣٧٩٥. مسلم: ٤٦٤٩ شيحا (بخاری رقم الكتاب/ ٦٣ رقم الباب/ ٩).

[١١٨٥] تجرید/٣، ژمارە: ١١٦٧ = ٢٨٣٤ بخاری. پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١١٧٤ = ٤٦٥٢ شيحا (بخاری رقم الكتاب/٥٦ رقم الباب/١١٠).

بـۆ شـەرحو راڤـەو روونكردنـەوەو تێگەیـشتنی بـاش لـەم فەرموودەیـە گێڕانـەوەی پێـشەوا بوخـاریو پێـشەوا موسـلیم دەنووسـین، ژمـارە (١١٦٧)ی تەجریدی بوخاری، بەرگی سێیەم، ئەم فەرموودەیە ئاوایە:

عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) يَقُولُ خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِلَى الْخَنْدَقِ فَإِذَا الْمُهَاجِرُونَ وَالأَنْصَارُ يَحْفِرُونَ فِي غَدَاةٍ بَارِدَةٍ فَلَمْ يَكُنْ لَهُمْ عَبِيدٌ يَعْمَلُونَ ذَلِكَ لَهُمْ فَلَمَّا رَأَى مَا بِهِمْ مِنَ النَّصَبِ وَالْجُوعِ قَالَ:

اللَّهُمَّ إِنَّ الْعَيْشَ عَيْشُ الآخِرَهْ      فَاغْفِرْ لِلأَنْصَارِ وَالْمُهَاجِرَهْ

فَقَالُوا مُجِيبِينَ لَهُ:

نَحْنُ الَّذِينَ بَايَعُوا مُحَمَّدَا      عَلَى الْجِهَادِ مَا بَقِينَا أَبَدَا

(الحديث ٢٨٣٤، أطرافُهُ في: ٢٨٣٥، ٢٩٦١، ٢٧٩٥، ٢٧٩٦، ٤٠٩٩، ٤١٠٠، ٦٤١٣، ٧٢٠١):

ئەنەس(ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر(دروودی خـوای لەسـەر بـێ) كـاتێ دەرچـوو بـۆ غـەزای خەنـدەق، روانـی وا كۆچـكارو یاریـدەدەران (موهـاجرینو ئەنـصار) بـەو بەیانییـە سـاردە خەنـدەك هەڵدەكـەنن، بـەدەوری شاری مەدینەدا، ئەو سەردەمە بەندەو كۆیلەیان نەبوو، كە ئەو جۆرە كارەیان بۆ بكا لەبەر ئەوە خۆیان ئەنجامیان دەدا، جا كاتێ پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) لەسەر ئەو حاڵی شەكەتیو برسێتییە بینینی، فەرمووی:

اللَّهُمَّ إِنَّ الْعَيْشَ عَيْشُ الآخِرَهْ      فَاغْفِرْ لِلأَنْصَارِ وَالْمُهَاجِرَهْ

واتە:

ژین ئەو ژینەیە لەبەهەشتا بێ      لەگەڵ كۆچكارو یاریدەردا بێ!

ئەوانیش بەم هۆنراوەی تر وەڵامی پێغەمبەریان دایەوە:

نَحْنُ الَّذِينَ بَايَعُوا مُحَمَّدَا عَلى الْجِهَادِ مَا بَقِينَا أَبَدَاً

واته:

پەیمانەو دەیکەین لەگەڵ موحەممەد

خەبات دەگێڕین تا بەردەی ئەڵەد!

(تاج/٥/ل/١٧٢ف-١٧ز-٤٤- باسی گەورەیی یاریدەدەران) .

وعنْهُ فِي روايةٍ قَالَ: جَعَلَ الْمُهَاجِرُونَ وَالأَنْصَارُ يَحْفِرُونَ الْخَنْدَقَ حَوْلَ الْمَدِينَةِ وَيَنْقُلُونَ التُّرَابَ عَلَى مُتُونِهِمْ وَيَقُولُونَ:

نَحْنُ الَّذِينَ بَايَعُوا مُحَمَّدَا عَلَى الإِسْلامِ مَا بَقِينَا أَبَدَا

وَالنَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُجِيبُهُمْ وَيَقُولُ:

اللَّهُمَّ إِنَّه لا خَيْرَ إِلاَّ خَيْرُ الآخِرَهْ فَبَارِكْ فِي الأَنْصَارِ وَالْمُهَاجِرَهْ

(الحديث ٢٨٣٥):

له گێڕانەوەیەکی تردا ئەنەس(ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: کۆچکاران و یاریدەدەران (ڕەزای خودایان لێ بێ) کاتێ خەریکی هەڵکەندنی خەندەکەکە بوون، بەدەوری شاری مەدینەدا لەکاتی غەزای خەندەقا، وەبەکۆڵ خۆڵەکەیان دەگواستەوە بۆ دەرەوەی خەندەکەکە، بەدەم سۆز کردنەوە ئەم هەڵبەستەیان دەخوێندەوەو دەیانگوت:

نَحْنُ الَّذِينَ بَايَعُوا مُحَمَّدَا عَلى الإِسْلامِ مَا بَقِينَا أَبَدَا

واته:

پەیمانەو دەیکەین لەگەڵ موحەممەد

ئیسلام پەروەر بین، تا بەردەی ئەڵەد!

پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) وەڵامی دەدانەوەو دەیفەرموو:

ژین تەنیا ژینی دوارۆژە خوایە!

ڕێزی ئەنصارو کۆچکاری تیایە!

**ڕاڤەو شیکردنەوە:**

ئەم فەرموودەیەو چەندین فەرموودەی تر لەم بابەتە نیشانەو بەڵگەی ئەوەن کەشیعری جوان، کەخزمەتی مەبەستێکی رەوا بکا، درووستە، بەڵکوو وتنیشی لەسەر شێوەی سۆزو سروودی دڵهەژێن کارێکی باشە.

لەژمارە (١١٧٤)ی پوختەی موسلیم، بەرگی سێیەم ئەم فەرموودەیە ئاوایە:

عَنْ أَنَسِ بن مالك (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ أَصْحَابَ مُحَمَّدٍ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) كَانُوا يَقُولُونَ يَوْمَ الْخَنْدَقِ: نَحْنُ الَّذِينَ بَايَعُوا مُحَمَّدًا عَلَى الإِسْلَامِ مَا بَقِينَا أَبَدًا، أَوْ قَالَ: عَلَى الْجِهَادِ مَا بَقِينَا أَبَدًا (شَكَّ حَمَّادٌ). وَالنَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَقُولُ: « اللَّهُمَّ إِنَّ الْخَيْرَ خَيْرُ الآخِرَةْ ... فَاغْفِرْ لِلأَنْصَارِ وَالْمُهَاجِرَةْ ». {الحديث: ٤٦٥٢ = ٤٦٤٠ فم}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کاتێ خەریکی هەڵکەندنی خەندەکەکە بوون، بەدەوری شاری مەدینەدا، لەکاتی غەزای خەندەقا، بەکۆڵ خۆڵەکەیان دەگواستەوە، بۆ دەوری خەندەکەکە، بەدەم سۆزکردنەوە ئەم هەڵبەستەیان دەخوێندەوەو دەیانگوت:

نَحْنُ الَّذِينَ بَايَعُوا مُحَمَّدًا

عَلَى الْجِهَادِ مَا بَقِينَا أَبَدًا

واته:

پەیمانەو دەیکەین لەگەڵ موحەممەد

ئیسلام پەروەر بین تابەردی ئەڵەحەد

یا فەرمووی: دەیانگوت:

نَحْنُ الَّذِينَ بَايَعُوا مُحَمَّدًا

عَلَى الْجِهَادِ مَا بَقِينَا أَبَدًا

واته:

پەیمانەو دەیکەین لەگەڵ موحەممەد

ئیسلام پەروەر بین تابەردی ئەڵەحەد

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو:

اللَّهُمَّ إِنَّ الْخَيْرَ خَيْرُ الآخِرَهْ

فَاغْفِرْ لِلأَنْصَارِ وَالْمُهَاجِرَهْ

واته:

خێر تەنیا خێری دوا رۆژە وایە!

خۆشبە لە ئەنصار لە کۆچکار خوایە!

## (٤٥) باب غزوة ذي قرد وغيرها
## باسی كوشتار (غەزا)ی زیقیرەدو هی تر

١١٨٦- عَنْ سَلَمَةَ بْنَ الأَكْوَعِ قال: خَرَجْتُ قَبْلَ أَنْ يُؤَذَّنَ بِالأُولَى ، وَكَانَتْ لِقَاحُ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) تَرْعَى بِذِي قَرَدٍ، قَالَ، فَلَقِيَنِي غُلاَمٌ لِعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ فَقَالَ أُخِذَتْ لِقَاحُ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قُلْتُ مَنْ أَخَذَهَا قَالَ غَطَفَانُ . قَالَ فَصَرَخْتُ ثَلاَثَ صَرَخَاتٍ – يَا صَبَاحَاهْ – قَالَ فَأَسْمَعْتُ مَا بَيْنَ لاَبَتَي الْمَدِينَةِ ، ثُمَّ انْدَفَعْتُ عَلَى وَجْهِي حَتَّى أَدْرَكْتُهُمْ وَقَدْ أَخَذُوا يَسْتَقُونَ مِنَ الْمَاءِ ، فَجَعَلْتُ أَرْمِيهِمْ بِنَبْلِي ، وَكُنْتُ رَامِيًا ، وَأَقُولُ أَنَا ابْنُ الأَكْوَعْ ، الْيَوْمُ يَوْمُ الرُّضَّعْ . وَأَرْتَجِزُ حَتَّى اسْتَنْقَذْتُ اللِّقَاحَ مِنْهُمْ ، وَاسْتَلَبْتُ مِنْهُمْ ثَلاَثِينَ بُرْدَةً ، قَالَ وَجَاءَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) وَالنَّاسُ فَقُلْتُ يَا نَبِيَّ اللَّهِ قَدْ حَمَيْتُ الْقَوْمَ الْمَاءَ وَهُمْ عِطَاشٌ ، فَابْعَثْ إِلَيْهِمُ السَّاعَةَ . فَقَالَ « يَا ابْنَ الأَكْوَعِ ، مَلَكْتَ فَأَسْجِحْ » . قَالَ ثُمَّ رَجَعْنَا وَيُرْدِفُنِي رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) عَلَى نَاقَتِهِ حَتَّى دَخَلْنَا الْمَدِينَةَ.[١١٨٦]

**ئەم فەرموودەیە لە تەجریدی بوخاریدا، لە ژمارە (١٢٤٠)دا ئاوایە:**

عَنْ سَلَمَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: خَرَجْتُ مِنْ الْمَدِينَةِ ذَاهِبًا نَحْوَ الْغَابَةِ حَتَّى إِذَا كُنْتُ بِثَنِيَّةِ الْغَابَةِ لَقِيَنِي غُلامٌ لِعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ قُلْتُ: وَيْحَكَ مَا بِكَ قَالَ: أُخِذَتْ لِقَاحُ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قُلْتُ: مَنْ أَخَذَهَا؟ قَالَ غَطَفَانُ: وَفَزَارَةُ فَصَرَخْتُ ثَلاثَ صَرَخَاتٍ أَسْمَعْتُ مَا بَيْنَ لابَتَيْهَا يَا صَبَاحَاهْ يَا صَبَاحَاهْ ثُمَّ انْدَفَعْتُ حَتَّى أَلْقَاهُمْ وَقَدْ أَخَذُوهَا فَجَعَلْتُ أَرْمِيهِمْ وَأَقُولُ:

أَنَا ابْنُ الأَكْوَعِ وَالْيَوْمُ يَوْمُ الرُّضَّعْ

---

[١١٨٦] تجرید/٣، ژمارە: ١٢٤٠ = ٣٠٤١ بخاری + تجرید/٤، ژمارە: ١٥٦٨ = ٤١٩٦ بخاری. پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١١٧٦ = ٤٦٥٤ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٦٤ رقم الباب/٣٧).

فَاسْتَنْقَذْتُهَا مِنْهُمْ قَبْلَ أَنْ يَشْرَبُوا فَأَقْبَلْتُ بِهَا أَسُوقُهَا فَلَقِيَنِي النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ الْقَوْمَ عِطَاشٌ وَإِنِّي أَعْجَلْتُهُمْ أَنْ يَشْرَبُوا سِقْيَهُمْ فَابْعَثْ فِي إِثْرِهِمْ فَقَالَ يَا ابْنَ الأَكْوَعِ مَلَكتَ فَأَسْجِحْ إِنَّ الْقَوْمَ يُقْرَوْنَ فِي قَوْمِهِمْ) (الحديث ٣٠٤١، طرفه في: ٤١٩٤):

سەلەمەی کوڕی ئەکوەع (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: دەرچووم بۆ جەنگەڵەکە کەنزیکەی بەریدێ لەمەدینەوە دوورە، بەریدێ دوو فەرسەخە، کاتێ گەیشتمە ملەی جەنگەڵەکە، خولامێکی عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفم پێگەیشت پەشۆکا بوو، گوتم: ئەوە چیتە هاوار لەخۆت؟ گوتی: وشترە شیردارەکانی پێغەمبەریان فڕاند. گوتم: کێ فڕاندی ؟ گوتی: چەتەی هۆزی غەطەفانو هۆزی فەزارە، جامنیش وەك باوە لەکاتی وادا، سێ جار بەهەموو دەنگم بەرەو مەدینە هاوارم کرد: ئای لەم دەمە دەمی بەیانییەدا، خەڵکەکە! فریاکەون فەوماوە! بەم فیژەیە لەم پەڕی مەدینەوە هەتا ئەو پەڕی مەدینەم ئاگادار کردەوە. سەلەمە لەم غەزایەدا پیادە بوو ولاخی سواری پێ نەبوو ئەوجا خۆم بەتەنها گوژمم داو بەرەو چەتەکان تێم تەقانو پاش ماوەیێ گرتمنەوە، دەبینم وشترە دزیەکانیان واپێ، جابەتیر دام گرتنو بەدەم تیر تێگرتنەوە هۆرەم دەکردو دەمگوت:

أَنَا ابْنُ الأَكْوَعِ    وَالْيَوْمُ يَوْمُ الرُّضَّعْ

واتە:

ئەمن سەلەمەی کوڕی ئەکوەعم    نامەرد دەکوژم بەنەمری شەرعم

ئیتر بەشەڕە تیر هەڵم فڕاندنو وشترەکانم لێ سەندنەوەو مەودای ئەوەم نەدان کەبگەنە سەرئاوو ئاو بخۆنەوە، ئەوجا بەرەو مەدینە لێم خوڕینو گەڕامەوە. جا لەڕێ پێغەمبەرو هاوڕێیانی کەهاتبوون بەدەم ئەم ڕووداوەوە پێم

گەیشتن، عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! دوژمن حاڵیان شڕە ماندووو مردووو تینوون، منیش بەپەلە هەڵم فڕاندن، نەمهێشت پاراو ببن، ئەگەر سوپایێ بنێری بەدوایانا دەیانگرنەوەو تۆڵەی بەرودوایان لێ دەسێنن!

فەرمووی(دروودی خوای لەسەر بێ) : (ئەی کوڕی ئەکوەع! بەمرازی خۆت گەیشتوی داخی دڵی خۆت پێ ڕشتوون، پێ لێ هەڵبڕینیش زۆر باش نییە، کەواتە لێبوردنت هەبێ باشە! چاوپۆشی بکە، وەکی تریش ئێستا گەیشتوونەتە جێگەی قایم، وان لەناو وڵاتو هۆزی خۆیانا، هۆزەکەیان یاریدەیان دەدەن بشنێرین بەشوێنیانا سوودی نییەو، هەر بەئاسانی بۆمان زەوت ناکرێن).

## راڤەو شیکردنەوە:

ئەم فەرموودەیە دوازدەهەم فەرموودەی سیانی (ثلاثي) یە، لەبوخاری پیرۆزدا (بڕوانە فەرموودەی ژمارە: ١٢١٤ت = ٢٩٦٠ف).

لە موختەصەری صەحیحی موسلیمدا، لە ژمارە (١١٧٦)دا، داستانی ئەم فەرموودەیە زۆر دوورو درێژەو سوودو بەهرەی زۆری واتیادا، دەیکەین بە شەرحو راڤە بۆ ئێرە، کە ئەمە دەقەکەیەتی:

عَنْ إِيَاسُ بْنُ سَلَمَةَ قَالَ: حَدَّثَنِى أَبِى قَالَ: قَدِمْنَا الْحُدَيْبِيَةَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) وَنَحْنُ أَرْبَعَ عَشْرَةَ مِائَةً وَعَلَيْهَا خَمْسُونَ شَاةً لاَ تُرْوِيهَا قَالَ: فَقَعَدَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) عَلَى جَبَا الرَّكِيَّةِ فَإِمَّا دَعَا وَإِمَّا بَسَقَ فِيهَا قَالَ: فَجَاشَتْ فَسَقَيْنَا وَاسْتَقَيْنَا، قَالَ: ثُمَّ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) دَعَانَا لِلْبَيْعَةِ فِى أَصْلِ الشَّجَرَةِ، قَالَ: فَبَايَعْتُهُ أَوَّلَ النَّاسِ، ثُمَّ بَايَعَ وَبَايَعَ، حَتَّى إِذَا كَانَ فِى وَسَطٍ مِنَ النَّاسِ قَالَ: « بَايِعْ يَا سَلَمَةُ »، قَالَ: قُلْتُ: قَدْ بَايَعْتُكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ فِى أَوَّلِ النَّاسِ، قَالَ: « وَأَيْضًا »، قَالَ: وَرَآنِى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) عَزِلاً (يَعْنِى

لَيْسَ مَعَهُ سِلاَحٌ)، قَالَ: فَأَعْطَانِى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَجفَةً أَوْ دَرَقَةً، ثُمَّ بَايَعَ، حَتَّى إِذَا كَانَ فِى آخِرِ النَّاسِ قَالَ: « أَلاَ تُبَايِعُنِى يَا سَلَمَةُ »! قَالَ: قُلْتُ: قَدْ بَايَعْتُكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ فِى أَوَّلِ النَّاسِ، وَفِى أَوْسَطِ النَّاسِ، قَالَ: « وَأَيْضًا »، قَالَ: فَبَايَعْتُهُ الثَّالِثَةَ، ثُمَّ قَالَ لِى: « يَا سَلَمَةُ أَيْنَ حَجفَتُكَ أَوْ دَرَقَتُكَ الَّتِى أَعْطَيْتُكَ »؟ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ لَقِيَنِى عَمِّى عَامِرٌ عَزِلاً فَأَعْطَيْتُهُ إِيَّاهَا، قَالَ: فَضَحِكَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، وَقَالَ: « إِنَّكَ كَالَّذِى قَالَ الأَوَّلُ: اللَّهُمَّ أَبْغِنِى حَبِيبًا هُوَ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ نَفْسِى ». ثُمَّ إِنَّ الْمُشْرِكِينَ رَاسَلُونَا الصُّلْحَ حَتَّى مَشَى بَعْضُنَا فِى بَعْضٍ وَاصْطَلَحْنَا، قَالَ: وَكُنْتُ تَبِيعًا لِطَلْحَةَ بْنِ عُبَيْدِ اللَّهِ أَسْقِى فَرَسَهُ وَأَحُسُّهُ، وَأَخْدُمُهُ وَآكُلُ مِنْ طَعَامِهِ، وَتَرَكْتُ أَهْلِى وَمَالِى مُهَاجِرًا إِلَى اللَّهِ تعَالى وَرَسُولِهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، قَالَ: فَلَمَّا اصْطَلَحْنَا نَحْنُ وَأَهْلُ مَكَّةَ، وَاخْتَلَطَ بَعْضُنَا بِبَعْضٍ أَتَيْتُ شَجَرَةً، فَكَسَحْتُ شَوْكَهَا، فَاضْطَجَعْتُ فِى أَصْلِهَا، قَالَ: فَأَتَانِى أَرْبَعَةٌ مِنَ الْمُشْرِكِينَ مِنْ أَهْلِ مَكَّةَ، فَجَعَلُوا يَقَعُونَ فِى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَأَبْغَضْتُهُمْ فَتَحَوَّلْتُ إِلَى شَجَرَةٍ أُخْرَى، وَعَلَّقُوا سِلاَحَهُمْ وَاضْطَجَعُوا، فَبَيْنَمَا هُمْ كَذَلِكَ إِذْ نَادَى مُنَادٍ مِنْ أَسْفَلِ الْوَادِى: يَا لَلْمُهَاجِرِينَ قُتِلَ ابْنُ زُنَيْمٍ! قَالَ: فَاخْتَرَطْتُ سَيْفِى، ثُمَّ شَدَدْتُ عَلَى أُولَئِكَ الأَرْبَعَةِ، وَهُمْ رُقُودٌ، فَأَخَذْتُ سِلاَحَهُمْ. فَجَعَلْتُهُ ضِغْثًا، فِى يَدِى، قَالَ: ثُمَّ قُلْتُ: وَالَّذِى كَرَّمَ وَجْهَ مُحَمَّدٍ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لاَ يَرْفَعُ أَحَدٌ مِنْكُمْ رَأْسَهُ إِلاَّ ضَرَبْتُ الَّذِى فِيهِ عَيْنَاهُ، قَالَ: ثُمَّ جِئْتُ بِهِمْ أَسُوقُهُمْ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، قَالَ: وَجَاءَ عَمِّى عَامِرٌ بِرَجُلٍ مِنَ الْعَبَلاَتِ يُقَالُ لَهُ مِكْرَزٌ يَقُودُهُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى فَرَسٍ مُجَفَّفٍ فِى سَبْعِينَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ، فَنَظَرَ إِلَيْهِمْ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَقَالَ: « دَعُوهُمْ يَكُنْ لَهُمْ بَدْءُ الْفُجُورِ وَثِنَاهُ »، فَعَفَا عَنْهُمْ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، وَأَنْزَلَ اللَّهُ عز وجل: (وَهُوَ الَّذِي كَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ عَنْهُم بِبَطْنِ مَكَّةَ مِن بَعْدِ أَنْ أَظْفَرَكُمْ عَلَيْهِمْ وَكَانَ اللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا) الآيَةَ كُلَّهَا،

**روونکردنەوە:**

**ئـەم فەرموودەیـە، موعجیزەیـەکی واتیـادا، ئـەو هەواڵـەی کـە پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسـەردەمی خۆیـدا رایگەیانـدووە کـە موسـوڵمانان پایتەختی کیسرا دەگرن، چۆنی فەرمووە، ئاوەها ئەو هەواڵە هاتۆتە دی.**

## (٢) باب الإستخلاف وتركه
## دانانی جێنشینو دانەنانی جێنشین

١١٩٦- حديث عمر عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما) قَالَ قِيلَ لِعُمَرَ أَلاَ تَسْتَخْلِفُ قَالَ إِنْ أَسْتَخْلِفْ فَقَدِ اسْتَخْلَفَ مَنْ هُوَ خَيْرٌ مِنِّى أَبُو بَكْرٍ ، وَإِنْ أَتْرُكْ فَقَدْ تَرَكَ مَنْ هُوَ خَيْرٌ مِنِّى رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَأَثْنَوْا عَلَيْهِ فَقَالَ رَاغِبٌ رَاهِبٌ ، وَدِدْتُ أَنِّى نَجَوْتُ مِنْهَا كَفَافًا لاَ لِى وَلاَ عَلَىَّ لاَ أَتَحَمَّلُهَا حَيًّا وَلاَ مَيِّتًا: [١١٩٦]

**ئەمـە گێڕانـەوەی ژمـارە (٢١١٣)ی تەجریـدی بوخارییـە بـۆ ئـەم فەرموودەیە:**

وعنه رَضِي اللَّهُ عَنْهُ قال: قِيلَ لعمر" ألا تسْتَخْلِفُ؟ قَالَ: إن أَسْتَخْلِفْ فَقَدِ اسْتَخْلَفَ مَنْ هُوَ خَيْرٌ مِنِّي يَعْنِي أَبَا بَكْرٍ وَإِنْ أَتْرُكْكُمْ فَقَدْ تَرَكَ مَنْ هُوَ خَيْرٌ مِنِّي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. (الحديث ٧٢١٨):

**دیسان ئیبنوعومەر -رەزای خودا لەخۆیو باوکی- فەرمووی: (کاتێ عومەر -رەزای خودای لێ بێ- پێکرا، عەرزیان کرد کەبۆچی جێنشین بۆ پاش خۆت دیاری ناکەیت؟ فەرمووی: (خۆئەگەر جێ نشین بۆ پاش مردنی خۆم دیاری بکەم، ئەوە جێگەی خۆیەتی چونکە ئەبو بەکر کەلە من باشتر بوو، جێنشینی**

---

**[١١٩٦] تجريد/٥، ژمارە: ٢١١٣ - ٧٢١٨ بخاری. پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١١٩٧ - ٤٩٦١ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٩٣ رقم الباب/٥١).**

بۆ خۆی دانا، وەسێتی کرد کەمن مردم عومەری کوڕی خەتاب لەجێگەی من ببێت بەخەلیفەی موسوڵمانان، وە خۆشی وابوو، خۆ ئەگەر جێنشێنیش دیاری نەکەم ، ئەوە پێغەمەر(دروودی خودای لەسەر بێ) کەلەمن باشترە، جێنشێنی دیاری نەکرد بۆ پاش مەرگی خۆی).

ئەمەیش لەدواوە ژمارە (١١٩٧)ی پوختەی موسلیمە کە بەهرەی پتری والتیادا:

عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى حَفْصَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) فَقَالَتْ: أَعَلِمْتَ أَنَّ أَبَاكَ غَيْرُ مُسْتَخْلِفٍ؟ قَالَ: قُلْتُ: مَا كَانَ لِيَفْعَلَ، قَالَتْ: إِنَّهُ فَاعِلٌ، قَالَ: فَحَلَفْتُ أَنِّي أُكَلِّمُهُ فِي ذَلِكَ، فَسَكَتُّ حَتَّى غَدَوْتُ وَلَمْ أُكَلِّمْهُ، قَالَ: فَكُنْتُ كَأَنَّمَا أَحْمِلُ بِيَمِينِي جَبَلاً، حَتَّى رَجَعْتُ فَدَخَلْتُ عَلَيْهِ، فَسَأَلَنِي عَنْ حَالِ النَّاسِ؟ وَأَنَا أُخْبِرُهُ، قَالَ: ثُمَّ قُلْتُ لَهُ، إِنِّي سَمِعْتُ النَّاسَ يَقُولُونَ مَقَالَةً، فَآلَيْتُ أَنْ أَقُولَهَا لَكَ، زَعَمُوا أَنَّكَ غَيْرُ مُسْتَخْلِفٍ، وَإِنَّهُ لَوْ كَانَ لَكَ رَاعِي إِبِلٍ أَوْ رَاعِي غَنَمٍ ثُمَّ جَاءَكَ وَتَرَكَهَا رَأَيْتَ أَنْ قَدْ ضَيَّعَ، فَرِعَايَةُ النَّاسِ أَشَدُّ، قَالَ: فَوَافَقَهُ قَوْلِي، فَوَضَعَ رَأْسَهُ سَاعَةً ثُمَّ رَفَعَهُ إِلَيَّ فَقَالَ: إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يَحْفَظُ دِينَهُ، وَإِنِّي لَئِنْ لاَ أَسْتَخْلِفْ، فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَمَ) لَمْ يَسْتَخْلِفْ وَإِنْ أَسْتَخْلِفْ فَإِنَّ أَبَا بَكْرٍ قَدِ اسْتَخْلَفَ، قَالَ: فَوَاللَّهِ مَا هُوَ إِلاَّ أَنْ ذَكَرَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) وَأَبَا بَكْرٍ، فَعَلِمْتُ أَنَّهُ لَمْ يَكُنْ لِيَعْدِلَ بِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) أَحَدًا، وَأَنَّهُ غَيْرُ مُسْتَخْلِفٍ. {الحديث٤: ٤٦٩١ = ٤٦٧٨ فم}:

ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: کاتێ عومەری باوکم پێکرا، چووم بۆلای حەفصەی خوشکم (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئایا دەزانی کە باوکت نیازی نییە، کە کەسێ لەدوای خۆی بکا بەجێنشین؟ فەرمووی: منیش بەحەفصەم گوت: شتی وا ناکا، جێنشین بۆ خۆی دادەنێ، حەفصە فەرمووی:

بێگومان کەشتی وادەکاو جێنشین بۆخۆی دانانێ. فەرمووی: منیش سوێندم خوارد کەدەبێ لەم بارەیەوە قسەی لەگەڵدا بکەم، ئیتر بێ دەنگ بووم هەتا سبەینێ، سبەینێش هەر قسەم لەگەڵدا نەکرد لەم بارەیەوە فەرمووی: لەڕاستیدا قسەکردن و باسکردنی ئەم بابەتە لەخزمەت عومەردا، کە لەو حاڵەتی سەرە مەرگەدا بوو، زۆر ئەستەم و دیژوار بوو، وەك بەدەستێ کێوێ هەڵبگرم وەهابوو، هەتا دیسانەوە گەڕامەوە بۆ خزمەتی و چوومە ژوورەوە بۆ خزمەتی و خۆی هەواڵی بارودۆخی خەڵکەکەی لێم پرسی، منیش هەواڵم پێیدا. فەرمووی: لەپاشا عەرزیم کرد: دەبیستم کە خەڵکەکە قسەیێ دەکەن، منیش سوێندم خواردووە کە ئەو قسەیەی ئەوان بۆ تۆ بکەم، گوایە دەڵێن: کەتۆ جێنشین بۆ خۆت دانانێیت، دەی من عەرزت دەکەم: وادانێ تۆ شوانێکی وشترت هەیە، یا شوانی رانێکت هەیە، رۆژێ شوانە لەخۆیەوە رانەکە بەجێ دەهێڵێ بەبێ شوان و دێت بۆلای تۆ، ئایا لەکاتی وادا تۆ شوانەکە بەهەڵەکار دانانێیت، کەڕانەکەی زایە کردبێ؟ دەی چاودێری کردنی بەرژەوەندی ملەت گەلێ گرنگترە لە چاودێری کردنی بەرژەوەندی رانە وشترو رانە بزن و مەڕ، ئیبنو عومەر فەرمووی: باوکم ئەم قسەی منی بەدڵ بوو، لەبەرئەوە ماوەیێ مات بووو سەری دانەواند، وەك بیربکاتەوە کەچی بڕیارێ بدا، لەپاشا سەری بەرزەوە کرد بۆلای من و فەرمووی: بێگومانم و دڵنیام لەوە کە خودا ئایینی خۆی دەپارێزێ، خوای من جێنشین بۆ خۆم دابنێم، یا جێنشین بۆ خۆم دانەنێم، وەکی تریش لەڕاستیدا ئەگەر من جێنشین بۆخۆم دانەنێم، ئەوە نەنگی نییە، چونکە پێغەمبەری خوایش جێنشینی بۆ خۆی دانەنا، کاتێ مەرگ بوو بەمێوانی، ئەگەر جێنشینیش دابنێم دیسان قەیدی نییە، چونکە ئەبوبەکر، لەسەرە مەرگا جێنشینی بۆخۆی دانا. ئیبنو عومەر فەرمووی: ئیتر زانیم کە باوکم راناسپێرێ

کە لەپاش خۆی کەسێ ببێ بەجێنشین، چونکە پێغەمبەر ناگۆڕێتەوە بە کەسێکی تر، هەتا بیکا بەسەرمەشق و چاوی لێ بکا، تەنیا کەسێ کەبیکا بەسەر مەشق لەم کارەدا، پێغەمبەرە (درودی خودای لەسەر بێ) ئەویش لەسەرە مەرگا جێنشینی دانەناوە!!

لێرەدا ئەم رستەیە هەیە: (عومەر لەوکاتە ناسکەدا فەرمووی: ئومێدم بەسۆزو میهرەبانی خودا زۆرە، کە لەدوا رۆژا فریام بکەوێ، لەهەمان کاتا مەترسیم لەکردەوەی خۆم هەیە، ئەگەر خوا رەحمم پێ نەکا، بەهۆیەوە تووشی سزای خودای گەورە ببم!).

## (٣) باب طَلَبِ الإِمَارَةِ وَنَحْوِهَا
## داوای فەرمانڕەوایی و شتی تری وا

١١٩٧- عن عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ سَمُرَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْهُ قَالَ قَالَ لِي النبي صَلَّى اللَّهم عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَا عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ سَمُرَةَ لَا تَسْأَلِ الْإِمَارَةَ فَإِنَّكَ إِنْ أُعْطِيتَهَا عَنْ مَسْأَلَةٍ وُكِلْتَ إِلَيْهَا وَإِنْ أُعْطِيتَهَا عَنْ غَيْرِ مَسْأَلَةٍ أُعِنْتَ عَلَيْهَا وَإِذَا حَلَفْتَ عَلَى يَمِينٍ فَرَأَيْتَ غَيْرَهَا خَيْرًا مِنْهَا فَكَفِّرْ عَنْ يَمِينِكَ وَائْتِ الَّذِي هُوَ خَيْرٌ. (الحديث ٦٦٢٢ أطرافه في: ٦٧٢٢، ٧١٤٦، ٧١٤٧):[١١٩٧]

ئەورەحمانی کوڕی سەموورە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر - درودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی پێم: ئەی ئەورەحمان! داوای فەرمانڕەوایی (ئەمارەت = ئەمیریی) مەکە، چونکە ئەگەر لەسەر داواکردنی خۆت، فەرمانڕەوایی و بەرپرسی وەربگریت لێت دەبێ بەبار، بەلام ئەگەر بەبێ ئەوە

---

[١١٩٧] تجريد/٥، زمارە: ٢٠٤٨ - ٦٦٢٢ بخاری. مسلم: ٤٦٩٢ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٨٣ رقم الباب/١).

کەخۆت هەوڵی بۆ بدەی بکرێی بەفەرمانڕەوا، یابەسەر کاری سەرکاریێ، ئەوا خودا زاڵت دەکا بەسەریا، ئەی ئەو ڕەحمان! ئەگەر سوێندت خوارد لەسەر شتێ، وەلەپاشا تەماشات کرد کەلەوشتە باشتر هەیە، ئەوە برێتی – واتە: کەفارەتی-سوێندەکەت بدەو، ئەوە بکە کەبەباشتری دەزانی).(تاج/٣ ل/٢٧٠ ز/ ژ/١ ش/د/ت/ن).

١١٩٨- عَنْ أَبِي بُرْدَةَ قَالَ: قَالَ أَبُو مُوسَى: أَقْبَلْتُ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَمَعِي رَجُلَانِ مِنَ الأَشْعَرِيِّينَ، أَحَدُهُمَا عَنْ يَمِينِي، وَالآخَرُ عَنْ يَسَارِي، فَكِلاَهُمَا سَأَلَ الْعَمَلَ، وَالنَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَسْتَاكُ، فَقَالَ: « مَا تَقُولُ يَا أَبَا مُوسَى أَوْ يَا عَبْدَ اللَّهِ بْنَ قَيْسٍ»؟ قَالَ: فَقُلْتُ: وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ مَا أَطْلَعَانِي عَلَى مَا فِي أَنْفُسِهِمَا، وَمَا شَعَرْتُ أَنَّهُمَا يَطْلُبَانِ الْعَمَلَ، قَالَ: وَكَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى سِوَاكِهِ تَحْتَ شَفَتِهِ وَقَدْ قَلَصَتْ، فَقَالَ: «لَنْ - أَوْ لاَ - نَسْتَعْمِلُ عَلَى عَمَلِنَا مَنْ أَرَادَهُ، وَلَكِنِ اذْهَبْ أَنْتَ يَا أَبَا مُوسَى أَوْ يَا عَبْدَ اللَّهِ بْنَ قَيْسٍ»، فَبَعَثَهُ عَلَى الْيَمَنِ، ثُمَّ أَتْبَعَهُ مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ، فَلَمَّا قَدِمَ عَلَيْهِ، قَالَ: انْزِلْ، وَأَلْقَى لَهُ وِسَادَةً، وَإِذَا رَجُلٌ عِنْدَهُ مُوثَقٌ، قَالَ: مَا هَذَا؟ قَالَ: هَذَا كَانَ يَهُودِيًّا فَأَسْلَمَ، ثُمَّ رَاجَعَ دِينَهُ دِينَ السَّوْءِ فَتَهَوَّدَ، قَالَ: لاَ أَجْلِسُ حَتَّى يُقْتَلَ، قَضَاءُ اللَّهِ وَرَسُولِهِ، فَقَالَ: اجْلِسْ، نَعَمْ، قَالَ: لاَ أَجْلِسُ حَتَّى يُقْتَلَ قَضَاءُ اللَّهِ وَرَسُولِهِ (ثَلاَثَ مَرَّاتٍ). فَأَمَرَ بِهِ فَقُتِلَ، ثُمَّ تَذَاكَرَا الْقِيَامَ مِنَ اللَّيْلِ، فَقَالَ أَحَدُهُمَا (مُعَاذٌ): أَمَّا أَنَا فَأَنَامُ وَأَقُومُ، وَأَرْجُو فِي نَوْمَتِي مَا أَرْجُو فِي قَوْمَتِي. {الحديث: ٤٦٩٥ = ٦٨٢٤ فم. تجريد/٣/٧٥، رقم: ١٠٠٢ = ٢٢٦١، ٣٠٣٨، ٤٣٤١، ٤٣٤٣، ٤٣٤٤، ٦١٢٤، ٦٩٢٣، ٧١٤٩، ٧٧٥٦، ٧١٥٧، ٧١٧٢}: [١١٩٨]

---

[١١٩٨] تجرید/٣، ژمارە: ١٠٠٢ = ٢٢٦١ بخاری. پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١٢٠٥ = ٤٦٩٥ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٨٨ رقم الباب/٢).

ئەبو بوردەی کوڕی ئـەبو مووسا، فـەرمووی: بـاوکم فـەرمووی: خـۆم‌و دوو پیاو لە ئامۆزاکانم، لـە ئەشـعەرییەکانی قـەومم، چووینە خزمـەتی پێغەمبـەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ) یەکێکیان لەلای راسـتمەوە بـوو، ئـەوی تریـان لەلای چەپمەوە بوو، عەرزی حەزرەتیان کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! بمانکە بـە کاربەدەسـتی سـەرکارێ؟ لەوکاتـەدا پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) خەریکی سیواك کردن بوو، بەمنی فەرموو: (ئەی ئەبو مووسا تـۆ دەڵێـی چـی؟) یا فەرمووی: (ئەی عەبدوڵڵای کوڕی قەیس! تۆ دەڵێی چی؟).

منیش گوتم: قوربان! بەو کەسەی کەتۆی کردووە بە پێغەمبەرو ئەم ئایینە راسـت‌و دروسـتەی پیادا نـاردووی، بـۆ دانیـشتوانی سـەر رووی زەوی، ئاگـام لـەم نیازەیان نەبووەو نـەمزانیوە کـە بـەم نیـازە هـاتوون، کـەداوای ئـیش‌و کـار لـەتۆ بکـەن، ئـەبو مووسـا فـەرمووی: ئێـستایش دەڵێـی والەبەرچاوم، کـە سـیواکەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەژێر لێویدا بوو، لێوی کرژەوە بوو بـوو، کـە فـەرمووی: (ئێمـە ئـەو جـۆرە کەسـانە ناکـەین بەسـەرەوکاری کارەکانمـان، کـەخۆیان حـەزیان لەسـەر کارییـەو خۆیـان داوای دەکـەن). ئـەوجا فـەرمووی: (بەڵام تۆ ئەی ئەبو مووسا) یا فەرمووی: (ئـەی عەبـدوڵڵای کـوڕی قـەیس! بـڕۆ ببـە بـە کاربەدەسـتی ئێمـە). ئـەبو بـوردە فـەرمووی: جـا بـاوکمی نـارد، کـردی بەکاربەدەستی سـەر وڵاتـی یەمـەن، هـەروەها موعـازی کوڕی جەبەلیـشی نـاردو کـردی بـە فـەرمانڕەوای یـەکێ لـەدوو ناوچـەکەی یەمـەن، جـا جـارێ موعـاز بـە قەڵەمڕەوی خۆیدا دەسووڕێتەوە، کە لەئەبو مووسـای هـاوڕێی نزیـك دەبێتـەوە، بەسـواری قـاترێ دەچـێ بـۆلای، دەڕوانـێ وا ئـەبو مووسـا دانیـشتووەو خـەڵك دەوریان لێ داوەو پیاوێکیش وا لەلایدا، هەردوو دەستی بەکۆت‌و زنجیر شـەتەك دراوەو کراوەتە ملی!!

ئەبو مووسا دۆشەکەڵەیێ رادەخا بۆ موعازو پێی دەفەرموێ: دابەزەو لێرە دانیشە، ئەویش پێی دەفەرموێ: ئەی ئەبو مووسا! ئەم پیاوە چییە، بۆ واکۆت‌و زنجیر کراوە؟ دەفەرموێ: ئەمە جوولەکە بووەو موسوڵمان بووەو، لەپاشا چووەتەوە سەر ئایینە خراپەکەی جارانی خۆی‌و بووەتەوە بە جوولەکە. موعاز فەرمووی: نەخەیر، هەتا بەپێی بڕیارو حوکمی خوداو پێغەمبەری خودا، کە دایان ناوە بۆ ئەم جۆرە کەسە، ئەم پیاوە نەکوژرێ دانانیشم. ئەبو مووسا دەفەرموێ: دەتۆ دانیشە، خۆشمان بۆ ئەوەمان هێناوە، ئەم قسەو گوفتوگۆیە، تا سێ‌جار لەنێوانیانا دووبارە بۆوە، ئەوجا ئەبو مووسا فەرمان دەداو پیاوەکە دەکوژرێ.

ئەوجا لەناو خۆیانا باسی شەو نوێژیان کرد، موعاز فەرمووی: بەڵام من لەپێشا دەخەوم بەنیازی ئەوە کە بەهێزبم بۆ شەو نوێژ، ئەوسا هەڵدەسم بۆ شەو نوێژ، جا هەم لە خەوتنەکەمدا بەتەمای پاداشی باشم، هەم لەشەو نوێژەکەمدا بەتەمای پاداشی باشم). {تاج/٨٤٦/٤، زنجیرە: ١٠٤، ژمارە: ٤٦٤٧ + تاج/٧١/٣، زنجیرە: ١٠٣، ژمارە: ٢٤٠٧}.

## (٥) باب فَضِيلَة الإمام العَادِلِ وَعُقُوبَةِ الجائِرِ والحث عَلَى الرِفْقِ بالرَّعِيَّةِ وَالنَهي عَنْ إدْخَالِ المَشَقَةِ عَلَيهِمْ

## باسی بەهرەوەری پێشەوای دادپەروەرو تۆڵەو سزای ستەمکەرو هاندان لەسەر نەرمەو نیانی نواندن لەگەڵ هاوڵاتیان‌و ڕێگری لە ئازاردانیان‌و دروستکردنی ئەرك‌و زەحمەت بۆیان

١١٩٩- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رضى الله عنهما) سَمِعْت -رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ- يَقُولُ:(كُلُّكُمْ رَاعٍ، وكلكم مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِـهِ ،فَالْإِمَـامُ رَاعٍ وَمَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ وَالرَّجُلُ راعٍ فِي أَهْلِهِ وَهُوَ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ،وَالْمَرْأَةُ راعيةٌ فِي بَيْتِ زَوْجِهَا

وَمَسْئُولَةٌ عَنْ رَعِيَّتِهَا وَالْخَادِمُ راعٍ فِي مَالِ سَيِّدِهِ و مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ ). قَالَ: وَحَسِبتُ أن قدقَالَ: (وَالرَّجُلُ راعٍ فِي مَالِ أَبِيهِ، وَمَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، وَكُلُّكُمْ رَاعٍ وَ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ). (الحديث: ٨٩٣- أطرفه في: ٢٤٠٩،٢٥٥٤،٢٥٥٨،٢٧٥١،٥١٨٨،٥٢٠٠،٧١٣٨):[1199]

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرموی: بەگوێی خۆم لەزاری پێغەمبەرم بیست (دروودی خوای لێ بێ) دەیفەرموو: (ئاگاداربن کەئێوە هەموتان، هەرکەسە بەپێی بەر پرسیاریی خۆی چاودێرن وەك شوانی دیار ران، پێشەوا کەسەرۆکی نەتەوەی ئیسلامە-شوانی ئەوکۆمەڵە خەڵکەیە، کەبووە بەسەرۆکیان، لەلای خودا بەرپرسیارە لەئەرکی پێشەوایی، سەبارەت بەو گەلی ئیسلامە، کەوان لەژێر چاودێریی ئەودا، هەروا هەموو پیاوێ (لەناو ماڵومناڵی خۆیدا) چاودێرەو شوانیانە، دەبێ وەك شوانی باش چاودێریی بەرژەوەندی ماڵو مناڵی خۆی بکا، چونکە لەلای خودا بەرپرسیارە لەوە، هەروەها هەموو ژنێ (لەناو ماڵی مێردیدا) چاودێرەو،لەلای خودای گەورە بەرپرسیارە لە ڕەچاوکردنی بەرژەوەندی ئەوانەی کەوان لەژێر چاودێریی ئەودا،هەروەها نۆکەریش چاودێرە بەدیار سامانی ئاغاکەیەوە، وەلەلای خودای گەورە بەرپرسیارە لەوەی کەوا لەژێرچاودێریی ئەودا). ئیبنوعومەر فەرموی: وادەزانم کەپێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرموشی: (هەروەها پیاو چاودێرە لەناو سامانی باوکی دا، وەلەلای خودا بەر پرسیارە لە چاودێرکراوی خۆی، تێکرا ئێوەی گەلی ئیسلام، هەموتان، هەرکەسەی بەپێ ی پایەو پلەی خۆی، چاودێرنو پاسەوانن، وەهەمویشتان، هەر کەسە بەپێ ی پایەی خۆی لەناو گەلی ئیسلام دا،

---

[1199] تجرید/١، ژمارە: ٤٧٤ = ٨٩٣ بخاری. پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ١٢٠١ = ٤٧٠١ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٤٩ رقم الباب/١٧).

بەرپرسیارن لەرەچاو کردنی بەرژەوەندی ئەوەی کەوا لەژێر چاودێریتان دا).
(تاج-٣ ز-١٠٦ ژ-٢٤٣١ چ-٤).

بۆ شەرحو بەراود لەگەڵ گێڕانەوەی پێشەوا بوخاریو پێشەوا موسلیمدا (رەحمەتی خودایان لێ بێ) گێڕانەوەی ژمارە (١٢٠١)ی پوختەی موسلیمیش راگوێزدەکەین، ئەمەی نووسرا دەقی ژمارە (٤٧٤)ی تەجریدی بوخاری بوو:

ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) أَنَّهُ قَالَ: « أَلاَ كُلُّكُمْ رَاعٍ، وَكُلُّكُمْ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، فَالأَمِيرُ الَّذِى عَلَى النَّاسِ رَاعٍ، وَهُوَ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، وَالرَّجُلُ رَاعٍ عَلَى أَهْلِ بَيْتِهِ، وَهُوَ مَسْئُولٌ عَنْهُمْ، وَالْمَرْأَةُ رَاعِيَةٌ عَلَى بَيْتِ بَعْلِهَا وَوَلَدِهِ، وَهِيَ مَسْئُولَةٌ عَنْهُمْ، وَالْعَبْدُ رَاعٍ عَلَى مَالِ سَيِّدِهِ، وَهُوَ مَسْئُولٌ عَنْهُ، أَلاَ فَكُلُّكُمْ رَاعٍ، وَكُلُّكُمْ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ». {الحديث: ٤٧٠١ = ٤٦٨٨ فم. تجريد/١/٤٤٩، رقم: ٤٧٤ = ٨٩٣، ٢٤٠٩، ٢٥٥٤، ٢٥٥٨، ٢٧٥١، ٥١٨٨، ٥٢٠٠، ٧١٣٨}:

ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: بزانن! کەئێوە هەمووتان چاودێرو شوانن‌و هەمووتان بەبێ جیاوازیی بەرپرسیارن لەژێر دەست (رەعییەت)ەکانی خۆتان، پێشەوا (کە سەرۆکی هەموو ملەتە) چاودێرەو شوانی ملەتە، وە ئەو لەلای خودا بەرپرسیارە لەو هەموو خەڵکەی کەوان لەژێر چاودێری ئەوداو ئەو بووە بەشوانیان، پیاو لەناو ماڵی خۆیدا شوانەو چاودێرە، وە ئەو بەرپرسیارە لەوانەی کەوان لەژێر چاودێریی ئەودا، ژن لەناو ماڵی مێردەکەیدا شوانەو چاودێرە، وە ئەو بەرپرسیارە لەخێزان‌و منداڵی مێردەکەی، وە کۆیلە شوانی ماڵی ئاغاکەیەتی‌و بەرپرسیارە لەلای خودا لەو ماڵە، ئەدیی! ئیتر هەمووتان هەر شوانن‌و هەمووتان بەپێی حاڵ بەرپرسیارن لەهەموو ئەوانەی کەوان لەژێر چاودێری ئێوەدا، خوای ماڵ‌و منداڵ‌و خێزان‌و کەسانی تربن، خوای ماڵات‌و

ئـاژەڵو گیانـدارانی بـێ زمـان بـن). {تـاج/٣/٨٤، زنجـیرە: ١٠٦، ژمـارە: ٢٤٣١} + {ریاض/١/٢٤٢، زنجیرە: ٣٥، ژمارە: ٢٨٣}.

١٢٠٠- عن مَعْقِلَ بْنَ يَسَارٍ رَضِي اللَّهُ عَنْهُ قال سَـمِعْتُ النَّبِـيَّ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: مَا مِنْ عَبْدٍ اسْتَرْعَاهُ اللَّهُ رَعِيَّةً فَلَمْ يَحُطْهَا بِنَـصِيحَةٍ إِلَّـا لَـمْ يَجِـدْ رَائِحَـةَ الْجَنَّةِ. (الحديث ٧١٥٠):[١٢٠٠]

مەعقیلی کوڕی یەسار -ڕەزای خودای لێ بێ- فەرمووی: بەگوێی خۆم لەزاری پیرۆزی پێغەمەرم ژ نەوت دەیفەرموو: (هەر بەندەیێ خودا بیکا بەسەر گەورەی کۆمەڵێ‌و بەباشیو بەدڵسۆزی سەرەوکاریی کاروبارییان نەکا بێگومان کەئەو بەندەیە بۆنی بەهەشت ناکات). (تاجی کورد/٣ ل/٢٨٥ ز/١٠٦ ژ/٢ - باسی ئەرکی سەر شانی فەرمانڕەوا).

## (٦) بابُ غِلَظِ تَحْرِيم الغلول

## باسی ناخونەكو گزیو دەستپیسی لە دەستکەوتی جەنگ زۆر نادروستەو ناڕەوایە

١٢٠١- حَدَّثَنِي أَبُو هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) قَالَ قَـامَ فِينَـا النَّبِـيُّ (صـلى الله عليـه وسلم) فَذَكَرَ الْغُلُولَ فَعَظَّمَهُ وَعَظَّمَ أَمْرَهُ قَالَ « لاَ أُلْفِيَنَّ أَحَدَكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى رَقَبَتِهِ شَاةٌ لَهَا ثُغَاءٌ عَلَى رَقَبَتِهِ فَرَسٌ لَهُ حَمْحَمَةٌ يَقُولُ يَا رَسُولَ اللَّهِ ، أَغِثْنِي . فَأَقُولُ لاَ أَمْلِكُ لَكَ شَيْئًا ، قَدْ أَبْلَغْتُكَ . وَعَلَى رَقَبَتِهِ بَعِيرٌ لَهُ رُغَاءٌ ، يَقُولُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَغِثْنِي . فَأَقُولُ لاَ أَمْلِكُ لَكَ شَيْئًا ، قَدْ أَبْلَغْتُكَ . وَعَلَى رَقَبَتِهِ صَامِتٌ ، فَيَقُولُ يَا رَسُولَ اللَّـهِ أَغِثْنِـي .

---

[١٢٠٠] تجریـد/٥، ژمـارە: ٢١٠٦ = ٧١٥٠ بخـاری. مـسلم: ٤٧٠٦ شـیحا (بخـاری رقـم الکتـاب/٩٣ رقـم الباب/٨).

**فَأَقُولُ لاَ أَمْلِكُ لَكَ شَيْئًا ، قَدْ أَبْلَغْتُكَ . أَوْ عَلَى رَقَبَتِهِ رِقَاعٌ تَخْفِقُ ، فَيَقُولُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَغِثْنِي . فَأَقُولُ لاَ أَمْلِكُ لَكَ شَيْئًا ، قَدْ أَبْلَغْتُكَ »:** [1201]

**ئـەم فەرموودەیـە گێڕانـەوەی جیاجیـای زۆرە، وا لەپێـشا ژمـارە (٦٧٠)ی تەجریدی بوخاری راگوێز دەکەین و لەپاش ئەویش ژمارە (١٢١٣)ی موختەصەری صەحیحی موسلیم دەنووسین، کە ناسراوە بە پوختەی موسلیم:**

**عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ يَقُولُ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (تَأْتِي الْإِبِلُ عَلَى صَاحِبِهَا، عَلَى خَيْرِ مَاكَانَتْ، إِذَا هُوَ لَمْ يُعْطِ فِيهَا حَقَّهَا، تَطَؤُهُ بِأَخْفَافِهَا، وَتَأْتِي الْغَنَمُ عَلَى صَاحِبِهَا عَلَى خَيْرِ مَاكَانَتْ، إِذَا لَمْ يُعْطِ فِيهَا حَقَّهَا، تَطَؤُهُ بِأَظْلَافِهَا، وَتَنْطَحُهُ بِقُرُونِهَا، وَقَالَ وَمِنْ حَقِّهَا أَنْ تُحْلَبَ عَلَى الْمَاءِ).**

**قَالَ: (وَلَا يَأْتِي أَحَدُكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِشَاةٍ يَحْمِلُهَا عَلَى رَقَبَتِهِ لَهَا يُعَارٌ، فَيَقُولُ يَا مُحَمَّدُ، فَأَقُولُ: (لَا أَمْلِكُ لَكَ شَيْئًا، قَدْ بَلَّغْتُ، وَلَا يَأْتِي بِبَعِيرٍ يَحْمِلُهُ عَلَى رَقَبَتِهِ، لَهُ رُغَاءٌ، فَيَقُولُ: يَا مُحَمَّدُ، فَأَقُولُ: (لَا أَمْلِكُ لَكَ مِنْ اللَّهِ شَيْئًا قَدْ بَلَّغْتُ). (الحديث ٢ ١٤٠ – اطرافه في: ٢٣٧٨، ٣٠٧٣، ٩٦٥٨):**

**ئـەم فەرموودەیـە دوو فەرموودەیـە، یەکـەمیان لەبـەرگی سـێی ریـاض الصالحیندا، زنجیرە/٢١٦ ل-٩٠٠ف-٩. تەرجەمە کوردییەکەی ئاوایە:**

**ئەبو هـوریرە (رەزای خـوای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەوکەسەی خاوەنی زێڕوزیـو بـێ و زەکـاتی لێ دەرنـەکا، لەرۆژی قیامەتا، ئەو زێڕ و زیوە سوور دەکرێتەوە، لەناو ئاگری دۆزەخا، تـادەبێ بەیەك پارچـە ئـاگری سـوور، ئـەوجا تەنیـشتی و ناوچـەوانی و پـشتی و هـەموو لەشی تـری پێـی داخ دەکرێ، هەموو جارێ کە سـارد دەبێتـەوە، سـەرلەنوێ سـوور سـووری دەکەنـەوە بـۆی و دیـسان وای لێ دەکەنـەوە، ئـیتر لـەو رۆژەدا کـە پـەنجا**

---

**[1201] تجرید/٢، ژمارە: ٦٧٠ = ١٤٠٢ بخاری.**

هەزار ساڵ درێژە، ئەو کابرایە ئەمە حاڵیەتی، هەتا دادگایی بەندەکان لەناو خۆیانا لە دادگای خودادا تەواو دەبێ، ئەوجا ڕێگەی خۆی نیشان دەدرێ، سا یا بۆ بەهەشت، یا بۆ دۆزەخ.

گوترا: ئەی پێغەمبەری خودا ! ئەی وشتر؟

فەرمووی: (وە ئەوەی خاوەنی وشتر بێ و، مافی مافدارانی لێ نەدا، کە یەکێ لەو مافانەی کە لە وشتردا هەن ئەوەیە: ئەو ڕۆژەی کە وشترەکە دەبرێ بۆ سەر ئاوو ئاودەدرێ و دە دۆشرێ، لەو شیرەی ئەو ڕۆژەیشدا مافی هەژارانی واتیادا، وەك خەرمانلۆغەی خەرمان، ئەو خاوەن وشترەی کە مافی مافدارانی لێ نەدا، لە ڕۆژی قیامەتدا، لە دەشتێکی کرکای کرکا، لەسەر دەم رایدەخەن بۆ ئەو وشترانە، وەتا بڵێیت زل زل و فیلەتەن و قەبەن و یەك پارێنەشیان کەم نییە، ئیتر ئەوانیش بەپا دەیشێلن و بە دەم دەیگەزن و قەپی لێ دەگرن، گشت جارێ کە دواییەکەیان بەسەریدا تێ دەپەڕێ، دیسانەوە بەرایەکەیان دەگێڕنەوە بۆ سەری ئیتر ئەمە حاڵیەتی لەو ڕۆژەدا، کە پەنجاهەزار ساڵ درێژە هەتا مەحکەمەو دادپرسیی ناو بەندەکان تەواو دەبێ، ئەوجار ڕێگەی خۆی پیشان دەدرێ، سایا بۆ بەهەشت یا بۆ دۆزەخ.

گوترا: ئەی پێغەمبەری خودا ! ئەی ڕەشەوڵاخ و مەڕو بزن ؟

فەرمووی: (وە ئەوەی خاوەنی ڕەشەوڵاخ و مەڕوبزن بێ‌و، مافی هەژارانیان لێ نەداو زەکاتی شەرعییان لێ دەرنەکا، لە ڕۆژی ژینەوەدا، لە قیامەتدا، لەدەشتێکی کرکای کرکا، لەسەردەم بۆیان ڕادەخرێ، ئەو ئاژەڵە لەو کاتەدا، نە تاقە یەکێکیان کەمە، نە شاخبادراوێکیان واتیادا، نە کۆڵێ، نە شاخ شکاوێ، بەڵکوو هەموو زرت و زیت و بزو ئامادەن بۆ شەڕە شۆق و قۆچ وەشاندن، ئیتر بە شاخ دەیدەنە بەر شۆق و بە سم گێرەی دەکەن، گشت جارێ کە دواییەکەیان

بەسەریدا تێ دەپەڕێ، دیسانەوە بەرابیەکەیان دەگێڕنەوە بۆ سەری، ئیتر ئەمە حاڵیەتی لەو ڕۆژەدا کە پەنجا هەزار ساڵ درێژە، هەتا مەحکەمەی ناو بەندەکان تەواو دەبێ، ئەوجا ڕێگەی خۆی پێ نیشان دەدرێ: جا یا بۆ دۆزەخ، یا بۆ بەهەشت.

گوترا: ئەی پێغەمبەری خودا ! ئەوا بڕیار (حوکم) ی زێڕو زیوو وشترو ڕەشە ولاخ و بزن و مەڕمان زانی ئەی بڕیاری ولاخی بەرزە چییەو چۆنە؟

فەرمووی: (ولاخی بەرزە سێ جۆرە: بۆ هەندێ پیاو مایەی پاداش‌و خێرە، بۆ هەندێ پیاو مایەی تاوان‌و شەڕە، بۆ هەندێ پیاو پەردەو داپۆشەرە، مایەی تاوان‌و شەڕە بۆ ئەو پیاوەی کە ڕایدەگرێ بۆ ڕیاو چاوەو خۆنواندن‌و شانازی پێوە کردن‌و هەروا بۆ دوژمنایەتی‌و دژایەتی گەلی ئیسلام‌و لە دژی موسوڵمانان بەکاری دەهێنێ!

پەردەو تارمیەکی داپۆشەریشە بۆ ئەو پیاوەی کە لەڕێگەی خودادا ڕایدەگرێ و بۆ ڕووسووری هەردوو جیهان، کارو کەسابەتی پێوە دەکاو، ئەو مافەی کە خودا لەسەر ئەو ولاخەی داناوە، کە بریتیە لە خەباتگێڕان لەسەر پشتی فەرامۆش نەکا، لەکاتی خۆیدا ئاوو ئالیکی دەداو، وچانی دەدا، نایڕەتێنێ، مایەی پاداشی باش و خێری گەورەیشە بۆ ئەو پیاوەی کە ڕایدەگرێ بۆ غەزا کردن و تێکۆشان لەبەر ڕەزای خودا، بۆ بەرژەوەندیی گەلی ئیسلام، لە مێرگێکدا، یا لە مێرغوزارێکا دەیبەستێتەو، ئیتر ئەو ولاخە هەرچی بخوات لەو مێرگ و میرغوزارەو، چەندە لەو لەوەڕە بلەوەڕێ، بە ژمارەی ئەوە چاکەو خێرو خێرات بۆ خاوەنەکەی دەنووسرێ، تەنانەت ئەگەر مەڕ بەندەکەی بپسێنێ، یان پەت و گوریسەکەی بپچڕێنێ، وە سەرێ دووسەر غار بکاو، بای باڵی خۆی بداو، یاری بکاو، تەنانەت ئەگەر بەبێ سوارەکەیشی تەراتێن بکا، هەتا لەکاتی وایشدا، خودا بە ژمارەی شوێن سم و بە ژمارەی تەرس و میزەکەی چاکەو خێری بۆ

دەنووسرێ.

گریمان خاوەنەکەی بەسەر ئاوێکا بردی، نیازی ئەوەیشی نەبێ کە ئاوی بدا، بەلاّم ولاّخەکە لە خۆیەوە دەمی نایە ئاوەکەوەو لێی خواردەوە، ئەوە بە قەد ژمارەی ئەو ئاوەی کە دەیخواتەوە چاکەی بۆ دەنوسرێ!.

گوترا: فوربان ! ئەی گوێدرێژ ؟

فەرمووی: (لەبارەی گوێدرێژەوە هیچ سرووشێکم بەتایبەتی بۆ نەهاتووە، تەنیا ئەم ئایەتە دانسقەو کەم هاوتایە نەبێ، کە تێکڕا گشت جۆرە خەیرێ، کەم و زۆر دەگرێتەوە، کە دەفەرمووێ: ﴿فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ، وَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ. (٧-٨)- زلزلة - ٩٩/٨﴾ واتە: هەر کەسێ بەقەی سەنگی تۆسقالێ چاکەی کردبێ پاداشتەکەی وەردەگرێ، هەروا هەرکەسێ بەقەی سەنگی تۆسقالێ خراپەی کردبێ، پاداشتەکەی وەردەگرێ..)، (ریاض الصالحين، کوردی/٣/٩٠٠ ف/٩ ـش).

دووەمیان لە پوختەی موسلیم ژمارە (١٢١٣) ئاوایە:

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَامَ فِينَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ذَاتَ يَوْمٍ، فَذَكَرَ الْغُلُولَ، فَعَظَّمَهُ وَعَظَّمَ أَمْرَهُ، ثُمَّ قَالَ: «لاَ أُلْفِيَنَّ أَحَدَكُمْ يَجِيءُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى رَقَبَتِهِ بَعِيرٌ لَهُ رُغَاءٌ، يَقُولُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَغِثْنِي، فَأَقُولُ: لاَ أَمْلِكُ لَكَ شَيْئًا قَدْ أَبْلَغْتُكَ، لاَ أُلْفِيَنَّ أَحَدَكُمْ يَجِيءُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى رَقَبَتِهِ فَرَسٌ لَهُ حَمْحَمَةٌ، فَيَقُولُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَغِثْنِي، فَأَقُولُ: لاَ أَمْلِكُ لَكَ شَيْئًا، قَدْ أَبْلَغْتُكَ. لاَ أُلْفِيَنَّ أَحَدَكُمْ يَجِيءُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى رَقَبَتِهِ شَاةٌ لَهَا ثُغَاءٌ، يَقُولُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَغِثْنِي، فَأَقُولُ: لاَ أَمْلِكُ لَكَ شَيْئًا قَدْ أَبْلَغْتُكَ. لاَ أُلْفِيَنَّ أَحَدَكُمْ يَجِيءُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى رَقَبَتِهِ نَفْسٌ لَهَا صِيَاحٌ، فَيَقُولُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَغِثْنِي، فَأَقُولُ: لاَ أَمْلِكُ لَكَ شَيْئًا، قَدْ أَبْلَغْتُكَ. لاَ أُلْفِيَنَّ أَحَدَكُمْ يَجِيءُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى رَقَبَتِهِ رِقَاعٌ تَخْفِقُ، فَيَقُولُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَغِثْنِي،

فَأَقُولُ: لاَ أَمْلِكُ لَكَ شَيْئًا، قَدْ أَبْلَغْتُكَ. لاَ أُلْفِيَنَّ أَحَدَكُمْ يَجِيءُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى رَقَبَتِهِ صَامِتٌ، فَيَقُولُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَغِثْنِي، فَأَقُولُ: لاَ أَمْلِكُ لَكَ شَيْئًا، قَدْ أَبْلَغْتُكَ». {الحديث: ٤٧١١ = ٤٦٩٧ فم= فتح الملهم تجريد/٢، رقم: ٦٧٠ = ١٤٠٢، ٢٣٧٨، ٣٠٧٣، ٩٦٥٨}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) رۆژێ هەڵسایەوە، وتارێکی فەرموو بۆمان، باسی ناخونەك‌و دەستپیسی لەماڵی تالانی کرد، وە ئەوەی بە تاوانێکی گەلێ گەورە دانا، وە فەرمووی: (نامەوێ لەرۆژی قیامەتدا بگەم بە یەکێکتان، وشترێ، بە بۆرە بۆر، بە قەلاندۆشکانیەوەبێ، بێ بڵێ: ئەی پێغەمبەری خودا! فریام کەوە، گرفتاری دەستی ئەم وشترە دزێتییە بووم، رزگارمکە لەدەستی، منیش پێی دەڵێم: من دەستەلاتی هیچم نییە کە بیکەم بۆت، من لەکاتی خۆیدا، لەجیهاندا، پێم راگەیاندوویت، نامەوێ لەرۆژی قیامەتدا بگەم بە یەکێکتان ئەسپێ، یا ماینێ، بە لووشکە لووشك، بە قەلاندۆشکانیەوە بێ، کە لەجیهانا بەناهەق بەدەستی هێنابێ، بێت بۆلاوو بڵێ: ئەی پێغەمبەری خودا! دەخیلتم لێم قەوماوە، بەدەستی ئەم ئەسپەوە پەرێشانم، هەم شەکەت‌و ماندووم‌و هەم ئابرووم چووە، دەی فریامکەوە، منیش پێی دەڵێم کەمن دەستەلاتی هیچم نییە بۆت کەبیکەم، من لەکاتی خۆیدا پێم راگەیاندووی، نامەوێ لەرۆژی دوا رۆژدا بگەم بە یەکێکتان مەرێ، یابزنێ، بە بارە بارو قارە قارو باعە باع، بەسەر نەرەی شانیەوە بێ، بێ‌و بڵێ: ئەی پێغەمبەری خودا! فریامکەوە، منیش پێی دەڵێم: من دەستەلاتی هیچم نییە کە بۆتی بکەم، من لەکاتی خۆیدا پێم راگەیاندووی!

نامەوێ لەرۆژی دوا رۆژدا بگەم بەکەسێکتان، کەسێ بەهاتوو هاوارو قیژە قیژ بە قەلادۆشکانیەوە بێ، بێت بۆلاوو بڵێ: ئەی پێغەمبەری خودا!

فریامکەوە، بەدەست ئـەم کۆیلـەوە کـە لـە تالآنییەکـەم حەشـارداوە کـە ئێـستا وا بەکۆڵمـەوە پەرێـشانم، منـیش پێـی دەڵـێم: مـن دەسـتەڵاتی هیـچم نییـە بـۆت کەبیکەم بۆت، من لەکاتی خۆیدا پیـتم راگەیانـدووە، نامـەوێ لـەڕۆژی دوا ڕۆژدا بگەم بە یەکێکتان کاڵاو جلو بەرگ، بەخشە خش، بە قەڵادۆشکانیەوە بێ، بێ بۆلامو بڵێ: ئەی پێغەمبـەری خـودا! فریامکـەوە، دامـاوم بەدەسـت ئـەم کووتـاڵی دزییەوە، منیش پێـی دەڵـێم: مـن دەسـتەڵاتی هیـچم نییـە کـە بیکـەم بـۆت، مـن لەجیهانا پێتم راگەیانـدووە، نامـەوێ لـەڕۆژی دوا ڕۆژدا بگەمـەوە بەکەسـێکتان، مردە ماڵو زێڕو زیوی دزێتیو گزێتیو فزێتی، بـە قەڵادۆشـکانیەوە بێـت، بێـت بـۆلامو بڵـێ: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! فریامکـەوە، منـیش پێـی دەڵـێم: مـن دەستەڵاتی هیچم نییە کەبیکـەم بـۆت، مـن لـەجیهانا، سـەبارەت بـە ئۆبـاڵی ئـەم جۆرە کاروبارە پێم راگەیاندووی). {تـاج/٣/٩٥، زنجـیرە: ١٠٩، ژمـارە: ٢٤٥٦، ج/٤} + {ریاض/٣، زنجیرە: ٢١٦}.

**ڕوونکردنەوە:**

١- بـۆ تێگەیـشتنی تـەواو لـەم فەرموودەیـە بڕوانـە ئـەم ژمارانـە لەپوختـەی موسلیم: (٩٢، ٩٣، ٩٤، ٩٥، ٩٦، ٩٧، ٩٨، ٩٩، ١٠٠).

٢- بەکۆی دەنگ زاناکان دەفەرموون: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەهـەردوو جیهانـدا، سـوودی بـۆ موسـوڵمان هەیـە، ڕەحمەتـەن لیلعالەمینـە، وە مەبەست لەم فەرموودەیەو وێنەی ئەم فەرموودەیە، یەکێکە لەم دوو مەبەستە:

١- هەڕەشەو گوڕەشـە، بەتایبـەتی لەسـەرەتای ئیـسلامەتییەوە، هـەتا خـەڵك بایەخی تەواو بە هەوڵو کۆششی خودی خۆیان بدەن.

٢- (ئەگەر کەسێ موسوڵمان نەبێو لەسەر بێ بـاوەڕی بمـرێ، نـە لـەجیهاناو

نـه لـهدوا رۆژدا، پێغهمبـهر (دروودی خـودای لهسـهر بـێ) سـوودی نابـێ بـۆی، چونکه کلیلی رزگاری نییه، که باوهڕه به ئایینی پیرۆزی ئیسلام!).

## (٧) بابُ تَحْرِيم هَدَايا العُمال
## دیاری بۆ کاربهدهستو فهرمانڕهواکان نادروسته

١٢٠٢- عَنْ أَبِى حُمَيْدٍ السَّاعِدِىِّ أَنَّهُ أَخْبَرَهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) اسْتَعْمَلَ عَامِلاً فَجَاءَهُ الْعَامِلُ حِينَ فَرَغَ مِنْ عَمَلِهِ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ هَذَا لَكُمْ ، وَهَذَا أُهْدِىَ لِى . فَقَالَ لَهُ « أَفَلاَ قَعَدْتَ فِى بَيْتِ أَبِيكَ وَأُمِّكَ فَنَظَرْتَ أَيُهْدَى لَكَ أَمْ لاَ » . ثُمَّ قَامَ رَسُولُ اللَّهِ – صلى الله عليه وسلم – عَشِيَّةً بَعْدَ الصَّلاَةِ فَتَشَهَّدَ وَأَثْنَى عَلَى اللَّهِ بِمَا هُوَ أَهْلُهُ ثُمَّ قَالَ « أَمَّا بَعْدُ ، فَمَا بَالُ الْعَامِلِ نَسْتَعْمِلُهُ ، فَيَأْتِينَا فَيَقُولُ هَذَا مِنْ عَمَلِكُمْ ، وَهَذَا أُهْدِىَ لِى . أَفَلاَ قَعَدَ فِى بَيْتِ أَبِيهِ وَأُمِّهِ فَنَظَرَ هَلْ يُهْدَى لَهُ أَمْ لاَ ، فَوَالَّذِى نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لاَ يَغُلُّ أَحَدُكُمْ مِنْهَا شَيْئًا ، إِلاَّ جَاءَ بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يَحْمِلُهُ عَلَى عُنُقِهِ ، إِنْ كَانَ بَعِيرًا جَاءَ بِهِ لَهُ رُغَاءٌ ، وَإِنْ كَانَتْ بَقَرَةً جَاءَ بِهَا لَهَا خُوَارٌ ، وَإِنْ كَانَتْ شَاةً جَاءَ بِهَا تَيْعَرُ ، فَقَدْ بَلَّغْتُ » . فَقَالَ أَبُو حُمَيْدٍ ثُمَّ رَفَعَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَدَهُ حَتَّى إِنَّا لَنَنْظُرُ إِلَى عُفْرَةِ إِبْطَيْهِ. [١٢٠٢]

ئهم فهرموودهیه له ژماره (١٢١٥)ی پوختهی موسلیمدا ئاوایه:

عَنْ أَبِى حُمَيْدٍ السَّاعِدِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: اسْتَعْمَلَ رَسُولُ اللَّه (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) رَجُلاً مِنَ الأَسْدِ عَلَى صَدَقَاتِ بَنِى سُلَيْمٍ يُدْعَى ابْنَ الأُتْبِيَّةِ، فَلَمَّا جَاءَ حَاسَبَهُ، قَالَ: هَذَا مَالُكُمْ، وَهَذَا هَدِيَّةٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّه (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «فَهَلاَّ جَلَسْتَ فِى بَيْتِ أَبِيكَ وَأُمِّكَ حَتَّى تَأْتِيَكَ هَدِيَّتُكَ إِنْ كُنْتَ صَادِقًا»؟ ثُمَّ خَطَبَنَا فَحَمِدَ

---

[١٢٠٢] بخاری: ٩٢٥ پوختهی موسلیم/٢، ژماره: ١٢١٥ - ٤٧١٧ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٨٣ رقم الباب/٣).

اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: « أَمَّا بَعْدُ، فَإِنِّي أَسْتَعْمِلُ الرَّجُلَ مِنْكُمْ عَلَى الْعَمَلِ مِمَّا وَلاَّنِي اللَّهُ، فَيَأْتِي فَيَقُولُ: هَذَا مَالُكُمْ، وَهَذَا هَدِيَّةٌ أُهْدِيَتْ لِي، أَفَلاَ جَلَسَ فِي بَيْتِ أَبِيهِ وَأُمِّهِ حَتَّى تَأْتِيَهُ هَدِيَّتُهُ إِنْ كَانَ صَادِقًا؟ وَاللَّهِ لاَ يَأْخُذُ أَحَدٌ مِنْكُمْ مِنْهَا شَيْئًا بِغَيْرِ حَقِّهِ إِلاَّ لَقِيَ اللَّهَ تَعَالَى يَحْمِلُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَلأَعْرِفَنَّ أَحَدًا مِنْكُمْ لَقِيَ اللَّهَ يَحْمِلُ بَعِيرًا لَهُ رُغَاءٌ، أَوْ بَقَرَةً لَهَا خُوَارٌ، أَوْ شَاةً تَيْعِرُ، ثُمَّ رَفَعَ يَدَيْهِ حَتَّى رُئِيَ بَيَاضُ إِبْطَيْهِ يقول: «اللَّهُمَّ هَلْ بَلَّغْتُ؟ بَصُرَ عَيْنِي، وَسَمِعَ أُذُنِي». {الحديث: ٤٧١٧ = ٤٧٠٣ فم. تجريد/٢، رقم: ٧٢٣ = ١٥٠٠، ٩٢٥، ٢٥٩٧، ٦٦٣١، ٦٩٧٩، ٧١٧٤}:

ئەبو حومەیدی ئەلساعیدی (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پیاوێکی ئەسدی کرد بە سەرکاری سەر زەکات، کە لەبەنی سولەیم کۆی بکاتەوە، ناوی ئیبنوللوتبییە بوو، کابراکە هاتەوە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لێپرسینەوەی لەگەڵدا ئەنجامدا، ئەویش گوتی: ئەمە هی ئێوەیەو ئەمەیش هی منە بەدیاری بۆم هاتووە! پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (جا کەوایە بۆ لەماڵی باوکت یا لەماڵی دایکت دانانیشیت هەتا بزانیت کە دیاریت بۆ دێت یانا، ئەگەر راست دەکەیت؟).

جا لەپاشا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سەرکەوتە سەر دوانگەو راوەستاو ستایش‌و سوپاسی خودای کردو ئەوجا فەرمووی: (لەپاش ئەمە، گەلێ جار وادەبێ هەندێ پیاو لەئێوە دەکەم بەسەرکاری سەرکارێ، لەو ئیش‌و کارانەی کە خودای گەورە سپاردوونی بەمن، کەچی کەدێتەوە دەڵێ: ئەمە هی ئێوەیەو ئەمەیش هی منە بەدیاری بۆم هاتووە، جا ئەگەر وایە ئەدیی بۆچی لەماڵی بابی، یا لەماڵی دایکی دانانیشیت هەتا بزانێ کە دیاریی بۆدێ یانا؟ ئەگەر راست دەکا؟ بەخودای گەورە، ئەوەی لەئێوە ناخونەك لەم ماڵە بداو چەپو گووپی لێ بکا بەناهەق، ئەوە لەرۆژی دواییدا ئەو ناخونەکە دەنێ بە نەڕەی

شانیەوەو دەیهێنێ بۆ دیوانی خودای گەورە، جا نامەوێ کە لەڕۆژی دواڕۆژدا بگەمەوە بەکەسێکتان، وشترێ بە بۆڕە بۆڕ بەکۆڵیەوە بێو بێ بۆ دیوانی خودا، یا بگەمەوە بە یەکێکتان کە رەشە وڵاخێ دزێتی بەکۆڵیەوەبێو بێ بۆ دیوانی خودا، یابگەمەوە بە کەسێکتان مەڕێ، یا بزنێکی دزێتی بەکۆڵەوە بێو بێ بۆ دیوانی خودا).

ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەردوو دەستی خۆی بەرزەوەکرد، هەتا سپیدەی هەردوو بنباڵەکانی بینران، ئەوجا فەرمووی: (ئەی خودایە! تۆ بەشایەت بە، ئەوا من ئەرکی سەرشانی خۆمم بەجێ هێناو پەیامی تۆم پێیان راگەیاند!!). ئەبو حومەید فەرمووی: بەچاوی خۆم پێغەمبەرم بینی کە ئەم فەرمایشتانەی دەفەرموو، وە بەگوێی خۆم گوێم لەم فەرمایشتانەی بوو، لەبەرئەوە دڵنیام لەم فەرموودەیە). {تاج/٣، زنجیرە: ١٠٩، ژمارە: ٢٤٥٥، ٢٤٥٦} .

## (٨) باب وجوب طاعة الأمَرَاء في غَيْرِ مَعْصِيَةٍ وَتحريمها في المعصيَةِ

## کوێڕایەڵی بۆ فەرمانڕەوا مەرجەو پێویستە، بە مەرجێ لە گوناها نەبێ، دەنا نادروستە

١٢٠٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضى الله عنهما): ( أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِـي الأَمْرِ مِنْكُمْ). قَالَ نَزَلَتْ فِي عَبْدِ اللَّهِ بْنِ حُذَافَةَ بْـنِ قَـيْسِ بْـنِ عَـدِيّ ، إِذْ بَعَثَـهُ النَّبِـيُّ (صلى الله عليه وسلم) فِي سَرِيَّةٍ. [١٢٠٣]

ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جارێ عەبدوڵڵای کوڕی حوزافەی کوڕی قەیسی کوڕی عەدی کرد بە سەرکردەی نێردەیەکی سەربازی، سەبارەت بەم عەبدوڵڵایە، ئەم ئایەتە

---

[١٢٠٣] بخاری. تفسیر: ٤٥٨٤ مسلم: ٤٧٢٣ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٦٥ رقم الباب/١١/٤).

دابەزی، كە دەفەرموێ: ﴿أَطِيعُوا اللّٰهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الأَمْرِ مِنْكُمْ﴾. واتە: گوێڕایەڵی فەرمانی خوداو فەرمانی پێغەمبەر بكەن، هەروا لە فەرمانی فەرمانڕەواكانتان دەرمەچن، بەمەرجێ موسوڵمان بن و لە فەرمانی خوداو پێغەمبەری خودا دەرنەچن).

١٢٠٤- عَنْ أَبِی هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أنه قَالَ: « مَنْ أَطَاعَنِي فَقَدْ أَطَاعَ اللَّهَ، وَمَنْ يَعْصِنِي فَقَدْ عَصَى اللَّهَ، وَمَنْ يُطِعِ أَمِيرِي فَقَدْ أَطَاعَنِي، وَمَنْ يَعْصِ أَمِيرِي فَقَدْ عَصَانِي ». {الحديث: ٤٧٢٤ = ٤٧١٠ فم. بخاری. أحكام: ٧١٣٧} : [١٢٠٤]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەركەسێ فەرمانبەریی من بكا، ئەوە فەرمانبەریی خودا دەكا، چونكە من هەموو شتێ لەسەر فەرمانی ئەو دەكەم، وە هەركەسێ لەمن یاخی ببێ ئەوە لەخودا یاخی دەبێ، وە هەركەسێ فەرمانبەریی فەرمانڕەوای من بكا، ئەوە فەرمانبەریی من دەكا، وە هەركەسێ لەفەرمانی فەرمانڕەوای من دەرچێ ئەوە لەفەرمانی من دەردەچێ). {تاج/٣/٧٨، زنجیرە: ١٠٥، ژمارە: ٢٤٢٠ چ/٤} + {ریاض/٢، زنجیرە: ٨٠، ژمارە: ٦٧١} .

١٢٠٥- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَّهُ قَالَ: « عَلَى الْمَرْءِ الْمُسْلِمِ السَّمْعُ وَالطَّاعَةُ فِيمَا أَحَبَّ وَكَرِهَ، إِلاَّ أَنْ يُؤْمَرَ بِمَعْصِيَةٍ، فَإِنْ أُمِرَ بِمَعْصِيَةٍ، فَلاَ سَمْعَ وَلاَ طَاعَةَ». {الحديث: ٤٧٤٠ = ٤٧٢٦ فم} : [١٢٠٥]

---

[١٢٠٤] بخاری. أحكام: ٧١٣٧ پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١٢٢٣ - ٤٧٢٤ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٩٣ رقم الباب/١).

[١٢٠٥] تجرید/٣، ژمارە: ١٢١٠ = ٢٩٥٥ بخاری. پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١٢٢٦ = ٤٧٤٠ تخریج وترقیم الشیخ خلیل مأمون شیحا لصحیح مسلم (بخاری رقم الكتاب/٩٣ رقم الباب/٤).

**ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (پیاوی موسوڵمان لەسەریەتی کە گوێڕایەڵ و فەرمانبەربیو لەفەرمانی گەورەی خۆی دەرنەچێ، ئەوکارەی پێ خۆش بێ یانا، بەمەرجێ فەرمانی پێ نەکرێ بە گوناهو خراپە، بەڵام ئەگەر فەرمانی پێکرا بە گوناهو خراپە، ئەوەنابێ بەگوێی بکا). {تاج/٣، زنجیرە: ١٠٥، ژمارە: ٢٤٢١} + {ریاض/٢، زنجیرە: ٨٠، ژمارە: ٦٦٣}.**

**١٢٠٦- عنْ عَلِيّ (رَضيَ اللهُ عنهُ) قَالَ: (بَعَث النَّبِيُّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) سَرِيَةً فَاسْتَعْمَلَ رَجُلا مِنْ الانْصار وَامَرَهُمْ انْ يُطيعُوهُ فَغَضبَ فَقَالَ: الَيْسَ امَرَكُمْ النَّبِيُّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) انْ تُطيعُونِي؟ قَالُوا: بَلَى قَالَ: فَاجْمَعُوا لِي حَطبا فَجَمَعُوا فَقَالَ: اوْقِدُوا نَارًا فَاوْقَدُوهَا فَقَالَ: ادْخُلُوهَا فَهَمُّوا وَجَعَلَ بَعْضهُمْ يُمْسِكُ بَعْضا وَيَقُولُونَ فَرَرْنَا الَى النَّبِيِّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) مِنْ النَّارِ فَمَا زَالُوا حَتَّى خَمَدَتْ النَّارُ فَسَكَنَ غَضبُهُ فَبَلَغَ النَّبِيَ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فَقَالَ: لَوْ دَخَلُوهَا مَا خَرَجُوا مِنْهَا الَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ الطاعَةُ فِي الْمَعْرُوفِ). (الحديث: ٤٣٤٠، طرفاه في: ٧١٤٥، ٧٢٥٧)؛ [١٢٠٦]**

**ئیمامی عەلی (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) لقێ سەربازی نارد بۆ کارێو، پیاوێکی لەیاریدەدەران (ئەنصار) کرد بە بەسەرکردەیان، وە فەرمانی پێیان کرد، کە فەرمانبەریی ئەو فەرماندەیە بکەن و لەفەرمانی دەرنەچن، جا ڕۆژێ فەرماندەکە تووڕە دەبێ، لەسەر ئەوە فەرمانێکیان پێ دەکا، ئەوانیش بەگوێی ناکەن، جادەڵێ: ئەی باشە! پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی نەکردووە بە ئێوە کە لەفەرمانی من دەرنەچن و بەگوێم بکەن! گوتیان: بەڵێ. دەڵێ: کەواتە ئادەی بارێ دارم بۆ**

---

**[١٢٠٦] تجرید/٤، ژمارە: ١٥٩٧ = ٤٣٤٠ بخاری. پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١٢٢٥ = ٤٧٤٢ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٩٣ رقم الباب/٤).**

کۆبکەنەوەئەوانیش دارەکەی بۆ کۆدەکەنـەوە،دەڵێ: ئـادەی ئـاگری تـێ بـەردەن، ئەوانیش ئاگری تێ بەردەدەن، ئەوجا دەڵێ: ئادەی بچنە ناوی!

جا ئەوانیش لە سەرەتاوە خەریك دەبن بـچنە نـاوی، بـەڵام بەرەبـەرە رایـان دەگۆڕێو ئەوانەی کە دەیانەوێ بـچنە نـاو ئاگرەکـە، کەسـانی تـر لـەهاوڕێکانیان دەیانگرن و ناهێڵن بچنە نـاوی و بەیـەکتری دەڵێن: ئێمـە لەدەسـتی چـوونە نـاو ئاگر هـەنامان بـردووە بـۆ پـەنای ئـایینی موحەممـەد، ئـیتر چـۆن ئێـستا بـچینە ناوی؟ ئیتر ئەمە حاڵیان بوو، لەم بارەیـەوە هـەر مقۆمقۆیـان بـوو، وە نەچـوونە ناوی هەتا ئاگرەکە دامردەوە، لەولاشەوە فەرماندەکەیان ڕقەکەی نیشتەوە.

ئەم باس و خواسـە گەیـشتەوە بـە پێغەمبـەر (درووودی خـودای لـێ بـێ) بـۆ روون کردنەوەی کارەکە فەرمووی: (ئەوانـە ئەگـەر بەقسەی ئـەو فەرماندەیـەی خۆیان بکردایە، بەبێ لێکۆڵینەوەی شایان لێی، بچوونایەتە ناو ئەو ئـاگرە، ئـەوە تاوانێکی گەورەی وا دەبوو، کە لە تۆڵـەو سزای ئـەوەدا هـەتا ڕۆژی قیامـەت لـەو ئـاگرەدا دەمانـەوەو لـە ژیـانی بـەرزەخ دا لـەناو ئـەو ئـاگرەدا دەبـوون، باشـیان کـردووە کـە لەمــەدا بـەگوێی فەرماندارەکـەی خۆیانیـان نـەکردووە، چـونکە فەرمانەکـەی ناهـەق بـووە، ئـەوەی کـە لەسـەر فەرمانبـەرە، فـەرمانی فەرمانڕەواکەی جێ بە جێ بکا، بـەڵام بەمـەرجێ فەرمانەکەی هـەق و دروسـت بێ نەوەك ناحەق و نادروست، وەك ئەم حاڵەتەی ئەمان).

لەبەرنەوەی وەرگەڕاوی ژمـارە (١٢٢٥)ی پوختـەی موسـلیم، سـەرکەوتووترە، ئــەویش راگوێزدەکــەین، لەهــەمان کاتــدا بــەهرەی جیــاوازی نێــوانی گێڕانەوەکانیـشمان بـۆ رەچـاو دەکـرێو هەسـت بـەو بەهرەیـە دەکـەین، کـە موحەدەثـین هەسـتیان پێکـردووە کـە گێڕانـەوەکان ئەگـەر لـەناو خۆیانـا کـەمێ جیاوازییـان بووبـێ، هـەردوو لایـان پیـادە کـردووە، وەهـیچ لایـەکیان فـەرامۆش نەکردووە.

عَنْ عَلِيّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَعَثَ جَيْشًا وَأَمَّرَ عَلَيْهِمْ رَجُلاً، فَأَوْقَدَ نَارًا، وَقَالَ: ادْخُلُوهَا، فَأَرَادَ نَاسٌ أَنْ يَدْخُلُوهَا، وَقَالَ الآخَرُونَ: إِنَّا قَدْ فَرَرْنَا مِنْهَا، فَذُكِرَ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ لِلَّذِينَ أَرَادُوا أَنْ يَدْخُلُوهَا: «لَوْ دَخَلْتُمُوهَا لَمْ تَزَالُوا فِيهَا إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ»، وَقَالَ لِلآخَرِينَ قَوْلاً حَسَنًا، وَقَالَ: «لاَ طَاعَةَ فِي مَعْصِيَةِ اللَّهِ، إِنَّمَا الطَّاعَةُ فِي الْمَعْرُوفِ». {الحديث: ٤٧٤٢ = ٤٧٢٨ فم. تجريد/٤/٣٤٣، رقم: ١٥٩٧ = ٤٣٤٠، ٧١٤٥، ٧٢٥٧ فتح الباري. نسائي. بيعة: ٤٢١٦. أبو داود. جهاد: ٢٦٢٥. تحفة الأشراف: ١٠١٦٨}:

ئیمامی عەلی (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەشکرێکی ناردو پیاوێکی لە یاریدەدەران (ئەنصار) کرد بەسەرکردەیان، وە فەرمانی پێیانکرد کە فەرمانبەریی ئەو فەرماندەیە بکەن‌و لەفەرمانی دەرنەچن، جا رۆژێ فەرماندەکە تووڕە دەبێ، لەسەرئەوە فەرمانێکیان پێ دەکا، ئەوانیش بەگوێی ناکەن، جا دەڵێ: ئەی باشە! پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی نەکردووە بەئێوە کە لەفەرمانی من دەرنەچن‌و بەگوێم بکەن! گوتیان: بەڵێ، دەڵێ: ئادەی بارێ دارم بۆ کۆبکەنەوە، ئەوانیش دارەکەی بۆ کۆدەکەنەوە، دەڵێ: ئادەی ئاگری تێ بەردەن، ئەوانیش ئاگری تێ بەردەدەن ئەوجا دەڵێ: ئادەی بچنە ناوی، چەند کەسێکیان ویستیان بچنە ناوی، کەسانێ تریش گوتیان: نەکەن شتی وا بکەن، چونکە ئێمە لەدەستی چوونە ناو ئاگری دۆزەخ هانامان بردووە بۆ پەنای ئایینی موحەممەد، ئیتر چۆن ئێستا بچینە ناوی؟

ئیتر ئەمە حاڵیان بوو، لەم بارەیەوە هەر مقۆ مقۆیان بوو، وە نەچوونە ناوی هەتا ئاگرەکە دامردەوە، لەولایشەوە فەرماندەکەیان رقەکەی نیشتەوە. جا ئەم باس‌و خواسە گەیشتەوە بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ

روونکردنەوەی کارەکە فەرمووی بەوانەی کە ویستبوویان بچنە ناو ئاگرەکە: (ئەوانە ئەگەر بەقسەی ئەو فەرماندەیەی خۆیان بکردایەو بەبێ لێکۆڵینەوەی شایان لێی، بچوونایەتە ناو ئەو ئاگرە، ئەوە تاوانێکی گەورەی وادەبوو، کە لەتۆڵەو سزای ئەوەدا هەتا ڕۆژی قیامەت لەو ئاگرەدا دەمانەوەو لەژیانی بەرزەخدا، لەناو ئەو ئاگرەدا دەبوون، باشیان کردووە کە لەمەدا بەگوێی فەرماندەکەی خۆیانیان نەکردووە، چونکە فەرمانەکەی ناهەق بووە).

حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) مەدحی ئەوانی تری کرد، کە بەگوێی فەرماندەکەیان نەکردبوو، وە فەرمووی: (شتێ کە بێ فەرمانی خودابێ، نابێ بەقسەی کەس ئەنجام بدرێ، تەنیا لەکاری باشدا مرۆڤ دەبێ گوێڕایەڵ بێ!!).

**روونکردنەوە:**

بۆ روونکردنەوەی ئەم فەرموودەیە بەهرە لەگێڕانەوەکەی تەجریدی بوخاری وەرگیراوە.

١٢٠٧- عَنْ جُنَادَةَ بْنِ أَبِي أُمَيَّةَ قَالَ: دَخَلْنَا عَلَى عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ وَهُوَ مَرِيضٌ، فَقُلْنَا: حَدِّثْنَا أَصْلَحَكَ اللَّهُ بِحَدِيثٍ يَنْفَعُ اللَّهُ بِهِ سَمِعْتَهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، فَقَالَ: دَعَانَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَبَايَعْنَاهُ، فَكَانَ فِيمَا أَخَذَ عَلَيْنَا أَنْ بَايَعَنَا عَلَى السَّمْعِ وَالطَّاعَةِ، فِي مَنْشَطِنَا وَمَكْرَهِنَا وَعُسْرِنَا وَيُسْرِنَا وَأَثَرَةٍ عَلَيْنَا، وَأَنْ لاَ نُنَازِعَ الأَمْرَ أَهْلَهُ، قَالَ: «إِلاَّ أَنْ تَرَوْا كُفْرًا بَوَاحًا عِنْدَكُمْ مِنَ اللَّهِ فِيهِ بُرْهَانٌ». {الحديث: ٤٧٤٨ = ٤٧٣٤ فم. تجريد/٥، رقم: ٢٠٩٣ = ٧٠٥٥، ٧٠٥٦. تحفة الأشراف: ٥٠٧٧} : [١٢٠٧]

---

[١٢٠٧] تجريد/٥، ژمارە: ٢٠٩٣ = ٧٠٥٥ بخاری. پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١٢٢١ = ٤٧٤٨ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٩٢ رقم الباب/٢).

جونادەی کوڕی ئەبو ئومەییە فەرمووی: چووین بۆسەردانی عوبادەی کوڕی صامیت، نەخۆش بوو، عەرزمان کرد: خودا چاکت بۆبکا، فەرموودەیەکمان بۆ بگێڕەوە، کەخۆت لە پێغەمبەرت بیستبێ، کەخودا بیکا بەمایەی سوودو قازانج بۆ هەموو لایێ، فەرمووی: پێغەمبەری خودا (درووودی خودای لەسەر بێ) بانگی کردین، لەشەوی پەیمانی عەقەبەدا، داوای لێ کردین، کەپەیمانی پێ بدەین، ئێمەیش پەیمانمان پێدا، پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) لەکاتی پەیمان لێ وەرگرتنەکەماندا، فەرمووی پێمان: (پەیمان‌و بەڵێنم پێ بدەن لەسەرئەوە: کە هەمیشە گوێڕایەڵ‌و فەرمانبەری خوداو پێغەمبەری خودابن، لەخۆشی‌و ناخۆشیدا، لەکاتی ئاسوودەیی‌و تەنگانەدا، تەنانەت ئەگەر فەرمانڕەواکانیشمان خۆمانە خۆمانەمان لەگەڵدا بکەن‌و نازی ئەم‌و ئەو بدەن بەسەر ئێمەدا، ئێمە ئەوە نەکەین بەمەهانەو لەفەرمانیان دەرنەچین). وە لەسەر ئەوەیش پەیمانمان داپێی: (کە گەڕو گێچەڵ‌و تەشقەڵە بەو کەسانە نەکەین، کەبوون بەسەرەوکارو کاربەدەست‌و بەرپرس‌و فەرمانڕەوای موسوڵمانان، مەگەر لەکاتێکا کە بەتەواوی شووڵی لێ هەڵ بکێشین‌و لەرێ دەرچن‌و کار بگاتە ئەوە، کوفرێکی پەتی‌و بێ باوەڕییەکی ئاشکرایان بەچاوی خۆتان لێ ببینن، کە ببێ بە بەڵگەیەکی رۆشن‌و بەمەهانەیەکی رەوا بۆتان لەلای خودا، ئەوجا هەقتان هەیە بەزەبری شیرو تیر، بایان پێ بدەنەوە بۆسەر شەقامە رێگەی ئیسلام). {تاج/٤٢/١، زنجیرە: ٨، ژمارە: ٥٧، ج/٤}.

## (١٠) باب الأمرِ بالوَفاءِ بِبَيْعَةِ الخُلَفاءِ الأوّلِ فالأوّل

## شەرع فەرمان دەكا بە وەفاكردن بە پەیمانی جێنشینەكان یەك لەدوای یەك، كامیان لە پێشتر بوو، وەفا بە پەیمانی ئەو، هەروا ئەوانی تر یەك لەدوا یەكتری

١٢٠٨- عَنْ أَبِي حَازِمٍ قَالَ: قَاعَدْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) خَمْسَ سِنِينَ، فَسَمِعْتُهُ يُحَدِّثُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « كَانَتْ بَنُو إِسْرَائِيلَ تَسُوسُهُمُ الأَنْبِيَاءُ كُلَّمَا هَلَكَ نَبِيٌّ خَلَفَهُ نَبِيٌّ، وَإِنَّهُ لاَ نَبِيَّ بَعْدِي، وَسَتَكُونُ خُلَفَاءُ فَتَكْثُرُ»، قَالُوا: فَمَا تَأْمُرُنَا؟ قَالَ: « فُوا بِبَيْعَةِ الأَوَّلِ فَالأَوَّلِ، وَأَعْطُوهُمْ حَقَّهُمْ، فَإِنَّ اللَّهَ سَائِلُهُمْ عَمَّا اسْتَرْعَاهُمْ». {الحديث: ٤٧٥٠ = ٤٧٣٦ فـم. تجريد/٤/٦٢، رقم: ١٣٧٧ = ٣٤٥٥}:[١٢٠٨]

ئەبو حازم (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: پێنج ساڵ ئامادەی كۆڕی زانستی ئەبو هورەیرە بووم، لێیم بیست دەیفەرموو: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (جاران نەوەی ئیسرائیل – واتە: گەلی جوولەكە، كە لەزمانو زاراوی قورئانو سوننەتدا ناودارن بە بەنی ئیسرائیل – پێغەمبەران دەیانبردن بەڕێوەو سەرپەرشتی كاروباریان دەكردن، هەركاتێ پێغەمبەرێ فەوتی دەكرد، گورج پێغەمبەرێكی تر لەجێگەی ئەو دادەنیشتو وڵاتی دەبرد بەڕێوە، بەڵام ئاشكرایە كە لەپاش من پێغەمبەری تر نابێ، بەڵام جێنشین دەبن، زۆریش دەبن نەوەك كەم، هاوەڵان فەرموویان: قوربان! جا فەرمانت بەچییە پێمان، وە ئەركی سەرشانی ئێمە چییە بەرابەریان؟ فەرمووی: (بەرودوا، یەك لەدوایەك پەیمانیان بدەنێ لەسەر ئەوە كە فەرمانیان نەشكێنن‌و بەگوێیان بكەن لەكاری خێرا، با هیچ كاتێ بێ پێشەواو بێ سەرۆك نەبن، تانەبێ بە پادشا گەردانی، بەڵام لەهەر سەردەمێكا، كێ لەپێش پێشەوە

[١٢٠٨] تجرید/٤، ژمارە: ١٣٧٧ = ٣٤٥٥ بخاری. پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١١٩٨ = ٤٧٥٠ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٦٠ رقم الباب/٥٠).

**پەیمانتان داپێی، ئیتر ئەوە جێنشینی راستەقینەیەو پەیمانی ئەوە ببەنە سەر، هەتا بەپێی شەرعی خودا، یەکێکی تر لەجێگەی ئەو دەبێ بەجێنشین، ئەوسا پەیمانی ئەو جێبەجێ بکەن‌و بیبەنە سەر، ئیتر هەروەها، وە هەموو کاتێ پەیمانەکەیان ببەنە سەرو مافی خۆیانیان پێ بدەن‌و بەناڕەوا بەترە بیانوویێ لە فەرمانیان دەرمەچن!**

**بێگومان کە ئەوانیش لەلای خوداوەندی مەزن بەرپرسیارن، دەرهەق بەو خەڵکەی کە خودا ئەوانی کردووە بەکاربەدەستو بەرپرس‌و چاودێریان!).**

**{ریاض/٢، زنجیرە: ٧٨، ژمارە: ٦٥٦}.**

## **روونکردنەوەیەکی گرنگ:**

**مەبەست لەم فەرموودەیە دوو خاڵی سەرەکییە:**

**یەکەم: لەپاش مەرگی پێغەمبەر (درووددی خودای گەورەی لەسەر بێ) دەرگای وەحی‌و تەشریع‌و یاسادانان دادەخرێ‌و، بیعثەت‌و پێغەمبەرایەتی دێتە کۆتاییی‌و، سرووش‌و وەحی‌و پەیامی ئاسمانی تر، لەدوا مەرگی پێغەمبەر نابێ‌و، ئایینی پیرۆزی ئیسلام، لەهەموو رویەکەوە تەواوو دامەزراو دەبێ‌و پێویستی بە لێ کەمکردن‌و لێ زیادکردن نییەو هەرکەسێ لافی شتی وا لێ بداو داوایەکی لەم چەشنەی هەبێ، بەهەر ناوێکەوە بێ، ئەوە درۆی پەتییەو ئەو داوایەی لێ قەبووڵ ناکرێ، داوای بوون بە پێغەمبەرو فروستادەو ئیمامی مەعصووم‌و وەصی پێغەمبەرو مەهدی مونتەظەرو ئیمامی موسەردەب، شتی وا لەدوای مەرگی پێغەمبەر، هەمووی درۆیەو نابێ باوەڕی پێ بکرێ، هەرکەسێ لافی شتێکی ئاوا لێبدا، ئەوە درۆزنەو نابێ باوەڕی پێ بکرێ، قسەو داوای وا پووچ‌و بێ بایەخەو بە پێچەوانەی قورئانە کە دەفەرموێ:**

{إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ – الحجر – ٩/١٥} وە دەفەرموێ: {الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِينًا – المائدة – ٥/٣} وە دەفەرموێ: {مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَكِن رَّسُولَ اللَّهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ – الأحزاب – ٤٠/٣٣}.

واتەیەکی کورت بۆ ئەم ئایەتانەو کۆمەڵێ فەرموودەی تری پێغەمبەر، لەم بابەتە ئەمەیە: (موحەممەد ئاخر پێغەمبەرە، ئیسلام ئاخر دین‌و ئایینە، قورئان ئاخر نامەی ئاسمانییە، ئایینی ئیسلام لەهەموو روویەکەوە تەواوە، خودا خۆی دەیپارێزێ لە فەوتان‌و دەستکاری‌و گۆڕانکاری!). {بڕوانە: تاج/١، لاپەڕە: ٢٦، زنجیرە: ٤، ژمارە: ٣٠، ج/٤ + تاج/٤/٤٢٣، زنجیرە: ١٦، ژمارە: ٤٠٤٥ چاپی چوارەم}.

هەروەك چۆن قسەی وا بێ سەروبەرەو داوای وا بێ بەڵگەیەو پێچەوانەی قورئان‌و سوننەتی صەحیحی پێغەمبەرەو پێچەوانەو دژی بیرو باوەڕی دامەزراوی چینی یەکەمی موسوڵمانانیشە، کە زۆرینەیان لە مەککەو لەمەدینە لە خزمەتی پێغەمبەردا بوون‌و دەماودەم بەگوێی خۆیان، ئایەت بەئایەت‌و بابەت بە بابەت، ئەم ئایینە پیرۆزەیان لەدەمی پێغەمبەر خۆی وەرگرتووەو زۆر بەباشی لێی حاڵی بوون‌و لە عیشقی ئەو دینە کۆچ‌و باریان کردووەو ئازارو ئەشکەنجەو دەربەدەری زۆریان چەشتووەو بە رۆح‌و بە سەروماڵ‌و منداڵ‌و بە کۆششێکی بێ وچان‌و بەو پەڕی دڵسۆزی‌و لەخۆبووردن‌و قوربانی دانەوە، خەوو خۆراکیان لەخۆیان هەراسان کردووە، هەتا ئەم ئایینە پیرۆزەیان پەخشەوە کردووە، لەپێناوی ئەوەدا لێیان کوژراوە، کوڕیان کوژراوە، ماڵیان تالانکراوە، دەربەدەر بوون، ئەم چینی یەکەمی ئیسلامە کە بریتی بوون لە موهاجیرین‌و ئەنصارو ئەصحابی بەیعەتولریضوان‌و عەشەرەی موبەششەرەو هەموو خەڵکی

مەککـــەو مەدینـــەو دەوروبـــەریانو هـــەموو صـــەحابەکانی پێغەمبـــەرو کەسـوکارەکەیو هاوسـەرەکانیو هـۆزی قـورەیشو زۆرینـەی پیـاو مـاقوڵانی دوورگەی عەرەبو بەشداربووانی غـەزای بـەدرو ئوحـودو حونـەینو خەنـدەقو غەزەواتەکانی تـری پێغەمبـەر، ئـەم چینی یەکـەمی موسـوڵمانانە، لەسـەردەمی پێغەمبەرو لەدوای سەردەمی پێغەمبەر، ئەوانەیان کە شەهید بوون لەسەر ئـەم بیرو باوەڕە شەهید بوون ئەوەیشی کە شەهید نەبووە، هەتا مردووە لەسەر ئـەم بیروباوەڕە مردووەو ئاگای لەم هەموو زاراوە تازانە نەبووە، کە هەندێ لایەن بـۆ دینی موحەممەدیان زیادکردووە!!

ئـەم چینی یەکەمـە زۆر بەباشـی لـە ئایەتـەکانی قورئـانو فـەرموودەکانی پێغەمبەر تێ گەیشتوون، وە هەموو دەقەکان لەناو دڵیانا چەسپ بووەو جێگـەی خۆیان کردۆتەوە، وەك (لاَ نَبِيَّ بَعْدِي) و (وَأَنَا خَاتَمُ النَّبِيِّينَ)، هەر لەم خـاڵی گـورِ بەستنەوە بووە، کە جەنگیان لەگەڵ موسـەیلەی کـەذابو موختـاری ئـەقەفیو ئەسوەدی عەنسی یەمەنیو سەجاحەوە کرد، کە ئەمانـە لافـی پێغەمبەرایـەتیو شتی وایان لێ دەدا، یەکسەر لـەپاش مـەرگی پێغەمبـەر، بێگومـان کـە لـەناو ئـەم چینەدا، کە برێتی بوون لەپێشینانی باشـی ئـەم گـەلی ئیـسلامە، کـە زانـاو دانـاو شـاعیرو مێـژوو نـووسو موحـەددیـثو موفەسـسیرو ئـەدیبو خواناسـی گـەورە گـەورەیان تیـابوو، شـتی وا نـەگوتراوەو نەبیـستراوە: (کـە گوایـە لـەپاش مـەرگی موحەممـەد، پێغەمبـەری تـر هـەبێ، یـا ئیمـامی مەعـصووم هـەبێ، یـا مەهـدی مونتـەظەر هـەبێ، یـا کـەموکورتی لـە ئـایینی ئیـسلامدا هـەبێ، یـا تەواوکـەری ئیـسلام هـەبێ، یـا هەرکەسـێ بـاوەڕی بـە وەسـێتیی عـەلیو ئیمـامی موسـەردەب نـەبێ، بـاوەڕی بــە موحەممــەدیش نییــە، بێگومــان ئەگــەر شــتی وا ببوایــە. نەدەشارایەوە، لە قورئانا باسی دەبوو، لە سوننەتی موتەواتـەردا دەیانگێڕایـەوە،

هەر هیچ نەبێ سەحابە گەورەکانو ئیمامی عەلیو ئیمامی حەسەنو ئەهلوبەیتەکەی پێغەمبەرو مامەکانیو ئامۆزاکانی دەیانگێڕایەوە!).

بەڵام لەپاش رزگارکردنی وڵاتی فارس لەلایەن ئیمامی عومەرەوەو لەپاش گورز وەشاندنی سەخت لە جوولەکەو لە ئایینەکانی تر، لە ناوچەکەدا، بەتایبەتی لەپاش رووداني کۆمەڵێ رووداوی ناهەمواری ناپەسەندو کۆمەڵێ کارەساتی دڵتەزێن، کە سێ کەس لە جێنشینە فرە باشەکانی پێغەمبەریان تیادا شەهیدبوو، بەتایبەتی تر لەپاش دوورکەوتنەوەی زۆر لە دەستەڵاتدارانی عەرەب لەگیانی ئیسلامو خۆ سەپاندنی عەرەبان بەسەر وڵاتداو پەراوێزکردنی نا عەرەبان لە حوکمی وڵاتی خۆیانو لەپاش سەرهەڵدانو پەیدابوونی مولکی عەضوض، وەك پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ثُمَّ يَكُونُ مُلْكٌ عَضُوضٌ) لەپاش پەیدابوونی بارودۆخێکی پڕ لە خۆمانە خۆمانە، لەبەینی فەرمانڕەواکانو گەلە موسوڵمانەکانا، وەك ئەم بارودۆخەی عێراق، کە هەمیشە کوردان پەراوێز کراونو هەر رۆژەی بەناوێکەوە زوڵمو زۆریان لێ دەکرێ، تەنانەت کار گەیشتووە بەوە، لە یەکەم دەرفەتی رەخساوا، لەناو بەناو رۆشنبیرەکانی کورددا، هەر کوردێ دیانی خێر بە عەرەب دابنێو خۆی بە موسوڵمان بزانێ، بەنۆکەرو بەجاشی عەرەبو بە عەرەب پەرست دائەنرێ!!

جا لەپاش رووداني بارودۆخێکی ئاوا، گوروویە داخ لەدڵەکانو لایەنە تێکشکاوەکان، کە چاوەڕوانی هەل بوونو لەوەوپێش تاكو تەرابوونو وەك رێکخراوێکی نهێنی داخ لەدڵی چاوەڕوانی تۆڵە سەندن بوون، لەرووموزەکانی فتوحاتی ئیسلامی، ئەمانە لەپاش هەلی رەخساو، زۆر بە لێزانانەو شەیتانانە، چوونە پاڵ حەجەکەو کۆمەڵێ مەزڵوومییەتی ئالوبەیتی پێغەمبەریان قۆستەوەو مەسحێکی زیرەکانەی ئایەتەکانی قورئانو فەرموودەکانی سوننەتیان

١٢١٢- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما عن النبي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قال: من كرِهَ مِنْ أَمِيرِهِ شَيْئًا فَلْيَصْبِرْ فَإِنَّهُ مَنْ خَرَجَ مِنْ السُّلْطَانِ شِبْرًا مَاتَ مِيتَةً جَاهِلِيَّةً. (الحديث ٧٠٥٣ طرفاه في: ٧٠٥٤، ٧١٤٣)[١٣١٣]

ئیبنو عەباس -رەزای خودا لەخۆی‌و باوکی- دەفەرموێ: پێغەمەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەگەر کەسێ شتێکی دی لەفەرمانڕەواکەی، وەئەو شتەی بەدڵ نەبوو، پێ ی ناخۆش بوو، ئەوە بائەوە نەکا بە مەهانە بۆ هەڵگردنی بەیداخی یاخێتی‌و لەفەرماندەرچوونی‌و، ئەوە نەکا بەبیانووی تێکدانی کۆمەڵەی موسوڵمانان، بەڵکوو باددان بەخۆیدا بگرێ، چونکە ئەوەی یەك بست لەکۆمەڵەی موسوڵمانان جیا ببێتەوە، وەبمرێ ئەوە بە نەزانی دەمرێ، وەك مردنی سەردەمی نەزانی پێش ئیسلام) (تاجی کوردی/٣ ل/٢٧٩ ژ/٥ ز/١٠٥- ش- باسی: بەگوێ کردنی فەرمانڕەوا پێویستەو..).

## (١٨) باب إستحباب مُبَايعَة الإمام الجَيْشَ عِنْدَ إرَادَةِ القِتالِ وبيان بيعة الرِضوان تَحْتَ الشَجَرَة

## لە کاتی دەستپێکردنی شەڕدا، سوننەتە کە سوپا پەیمان بدەن بە پێشەوا، وە باسی بەیعەتی ریضوان کە لە ژێر درەختەکەدا ڕوویدا

١٢١٣- عنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رَضيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ قَالَ لَنا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَوْمَ الْحُدَيْبِيَةِ: انْتُمْ خَيْرُ اهْلِ الارْض.وَكُنَّا الْفًا وَارْبَعَ مِائَةٍ وَلَوْ كُنْتُ

[١٣١٣] تجرید/٥، ژمارە: ٢٠٩٢ = ٧٠٥٣ بخاری. مسلم: ١٨٤٩، محمد فؤاد (بخاری رقم الکتاب/٩٢ رقم الباب/٢).

ابْصِرُ الْيَوْمَ لارَيْتُكُمْ مَكَانَ الشَّجَرَةِ(الحديث:٤١٥٤، اطرافه في: ٣٥٧٦، ٣١٥٢، ٤١٥٣، ٤٨٤٠، ٥٦٣٩):[١٣١٣]

جابیر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە ڕۆژی حودەیبییەدا، خۆشەویست (دروودی خودای لێ بێ) بە ئێمەی فەرموو، کە ئامادەی ئەو غەزایە بووین لەخزمەتیدا: (ئێوە باشترینی دانیشتوانی سەر ڕووی زەوین) وە ئەو کاتە ئێمە هەزارو چوار سەد کەس بووین، جابیر (رەزای خودای لێ بێ) لەکۆتایی تەمەنی دا کوێربوو بوو، بۆیە دەیفەرموو (ئەگەر ئێستا چاوم بمایە شوێنی ئەو درەختەم پێ نیشان دەدان کە یارانی پێغەمبەر(دروودی خودای لێ بێ) لەژێریدا بەیعەت و پەیمانیان دا، بەپێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لە یارانی و پەیڕەوانی).

١٣١٤- عَنْ الْمُسَيَّبِ عَنْ أَبِيهِ قَالَ لَقَدْ رَأَيْتُ الشَّجَرَةَ، ثُمَّ أَتَيْتُهَا بَعْدُ فَلَمْ أَعْرِفْهَا:[١٣١٤]

موسەییەبی کوڕی حەزەن فەرمووی: من خۆم ئەو درەختەم دی، کە لەڕۆژی پەیمانی حودەیبییەدا، موسوڵمانان لەژێر ئەو درەختەدا، پەیمانیان بەست لەگەڵ پێغەمبەردا، من خۆم یەکێك بووم لەو پەیماندەرانە، بەڵام لەوەدوا چوومەوە بۆ ئەوێ، درەختەکەم نەناسییەوە.

---

[١٣١٣] تجرید/٤، ژمارە: ١٥٦١ = ٤١٥٤ بخاری. مسلم: ١٨٥٦ = ٤٧٩٨ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٦٤ رقم الباب/٣٥).

[١٣١٤] بخاری. مغازی: ٤١٦٢، ٤١٦٣، ٤١٦٤، ٤١٦٥، مسلم: ٤٧٩٨ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٦٤ رقم الباب/٣٥).

**ڕوونکردنەوە:**

**سەعیدی کوڕی موسەییەبی کوڕی حەزن (ڕەزای خودای گەورە لەخۆیو لەباوکیو باپیری بێ).**

**سەعید خۆی تابیعییە، باوکیو باپیرەی هاوەڵی پێغەمبەر بوون، لەمەککەوە کۆچیان کردووە بۆ مەدینە، موسەییەب بازرگان بوو، لەو کۆمەڵەیە، کە لەژێر درەختەکەی شەجەرەتولریضواندا، پەیمانیان بەست لەگەڵ پێغەمبەردا، حەوت فەرموودەی گێڕاوەتەوە (٣) سیانیان لە بوخاریدایە، فەرموودەی لەموسلیمیشدا هەیە، وەك فەرموودەی ژمارە: (٣ = ١٣١ مختصر صحيح مسلم/شيحا).**

**حەزن ڕۆژی ئازاد کردنی مەککە ئیسلام بوو، یەکێك بوو لەپیاوماقوڵانی قورەیش، ئامادەی شەڕی یەمامە بوو، کەجەنگێکی گەورە بوو لەنێوانی موسوڵمانانو لەشکری موسەیلەمەی کەززابدا روویداوە. حەزن دەیفەرموو: چوومە خزمەتی حەزرەت فەرمووی: (ناوت چییە؟ گوتم: ناوم حەزنە (واتە: هەردەو هەڵەتو رەقەن!) حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (نا تۆ ناوت سەهلە). (واتە: دەشتو نەرمانی). منیش رازی نەبوومو بەگوێم نەکردو عەرزیمکرد: ناوێ ناگۆڕم کەباوکم لەمنی ناوە!**

**ئیبنو لموسەییەب دەیفەرموو: (ئیتر لەوساکەوە کەباپیرەم ئەم قسە رەقەی لەرووی پێغەمبەردا کردووەو بەگوێی نەکردووە، کەخۆی ناو بنێ (سەهل) سەررەقیو توندوتیژیمان هەتا ئێستا لەناودا ماوەو لێمان نابڕێ. (تاج/٥، ژمارە: ٥٤٠٧ چاپی چوارەم – گۆڕینی ناوی ناشیرین بەناوی لەبارتر)**

**رەحمەت لەو کەسەی لەبارەی رێزو خۆشەویستی باوکیو دایکییەوە دەڵێ (نووری فارس).**

بـــەبێ تـــۆ بابـــە! مـــاوێ نـــەماوم

دایـــەگیان! ئـــەتۆش هێـــزێ هـــەناوم

ئەوەنـــــدە ڕێزتـــــان وا لەبەرچـــــاوم

پـــێم شـــەرمە ناوتـــان وا لـــەپاش نـــاوم!!

حـەزن (ڕەزای خـودای لێ بێ) دوو فـەرموودەی لەبوخاریـدا هەیـە، کاتـێ لەپێش هاتنی ئیسلامدا بناغەی کابەیان دانایەوە، حەزن بەردێکی لەبـەردەکانی کابـە بـرد، بەردەکـە خـۆی لەدەسـتی ڕاپـسکان و ڕۆیـشتەوە جێگەکـەی خـۆی لـەدیواری کابـەتوڵڵا. حـەزن دەسـتی شـیعری هـەبوو، لـەکاتی جێنـشینی ئـەبو بەکردا، لەڕۆژەکەی شەڕی یەمامەدا شەهید کرا (ڕەزاو رەحمەتی خودا لەخۆی و لەموسەییەبی کوڕی و لەسەعیدی کوڕەزای. ڕۆحی نووریش بـە قوربـانی گـەردی سەر گۆڕیان بێ).

ســـەعید لەپەیڕەوانـــە (واتـــە: لەتابیعیـــە) کـــە پێـــشیان دەگـــوترێ: شـوێنکەوتوان، یەکێکـە لـەپیاوانی صـەحیحەین، واتـە: لـەڕیجالی صـەحیحەینە، کـەبریتین لـە (صـحیح البخـاری) و لـە (صـحیح مـسلم). ڕاوی ئەگـەر ژنـیش بـێ هەرپێی دەگووترێ، لەپیاوانی ڕشتەی بوخارییە، یا لەپیاوانی ڕشتەی موسلیمە، وەك دەگـوترێ: عائیـشەو ئـەسماءو ئـوم عـەتێ و ئـوم سـەلەمە لـەڕیجالی صەحیحەینن، ناگوترێ لەژنانی صەحیحەینن!

سەعید یەکێکە لەمەلا گەورەکانی مەدینە، کەناسراون بـە (فُقَهَاءُ المَدِينـة: شـەرعزانەکانی مەدینـە) لـەنزیکی چـل کـەس لـەهاوەڵانی پێغەمبـەرەوە فـەرموودەی گێڕاوەتـەوە، دادەنـرێ بەسـەروەری تـابیعین، لەسـاڵی سـێیەمی جێنـشینی عومـەری کـوڕی خـەتابا لـەدایك بـووە، لەساڵی (٩٤) نـەوەدو چـواری کۆچیدا، لەسەردەمی جێنشینی وەلیـدی کـوڕی عەبدولەلیکدا، فـەرمانی هـەقی

بەجێهێناوەو مردووە (ڕەزاو ڕەحمەتی خودای گەورەو سەروەر لەم کوڕو باوك‌و باپیرەیە بێت). (بڕوانە: مختصر صحيح مسلم/١، لاپەڕە: ١٧، ژمارە: ٣، + تـاج/٥، لاپەڕە: ٣٣١ + تاج/١٠، لاپەڕە: ١٦١، ژمارە: ١، چاپی یەکەم + عمـدة القـاری/٨ص١٨٠ + العمده/٢٢ ص٢٠٧ + إصابه واستيعاب لەناوی (حَزن ومُسَيَّب)دا.

١٢١٥- عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي عُبَيْدٍ قَالَ: قُلْتُ لِسَلَمَةَ: عَلَى أَيِّ شَيْءٍ بَايَعْتُمْ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَوْمَ الْحُدَيْبِيَةِ؟ قَالَ: عَلَى الْمَوْتِ. {الحديث: ٤٧٩٩ = ٤٧٨٤ فم. تجريد/٣، رقم: ١٢١٤ = ٢٩٦٠، ٤١٦٩، ٧٢٠٦، ٧٢٠٨}:

یەزیدی کوڕی ئەبو عوبەید (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: گوتم بە سەلەمەی کوڕی ئەکوەع: لەڕۆژی ڕووداوی حودەیبییەدا، لەسەرچی لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) پەیمانتان بەست؟ فەرمووی: لەسەرئەوە پەیمانمان پێدا: ئەگەر بشکوژرێین لەفەرمانی حەزرەت دەرنەچین). {تاج/٤، زنجیرە: ٢١، ژمارە: ٤٢٦٦، چ/٤}.

١٢١٦- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَيْدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: لَمَّا كَانَ زَمَنُ الْحَرَّةِ أَتَاهُ آتٍ فَقَالَ لَهُ: إِنَّ ابْنَ حَنْظَلَةَ يُبَايِعُ النَّاسَ عَلَى الْمَوْتِ فَقَالَ: لا أُبَايِعُ عَلَى هَذَا أَحَدًا بَعْدَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). (الحديث ٢٩٥٩، طرفُهُ في: ٤١٦٧):

عەبدوڵڵای کوڕی زەید(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەسەردەمی هەراکەی ئەلحەڕرەدا، پیاوێ هات گوتی پێم: ئاگات لێیە کە عەبدوڵڵای کوڕی حەنظەلە (ڕەزای خوای لێ بێ) ، لەسەر مەرگ پەیمان بەجەنگاوەرەکان دەدا؟ عەبدوڵڵا فەرمووی: لەپاش پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) لەسەر مەرگ پەیمان بەکەس نادەم.

## راڤەو شیکردنەوە:

**ئەم فەرموودەیە راڤەو روونکردنەوە: یەکی دوورو درێژی دەوێ:**

**١. ئیبنو ئەثیر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) لەنیهایەدا دەفەرموێ: رۆژی ئەلحەررە رۆژێکە ناسراوە لەمێژووی ئیسلاما، لەسەردەمی یەزیدی کوڕی موعاویەدا رووی دا، سوپایەکی زۆری هێنا لەخەڵکی شام، بەسەرکردەیی موسلیمی کوڕی عوقبەی ئەلمورری، لەمانگی قوربانی ساڵی شەش سەدو هەشتاو سێی کۆچیدا (٦٨٣ز) دەستیان کرد بەکوشتو بڕی خەڵکی مەدینە، وەشاری مەدینەیان تاڵان کرد، صەحابەو تابیعینێکی زۆریان شەهید کرد. حەررە خرە بەرداوییەکە، وا لەدەوری مەدینە، بەردێکی رەشی زۆری والێ، جەنگەی کوشتارەکە لەوێدا روی دا.**

**٢. مەولەوی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ:**

**لەعنی یەزیدی چ بەحثی نەدەین طول**
**نیمان پەنهانەو، خاتیمە مەجهوول**
**راستە نەعمالی قەبیحی زۆر کرد**
**بەڵام چووزانی نیمانی نەبرد**

**من دڵنیام لەوە کە یەزید گەلێ گەلێ لەم سەرکردانەی ئەمڕۆ باوەڕی بەخودا بووە، وە عادڵتریش بووە.**

**جا بۆ بەرگری لەم جۆرە بەدرەفتارییەی یەزیدو، بۆ سکاڵای حاڵو ئامۆژگاری خێر، لەهەموو لایەکەوە دەنگی نارەزایی بەرزەوە بوو، بەڵام سوودی نەبوو، جا لەم روانگەیەوە، وەفدێ لەخەڵکی مەدینە لەگەڵ عەبدوڵڵای کوڕی حەنظەلەدا چوون بۆ لای یەزید، جا پاش هەوڵو کۆششێکی زۆری بێ سوود، کۆمەلێ کاری بێ شەرعیو ناپەسەندیان لەیەزیدو دەستەو بەستەکەی بینی،**

جا كاتێ گەڕانەوە بۆ مەدینە لەپاش راوێژ یەزیدیان لەخەلافەت خەلع كردو بڕیاریان دا كە یەزید لەم رۆ بەدواوە جێنشین نییە، لەشوێنی ئەو عەبدوڵلای كوڕی زوبەیریان كرد بەجێنشینو پەیمانیان پێ دا.

جا ئەوەبوو یەزید ئەو لەشكرەی بەفەرماندەیی موسلیمی كوڕی عوقبە نارد بۆ سەریان، كوشتارێكی گەلێ گەورەی لەخەڵكی مەدینە كرد، هەزارو حەوسەدكەسی لەپیاوماقوڵانی شار، لەصەحابەو تابیعین، كوشت، وە لەڕەشەخەڵكیش لەژنو منداڵو پیرو كاسبكار دەهەزار كەسی تری كوشت، جا لەپاش رۆژەكەی ئەلحەررە موسلیم جاڕی دا، كەسێ رۆژ شاری مەدینە بەرەڵایە، بێستانی بێ خاوەنە، چیدەكەن لەكوشتنو بڕینو تالانیو ژن تالانی كردن بیكەن!!

جا موسوڵمانان بەم بۆنەیەوە فەرماندەی شەڕەكە، كەناوی (موسلیم) بوو، ناوەكەیان گۆڕی چونكە مسلم واتە: بێوەیو ئاشتیخواز، وەلەناوەكەیو لەواقیعی حاڵی، ناوێكی تازەیان بۆ داتاشیو ناویان نا (مُسرِف) واتە: زیادەڕەویكار لەخوێنڕشتن دا!! وەیەزید خۆی لەپاش ئەم زوڵمەو زۆرە لەناو چوو، بوو بەمیوانی مەرگی رەش.

٣- ئەمەی ئەمڕۆ لەسوریا روودەدا، حافظ أسد بەیەك دووروژ لەحمصو حما، دەهەزار كەس دەكوژێ، ئێستا لەم مێژووەدا (٢٠١٤) بەشاری كوڕی بەسەدان جار لەگۆڕ بەگۆڕەكەی باوكی خراپترەو ئەژدەهاكانی عێراق بەسەدان هەزار مرۆڤی بێتاوانی موسوڵمان دەكوژنو ئەنفال دەكەنو زیندەبەچاڵ دەكەن، بەسەدان مزگەوت دەڕوخێننو موسوڵمان لەسەر ئەوەی كەناوی عائیشەیە، یا عومەرە دەكوژن دووبارە بوونەوەیەكی كردەوەكانی یەزیدوموسریفی كوڕی عوقبەیە. جا خوا بكا كوردەكانی خۆشمان نەكەونە ئەم هەڵانەوە.

لەراستیدا ئەمڕۆ ئەم عەلمانییەتە وای لەو خەڵکە کردووە باوەڕی بەهیچ نەماوە، مەگەر بەبەرژەوەندی خۆی، وەزۆرداریش لەزۆرداری پێش خۆی پەندو عیبرەت وەرناگرێ، لەبەرئەوە دەبینین هەموو زۆردارێ لەئەوەی پێش خۆی خراپترە، وەئەو چیکردووە ئەمیش دەیکا بەزیادەوە!

بڕوانە: (بەرگی یەکەم لاپەڕە: ٩٧ ژیاننامەی ئەسماء کەدایکی عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیرە، فەرموودەی ژمارە: ٧٥ + تاج/ ٥/ ٧٩ز —١٠ف. ٢. مەزناهی زوبەیری کوڕی عەوام + تاج/ ١٠ل-٢٥٤ز- ٩٧. لەهۆزی ثەقیف هەڵاتبازێك و خوینمژێك پەیدا دەبن + ریاض/١ل —١٨٦ژ- ٢٠٢ز-٢٥. باسی دابەش کردنی کەلەپوورەکەی زوبەیر).

٤- حەنظەلەی باوکی ئەم عەبدوڵڵایە ناسراوە بە: (غسیلُ الملائکة: شۆراوی فریشتە) چونکە لەغەزای ئوحوددا بەلەشی گرانەوە شەهید بوو، فریشتە شۆردبوویان و لەشپیسییان دەرکردبوو.

## (١٩) باب تحريم رجوع المُهَاجِر إلى إستيطان وَطَنِهِ
## بۆ کۆچکار (موهاجیر) نادروستە کە مەدینە بەجێ بهێڵێ و بچێتەوە بۆ نیشتمانی خۆی

١٢١٧- عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّهُ دَخَلَ عَلَى الْحَجَّاجِ، فَقَالَ: يَا ابْنَ الأَكْوَعِ ارْتَدَدْتَ عَلَى عَقِبَيْكَ تَعَرَّبْتَ؟ قَالَ: لاَ، وَلَكِنْ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَذِنَ لِي فِي الْبَدْوِ. {الحديث: ٤٨٠٢ = ٤٧٨٥ فم. تجريد/٥/٣٥٧، رقم: ٢٠٩٨ = ٧٠٨٨ فتح الباري. نسائي. بيعة: ٤١٩٧. تحفة الأشراف: ٤٥٣٩} : [١٢١٧]

---

[١٢١٧] تجرید/٥، ژمارە: ٢٠٩٨ = ٧٠٨٨ بخاری. پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١١٨٨ = ٤٨٠٢ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٩٢ رقم الباب/١٤).

سەلەمەی کوڕی ئەکوەع (ڕەزای خودای لێ بێ) ڕۆیشت بۆلای حەجاجی کوڕی یوسوفی ئەقەفی، حەجاج ویستی بیانووی پێ بگرێ، پێی گوت: ئەی کوڕی ئەکوەع! لە ئیسلامو لە کۆچکردن بۆ مەدینە پاشگەز بوویتەوەو ئەوەتا بوویتەوە بە ئەعرابو لەناو بەدوەکانا، وەك ئەوان لەسارا دائەنیشیو نیشتەجێ بووی، تاوانی وایش تۆڵەی سەختی شایانە؟

سەلەمەیش (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: نا، وانییە، من نە لەئیسلام پاشگەز بوومەتەوەو نە لەکۆچکردن پەشیمان بوومەتەوە، بەڵام من کاتی خۆی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ڕێگەی ئەوەی پێمداوە، کە لەدەشت نیشتەجێ بم).

روونکردنەوە:

١- سەلەمەی کوڕی ئەکوەع (ڕەزای خودای لێ بێ) لەسەردەمی ئاژاوەو فەرتەنەکان (الفتن)دا، ڕۆیشت لەو دەشتە، لەناو بەدوەکانا نیشتەجێ بوو، بەوە کەناری گرت لەشەڕو شۆڕو کوشتاری نێوانی یارانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ).

٢- ژیان نامەی حەجاجی کوڕی یوسفی ئەلثەقەفی. ئەم خوێنڕێژە سیسیو بەشار ئەسەدو سەددامی ملهوڕی سەردەمی خۆی بوو، خوێنڕێژی وەك خۆی کەم بوو، جا وا لەخوارەوە، بەڕێز ئەم خاڵانە لەبارەی ئەم ستەمکارەوە دەنووسین، هەتا پەند لە پەندەکان وەربگرینو ببێ بە نەفرەتنامەیێ، بۆ هەموو ئەوانەی کە ئازاری موسوڵمانان دەدەنو بەهەقو ناهەق دەیانەوێ خۆیانو دەستەو بەستەیان بسەپێنن بەسەر گەلو وڵاتدا:

١/ حەجاج لەساڵی (٤٥) چل‌و پێنجی کۆچی لەدایك بووە، لە طائیف گەورە بووە، یوسفی باوکی حەجاج لەلایەنگرانی بەنی ئومەییە بوو، لەگەڵ مەروانا ئامادەی جەنگەکانی بوو.

٢/ حەجاج سەرکردەی ئەو لەشکرە بوو کەچوونە سەر عەبدوڵلای کوڕی زوبەیر، لەمەککە، کەعبەی دایە بەرتۆپی مەنجەنیق‌و ئیبنو زوبەیری کوشت.

٣/ لە تهذیب (التهذیب)دا دەفەرموێ: ئیبنو عومەریشی بە ژەهر کوشتووە، نووکی رمێکی ژەهراوی کردووەو پێی زامار کردووەو پێی مردووە.

٤/ نزیکی بیست ساڵ دەستەڵاتدارێکی ستەمکاری بێڕەزا بووە، زوڵم‌و زۆرو بێ دادییەکی زۆری لە خەڵك کردووە.

٥/ پیاوێکی زمانزانی رەوانبێژی زمانپاراو بوو.

٦/ شەرعزانێکی عەجایەب بوو.

٧/باوەڕی وابوو کە بەگوێکردنی فەرمانڕەوا، فەرزە لەسەر مەردوم، بەهیچ جۆرێ نابێ لەفەرمانی دەرچن.

٨/ ئیبنو ئەشعەث‌و زۆرینەی مەلاو شەرعزانەکان‌و قورئان زانەکانی بەصرەی لێ هەڵگەڕانەوە، لەگەڵ خەڵکانی تردا، بەڵام حەجاج جەنگی لەگەڵ ئیبنو ئەشعەث کردو کوشتی‌و یەکە یەکە، شوێن کەوتووەکانی دەکرد بەسەرپشك: یا بەشمشێر دەیدا لەملی، یادەبێ ددانی بنایە بەوەدا، کەمن بەوە کافر بووم کە لەتۆ هەڵگەڕاومەتەوە، ئەوسا وازی لێ دەهێنا.

٩/ جێنشینی خواناسی گەورە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز، لەبارەی حەجاجەوە دەفەرموێ: (ئەگەر هەموو نەتەوەکان، هەرکەسەیان چەپەڵترین کەسی خۆیان بهێنن‌و ئێمەیش حەجاج بهێنین، ئێمە دەیانبەزێنین). ئەمە بۆ

**کاتی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز وابووە، ئێستا زۆر ستەمکاری وامان هەیە حەجاج بەشاگرد وەرناگرێ!**

**١٠/ تەرمەزی فەرموودەیێ لەڕێگەی هشامی کوڕی حسانەوە دەگێڕێتەوە، دەڵێ: ئەوانەمان سەرژمێرکرد کە حەجاج، لەبەندا کوشتوویانی (١٢٠) سەدو بیست هەزار کەس بوون!!**

**١١/ نازان دەفەرموێ: حەجاج لەدینا مایە پووچ بوو. طاووس دەفەرموێ: سەرسامم لەو کەسانە کە حەجاج بە موسوڵمان دائەنێن. ڕەحمەت لە طاووس، سەردەمی ئێمەی نەدیوە، بۆیە وایفەرمووە!**

**١٢/ سەعیدی کوڕی جوبەیرو نەخەعیو موجاهیدو کۆمەڵێ زانای تریش حەجاج بە کافرو ناموسوڵمان دادەنێن.**

**١٣/ ئەسمائی کچی ئەبوبەکری صەدیق، کە حەجاج کوڕەکەی کوشت پێی فەرموو: من وادەزانم کەتۆ ئەو زیانە خۆرو خوێن مژەی کە پێغەمبەر بەئێمەی فەرموو: لەناو هۆزی ثەقیفا زیانە خرۆیەکی خوێنمژ پەیدا دەبێ. {بڕوانە: تاج/٥، لاپەڕە: ٥٦٧، زنجیرە: ٩٧، ژمارە: ٥٥٣٩} .**

**١٤/ ئیبنو شەوذەب دەفەرموێ: مالیکی کوڕی دینار فەرمووی: جارێ گوێم لە حەجاج بوو، گوتاری دەدا، ئەوەندە گوتەکانی ڕەوانو ئەوەندە بەڵگەکانی ئاشکراو بەهێز بوو، ئەوەندە بە زانایانە بەڵگە سازی پێیان دەکرد، تەنانەت هاتمە سەر ئەو باوەڕە کە حەجاج مەزڵوومو زۆرلێکراوە.**

**١٥/ لە تەهذیبو تەهذیبدا، ئیمامی عەسقەلانی دەفەرموێ: کە ئیبنو ئەبی دونیا بەسەنەدێکی صەحیح (بەڕشتەیەکی دروست) لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە دەگێڕێتەوە، زەید دەفەرموێ: جارێ میسوەری کوڕی مەخرەمەی هاوەڵی پێغەمبەر بوورایەوە، کە هۆشی هاتەوە فەرمووی: {أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلهَ إِلاَّ اللّهُ وأشهد**

أنَّ محمداً رَسُولُ اللّهِ} ئـەم وشـە پـیرۆزەم لـە جیهـانو لەهەرچی وا لـەجیهانا لـەلا خۆشەویسترە، عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف لەناو بەهەشـتایە وا لەگـەڵ (الرفیـق الأعْلَى)دا (مَعَ الّذِينَ أنْعَمَ اللّهُ عَلَيْهِمْ مِنَ النَّبِـيِّينَ وَالـصِّدِّيقِينَ وَالـشُّهَدَاءِ وَالـصَّالِحِينَ وَحَسُنَ أُولَئِكَ رَفِيقًا) وە عەبدولمەلیكو حەججاج لەناو ئاگری دۆزەخـدا ریخۆڵـەی خۆیان بەکێش دەکەن!!).

شـێخی عەسـقەلانی دەفـەرموێ: (ئـەم گێڕانەوەیـە سـاغو دروسـتە، بـەڵام لەکاتی ڕوودانی ئەم چیرۆکەدا، نە عەبدولمەلیك بـووە بەجێنـشینو نـە حـەجاج ناسـراو بـووە، چـونکە میـسوەر ئـەو ڕۆژە وەفـاتی کـردووە کـە هـەواڵی مردنـی یەزیـدی کـوڕی موعاوییـە گەیـشتووە، کـە لـەمانگی ڕەبیعـی یەکـەمی سـاڵی (٦٤) شەستو چواری کۆچی مردووە. مەبەستی عەسقەلانی ئەوەیە کەئەمە دادەنـرێ بەکەرامەت بۆ میسوەر، کەپێش هاتنە سەرکاری ئەم دوو کەسە هەواڵی داوە، کە شایانی چینو چۆن ستەمکارێکن.

١٦/ حـەجاج سـاڵی (٩٥)ی کۆچـی لـەواسـیط مـردووە، کـەخۆی ئـەم شـارەی دروست کردبوو.

١٧/ ئەشعەثی الحدانی، کە لەمانگی ڕەمەزانا قورئانی دەخوێند، بۆ حـەجاج. خەوێکی سەیری پێوە دەبینی، وەك خۆی دەفەرموێ: لەخەوما حـەجاجم بینـی لەدۆخێکی زۆر خراپدا بینیم پێم گوت: ئەی باوکی موحەممـەد! حاڵت چۆنە؟ گوتی: هەرکەسێکم بەناهەق کوشتبوو، لەسەرچی شێوەیەك کوشتبووم، لەسـەر ئـەو شـێوەیە لـەجیاتی ئـەو کوژرامـەوە. پـێم گـوت: دوا ئـەوە؟ گـوتی: ئـەوجا فەرمانکرا بردمیـان بـۆ دۆزەخ، پـێم گـوت: ئـەی ئێـستا بەتـەمای چیت؟ گوتی: ئێستا بەس تاقەیەك هیوام ماوە کە ئەویش ئومێدی هەموو ئـەو کەسـانەیە کـە لەدەستەی (لا إله إلاّ الله)ن)! کاتێ ئەم چیرۆکە دەگاتـەوە بـە ئیبنـو سیرین، کە

باشترین خەوزانی سەردەمی خۆی بوو، دەفەرموێ: منیش ئومێدی ئەوەم هەیە بۆی، جا کەئەم گوفتوگۆیە دەگاتەوە بە حەسەنی بەصری دەفەرموێ: (بەڵام بەخودا، خودا ئەم ئومێدەی ئیبنوسیرینە جێبەجێ ناکا!). منیش کە وەرگێڕم دەڵێم: هیچ موسوڵمانێ نائومێد نابێ.

١٨/ بڕوانە تەجریدی بوخاری بەکوردی بەرگی پێنجەم لاپەڕە (١٢٥، ژمارە: ١٨٣٣ = ٥٥١٥ فتح الباری چاپی یەکەم). بۆ ئەو زوڵمەی کە حەجاج لەسەعیدی کوڕی جوبەیری دەکا.

## (٢٠) باب المُبَايَعَةِ بَعْدَ فَتْحِ مَكَّةَ عَلَى الإِسْلامِ وَالجِهَادِ وَالخَيرِ وَبَيَانِ مَعْنى لا هِجْرَةَ بَعْدَ الفَتْحِ

## لەپاش ئازادکردنی مەککە، پەیمان دەدرا لەسەر ئیسلامو لەسەر خەباتو خێر، ڕوونکردنەوەی واتای (لەپاش ئازادکردنی مەککە کۆچکردن نەما)

١٢١٨- عَنْ مُجَاشِعُ بْنُ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: جِئْتُ بِأَخِي أَبِي مَعْبَدٍ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَعْدَ الْفَتْحِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! بَايِعْهُ عَلَى الْهِجْرَةِ، قَالَ: « قَدْ مَضَتِ الْهِجْرَةُ بِأَهْلِهَا»، قُلْتُ: فَبِأَيِّ شَيْءٍ تُبَايِعُهُ؟ قَالَ: « عَلَى الإِسْلاَمِ وَالْجِهَادِ وَالْخَيْرِ»، قَالَ أَبُو عُثْمَانَ (يعني النهدى): فَلَقِيتُ أَبَا مَعْبَدٍ، فَأَخْبَرْتُهُ بِقَوْلِ مُجَاشِعٍ، فَقَالَ صَدَقَ. {الحديث: ٤٨٠٤ = ٤٧٨٩ فم. تجريد/٣، رقم: ١٢١٥ = ٢٩٦٢، ٣٠٧٨، ٤٣٠٥، ٤٣٠٧، ٢٩٦٣، ٣٠٧٩، ٤٣٠٦، ٤٣٠٨. تحفة الأشراف: ١١٢١٠}: [١٢١٨]

موجاشیعی کوڕی مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەپاش ئازادبوونی مەککە، لەگەڵ موجالیدی کوڕی مەسعوودی براما، کە ناسراوە بە

---

[١٢١٨] تجرید/٣، ژمارە: ١٢١٥ = ٢٩٦٢ بخاری. پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١١٨٥ = ٤٨٠٤ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٦٤ رقم الباب/٥٣).

ئـەبو مەعبـەد، چووین بـۆ خزمـەتی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) عـەرزیم کـرد: قوربـان! ئـەی پێغەمبـەری خـودا! پـەیمانمان بـدەرێ لەسـەر کۆچکردن بۆلای تـۆ، بـۆ مەدینـەی نـازدار، فـەرمووی: (کۆچکردن بەسەرچوو، ئەوەی کۆچی کرد لەکاتی خۆیدا، دەستی خۆی وەشاند!) گوتم: ئـەی لەسەرچی پـەیمانمان لەگـەڵ دەبەسـتی؟ فـەرمووی: (پـەیمانم پـێ بـدەن لەسـەر خزمـەتی ئایینی ئیسلام‌و لەسەر غەزا کردن‌و لەسەر پەخشی چاکەو خێر).

ئەبو عوسمانی ئەلنەهدی، کە ئەم فەرموودەیە لە موجاشیعەوە دەگێڕێتەوە دەفـەرموێ: گەیـشتم بـە ئـەبو مەعبـەدی بـرای موجاشـیع، عـەرزیم کـرد: موجاشیعی برات فەرموودەیـەکی وا وای بـۆم گێڕایـەوە، فـەرمووی: راسـت دەکا، چۆنی فەمووە وایە. {تاج/٣/٧٣، زنجیرە: ١٠٤، ژمارە: ٢٤١١، ج/٤}.

١- ئەمەی نووسیمان ئەوە دەقی گێڕانـەوەی بوخارییـە، زیـادەی تیایـە، بۆیـە کردمان بەشەرح بۆ گێڕانەوەکەی موسلیم.

٢- موجاشـیعی کـوڕی مەسـعوودو موجالیـدی کـوڕی مەسـعوود، دوو بـران، هـەردوکیان صـەحابەو هـاوەڵی پێغەمبـەرن، موجاشـیع لـە بوخـاری‌و موسـلیمدا گێڕانەوەی هەیە، وەك ئەم فەرموودەیەی ئێرە، کە هەردوو پـیر گێڕاویانەتـەوە، لەسەر فەرمایشتی ئیصابە، شێخ دولابی دەفـەرموێ: موجاشـیع شـاری کـابولی لـە وڵاتـی هینـد غـەزاکرد، موجاشـیع دەچـێتە نـاو ژووری بتخانەکـە، گەوهـەرێ لەچاوی بتێ دەردەهێنێ‌و دەیباو، دەفەرموێ: بۆئەوە وامکرد هەتا بزانن کە ئەو بتە نەزیان دەبەخشێ‌و نەسوود، موجاشیع یەك فەرموودەی لە بوخاریدا هەیـە. لەرووداوی ئەلجەمەلدا کوژراوە، هەروا موجالیدی برایشی، گۆڕی هـەردوکیان لـە بەصرەیە، گۆڕەکەیان ناسراوە (رەزاو رەحمەتی خودایان لێ بێ).

١٢١٩- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضى الله عنهما) قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم): يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ « لاَ هِجْرَةَ وَلَكِنْ جِهَادٌ وَنِيَّةٌ ، وَإِذَا اسْتُنْفِرْتُمْ فَانْفِرُوا »: [١٢١٩]

ئـەم فەرموودەیـە لـە پوختـەی موسـلیما، ژمـارە (١١٨٦) لـە عائیـشەوەیە، بەهەرەی پتری واتیادا، ئاوایە:

عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) قَالَتْ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَمَ) عَنِ الْهِجْرَةِ فَقَالَ: « لاَ هِجْرَةَ بَعْدَ الْفَتْحِ وَلَكِـنْ جِهَـادٌ وَنِيَّـةٌ، وَإِذَا اسْـتُنْفِرْتُمْ فَـانْفِرُوا ». {الحديث: ٤٨٠٨ = ٤٧٩١ فم. بخاري. جهاد: ٣٠٨٠} :

عائیـشە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: سـەبارەت بـە کۆچـکردن بـۆ مەدینـەو مانـەوە لەخزمـەت پێغەمبـەردا لەمەدینـە، پرسـیارکرا لـە پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئـەو کۆچـکردنە پەسـەندو نایابـەی کە دەبوو بەمایەی شانازیو سەر بەرزیی هەردوو جیهان، بۆ کۆچکار، کە لـەوڵاتی بێباوەڕیو کوفرەوە، ڕەوو کۆچیان دەکـرد بـۆ مەدینـە، کـە تاقـە وڵاتـی ئیـسلام بوو، لەپێش ئازادکردنی شاری مەککەدا، کۆچکردن بەم واتایە بوو، بەڵام لـەپاش ڕزگارکردنی مەککەو موسوڵمان بوونی خەڵکەکەی کۆچـکردن بـەو مانایـە نـەما، بەڵام تێکۆشانو خەباتگێڕانو غەزاکردنو نیازی باشو پاك هەتا ڕۆژی قیامەت هەردەمێنێ، بەڵام هەرکاتێ پێشەوای ئیسلام داوای لێ کردن کە ئیلْجاڕی بکـەنو دەربچن بۆ غەزاو خەباتگێڕان، ئیلْجاڕی لێ بکەنو بڕۆن بۆ غەزاو خەباتگێڕانو تێکۆشان لەڕێگەی خودادا).

١٢٢٠- عَنْ أَبِى سَعِيدٍ الْخُدْرِيُّ (رَضِيَ اللهُ عَنْـهُ): أَنَّ أَعْرَابِيًّـا سَـأَلَ رَسُـولَ اللَّـهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) عَنِ الْهِجْرَةِ؟ فَقَالَ: « وَيْحَكَ إِنَّ شَأْنَ الْهِجْرَةِ لَشَدِيدٌ، فَهَـلْ لَـكَ

---

[١٢١٩] بخاری. جهاد: ٣٠٨٠ مسلم. شـیحا: ٤٨٠٦. پوختـەی موسـلیم/٣، ژمـارە: ١١٨٦ = ٤٨٠٨ شـیحا (بخاری رقم الکتاب/٥٦ رقم الباب/١٩٤).




مِنْ إِبِلٍ»؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: « فَهَلْ تُؤْتِي صَدَقَتَهَا؟». قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: « فَاعْمَلْ مِنْ وَرَاءِ الْبِحَارِ فَإِنَّ اللَّهَ لَنْ يَتِرَكَ مِنْ عَمَلِكَ شَيْئًا ». {الحديث: ٤٨٠٩ = ٤٧٩٢ فم. تجريد/٢/١١٨، رقم: ٦٩٥ = ١٤٥٢، ٢٦٣٢، ٣٩٢٣، ٦١٦٥. أبو داود. جهاد: ٢٤٧٧. نسائي. بيعة: ٤١٧٥. تحفة الأشراف: ٤١٥٣} : [١٣٢٠]

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: عارەبێکی دەشتەکی دەیویست کۆچ بکا بۆ مەدینە بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جا لەبارەی ئەم کارەوە، لە خۆشەویستی پرسی، خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (هاوار لەخۆت ئەو باسە گەلێ سەختو دیژوارەو ئەرکی گرانە، بۆ هەموو کەسێ راگیرناکرێ، واز لەم لایەنە بێنە، بەلام ئایا وشترت هەیە کە زەکاتیان لێ بدەی؟). گوتی: بەلێ هەمە. فەرمووی: (دە لەهەرکوێ کاری باش دەکەی بیکە، خودا دەکا کەلەوپەڕ دەریاوە دەیکەی، لەهەرلا دەیکەی جیاوازی نییە، کاری خێر هەرکاری خێرە، خودا بۆتی دەنووسێو هیچی لێ کەم ناکاتەوە). {تاج/٢/١٤، زنجیرە: ٣، ژمارە: ١١٨٧} .

## (٢١) باب كيفيَّة بَيْعَة النساء
## چۆنیتی وەرگرتنی پەیمان لە ژنان

١٣٢١- عَنْ عَائِشَةَ زَوْجَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَتْ: كَانَتِ الْمُؤْمِنَاتُ إِذَا هَاجَرْنَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُمْتَحَنَّ بِقَوْلِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ: (يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا جَاءَكَ الْمُؤْمِنَاتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَى أَنْ لاَ يُشْرِكْنَ بِاللَّهِ شَيْئًا وَلاَ يَسْرِقْنَ وَلاَ يَزْنِينَ) إِلَى آخِرِ الآيَةِ، قَالَتْ عَائِشَةُ: فَمَنْ أَقَرَّ بِهَذَا مِنَ الْمُؤْمِنَاتِ فَقَدْ أَقَرَّ بِالْمِحْنَةِ،

---

[١٣٢٠] تجرید/٢، ژمارە: ٦٩٥ = ١٤٥٢ بخاری. پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١١٨٧ = ٤٨٠٩ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٢٤ رقم الباب/٣٦).

وَكَانَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) إِذَا أَقْرَرْنَ بِذَلِكَ مِنْ قَوْلِهِنَّ، قَالَ لَهُنَّ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «انْطَلِقْنَ فَقَدْ بَايَعْتُكُنَّ»، وَلاَ وَاللّٰهِ مَا مَسَّتْ يَدُ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَدَ امْرَأَةٍ قَطُّ، غَيْرَ أَنَّهُ يُبَايِعُهُنَّ بِالْكَلاَمِ. قَالَتْ عَائِشَةُ (رَضِيَ اللهُ عَنْها): وَاللّٰهِ مَا أَخَذَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) عَلَى النِّسَاءِ قَطُّ إِلاَّ بِمَا أَمَرَهُ اللّٰهُ تَعَالَى، وَمَا مَسَّتْ كَفُّ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) كَفَّ امْرَأَةٍ قَطُّ، وَكَانَ يَقُولُ لَهُنَّ إِذَا أَخَذَ عَلَيْهِنَّ: «قَدْ بَايَعْتُكُنَّ». كَلاَمًا. {الحديث: ٤٨١١ = ٤٧٩٦ فم. بخاري. طلاق: ٥٢٨٨، ٤٨٩١، ٧٢١٤ + تجريد/٤، رقم: ١٧٠٥ = ٤٨٩٢ + تجريد/١، رقم: ٦٢٨ = ١٣٠٦ فتح }: [١٣٣١]

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەهەموو هاوسەرەکانی بێ) فەرمووی: جاران کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پەیمانو بەیعەتی وەردەگرت لەئافرەتە بڕوادارەکان، بەتایبەتی لەوانەیان کە کۆچیان دەکرد، لەشوێنی خۆیانەوە، لەبەر ڕەزای خودا، بۆلای پێغەمبەری خودا لەمەدینە، تەنیا بەدەمو بەقسە، نەك بە تەوقەکردنو دەست خستنە ناودەست، پەیمانی لێ وەردەگرتن، لەسەر ڕەفتارکردن بەم ئایەتە:

{يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا جَاءكَ الْمُؤْمِنَاتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَى أَن لَّا يُشْرِكْنَ بِاللَّهِ شَيْئًا وَلَا يَسْرِقْنَ وَلَا يَزْنِينَ وَلَا يَقْتُلْنَ أَوْلَادَهُنَّ وَلَا يَأْتِينَ بِبُهْتَانٍ يَفْتَرِينَهُ بَيْنَ أَيْدِيهِنَّ وَأَرْجُلِهِنَّ وَلَا يَعْصِينَكَ فِي مَعْرُوفٍ فَبَايِعْهُنَّ وَاسْتَغْفِرْ لَهُنَّ اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ - الممتحنة - ٦٠/١٢ }. واتە:

ئەی پێغەمبەر! کاتێ ئافرەتە موسوڵمانەکان هاتن بۆلات کە پەیمانو بەیعەتت پێ بدەن، لەسەر ئەوە پەیمانیان لێ وەربگرە کە: بەهیچ جۆرێ

---

[١٣٣١] تجريد/٤، ژمارە: ١٧٠٥ = ٤٨٩٢ بخاری. پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١٢٢٢ = ٤٨١١ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٦٨ رقم الباب/٢٠).

هاوبەش‌و هاوەڵ بۆ خودا بڕیار نـەدەن‌و دزی نەکـەن‌و حیـزی نەکـەن‌و منـداڵی خۆیـان نـەکوژن‌و کـچی خۆیـان زینـده بەچـاڵ نەکـەن‌و بوختـانی درۆ لـەنێوان دەست‌و پێی خۆیاندا نەکەن، واتە: منداڵی بێگانە نەهێنن لەبەینی دەست‌و پێی خۆیان دایبنێن‌و بەدرۆو ناهەق بیکەن بەمنداڵی مێردەکەیان، وە لەکردنی کاری خێردا نافەرمانی تۆ نەکەن‌و سەرپێچی لە فەرمانی تۆ نەکەن، جا لەپاش ئەمە، لـەخودا بپـاڕێرەوە بۆیـان کـەلێیان خـۆش بـێ، بەڕاسـتی خـودا تاوانبـەخش‌و میهرەبانە).

عائیشە فەرمووی: جا هەر ژنێکی موسوڵمان ئەمەی قـەبووڵ بکردایـە، ئـیتر دەرچوو دەبوو لە تاقیکردنەوەکەیدا، دەستووری پێغەمبەریش (درووودی خـودای لەسەر بێ) وابوو: هەر ژنێ لەژنە باوەڕدارەکان، بەدەم ئەمەی قەبوول بکردایـە، کە لەم ئایەتەدا گوتراوە، پێی دەفەرموو: (بڕۆ پەیمانم پێتدا).

عائیشە فەرمووی: نا بەخودا شتی وا نەبووە، کە پێغەمبـەر لـەکاتی پـەیمان وەرگرتندا، دەست بخاتە ناو دەستی ژنەوە، قەت نەبووە کـە پێغەمبـەر (درووودی خودای لەسەر بێ) دەستی لەدەسـتی ژنـی نـاخۆیی (نامـەحرەم) بکـەوێ، مەگـەر ئافرەتـێ کـە حـەڵاڵی خـۆی بووبـێ، بـەڵام بـەدەم، تـەنیا بەقـسە پـەیمانی لێ وەردەگرتن.

عائیـشە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: سـوێندم بـەخودا هـەرگیز پێغەمبەری خودا (درووودی خودای لەسەر بێ) شتێکی لەژنان وەرنـەگرتووە، کـە خودای گەورە فەرمانی ئەوەی پێ نەکردبێ، هـەرگیز لـەپی پێغەمبـەر (درووودی خودای لەسەر بێ) نەکەوتووە لـە لـەپی ژنـی بێگانـە، کاتـێ پێغەمبـەر (درووودی خـودای لەسـەر بـێ) پـەیمانی لێ وەردەگـرتن، پێـی دەفـەرموون: (ئـەوا پـەیمانم

پێتاندا) واته بەس بەقسە پـەیمانم لێ وەرگـرتن. {تـاج/١، زنجـیرە: ٨، ژمـارە: ٦٠، ج/٤}.

## (٢٢) باب البَيعةِ علَى السَمْعِ والطَاعةِ فيما استَطَاعَ
## پەیمان وەرگرتن لەسەر گوێڕایەڵیو بە گوێکردن بە پێی توانا

١٢٢٢- عَنْ ابْنُ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: كُنَّا نُبَايِعُ رَسُولَ اللَّـهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) عَلَى السَّمْعِ وَالطَّاعَةِ، يَقُولُ لَنَـا: «فِيمَـا اسْتَطَعْتَ». {الحـديث: ٤٨١٣ = ٤٧٩٨ فم. تجريد/٥، رقم: ٢١١٢ = ٧٢٠٢ فتح الباري}: [١٢٢٢]

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەیفـەرموو: جاران کە پـەیمانمان دەدا بـە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) دەیفـەرموو: (ئەوەنـدەی کـە لەتواناتانا هەیەو دەتوانن!). {تاج/١، زنجیرە: ٨، ژمارە: ٥٩، ج/٤}.

ئەمـە دەقـی ژمـارە (١٢٢٠)ی پوختـەی موسـلیم بـوو، ئەمـەیش لـەدواوە، دەقی ژمارە (٢١١٢) تەجریدی بوخارییە، ڕەچاودەکرێ، کـە هـەردوو گێڕانەوەکـە لەهـەموو شـتێکا زۆر لەیەکـەوە نـزیکن، ئەمـەیش نموونـەی بـاڵای (متفـق علیه)ییە.

عن عبدالله بن عمر رَضِي اللّهُ عَنْهُما قال: كنا إذا بايعنا رسول الله صلى الله عليه وسلم على السمع و الطاعة، يقول لنا: فيما استطعتم. (الحديث ٧٢٠٢):

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر- ڕەزای خودایان لێ بێ- فـەرمووی: جـاران کاتـێ پـەیمانمان لەگـەڵ پێغەمـەردا دەبەسـت، دەیفـەرموو: (ئەوەنـدەی کـە لـەتواناتانا

---

[١٢٢٢] تجریـد/٥، ژمـارە: ٢١١٢ = ٧٢٠٢ بخـاری. پوختـەی موسـلیم/٣، ژمـارە: ١٢٢٠ = ٤٨١٣ شـیحا (بخاری رقم الكتاب/٩٣ رقم الباب/٤٣).

هەیە). (تاج/٣ ل/٢٧٣ ز/١٠٤ ژ/٢ - ش/د/ت/ن-باسی: پەیمان بەستن (بەیعەت) و پەیمان بردنە سەر).

## (٢٣) بابُ بيان سِنِ البُلُوغِ
## ڕوونکردنەوەی تەمەنی ڕەسیدەبوون

١٢٢٣- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: عَرَضَنِي رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَوْمَ أُحُدٍ فِي الْقِتَالِ، وَأَنَا ابْنُ أَرْبَعَ عَشْرَةَ سَنَةً فَلَمْ يُجِزْنِي، وَعَرَضَنِي يَوْمَ الْخَنْدَقِ وَأَنَا ابْنُ خَمْسَ عَشْرَةَ سَنَةً فَأَجَازَنِي، قَالَ نَافِعٌ: فَقَدِمْتُ عَلَى عُمَرَ بْنِ عَبْدِ الْعَزِيزِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) وَهُوَ يَوْمَئِذٍ خَلِيفَةٌ، فَحَدَّثْتُهُ هَذَا الْحَدِيثَ فَقَالَ: إِنَّ هَذَا لَحَدٌّ بَيْنَ الصَّغِيرِ وَالْكَبِيرِ، فَكَتَبَ إِلَى عُمَّالِهِ أَنْ يَفْرِضُوا لِمَنْ كَانَ ابْنَ خَمْسَ عَشْرَةَ سَنَةً، وَمَنْ كَانَ دُونَ ذَلِكَ فَاجْعَلُوهُ فِي الْعِيَالِ. {الحديث: ٤٨١٤ = ٤٧٩٩ فم. تجريد/٣، رقم: ١١٢٣ = ٢٦٦٤ = ٤٠٩٧}: [١٢٢٣]

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: ڕۆژی غەزای ئوحود چواردە ساڵ بووم، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەماشای کردم تا بزانێ بەکەڵکی جەنگ دێم یانا، بەڵام لەبەر بچووکی تەمەنم بەگەندی نەکردم، وەلێ ڕۆژی غەزای خەندەق پازدە ساڵ بووم، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆهەمان مەبەست تەماشای کردمو هەڵی سەنگاندمو ڕێگەی غەزاکردنی دام.

نافیع فەرمووی: عومەری کوڕی عەبدولعەزیز کاتێ جێنشین (خەلیفە) بوو، چووم بۆ سەردانیو ئەم فەرموودەیەم بۆیگێڕایەوە، جا عومەر فەرمووی: ئەم سەر گوزوشتەیە ڕادەو سنووری جیاکردنەوەی بچووكو گەورەیە لەیەکتری،

---

[١٢٢٣] تجرید/٣، ژمارە: ١١٢٣ = ٢٦٦٤ بخاری. پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١١١٤ = ٤٨١٤ تخریج وترقيم الشيخ خليل مأمون شيحا لصحيح مسلم (بخاری رقم الكتاب/٥٢ رقم الباب/١٨).

جا بۆیه نامەی نووسی بۆ سەرکارەکانی: (کە ئەوەی تەمەنی پازدە ساڵی تەواوە بەشی بۆ دابنێنو لەخێرو لەشەڕدا حسێبی پیاوی بۆبکەن، ئەوەیشی تەمەنی لەوە کەمتربێ دای بنێن بەوردە خێزانو لەچاكو لەخراپا حاڵی حاڵی منالّە!). {تاج/١، زنجیره: ٥١، ژماره: ٣٧٩ — ش/د/ت/ن} .

**ڕوونکردنەوە:**

لەشەرحی نەوەوی لەسەر صەحیحی موسلیمدا، ئەم فەرموودەیە دانراوە، بە بەڵگە لەسەر تەمەنی ڕەسیدەییو باڵقیو تەمەنی ناباڵقی.

## (٢٤) باب النَّهى أنْ يُسافَرَ بالمُصحَفِ إلى أرْضِ الكُفارِ إذا خِيفَ وقوعُهُ بأيديهِمْ
## ڕێگە نەدراوە کە قورئان ببرێ بۆ وڵاتی دوژمن بەمەرجێ مەترسی ئەوەی هەبێ کە بکەوێتە دەستی کەسانێ، کە ڕێزی شایانی خۆی نەگرێ

١٣٢٤- عَنْ ابْنُ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) عَنْ رَسُولِ اللّهِ (صلى الله عليه وسلم): أنَّهُ كَانَ يَنْهَى أنْ يُسَافَرَ بِالْقُرْآنِ إلَى أرْضِ الْعَدُوِّ، مَخَافَةَ أنْ يَنَالَهُ الْعَدُوُّ. {الحديث: ٤٨١٧ = ٤٨٠٢ فم} : [١٣٢٤]

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەهی دەکرد کە قورئان ببرێ بۆ خاکی دوژمن، مەبادا دەست دوژمن بکەوێو بێ ڕێزی پێ بکەن). {ریاض/٤، زنجیره: ٣٦٣، ژماره: ١٧٩٤ - ش} + {تەجرید/٣، ژماره: ١٣٢٤ = ٢٩٩٠} + {تاج/٤، زنجیره: ٢٤، ژماره: ٤٣٨٥} .

---

[١٣٢٤] تجرید/٤، ژماره: ١٣٢٤ = ٢٩٩٠ بخاری. پوختەی موسلیم/٣، ژماره: ١١١٥ = ٤٨١٧ شیحا - ترقیم شیخ خلیل مأمون شیحا (بخاری رقم الكتاب/٥٦ رقم الباب/١٢٩).

**روونکردنەوە:**

١- مەبەست لەم جۆرە بابەتو بڕیارە، بۆ ئەو رۆژگارە بووە، کەهێشتا مەترسی ئەوە دەکرا، کە بەهۆی دەستکاری قورئانەوە، قورئان گۆڕانکاری تیابکرێ، بەڵام ئێستا ئەم مەترسییە نەماوە، چونکە بەسەدان مەلیۆن دانە (نوسخە) لە قورئان، لە دەسخەتو لەچاپکراو، بە جیهانا بڵاوبۆتەوە، بگرە ئێستا باشترین چاپی قورئان ئەوەیە کە لە وڵاتە ناموسوڵمانەکان چاپ دەکرێ لەبەرئەوە واباشە بۆ ئەو بەڕێزانەی کە لەوڵاتی ئیسلامەوە، کۆچ یا سەفەر، دەکەن بۆ وڵاتە ناموسوڵمانەکان، قورئانو پەراوی فەرموودەو تەفسیرو شەریعەت لەگەڵ خۆیان بەرن، یا هەوڵ بدەن کە پەیدایان بکەن، چونکە یەکێ لەهۆی بەردەوامبوونی بیرو باوەڕ ئەوەیە کە هۆکاری روونکردنەوەو پەخشەوە بوونی لەبەر دەستدابێ.

جا لەکاتی نەقڵو گواستنەوەی لەم جۆرە شتانەدا، بەم مەبەستە رەوایە موسامەحەو چاوپۆشی لەهەندێ گیروگرفتو پێشهات دەکرێ، وەك ئەوە دوور نییە کە کتێبە پیرۆزەکان، لەناو پاپۆڕو خۆشرۆو شتی وادا، لەجێگەی شایانی خۆیان دانەنرێن، یا لەلایەن کرێکارو حەماڵو دەستەی کارمەندانی بەرپرسیاری ئەم جۆرە کارو فرمانانەوە رێزی شایانی خۆیان پێ نەدرێ، بەڵام لەهەمان کاتدا وەك پێویست ئەرکی سەرشانی خۆیان ئەنجام دەدەنو، ئەوەی مەبەستی هەموو لایەکە دێتەجێ. لەبەرئەوە موسامەحەو چاوپۆشی لەم جۆرە گرفتانە دەکرێ وەبەر ئەو جۆرە یاسایە دەکەوێ کە دەفەرموێ: (لِلضَّرُورَاتِ أَحْكَامُهَا). واتە: ناچاریەکان بڕیاری تایبەتی خۆیان هەیە). یا ئوصولییەکان دەفەرمون: (بڕیار دەگۆڕێ بەپێی گۆڕانی رۆژ).

٢- بەڵام لەکاتی شەڕو شۆڕو ئاژاوە گەڵو ئاشووبدا، کە هەڵ دەگرێ ناموسوڵمانە نەیارەکان بێڕێزی بەم جۆرە پەڕاوە پیرۆزە ئیسلامییانە بکەن، ئەوکاتە کار بەبڕیاری ئەم فەرموودەیە دەکرێ.

## (٢٥) باب المُسَابَقَةِ بَيْنَ الخَيْلِ وَتَضْمِيرِهَا
## پێشبڕکێ لە نێوانی چەند وڵاخێکی بەرزەداو پەروەردە کردنو قاڵکردنیان

١٢٢٥- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) سَابَقَ بِالْخَيْلِ الَّتِى قَدْ أُضْمِرَتْ مِنَ الْحَفْيَاءِ وَكَانَ أَمَدُهَا ثَنِيَّةَ الْوَدَاعِ، وَسَابَقَ بَيْنَ الْخَيْلِ الَّتِى لَمْ تُضْمَرْ مِنَ الثَّنِيَّةِ إِلَى مَسْجِدِ بَنِى زُرَيْقٍ، وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ فِيمَنْ سَابَقَ بِهَا. {الحديث: ٤٨٢٠ = ٤٨٠٥ فم. تجريد/١، رقم: ٢٦٠ = ٤٢٠، ٢٨٦٨، ٢٨٦٩، ٣٨٧٠، ٧٣٣٦. أبو داود. جهاد: ٢٥٧٥. نسائي. خيل: ٣٥٨٦. تحفة الأشراف: ٨٣٤٠}: [١٢٢٥]

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێشبڕکێیەکی بە وڵاخی بەرزە سازدا، ئەسپو ماینەکانی کرد بەدوو تاقم، ئەو ئەسپو ماینانەی کەقاڵ بوونو ئامادە کرابوون بۆ قۆشمە پێکردن، ئەمسەری مەیدانی تەراتێنەکەیان حەیفاء بوو، ئەوسەری ثەنییەتول وەداع بوو، ئەو ماینو ئەسپانەیشی کە ئامادە نەکرابوون بۆ قۆشمە، گۆڕەپانی پێشبڕکێکەیان کورتتر بوو، لە ثەنییەتول وەداعەوە بوو، هەتا مزگەوتی بەنی زورەیق، وەمن خۆم یەکێك بووم لەو سوارانەی کە بەشدارییان کرد، لەم پێشبڕکێیەدا وە یەکەمیان بووم). {تاج/٤، زنجیرە: ٣٣، ژمارە: ٤٤٢٣، ج/٤}.

---

[١٢٢٥] تجرید/١، ژمارە: ٢٦٠ = ٤٢٠ بخاری. پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ١١٠٨ = ٤٨٢٠ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٨ رقم الباب/٤١).

**روونکردنەوە:**

١. حەیفاء جێگەیەکە، لە کلکەی مەدینەی جارانەوەیە، پێنج یا شەش میل لەمەدینەوە دوورە.

٢. ثەنییەتول وەداع (واتە: ملەی خواحافیزیو بەرێکردن) شوێنێکی ناسراوە، لەنزیك مەدینەوە، کەسێکی ئازیز کە لەمەدینە دەردەچوو هەتا ئەوێ لەگەڵی دەچوون بۆ خواحافیزی لێکردن.

٣. مزگەوتی بەنی زورەیقیش دەوری میلێ لە ثەنییەتول وەداعەوە دوورە. ئیبنو عومەر لەم پێشبڕکێیەدا براوەی یەکەم بووە.

## (٢٦) باب الخيل في نَوَاصيها الخَيْرُ إلى يَومِ القيامة
## خێرو خۆشی لە ناوچەوانی وڵاخی بەرزە گرێدراوە هەتا ڕۆژی دوا ڕۆژ

١٢٣٦- عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَلْوِي نَاصِيَةَ فَرَسٍ بِإِصْبَعِهِ، وَهُوَ يَقُولُ: « الْخَيْلُ مَعْقُودٌ بِنَوَاصِيهَا الْخَيْرُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ: الأَجْرُ وَالْغَنِيمَةُ ». {الحديث: ٤٨٢٤ = ٤٨٠٩ فم. تجريد/٣/٢٠٥، رقم: ١١٧٥ = ٢٧٥٠، ٢٨٥٢، ٣١١٩، ٣٦٤٣. نسائي. خيل: ٣٥٧٥، ٣٥٧٤، ٣٥٧٦. ترمذي. جهاد: ١٦٩٤، ٣٥٧٦، ٣٥٧٧، ٣٥٧٨، ٣٥٧٩. تحفة الأشراف: ٣٢٣٨} : [١٢٣٦]

جەریری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەرم بینی (دروودی خودای لەسەر بێ) بە پەنجەکانی کاکۆڵی ئەسپێکی دەهۆنییەوەو دەیفەرموو: (لە کاکۆڵو یاڵی ماینو ئەسپ خێرو خۆشی گرێدراوە هەتا ڕۆژی

---

[١٢٣٦] تجرید/٣، ژمارە: ١١٧٥ = ٢٧٥٠ بخاری، پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١١٠٥ = ٤٨٢٤ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٥٦ رقم الباب/٤٤).

قیامەت: کە ئەو خێرو بێرە برێتییە لەپاداشی باشی قیامەتو، لەماڵی تاڵانی حەلاڵ لەم جیهانەدا). {تاج/٤، زنجیرە: ٢٦، ژمارە: ٤٣٩٢} + {ریاض/٣، لاپەرە: ٢٢٠، زنجیرە: ٢٣٤، ژمارە: ١٣٢٨، ١٣٢٩}.

١٢٣٧- عَنْ عُرْوَةَ الْبَارِقِيُّ أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (الْخَيْلُ مَعْقُودٌ فِي نَوَاصِيهَا الْخَيْرُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ: الأَجْرُ وَالْمَغْنَمُ) (الحديث ٢٧٥٠، أطرافُهُ في: ٢٨٥٢، ٣١١٩، ٣٦٤٣): [١٢٣٧]

عوروەی بارقی(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست(درودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەکاکۆڵو یاڵی ماینو ئەسپ خێرو خۆشی گرێدراوە هەتا ڕۆژی قیامەت: کە ئەو خێرو بێرە بریتیە لەپاداشی باشی قیامەتو، لەماڵی تاڵانی حەلاڵ لەم دنیایەدا) (تاج/٨/٨٨ف١ز٢٦).

عوروەی کوڕی جەعدی بارقی(ڕەزای خوای لێ بێ) کۆمەڵێ فەرموودەی لەپێغەمبەرەوە (درودی خوای لەسەر بێ) گێڕاوەتەوە، لەبوخاریدا دوو فەرموودەی هەیە، پێغەمبەر نزای بۆ کردبوو کەخوا پیتو فەڕ بخاتە مامەڵەیەوە، خۆی دەفەرموێ: ئیتر لەوەدوا ئەگەر خۆڵم بکڕیبایە قازانجم دەکرد (تاج/٢ل/٣٣٨ف٨ز١٦١) لەفەتحەکانی شام دا لەوێ ئامادە بوو لەوێ دادەنیشت، دوایی پێشەوا عوثمان ناردی بۆ کووفە، فەرموودەکانی لای خەڵکی کووفە هەن، عوروە دەوری حەفتا ماینی ڕاگرتبوو بۆ غەزا.

١٢٣٨- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رضى الله عنه) قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) « الْبَرَكَةُ فِي نَوَاصِي الْخَيْلِ»: [١٢٣٨]

---

[١٢٣٧] لە ژمارە: (١٢٣٦)دا تەخریجەکەی ڕۆیشت.

[١٢٣٨] تجرید/٢، ژمارە: ١١٧٦ - ٣٦٤٥ بخاری. پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١١٠٦ - ٤٨٣١ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٥٦ رقم الباب/٤٣).

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (پیتو فەڕو پیرۆزی هەردوو جیهان، وا بە ناوچاوانی ماینەوە!).

## (٢٨) بابُ فَضْلِ الجِهَادِ والخُرُوجِ فِي سَبيلِ اللَّه
## بەهرەی خەباتگێڕانو تێکۆشانو کۆشش لە پێناوی نایینی خودادا

١٢٢٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (انْتَدَبَ اللَّهُ لِمَنْ خَرَجَ فِي سَبِيلِهِ لَا يُخْرِجُهُ إِلَّا إِيمَانٌ بِي وَتَصْدِيقٌ بِرُسُلِي أَنْ أُرْجِعَهُ بِمَا نَالَ مِنْ أَجْرٍ أَوْ غَنِيمَةٍ أَوْ أُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ وَلَوْلَا أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي مَا قَعَدْتُ خَلْفَ سَرِيَّةٍ وَلَوَدِدْتُ أَنِّي أُقْتَلُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ثُمَّ أُحْيَا ثُمَّ أُقْتَلُ ثُمَّ أُحْيَا ثُمَّ أُقْتَلُ). (الحديث ٣٦ - أطرافه في: ٢٧٨٧، ٢٧٩٧، ٢٩٧٢، ٣١٢٣، ٧٢٢٦، ٧٢٢٧، ٧٤٥٧،٧٤٦٣)[١٢٢٩]:

دیسان لەوەوە لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ: (کەسێ بڕوا بۆ غەزاو تێکۆشان لەڕێ ی خودادا، خودای بالأدەستو شکۆمەند بۆخۆی دەبێ بەدەستەبەری،و دەفەرموێ: خۆم کەفیلی ئەوم کەیەکێ لەم دوو خەلأتە گەورەیەی پێ بدەم: یابیبەمە ناوبەهەشت، یابیبەمەوە بۆ شوێنی خۆی لەگەڵ ئەو هەموو پاداشی گەورەو تالأنییە زۆرەی کەدەستی دەکەوێ! بەمەرجێ ئەو تێکۆشەرە کەدەچێ بۆ ئەو غەزاو کۆششە مەبەستی تەنیا ڕەزامەندیی خودابێو باوەڕی بەمنو بە پێغەمبەرانی من هەبێ، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: دەترسم کەموسوڵمانان تووشی ڕەنجو سەخڵەتی بکەم دەنا

[١٢٢٩] تجرید/١، ژمارە: ٣٤ = ٣٦ بخاری. پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ١٠٧٠ - ٤٨٣٦ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٢ رقم الباب/٣٦).

لەگەڵ هەموو تاقمە موسوڵمانێکا کەدەچن بۆ غەزا خۆشم دەچووم بۆ ئەو غەزایە، بەڵام ئەمەناکرێ: چونکە نەخۆم ئەو توانایيەم هەیە کەوڵاخی سواری بۆ هەموویان پەیدا بکەمو، نەخۆشیان ئەو دەستەیان دەڕوا، لەهەمان کاتا زۆریش بەزەحمەتی دەزانن و لەشانیان گرانە ئەگەر من بچم بۆ غەزاو ئەوان نەیەن! بەوخودایە کەگیانی موحەممەدی لەدەست دایە، بەحەزی دڵ پڕبەدڵ حەز دەکەم کەلەڕێگەی خودادا بچم بۆ غەزاو لەو غەزایەدا بکوژرێم، دیسان زیندوو ببمەوەو بچمەوە بۆ غەزاو دیسان بکوژرێمەوە، هەمدیسان زیندوو ببمەوەو بچمەوە بۆ غەزاو هەمدیسان بکوژرێمەوە). (تاج/٨ ل/٤٦ ف/٢ = تاج/٤ ژ/٤٢٨٩ ز/١١).

ئەم فەرموودەیە لە ژمارە (١٠٧٠)ی موسلیم دا ئاوایە:

عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « تَضَمَّنَ اللَّهُ لِمَنْ خَرَجَ فِى سَبِيلِهِ لاَ يُخْرِجُهُ إِلاَّ جِهَادًا فِى سَبِيلِى وَإِيمَانًا بِى وَتَصْدِيقًا بِرُسُلِى فَهُوَ عَلَىَّ ضَامِنٌ أَنْ أُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ، أَوْ أَرْجِعَهُ إِلَى مَسْكَنِهِ الَّذِى خَرَجَ مِنْهُ، نَائِلاً مَا نَالَ مِنْ أَجْرٍ أَوْ غَنِيمَةٍ، وَالَّذِى نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ، مَا مِنْ كَلْمٍ يُكْلَمُ فِى سَبِيلِ اللَّهِ إِلاَّ جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كَهَيْئَتِهِ حِينَ كُلِمَ، لَوْنُهُ لَوْنُ دَمٍ وَرِيحُهُ مِسْكٌ، وَالَّذِى نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لَوْلاَ أَنْ يَشُقَّ عَلَى الْمُسْلِمِينَ مَا قَعَدْتُ خِلاَفَ سَرِيَّةٍ تَغْزُو فِى سَبِيلِ اللَّهِ أَبَدًا، وَلَكِنْ لاَ أَجِدُ سَعَةً فَأَحْمِلَهُمْ وَلاَ يَجِدُونَ سَعَةً وَيَشُقُّ عَلَيْهِمْ أَنْ يَتَخَلَّفُوا عَنِّى، وَالَّذِى نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لَوَدِدْتُ أَنِّى أَغْزُو فِى سَبِيلِ اللَّهِ فَأُقْتَلُ، ثُمَّ أَغْزُو فَأُقْتَلُ، ثُمَّ أَغْزُو فَأُقْتَلُ ». {الحديث: ٤٨٣٦ = ٤٨٢١ فم. تجريد/١، رقم: ٣٤ = ٣٦، ٢٧٨٧، ٢٧٩٧، ٢٩٧٢، ٣١٢٣، ٧٢٢٦، ٧٢٢٧، ٧٤٦٣، ٧٤٥٧. نسائى. إيمان: ٥٠٤٥. تحفة الأشراف: ١٤٩٠}:

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خوای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەر بێ) **دەفەرموێ:** کەسێ بڕوا بۆ خەباتو غەزاو تێکۆشان لەرێی خودادا، خودا بۆخۆی دەبێ بە دەستەبەر (زامن)یو، دەفەرموێ: خۆم کەفیلی ئەوم کەیەکێ لەم دوو خەڵاتە گەورەیەی پێ بدەم؛ یا بیبەمە ناو بەهەشت (لە حاڵەتی شەهیدبوونا) یابیبەمەوە بۆ شوێنی خۆی لەگەڵ ئەو هەموو پاداشی گەورەو تاڵانییە زۆرەی کە دەستی دەکەوێ! بەمەرجێ ئەو تێکۆشەرە کەدەچێ بۆ ئەو غەزاو کۆششە تەنیا مەبەستی رەزامەندیی خودابێو باوەڕو ئیمانی بەمنو بە پێغەمبەرانی من هەبێ، بەو کەسە کە گیانی موحەممەدی بەدەستە، دیارە کەیەزدانی پاکە، هەرکەسێ لەرێی خودادا زامار بکرێ، لەرۆژی قیامەتا کەدێ بۆ دیوانی خودا زامەکەی تازەو نوێیە وەکوو تازە ئەودەمە زامارکرابێ ئاوایە، لەسەر هەمان شێوەیە، رەنگەکەی سووری تلیقییە، وەکوو خوێنی ئاسایی، بەڵام بۆنەکەی بۆنی میسکە، ئیتر بەو زامارە شەهید بووبێ یانا جیاوازیی نییە لەوەدا، کە لەرۆژی قیامەتا لەسەر ئەو شێوەیە دێ بۆ دیوانی خودا بەوکەسە کە گیانی موحەممەدی بەدەسە (دروودی خوای لەسەر بێ) دەترسم کە موسوڵمانان تووشی رەنجو سەخڵەتی ببن، دەنا ئەگەر لەبەرئەوە نەبوایە ئەوا لەگەڵ هەموو تاقمە موسوڵمانێکا کەدەچن بۆ غەزاو خەبات خۆشم لەگەڵیاندا دەچووم، بەڵام ئەمە ناکرێ: چونکە نەخۆم ئەو توانایییەم هەیە کە وڵاخی سواریی بۆ هەموویان پەیدا بکەمو، نەخۆشیان ئەو دەستەیان دەڕوا، لەهەمان کاتا زۆریش بەزەحمەتی دەزانن‌و لەشانیان گرانە ئەگەر من بچم بۆ غەزاو ئەوان لەگەڵم نەیەن بۆ ئەو غەزایە!

بەوخودایە کە گیانی موحەممەدی بەدەستە، بەحەزی دڵ پڕبەدڵ حەزدەکەم کە لەرێگەی خودادا بچم بۆ غەزاو لەو غەزایەدا بکوژرێم، دیسان

زیندوو ببمەوەو بچمەوە بۆ غەزاو هەمدیسان بکوژرێمەوە!). {تاج/٤، زنجیرە: ١١، ژمارە: ٤٢٩٨، ج/٤} + {ریاض/٣، زنجیرە: ٢٣٤، ژمارە: ١٢٩٤/١٠/٣٤٩}.

١٢٣٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « تَكَفَّلَ اللَّهُ لِمَنْ جَاهَدَ فِي سَبِيلِهِ ، لاَ يُخْرِجُهُ إِلاَّ الْجِهَادُ فِي سَبِيلِهِ وَتَصْدِيقُ كَلِمَاتِهِ ، بِأَنْ يُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ ، أَوْ يَرْجِعَهُ إِلَى مَسْكَنِهِ الَّذِي خَرَجَ مِنْهُ مِنْ أَجْرٍ أَوْ غَنِيمَةٍ»:[١٢٣٠]

واتاو مەبەست لێی لەژمارە (١٢٢٩)دا، بەتەواوی رۆیشت.

١٢٣١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (كُلُّ كَلْمٍ يُكْلَمُهُ الْمُسْلِمُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ يَكُونُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كَهَيْئَتِهَا إِذ طعِنَتْ تَفجَّرُ دَمًا اللَّوْنُ لَوْنُ الدَّمِ وَالْعَرْفُ عَرْفُ الْمِسْكِ). (الحديث ٢٣٧- طرفاه في: ٢٨٠٣، ٥٥٣٣):[١٢٣١]

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ لەڕێ ی خودادا زامار بکرێ، لەڕۆژی قیامەتا کەدێ بۆ دیوانی خودا، زامەکەی تازەو نوێ یە، وەکوو کاتی زامارکردنەکەی، ڕێك لەسەر هەمان شێوەیشە، رەنگەکەی سووری تلیقی یە، وەك خوێنی ئاسایی، بەڵام بۆنو بەرامە خۆشەکەی لەبۆنی میسك دەکا، لەناو خەڵکی مەحشەردا دەبێ بەمایەی شانازیو سەربەرزی بۆی). (ت/٨/ ٢/٤٦ =ز-١١ ژ-٤٢٩٨ تاج/٤ - ش).

[١٢٣٠] بڕوانە ژمارە: (١٢٢٩) (بخاری رقم الكتاب/٥٧ رقم الباب/٨).

[١٢٣١] تجرید/١، ژمارە: ١٧٠ = ٢٣٧ بخاری، مسلم: ٤٨٣٠ شیحا (بخاری رقم الكتاب/١ رقم الباب/٦٧).

## (٢٩) باب فضل الشَّهَادَةِ في سَبِيلِ اللَّهِ تَعَالى
## خێرو بەهرەی گەورەیی شەهیدیی کە لە پێناوی خودادا بێ

١٢٣٢- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « مَا مِنْ أَحَدٍ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ يُحِبُّ أَنْ يَرْجِعَ إِلَى الدُّنْيَا وَأَنَّ لَهُ مَا عَلَى الأَرْضِ مِنْ شَيْءٍ غَيْرُ الشَّهِيدِ، فَإِنَّهُ يَتَمَنَّى أَنْ يَرْجِعَ فَيُقْتَلَ عَشْرَ مَرَّاتٍ لِمَا يَرَى مِنَ الْكَرَامَةِ ». {الحديث: ٤٨٤٥ = ٤٨٣٠ فم. بخاري. جهاد: ٢٨١٧}: [١٢٣٢]

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەو کەسەی کەچووە ناو بەهەشت حەزناکا کە بگەڕێتەوە بۆ دونیا، ئەگەر هەرچی لەسەر رووی زەوی هەیە بیدەن پێی ناگەڕێتەوە، مەگەر شەهید، بەلاّم شەهید حەزدەکا کە بگەڕێتەوە بۆ جیهان‌و دەجاری تریش بکوژرێتەوە! چونکە بەچاوی خۆی دەبینێ کە شەهید چەندە بەقەدرو بەرێزو قورس‌و گرانە!). {تاج/٣، زنجیرە: ١٢، ژمارە: ٤٣٢٢} + {ریاض الصالحین/٣، لاپەڕە: ٢١١، چاپی/٢، زنجیرە: ٢٣٤، ژمارە: ١٣١١}.

١٢٣٣- عنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: دُلَّنِي عَلَى عَمَلٍ يَعْدِلُ الْجِهَادَ قَالَ: ( لا أَجِدُهُ) قَالَ: (هَلْ تَسْتَطِيعُ إِذَا خَرَجَ الْمُجَاهِدُ أَنْ تَدْخُلَ مَسْجِدَكَ فَتَقُومَ وَلا تَفْتُرَ وَتَصُومَ وَلا تُفْطِرَ؟) قَالَ: وَمَنْ يَسْتَطِيعُ ذَلِكَ ). (الحديث ٢٧٨٥): [١٢٣٣]

---

[١٢٣٢] بخاری. جهاد: ٢٨١٧. پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١٠٧٩ = ٤٨٤٥ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٥٦ رقم الباب/٢١).

[١٢٣٣] تجرید/٣، ژمارە: ١١٤٦ = ٢٧٨٥ بخاری. مسلم: ٤٨٤٦ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٥٦ رقم الباب/١).

ئـەبوهورەیرە (ڕەزای خـوای لــێ بـێ) فـەرمووی: پیـاوێ هاتـە خزمـەتی حەزرەت (دروودی خوای لەسەر بێ) عەرزی کرد: قوربان! چی کارێکی باشی تر هاوتـای تێـکۆشان لەڕێـگای خـودای گـەورەدا دەکـا؟ فـەرمووی: (کـاری وا گومـان نابـەم). ئـەوجا بەپیاوەکـەی فـەرموو: (ئایـا دەتوانیـت ئـەو کاتـەی کەخـەباتکار دەڕوات بۆ خەباتکاری، تۆیش بچیتە ناو نوێژگەکەت و سەرو مڕ نوێژو شەونوێژ بکەیت بەبێ ساردبوونەوە بەرۆژیش هەر بەرۆژوو بیو یەك رۆژی لێ نەخۆی) پیاوەکە گوتی: جا کێ شتیوا دەتـوانێ؟. (تـاج/٨/٤٤٧ف-٣-ش/ت/ن) +(ریـاض/٣/ل-٩٤٨ز-٢٣٤ باسی جیهاد).

## (٣٠) باب فضل الغدوة والروحة في سبيل الله

## یەك تاق کۆشش و تێکۆشان لە ڕێگەی خودادا، چی تاقی بەیانی بێ و چی تاقی ئێوارە بێ، لە هەموو سامان و نازو بەهرەی جیهان باشترە

١٢٣٤- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « لَغَدْوَةٌ فِى سَبِيلِ اللَّهِ أَوْ رَوْحَةٌ خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا ». {الحديث: ٤٨٥٠ = ٤٨٣٥ فـم. تجريـد/٣، رقـم: ١١٥٠ = ٢٧٩٢، ٢٧٩٦، ٦٧٦٨، نـسائي. جهـاد: ٣١١٨}:(١٢٣٤)

ئەنەسـی کـوڕی مالیـك (رەزای خـودای لێ بـێ) دەفـەرموێ: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) دەفـەرموێ: (تاقـێ کۆشـش و تێکۆشـان لەڕێگـەی خودادا (چی تاقی بـەیانی بێ و چی تـاقی ئێوارەبـێ) لەهـەموو سـامان و مـوڵکی

(١٢٣٤) تجریـد/٣، ژمـارە: ١١٥٠ = ٢٧٩٢ بخـاری. پوختـەی موسـلیم/٣، ژمـارە: ١٠٧٦ = ٤٨٥٠ شـیحا (بخاری رقم الكتاب/٥٦ رقم الباب/٥).

جیهـان چـاکترە). {ریـاض/٣، لاپـەڕە: ٩٤٣ – ٦، ٤. چـاپی یەکـەم = زنجـیرە/٢٣٤، ژمارە: ١٢٩٠} + {تاج/٤، زنجیرە: ١١، ژمارە: ٤٣٠٠}.

١٢٣٥- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ (رضى الله عنه) عَـنِ النَّبِـيِّ (صـلى الله عليـه وسـلم) قَالَ: «الرَّوْحَةُ وَالْغَدْوَةُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَفْضَلُ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا»: [١٢٣٥]

واتاکەی لەژمارە (١٢٣٤)دا رۆیشت.

١٢٣٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَـالَ: (لَقَـابُ قَـوْسٍ فِـي الْجَنَّـةِ خَيْـرٌ مِمَّـا تَطْلُـعُ عَلَيْـهِ الـشَّمْسُ وَتَغْـرُبُ) وَقَالَ: (لَغَدْوَةٌ أَوْ رَوْحَةٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ خَيْرٌ مِمَّا تَطْلُعُ عَلَيْهِ الشَّمْسُ وَتَغْرُبُ) (الحديث ٢٧٩٣، طرفُهُ في: ٣٢٥٣): [١٢٣٦]

ئـەبوهورەیرە (ڕەزای خـوای لـێ بـێ) فـەرمووی: خۆشەویـست (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (بەقەی جێ کـەوانێ لەبەهەشـتا لەهـەموو جیهـان باشترە، وە فەرمووشی: تاقێ کۆشش‌و غـەزاو تێـکۆشان لەرێـگەی خـودادا –چـی تـاقی بـەیانی بـێ‌و چـی تـاقی ئێـوارە بـێ- لەهـەموو سـامان‌و موڵـکی جیهـان چاکترە!). )تاج/٨/٤٨/٤ز-١١-ش/ت/ن).

---

[١٢٣٥] بڕوانە ژمارە: (١٢٣٤) (بخاری رقم الکتاب/٥٦ رقم الباب/٥).

[١٢٣٦] تجریـد/٣، ژمـارە: ١١٥١ = ٢٧٩٣ بخـاری. مـسلم: ٤٨٥٤ شـیحا (بخـاری رقـم الکتـاب/٥٦ رقـم الباب/٥).

## (٣٤) بابُ فَضْلِ الجِهَادِ وَالرِّبَاطِ
## گەورەیی خەباتگێڕانو نێشکو پاسەوانی ناو سەنگەرەكانی سەر سنوور

١٢٣٧- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ: أَيُّ النَّاسِ أَفْضَلُ؟ فَقَالَ: « رَجُلٌ يُجَاهِدُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِمَالِهِ وَنَفْسِهِ »، قَالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: « مُؤْمِنٌ فِي شِعْبٍ مِنَ الشِّعَابِ يَعْبُدُ اللَّهَ رَبَّهُ وَيَدَعُ النَّاسَ مِنْ شَرِّهِ ». {الحديث: ٤٨٨٣ = ٤٨٤٨ فم. تجريد/٣، رقم: ١١٤٧ = ٢٧٨٦، ٦٤٩٤ فتح الباري} : [١٢٣٧]

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێ) پرسیاری لێ کرد، گوتی: قوربان! چاکترین کەس کێیە؟ فەرمووی: (ئەو پیاوە موسوڵمانەی کە بەگیانو سامانو بەسەرو بەماڵ، لەڕێگەی خودادا تێ دەکۆشێ).

پیاوەکە گوتی: ئەی لەدوای ئەو کێ چاکترین کەسە؟ فەرمووی: (ئەو موسوڵمانەی کە لەپەنایەکا، خودای خۆی بەجوانی دەپەرستێو سەری خۆی کزدەگرێو لەخودای گەورە دەترسێو ئازاری کەس ناداو مەردووم لەشەڕو وەزەنی بەدوورن!). {تاج/٤، زنجیرە: ١١، ژمارە: ٤٣٠٢، ج/٤}. {ریاض/٣، زنجیرە: ٢٣٤، ژمارە: ١٢٨٩}.

بۆ بەراوردو ڕەچاوکردنی چۆنێتی هەردوو گێڕانەوەکانی بوخاریو موسلیم، ژمارە (١١٤٧)ی تەجریدی بوخاریش دەگوێزینەوە:

عنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَيُّ النَّاسِ أَفْضَلُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) :

---

[١٢٣٧] تجرید/٣، ژمارە: ١١٤٧ = ٢٧٨٦ بخاری. پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١٠٧٢ = ٤٨٨٣ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٥٦ رقم الباب/٢).




(مُؤْمِنٌ يُجَاهِدُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِنَفْسِهِ وَمَالِهِ) قَالُوا: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: (مُؤْمِنٌ فِي شِعْبٍ مِنْ الشِّعَابِ يَتَّقِي اللَّهَ وَيَدَعُ النَّاسَ مِنْ شَرِّهِ). (الحديث ٢٧٨٦، طرفُهُ في: ٦٤٩٤):

ئەبوسەعیدی خودری(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پرسیارکرا لە پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) : چاکترین کەس کێیە؟ فەرمووی: (ئەو موسوڵمانەی کە بەگیانو سامانو بەسەرو بەماڵ لەڕێگەی خودادا تێ دەکۆشێ) گوتیان: ئەی دوای ئەو کێ چاکترین کەسە؟ فەرمووی: (ئەو موسوڵمانەی کە لەپەنایەکا سەری خۆی کز دەگریو، بەجوانی خودای خۆی دەپەرستێ، وەلە خودای گەورە دەترسێو ئازاری کەس نادات. (تاج/٨/٤٩-٦-ش/د/ت).

خۆشە بێوەیی چەتری سەرت بێ

کاڵای هەژاری بەرگی بەرت بێ!

نە خەمی مەزراو ڕانە مەڕت بێ

نە ترسی گورگی دەشتو دەرت بێ

ئاسمان لێفەو زەوی بەڕت بێ

نە لەگەڵ کەسێ هەراو شەڕت بێ!

ناڵەی دەروێشی لە کەمەرت بێ

وەیسەکەی خۆمان بە ڕەهبەرت بێ!

ترسی ڕوو زەردی لای سەروەرت بێ

کردەوەی باشی خۆت سوپەرت بێ!

دڵی ڕووناکی خۆت خەفەرت بێ

چرای ڕۆشنی دەوروبەرت بێ!

تا لە ڕیسوایی سواڵ قوتەرت بێ




حـــالّ و مـــالّێکی ســـەروبەرت بـــێ!

مزگـــەوتێ نزیـــک بەرابـــەرت بـــێ

خـەڵوەگای گیـانی پـڕ هونـەرت بـێ!

خـەوگای دەروونـی بەخەبـەرت بـێ!

کەڵەشێری عەرش، بـە بانگـدەرت بـێ

هـــەڤاڵێ هـــاوبیر قەلەنـــدەرت بـــێ

کـاتی پێویـستی هاوسـەنگەرت بـێ!

نـــەک لەســـەر سینی بەرابـەرت بـــێ

کە پـشتی هـەڵکرد، لـە زەرەرت بـێ!

نەفسێ چون دەبـان پـڕ جەوهـەرت بـێ

هاوسەرێ وەک خۆت بە هاوسـەرت بـێ!

مەرگـی پڕ ڕەحمەت، ڕێی سەفەرت بێ

سـایەی عەرشـی خـوا، بەسـێبەرت بـێ!

**وەرگێڕ**

**نوری فارس حەمەخان**

## (٣٥) باب بيان الرجلين يقتل أحدهما الآخر يدخلان الجنة
## باسی دوو پیاو، یەکێکیان ئەوی تریان دەکوژێ‌و بکوژو کوژراو هەردووکیان پێکەوە دەچنە ناو بەهەشت

١٢٣٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (يَضْحَكُ اللَّهُ إِلَى رَجُلَيْنِ يَقْتُلُ أَحَدُهُمَا الآخَرَ يَدْخُلانِ الْجَنَّةَ يُقَاتِلُ هَذَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَيُقْتَلُ ثُمَّ يَتُوبُ اللَّهُ عَلَى الْقَاتِلِ فَيُسْتَشْهَدُ) (الحديث٢٨٢٦):[١٢٣٨]

ئەبوهورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (کاری ئەم دوو پیاوە ئەوەندە عەنتیکەیە، خودای گەورە بۆ خۆی پێکەنینی پێیان دێ، ئەوەندە کەیفی بەکارەکەیان دێ. یەکێکیان ئەوی تریان دەکوژێ، کەچی هەردووکیشیان دەچنە بەهەشت، لەپێشا یەکێکیان لەڕێگەی خودادا دەجەنگێ هەتا بەدەستی ئەویتریان دەکوژرێ. لەپاشا بکوژەکەش تەوبە دەکاو خودا پەشیمانی لێ گیرا دەکاو، ئەویش شەهید دەکرێ لەئەنجام دا، کوژراوی یەکەم‌و بکوژەکەی کەئەویش شەهید کراوە، هەردوولا پێکەوە دەچنە بەهەشت!) (تاج/٨/٤٩ز-١١ش).

گێڕانەوەی بوخاری‌و موسلیم زۆر لەیەکترەوە نزیکن، ئەمەیش ژمارە (١٠٩٨)ی پوختەی موسلیمە:

عَنْ أبى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قال: قال: رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « يَضْحَكُ اللَّهُ لِرَجُلَيْنِ، يَقْتُلُ أَحَدُهُمَا الآخَرَ، كِلاَهُمَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ » قَالُوا: كَيْفَ يَا رَسُولَ

---

[١٢٣٨] تجرید/٣، ژمارە: ١١٦٢ = ٢٨٢٦ بخاری. پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١٠٩٨ = ٤٨٧١ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٥٦ رقم الباب/٢٨).

اللّٰهِ؟ قَالَ: « يُقْتَلُ هَذَا فَيَلِجُ الْجَنَّةَ، ثُمَّ يَتُوبُ اللَّهُ عَلَى الآخَرِ، فَيَهْدِيهِ إِلَى الإِسْلَامِ، ثُمَّ يُجَاهِدُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَيُسْتَشْهَدُ». {الحديث: ٤٨٧١ = ٤٨٥٦ فم}:

ئـەبو هـورەیرە (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) دەفـەرموێ: (کـاری ئـەم دوو پیـاوە ئەوەنـدە سـەیرو عەنتیکەیـە، خـودای گـەورە بـۆ خـۆی پێکـەنینی پێیـان دێ، ئەوەنـدە کـەیفی بەکارەکەیان دێ: یـەکێکیان ئـەویتریان دەکـوژێ، کەچـی هەردووکیـشیان دەچـنە بەهەشـت! لەپێـشا یەکـەمیان لـە رێگـەی خـودادا دەجـەنگێ هـەتا بەدەسـتی ئـەویتریان دەکـوژرێ، لەپاشـا بکوژەکـەش تەوبـە دەکـاو خـودا پەشـیمانی لێ گیرادەکـاو رێنمـایی دەکـا بـۆ ئیـسلامەتیو دەچـێ بـۆ خـەباتو غـەزا لەرێگـەی خوداداو ئەویش شەهید دەکرێو لەئەنجامـدا کوژراوی یەکـەمو بکوژەکـەی (کـە ئەویش شەهید دەکرێ) هەردوولا پێکەوە دەچنە بەهەشت). {تاج/٤، زنجیرە: ١١، ژمـارە: ٤٣٠٣ — ش = شـەیخان = بوخـاریو موسـلیم} + {تەجریـدی بوخـاری/٢، ژمارە: ١١٦٢ = ٢٨٢٦ فتح}.

## (٣٨) باب فَضْلِ إِعانَةِ الغَازِى في سبيل الله بِمَرْكُوبٍ وَغَيْرِه، وَخَلَافَتَهُ في أَهْلِهِ بِخَيْرٍ

## پاداشی کەسێ یاریدەی تێکۆشەرانو غەزاکارانی ئیسلامدۆست بدا لەبەر خودا، ئیتر بە هەر شتێ بێ، وە سەرپەرشتی کەسوکاریان بکا، لەبەر خاتری خودای گەورەو سەروەر

١٢٣٩- عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَـنْ رَسُـولِ اللَّـهِ (صـلى الله عليه وسلم) أَنَّهُ قَالَ: « مَنْ جَهَّزَ غَازِيًا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَقَدْ غَزَا، وَمَـنْ خَلَفَـهُ فِـي أَهْلِـهِ

بِخَيْرٍ فَقَدْ غَزَا ». {الحديث: ٤٨٧٩ = ٤٨٦٤ فـم. تجريـد البخـارى/٣، رقـم: ١١٧١ = ٢٨٤٢} :[١٣٣٩]

زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنی (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەوەی کە لەبەر ڕەزای خودا خەباتگێڕێ تەدارەك بكاو چەكو تفاقی بۆ ئامادەبكا، ئەوە وەك ئەوە وایە کەخۆی بچێ بۆ غەزا، وە ئەوەی کە بە باشە سەرپەرشتی خێزانی تێکۆشەرێ بكا، كە بۆ ڕەزای خودا چووبێ بۆ غەزا، وەك ئەوە وایە کەخۆی بچێ بۆ غەزا). {ریاض/٣، لاپەڕە: ٢٠٩، زنجیرە: ٢٣٤، ژمارە: ١٣٠٦/٢٢ - ٣٦١} + {تاج/٤، زنجیرە: ١٦، ژمارە: ٤٣٤٦ — ش/ت — ج/٤ = چاپی چوارەم}.

**ڕوونکردنەوە:**

ئیمامی نەوەوی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) لەڕوونکردنەوەی ئەم فەرموودەیەدا دەفەرموێ: {وَفِي هذَا الحَدِيثِ الحَثُّ عَلَى الإِحْسَانِ إِلَى مَنْ فَعَلَ مَصْلَحَةً لِلْمُسْلِمِينَ أَوْ قَامَ بِأَمْرٍ مِنْ مهمَّاتِهِمْ}.

واتە: لەم فەرموودەیەدا هاندان هەیە لەسەر چاکەکردن لەگەڵ کەسێ بەرژەوەندییەك بۆ موسوڵمانان دابین بكا، یاخۆی کارێکی گرنگ بۆ گەلی ئیسلام ئەنجام بدا. بەپێی ئەم ڕوونکردنەوەیەی نەوەوی:

١. کەسێ یارمەتی فەقێو مامۆستای ئایینی بدا، کە خۆیان تەرخان کردووە بۆ خزمەتی ئایینی پیرۆزی ئیسلام، وەك ئەوە وایە کەخۆی فەقێ بێ، یا مەلابێ.

---

[١٣٣٩] تجرید/٣، ژمارە: ١١٧١ = ٢٨٤٢ بخاری. پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١٠٩٢ = ٤٨٧٩ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٥٦ رقم الباب/٣٨).

٢. کەسێ یاریدەی سەرۆکی دادپەروەر بدا، کە ملەت لە سێبەری دادپەروەریی ئەودا حەوابێتەوە، لەقیامەتا ئەویش بەقەد ئەو سەرۆکە خێرو پاداشی باشی بۆھەیە.

٣. کەسێ یاریدەی حافظو قورئان خوێن بدا، ئەوە وەك ئەوە وایە کەخۆی خەریکی خزمەتو لەبەرکردنو خوێندنی قورئان بێ.

٤. ھەروەھا کۆمەکیو یاریدەی خێزانی ئەم زاتانەش وەك یاریدەدەری خێزانی غەزاکار وایە.

## (٤٠) باب سُقوطِ فرض الجهادِ عَنِ المعذورين
## خاوەن مەھانەی ڕەوا غەزای لەسەر نیە

١٢٤٠- عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ: أَنَّهُ سَمِعَ الْبَرَاءَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) يَقُولُ فِي هَذِهِ الآيَةِ (لاَ يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ) فَأَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) زَيْدًا فَجَاءَ بِكَتِفٍ يَكْتُبُهَا فَشَكَا إِلَيْهِ ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ ضَرَارَتَهُ، فَنَزَلَتْ: (لاَ يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُولِي الضَّرَرِ). {الحديث: ٤٨٨٨ = ٤٨٧٣ فـم. تجريد البخاري/٣، رقم: ١١٦٦ = ٢٨٣٢، ٤٥٩٢. تحفة الأشراف: ١٨٧٧}: [١٢٤٠]

ئەبو ئیسحاق دەفەرموێ: لەبەرائی کوڕی عازیبم بیست (ڕەزای خودای لێ بێ) دەیفەرموو لەبارەی ئایەتی: {لاَ يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ .... وَالْمُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ – النساء – ٤/٩٥} کاتێ ئەم ئایەتە ھاتە خوارەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی کرد بەزەیدی کوڕی ثابیت

---

[١٢٤٠] بخاری/٣، ژمارە: ١١٦٦ = ٢٨٣٢ بخاری. پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١١٠٩ = ٤٨٨٨ (بخاری رقم الكتاب/٥٦ رقم الباب/٣١).




(ڕەزای خـوداى لێ بـێ) ئێـسكى دەفـەى شـانى ئـاژەڵێكى هێنـا، ئـەم ئایەتـەى لێ نووسى، لەم كاتەدا ئیبنو ئوممى مەكتووم (ڕەزاى خوداى لێ بێ) هاتـە خزمـەتى عـەرزیكرد: ئـەى پێغەمبـەرى خـودا! سـوێندم بەیـەزدانى پـاك، ئەگـەر توانـاى غەزاو تێكۆشـانو خـەباتگێڕانم دەبـوو، منـیش لـەم لایەنـەوە درێغـیم نـەدەكرد، بەڵام من پیاوێكى كوێرمو ئەمانەیش بە كوێر ناكرێ، ئیـتر بۆچـى مـن لـەپیتو فەڕو بەهرەى غەزا لەڕێگەى خودادا بێ بەشم؟ ئیتر ئایەتەكە گۆڕاو بەم شێوەى تر دابەزى: {لاَّ يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ - غَيْرُ أُوْلِـي الـضَّرَرِ - وَالْمُجَاهِـدُونَ فِي سَبِيلِ اللّهِ – النساء – ٤/٩٥} واتە: وەك یەك نین لەپاداشو تۆڵەى باشدا، ئەو موسوڵمانانەى كە دانیشتوونو بەبێ مەهانـەى ڕەواى، وەك كـوێرىو شـەلىو نەخۆشى، تەركى غەزاو خەباتیان كردووە، لەگەڵ ئەو موسوڵمانانەدا كە خەبات دەگێڕنو تێ دەكۆشن لەڕێگەى خودادا). {تاج/٤، زنجیرە: ٥، ژمارە: ٢٨١٣، ج/٤}.

## (٤١) باب ثبوت الجَنَة لِلشّهيدِ
## بەهەشت مسۆگەرە بۆ شەهید

١٢٤١- عنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: (قَالَ رَجُـلٌ لِلنَّبِـيِّ (صَـلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَوْمَ احُدٍ: ارَايْتَ انْ قُتِلْتُ فَايْنَ انَا؟ قَالَ: فِي الْجَنَّةِ فَالْقَى تَمَرَاتٍ فِـي يَدِهِ ثمَّ قَاتَلَ حَتَّى قُتِلَ). (الحديث: ٤٠٤٦)؛ [١٢٤١]

جـابیرى كـوڕى عەبـدوڵلا (ڕەزاى خودایـان لـێ بـێ) فـەرمووى: ڕۆژى غـەزاى ئوحـود، پیـاوێ عـەرزى حـەزرەتى كـرد: ئـەى پێغەمبـەرى خـودا! پـێم بفـەرموو، ئەگـەر مـن بكـوژرێم لەغـەزادا جێگـەم كوێیـە؟ فـەرمووى:(جێگـەت

---

[١٢٤١] تجریـد/٤، ژمـارە: ١٥٤٢ = ٤٠٤٦ بخـارى. پوختـەى موسـلیم/٣، ژمـارە: ١٠٩٠ = ٤٨٩١ شـیحا (بخارى رقم الكتاب/٦٤ رقم الباب/١٧).

ناوبەهەشـتە) پیاوەکـە چـەند دەنکـێ خورمـا لـەناو دەسـتیا بـوو، خـەریکی خواردنیان بـوو، وەك بڵێـی ئـەو خورمایانـە ڕێگربن لـە چوونە نـاو بەهەشتی، فڕەی دان وشێرانە جەنگی کرد هەتا کوژرا).

ئەمەیش دەقێکی تری ئەم بابەتەیە، راگوێزی دەکـەین لـەژمارە (١٠٩٠)ی موختەصەری صەحیحی موسلیمەوە:

عَنِ الْبَرَاءِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ مِنْ بَنِى النَّبِيتِ قَبِيلٍ مِنَ الأَنْصَارِ، فَقَالَ: أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَأَنَّكَ عَبْدُالله وَرَسُولُهُ. ثُمَّ تَقَدَّمَ فَقَاتَلَ حَتَّى قُتِلَ، فَقَالَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم): « عَمِلَ هَذَا يَسِيرًا، وَأُجِرَ كَثِيرًا ». {الحديث: ٤٨٩١ = ٤٨٧٦ فم. تجريد/٣، رقم: ١١٥٨ = ٢٨٠٨}:

بەراء (ڕەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: پیـاوێکی بـەنی نـەبیتی هـات، بـەنی نـەبیت تیرەیـەکن لـە ئەنـصار، عـەرزی حـەزرەتی کـرد: شـایەتی دەدەم کـە لەیـەزدانی پـاك بـەولاوە خـودای ترنییـە، وە تـۆیش ئـەی موحەممـەد! بەنـدەو پێغەمبەری ئەویت! ئەوجا چووە پێشەوەو خۆی کرد بـەکۆڕی شـەڕداو جـەنگی کرد هەتا کوژرا، جا حـەزرەت (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: (ئەمـە کارێ کەمی کردو پاداشێ زۆری برد!). یا ئاوا (کـەمێ کـاری کـردو پاداشـی زۆری برد). {تاج/٤، زنجیرە: ١٢، ژمـارە: ٤٣٣١، چ/٤} + {ریـاض/٣، زنجیرە: ٢٣٤، ژمـارە: ١٣١٠}.

**ڕوونکردنەوە:**

ئەم پیاوە بەرابەر بەهێنانی یەك شایەتمان ژیـانی نـەبڕاوەی نـاو بەهەشـتی بەرینی بۆ خۆی مسۆگەر کرد، لەسەر فەرمایشتی فـەتحولباری ئـەم پیـاوە نـاوی عەمری کوڕی ثابیتی کوڕی وەقش بووە، ناسراوە بە (ئەحرەمی کوڕی عەبـدول

**ئەشـهەل). دەگێڕنـەوە بەڕشـتەیەکی دروسـت (صـحیح) لەئـەبو هـورەیرەوە فەرموویەتی بە برادەرانی خۆی، لەسەر شێوەی مەتەڵ: (ئـەو پیـاوە موسـوڵمانە کێیە کە قەت نوێژی نـەکردووەو چووەتە بەهەشتەوە؟!) کە مەبەسـتی ئـەبو هورەیرە ئەم عەمری کوڕی ثابیتی کوڕی قەیسە بوو.**

١٢٤٢- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ بَعَثَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَقْوَامًا مِنْ بَنِي سُلَيْمٍ إِلَى بَنِي عَامِرٍ فِي سَبْعِينَ فَلَمَّا قَدِمُوا قَالَ لَهُمْ خَالِي: أَتَقَدَّمُكُمْ فَإِنْ أَمَّنُونِي حَتَّى أُبَلِّغَهُمْ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَإِلاَّ كُنْتُمْ مِنِّي قَرِيبًا فَتَقَدَّمَ فَأَمَّنُوهُ فَبَيْنَمَا يُحَدِّثُهُمْ عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذْ أَوْمَئُوا إِلَى رَجُلٍ مِنْهُمْ فَطَعَنَهُ فَأَنْفَذَهُ فَقَالَ: اللَّهُ أَكْبَرُ فُزْتُ وَرَبِّ الْكَعْبَةِ ثُمَّ مَالُوا عَلَى بَقِيَّةِ أَصْحَابِهِ فَقَتَلُوهُمْ إِلاَّ رَجُلاً أَعْرَجَ صَعِدَ الْجَبَلَ قَالَ هَمَّامٌ فَأُرَاهُ آخَرَ مَعَهُ فَأَخْبَرَ جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلام النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَّهُمْ قَدْ لَقُوا رَبَّهُمْ فَرَضِيَ عَنْهُمْ وَأَرْضَاهُمْ فَكُنَّا نَقْرَأُ: (أَنْ بَلِّغُوا قَوْمَنَا أَنْ قَدْ لَقِينَا رَبَّنَا فَرَضِيَ عَنَّا وَأَرْضَانَا ثُمَّ نُسِخَ بَعْدُ فَدَعَا عَلَيْهِمْ أَرْبَعِينَ صَبَاحًا عَلَى رِعْلٍ وَذَكْوَانَ وَبَنِي لَحْيَانَ وَبَنِي عُصَيَّةَ الَّذِينَ عَصَوْا اللَّهَ تعالى وَرَسُولَهُ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (الحديث ٢٨٠١): [١٣٤٢]

**ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) حەفتا کەسی نارد بۆ ناو بەنی ریعلو بەنی ذەکوانو بەنی عوصەییە، چەند پیاوێکی بەنی سولەیمیان تێدا بوو، جا کاتێك دەگەنە پێشەوە، جا حەرامی کوڕی میلحانی خاڵۆم پێیانی فەرموو: ئێوە لێرە چاوەڕوان بن من خۆم لەپێشا دەڕۆم بۆ ناویان، دەمو دوویان تاقی دەکەمەوە جا ئەگەر ئەمانیان پێ دام، ئەوا نامەکەی پێغەمبەریان پێ ڕادەگەیەنم لەگەڵ پەیامەکەی دا، خۆ**

---

**[١٣٤٢] تجرید/٣، ژمارە: ١١٥٣ = ٢٨٠١ بخاری. پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١٠٨١ - ٤٨٩٤ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٥٦ رقم الباب/٩).**

ئەگەر ناپاکیشیان لێ کردم، ئەوا ئێوە لەنزیکمەوەبن، بەشتەکە دەزانن ئیتر بەپێی هەڵوێست پاکۆمەکی من دەکەن، یا هەر هیچ نەبێ هەڵدێن‌و رادەکەن‌و ئێوە قوتارتان دەبێ.

جا کاتێ خالم چووە پێشەوە بەدرۆ بەفێڵ ئەمانیان پێ دا، وەدەستی کرد بەراگەیاندنی کاغەزو پەیامەکەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) لەناو خۆیان دا، ئامازەیان لەپیاوێکیان کرد رمێکی لەپشتەوە لێ دا، لەسنگیەوە دەرچوو. جا خالم فەرمووی: اللەأکبر! گەورەیی هەر بۆ خودایە، بەخودای گەورە، بەخاوەنی کەعبە، شادبووم بەشەهید بوون،و گەیشتم بەئاواتی خۆم‌و پیرۆز بووم، ئەوجا هۆزی بەنی عامر دەنیشنە سەر تاقمەکەی حەرام‌و هەر حەفتایان دەکوژن، تەنیا پیاوێکی شەلیان نەبێ کە هەڵدەزنێ بەکێوەکەداو خۆی دەگەیەنێتە لوتکەی کێوەکە. جا جوبرائیل (سەلامی خوای لێ بێ) هەواڵی بەپێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) دا، کە ئەو شەهیدانە گەیشتوون بەخزمەتی خودای خۆیان‌و خودا لەوان رازییەو، ئەوانیشی رازی کردووە.

جا خودای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا ئەمەی نارده خوارەوە، وەتا ماوەیێ لەناو قورئاندا ئەمانخوێند، تادوایی خودا سڕیەوەو نەسخی کردەوە، ﴿أنْ بلّغوا قَومَنا، أنْ قدْ لقِينا ربَّنا فرضيَ عنّا وأرضانا﴾ واتە: خودایە! هەواڵی حالمان رابگەیەنە بەگەلی ئیسلام، کەوا ئێمە شادبووین بەدیداری پەروەردگارمان، وەخوا لێمان رازییەو رازیشی کردوین.

جا لەوەدوا پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) چل بەیانی نزای شەڕی لەناو قونوتا، لەم هۆزانە کرد: لە ریعل‌و لەذەکوان‌و لەبەنی لەحیان‌و لەبەنی عوصەییە، کەئەوانەن لەم رووداوەدا لە خوداو لەپێغەمبەری خودا یاخی بوون. (بڕوانە: تاج/٨/٢٥٤ف-١+٢ز-١٠٢ هەناردنی حەفتاکەسە قورئانخوێنەکان + ریاض/٣/٩٥٧ف-٣٢ز-٢٣٤. باسی خەبات و...).

ئەمەیش چەمکێکی تری ئەم داستانەیە، راگوێزی دەکەین لە ژمارە (١٠٨١)ی پوختەی موسلیمەوە:

عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: جَاءَ نَاسٌ إِلَى النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالُوا: أَنِ ابْعَثْ مَعَنَا رِجَالاً يُعَلِّمُونَا الْقُرْآنَ وَالسُّنَّةَ، فَبَعَثَ إِلَيْهِمْ سَبْعِينَ رَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ يُقَالُ لَهُمُ الْقُرَّاءُ، فِيهِمْ خَالِي حَرَامٌ، يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ وَيَتَدَارَسُونَ بِاللَّيْلِ يَتَعَلَّمُونَ، وَكَانُوا بِالنَّهَارِ يَجِيئُونَ بِالْمَاءِ فَيَضَعُونَهُ فِي الْمَسْجِدِ، وَيَحْتَطِبُونَ، فَيَبِيعُونَهُ، وَيَشْتَرُونَ بِهِ الطَّعَامَ لأَهْلِ الصُّفَّةِ، وَلِلْفُقَرَاءِ، فَبَعَثَهُمُ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) فَعَرَضُوا لَهُمْ. فَقَتَلُوهُمْ قَبْلَ أَنْ يَبْلُغُوا الْمَكَانَ، فَقَالُوا: اللَّهُمَّ بَلِّغْ عَنَّا نَبِيَّنَا أَنَّا قَدْ لَقِينَاكَ فَرَضِينَا عَنْكَ وَرَضِيتَ عَنَّا، قَالَ: وَأَتَى رَجُلٌ حَرَامًا خَالَ أَنَسٍ مِنْ خَلْفِهِ فَطَعَنَهُ بِرُمْحٍ حَتَّى أَنْفَذَهُ، فَقَالَ حَرَامٌ: فُزْتُ وَرَبِّ الْكَعْبَةِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) لأَصْحَابِهِ: « إِنَّ إِخْوَانَكُمْ قَدْ قُتِلُوا، وَإِنَّهُمْ قَالُوا: اللَّهُمَّ بَلِّغْ عَنَّا نَبِيَّنَا أَنَّا قَدْ لَقِينَاكَ فَرَضِينَا عَنْكَ وَرَضِيتَ عَنَّا ». {الحديث: ٤٨٩٤ = ٤٨٧٩ فـم. تجريد/١، رقم: ٥١٥ = ١٠٠١، ١٠٠٢، ١٠٠٣، ١٣٠٠، ٢٨٠١، ٢٨١٤، ٣٠٦٤، ٣١٧٠، ٤٠٨٨، ٤٠٨٩، ٤٠٩٠، ٤٠٩١، ٤٠٩٢، ٤٠٩٤، ٤٠٩٥، ٤٠٩٦، ٦٣٩٤، ٧٣٤١}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کۆمەڵێ خەڵك لەچەند هۆزێکی عەرەب، وەك ریعلو زەکوانو عوصەیە، هاتن بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزیان کرد: پیاو گەلێکمان لەگەڵدا بنێرە بۆ ناو هۆزەکانمان، هەتا ببن بە مامۆستامانو فێری قورئانو سوننەتمان بکەن، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) حەفتا پیاوی قورئان زانی، لە یاریدەدەران لەگەڵدا ناردن بۆلای هۆزەکانیان، کە ناوداربوون بە قورئان خوێنەکان، حەرامی کوڕی میلحان کە خاڵۆی من بوو، برای دایکم بوو یەکێ بوو لەوان، ئەم کۆمەڵەیە هەر خەریکی خوێندنو لەبەرکردنو دەورو فێربوونی قورئانی پیرۆز بوون لەمەدینە، بۆیە پێیان دەگوتن قورئان خوێنەکان،

بەتایبەتی لەشەودا سەرگەرمی ئەم کارە پیرۆزە بوون، بەرۆژیش ئاویان دەکێشاو دەیانهێنا لە مزگەوت دایان دەناو دەیانکرد بەخێراو بۆ خواردنەوەو دەسنوێژو پێویستی تر، وە لەو دەشتە بەرۆژ داریان دەبڕیو بەکۆڵ دەیانهێنا لەبازاڕ دەیانفرۆشتو خۆراکیان پێ دەکڕی بۆ میوانەکانی میوانخانەی صوففەو بۆ هەژارانی تر. جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) حەرامی خاڵۆمی بەحەفتا سوارەوە، بۆ ئەم مەبەستە، نارد بۆ ناویان، کەچی نامەردانە، پێش ئەوەی کە بگەنە جێگەی مەبەست پەلاماریان دەدەنو دەیانکوژن، ئەوانیش دەفەرموون: ئەی خودایە! لەباتی ئێمە بە پێغەمبەری ئێمە کە موحەممەدە، رابگەیەنە: کە ئێمە شەهیدبووینو گەیشتووین بەدیداری تۆ، ئێمە لەتۆ رازینو تۆیش لەئێمە رازیت).

فەرمووی: ئاوا دەست دەکەن بەکوشتنیان: حەرامی کوڕی میلحان، دەست دەکا بەفەرمایشت فەرموون بۆیان هەتا پەیامی پێغەمبەریان پێ رابگەیەنێ، ئەوانیش بەدزییەوە ووشت لەپیاوێ لەخۆیان دەکەن، کابراکە لەپشتەوە بۆی دەچێو رمێکی لێ دەداو لەسنگیەوە دەردەچێو دەیکوژێ، حەرام لەخۆشیانا دەفەرموێ: بەخاوەنی کەعبە، کە خودای گەورەیە، واشادبووم بەشەهیدبوونو گەیشتم بەئاواتی خۆم، کە رەزابوونی خودایە بەهۆی شەهیدبوونمەوە!)

جا پاش روودانی ئەم کارەساتە دڵتەزێنە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەهاوەڵانی خۆی فەرموو: (برادەرانی ئێوە هەموو کوژراون، وە بەبۆنەی شادبوونیان بە پایەی شەهیدیی فەرموویانە: ئەی خودایە! بە پێغەمبەری ئێمە رابگەیەنە، کە ئێمە شەهید بووینو شادبووین بەدیداری تۆ، وە ئێمە لەتۆ رازینو توویش لەئێمە رازیت!). {تاج/٤، زنجیرە: ١٠٢، ژمارە: ٤٦٤٥، ٤٦٤٤} + {ریاض/٣، زنجیرە: ٢٣٤، ژمارە: ١٣١٦/٣٢/٣٧٠}.




## (٤٢) باب مَنْ قَاتَلَ لِتَكُونَ كَلِمَةُ اللهِ هِيَ العُليا فَهُوَ في سَبيل الله
## کەسێ جەنگ بکا لە پێناوی سەرخستنی یاسانامەی خودادا ئەوە لەبەر خاتری خودایە

١٢٤٣- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ الرَّجُلُ: يُقَاتِلُ لِلْمَغْنَمِ وَالرَّجُلُ يُقَاتِلُ لِلذِّكْرِ وَالرَّجُلُ يُقَاتِلُ لِيُرَى مَكَانُهُ فَمَنْ فِي سَبِيلِ اللّٰهِ؟ قَالَ: (مَنْ قَاتَلَ لِتَكُونَ كَلِمَةُ اللّٰهِ هِيَ الْعُلْيَا فَهُوَ فِي سَبِيلِ اللّٰهِ) (الحديث ٢٨١٠، أطرافُهُ سبقت في رقم: (١٠٢ت=١٢٣ف). [١٢٤٣]

ئەبو مووسا (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ هاتە خزمەتی حەزرەت(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: پیاوی وا هەیە بۆ تالان و دەستکەوت شەڕ دەکا، پیاوی واهەیە بۆ ناوو شۆرەت شەڕ دەکا، پیاوی واهەیە تا شوێنی دیار بێ و بڵێن ئازایە، لەبەر ئەوە شەڕ دەکا، ئەمانە کامەیان لەبەر رەزای خودایە؟ فەرمووی: (هەرکەسێ شەڕ بکا هەتا شەریعەتی خودا سەربکەوێ ئەوە لەبەر رەزای خودایە) (تاج/٨/ل-٧٢-ش/د/ت/ن ز-١٧).

١٢٤٤- عَنْ أَبِي مُوسَى قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ يَا رَسُولَ اللّٰهِ ، مَا الْقِتَالُ فِي سَبِيلِ اللّٰهِ فَإِنَّ أَحَدَنَا يُقَاتِلُ غَضَبًا ، وَيُقَاتِلُ حَمِيَّةً . فَرَفَعَ إِلَيْهِ رَأْسَهُ – قَالَ وَمَا رَفَعَ إِلَيْهِ رَأْسَهُ إِلاَّ أَنَّهُ كَانَ قَائِمًا – فَقَالَ: «مَنْ قَاتَلَ لِتَكُونَ كَلِمَةُ اللّٰهِ هِيَ الْعُلْيَا فَهُوَ فِي سَبِيلِ اللّٰهِ عَزَّ وَجَلَّ». [١٢٤٤]

ئەبو مووسای ئەشعەری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دانیشتبوو، پیاوێ هات بۆ لای، بەپێوە راوەستاو

---

[١٢٤٣] تجرید/٣، ژمارە: ١١٦٠ = ٢٨١٠ بخاری. پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١٠٨٨ - ٤٨٩٦ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٥٦ رقم الباب/١٥).

[١٢٤٤] لە ژمارە (١٢٤٣) تەخریج کرا (بخاری رقم الكتاب/٣١ رقم الباب/٤٥).




ئەم پرسیارەی لێ کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! جەنگین و خەباتگێران، کامەی لەپێناوی خودادایە؟ چونکە ئێمە هەمانە تووڕە بووە، رقی هەڵساوە، بۆیە شەڕدەکا، وە هەمانە تەنگە دەیگرێ و لەسەر هۆزەکەی خۆی دەکاتەوە. پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) سەری هەڵبڕی و تەماشای کردو فەرمووی: (هەرکەسێ بجەنگێ و شەڕبکا، بۆئەوەی یاسانامەی خودا سەرکەوێ و فەرمایشتی خودا لەسەرەوە بێ، ئەوە لەپێناوی خودادایە).

## (٤٥) باب قوله (ﷺ) إنما الأعمال بالنية

## فەرمایشتی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) (هەموو کردەوەیێ بە پێی نیازەکەیەتی)

١٢٤٥- عَن عُمَرَ بْنَ الْخَطابِ رَضيَ اللّٰهُ عَنْهُ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَقُولُ: (إِنَّمَا الْأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ وَإِنَّمَا لِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى فَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إِلَى دُنْيَا يُصِيبُهَا أَوْ إِلَى امْرَأَةٍ يَنْكِحُهَا فَهِجْرَتُهُ إِلَى مَا هَاجَرَ إِلَيْهِ). (الحديث رقم: ١ في فتح الباري): [١٢٤٥]

فەرمانڕەوای موسوڵمانان، ئەمیرلوئمینین عومەری کوڕی خەططاب (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ بەگوێ ی خۆم لەزاری پیرۆزی حەزرەتی پێغەمبەرم بیست (دروودو صەلاتو سەلامی خوای گەورەی لەسەر بێ) دەیفەرموو: (هەموو کارو کردەوەیی بەپێی نیازو نییەتەکەیەتی و هیچ کارێ بەبێ نیازو خواستی دڵ دانامەزرێ، وەهەموو کەسێکیش بەپاداشی نیازو نییەتی خۆی دەگا،چ چاك چ خراپ،کەوابوو هەرکەسێ مەبەستی لەکۆچ کردن و هیجرەتەکەی لەمەککەوە بۆ مەدینە رەزای خوداو پێغەمبەر بێ ئەوا کۆچ کردنەکەی قەبووڵەو بەپاداشی

[١٢٤٥] تجرید/١، ژمارە: ١ = ١ بخاری. مسلم: ١٩٠٧ - ٤٩٠٤ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٨٣ رقم الباب/٢٣).

گـەورە دەگـا، وەهـەر کەسـێکیش کۆچـکردنەکەی لەبـەر کـارێکی دنیـایی بـێ کەدەستی بکەوێ، یاخۆ لەبەر ئافرەتێ بێ کەمارەی بکا، ئـەوە کـۆچ کردنـەکەی بەپێی نیازەکەیەتیو هیچ خێری ناگا لەسەری).

**شیکردنەوە:**

کردەوەی جەستەیی (عەمەلی بەدەنی) فەرزبێ یان سونەت بەبێ نێـتو نیـاز لێهێنـان دانامـەزرێ، بـەلام ئەمـە بـەزۆری وایـە دەنـا هەنـدێ کـردەوە بـەبێ نێتلێهێنانیش دادەمەزرێ، وەك قورئانخوێندنو ذیکرو یادی خودا کـردنو بـانگ دان، بـەبێ نیازهێنـانیش دادەمـەزرێن وە وازهێنـان لەحـەرامیش بـەبێ نێـت دادەمـەزرێ، هـۆی روودان (ورود) ی ئـەم فەرموودەیـە سەرگورشـتەکەی ئوموقەیسە کەپیاوێ بەناوی کۆچ کردنـەوە شوێنی کـەوتبوو بـۆ مەدینـە،جا خـودا کۆچـەکەی دایـەوە بەسـەریدا چـوونکە نیازەکـەی پـاك نـەبوو. ئـەم فەرموودەیە یەکێکە لەو فەرموودانـەی کـەدەبن بەسـووڕگەو مـەدار بـۆ ئیـسلام. ئەم فەرموودەیە موسلیمو ئەبوداودو تیرمیذیو نەسـائیش (ڕەزای خودایـان لـێ بێ) گێڕاویانەتەوە. نێتو نیاز خواستی دڵن، گوتنیان بەدەم سوونەتە: (تاج-ل-٦٥) موسلیم (ڕەزای خوای لێ بێ) لەنامەی فەرمانڕەواییدا گێڕاوییەتـەوە باسـی (انما الأعمال بالنیة) ژمارە: ١٩٠٧ = ٤٩٠٤شیحا (رقم الحدیث في فتح البـاری بـشرح صحیح البخاري ١- أطرافه في: ٥٤، ٢٥٢٩، ٣٨٩٨، ٥٠٧٠، ٦٦٨٩، ٦٩٥٣).

## (٤٩) باب فضل الغزو في البحر
## خێرو بەهرەی خەبات لە دەریادا

١٢٤٦- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) كَانَ يَدْخُلُ عَلَى أُمِّ حَرَامٍ بِنْتِ مِلْحَانَ فَتُطْعِمُهُ، وَكَانَتْ أُمُّ حَرَامٍ تَحْتَ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ، فَدَخَلَ عَلَيْهَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَوْمًا فَأَطْعَمَتْهُ، ثُمَّ جَلَسَتْ تَفْلِي رَأْسَهُ، فَنَامَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، ثُمَّ اسْتَيْقَظَ وَهُوَ يَضْحَكُ، قَالَتْ: فَقُلْتُ: مَا يُضْحِكُكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ! قَالَ: « نَاسٌ مِنْ أُمَّتِي عُرِضُوا عَلَيَّ غُزَاةً فِي سَبِيلِ اللَّهِ، يَرْكَبُونَ ثَبَجَ هَذَا الْبَحْرِ مُلُوكًا عَلَى الأَسِرَّةِ أَوْ مِثْلَ الْمُلُوكِ عَلَى الأَسِرَّةِ (يَشُكُّ أَيَّهُمَا قَالَ) قَالَتْ: فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ ادْعُ اللَّهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ، فَدَعَا لَهَا، ثُمَّ وَضَعَ رَأْسَهُ، فَنَامَ، ثُمَّ اسْتَيْقَظَ وَهُوَ يَضْحَكُ، قَالَتْ: فَقُلْتُ: مَا يُضْحِكُكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: « نَاسٌ مِنْ أُمَّتِي عُرِضُوا عَلَيَّ غُزَاةً فِي سَبِيلِ اللَّهِ». (كَمَا قَالَ فِي الأُولَى) قَالَتْ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ادْعُ اللَّهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ، قَالَ: « أَنْتِ مِنَ الأَوَّلِينَ »، فَرَكِبَتْ أُمُّ حَرَامٍ بِنْتُ مِلْحَانَ الْبَحْرَ فِي زَمَنِ مُعَاوِيَةَ، فَصُرِعَتْ عَنْ دَابَّتِهَا حِينَ خَرَجَتْ مِنَ الْبَحْرِ فَهَلَكَتْ. {الحديث: ٤٩١١ = ٤٨٩٦ فم. تجريد/٥، رقم: ٢٠٨٦ = ٧٠٠٢، ٢٧٨٨، ٢٧٨٩، ٦٢٨٢، ٦٢٨٣. أبو داود. جهاد: ٢٤٩١. ترمذي. جهاد: ٢٤٩١. نسائي. جهاد: ١٦٤٥} : [١٢٤٦]

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: (گەلێ جار پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەچوو بۆ دێنی ئوم حەرام، کە پووری هەقی من بوو، خوشکی دایکم بوو، وە پووری شیریی پێغەمبەریش بوو، مەحرەمی بوو، نامەحرەم نەبوو، ئوم حەرام ناوی ڕومەیصای کچی میلحان بوو، خێزانی

---

[١٢٤٦] تجرید/٥، ژمارە: ٢٠٨٦ = ٧٠٠٢ بخاری. پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١٠٧٤ = ٤٩١١ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٥٦ رقم الباب/٣).

عوبادەی کوڕی صامیت بوو، ڕۆژێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) هات بۆسەردانی ئوم حەرام، نانی بۆدانا، دوایی هەنێ سەری پێغەمبەری دۆزی، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) خەوی لێ دەکەوێ و سەرخەوی نیوەڕۆ لەوێ دەشکێنێ، کاتێ خەبەری دەبێتەوە پێ دەکەنێ، ئوم حەرام فەرمووی: عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! باوك و دایکم بەقوربانت بن، ئەوە بۆچی پێ دەکەنی؟ فەرمووی: (لەخەوما کۆمەڵێ لەگەڵ ئیسلامی خۆمم بینی، دەبن بەخەباتکارو غەزاکار لەڕێگەی خودادا، سواری پشتی ئەم دەریایانە دەبن، شوێن و جێگەیان لەناو پاپۆڕو کەشتییەکاندا، ئەوەندە باش و خۆش و فەرەح و کەشخەیە، دەڵێی پاشان لەسەر تەخت و قەنەفەی شاهانە دانیشتوون). ئوم حەرام فەرمووی: عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! داوا لەخودا بکە کەمن یەکێ لەم چینەی ئۆمەتت بم.

فەرمووی: (تۆ لەوانیت و لەچینی غەزاکاران و شەهیدانی ناو دەریایت). ئەنجا دیسان پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) سەری نایەوەو جارێ تر خەوتەوە، کە هەڵسایەوە دیسان پێدەکەنی، کاتێ لەم بارەیەوە پرسیارم لێی کردەوە، هەمان وەڵامی پێشووی دامەوە، کە کۆمەڵانێ تریش لە ئۆمەتی پێغەمبەر، لەبارو دۆخێکی شاهانەدا دەچن بۆ خەباتگێڕان و غەزاکردن، لەڕێگەی خودای گەورەداو، ئەویش لەخۆشی ئەوە پێدەکەنێ و موعجیبە پێیان). ئوم حەرام فەرمووی: منیش عەرزیم کردەوە: ئەی پێغەمبەری خودا! نزام بۆبکە کەخودا بمکات بەیەکێ لەو کۆمەڵانە. فەرمووی: (تۆ لەکۆمەڵە پێشینەکانی!).

لەپاشا لەکاتی سەرکاریی موعاوییەی کوڕی ئەبو سوفیاندا، کە نوێنەری ئیمامی عوسمان بوو لەسەر وڵاتی شام، عوبادەی مێردی، لەدەریاوە ئوم حەرامی لەگەڵ خۆی برد بۆ غەزای قوبروس، کاتێ هاتەوەو گەڕایەوەو گەیشتە وشکانی،

هێستره ماچەیەکیان بۆیبرد، کاتێ ئوم حەرام سواری هێسترەکە بوو، گلاندیو کەوتە خوارەوە مرد. بەپێی دووعاکەی پێغەمبەر، کەبۆیی کرد شەهید بوو). {تاج/٤، زنجیرە: ١١، ژمارە: ٤٣١٣، چ/٤}.

## (٥١) باب بيان الشُهَدَاءِ
## ڕوونکردنەوەی چەند دەستەیێ لە شەهید

١٢٤٧- عَنْ أَبِی هُرَیْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « بَيْنَمَا رَجُلٌ يَمْشِي بِطَرِيقٍ وَجَدَ غُصْنَ شَوْكٍ عَلَى الطَّرِيقِ فَأَخَّرَهُ، فَشَكَرَ اللَّهُ لَهُ، فَغَفَرَ لَهُ»، وَقَالَ: « الشُّهَدَاءُ خَمْسَةٌ: الْمَطْعُونُ، وَالْمَبْطُونُ، وَالْغَرِقُ وَصَاحِبُ الْهَدْمِ، وَالشَّهِيدُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ ». {الحديث: ٤٩١٧ = ٤٩٠٢ فم. تجريد/١، رقم: ٣٧١ = ٦٥٢، ٢٤٧٢، ٦٥٣، ٧٢٠، ٢٨٢٩، ٥٧٣٣. ترمذي. صلاة: ٢٢٥. نسائي. مَوَاقيت: ٥٣٩} : [١٢٤٧]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (جارێ پیاوێ بەڕێگەیەکا دەڕۆیشت، لقێ دڕکی بینی لەسەر ڕێگەکە کەوتبوو، هەڵی گرتو دووری خستەوە، لەڕێگەکە، هەتا نەبێ بەئازار بۆ ڕێبوار، خودا لەسەرئەوە سوپاسی کردو چاکەی دایەوەو لێی خۆش بوو).

لەپاشتر خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەم پێنج کەسە، شەهیدنو لەکاتی گیان دەرچووندا فریشتەی ڕەحمەت دێنە دیاریان:

**یەکەم:** کەسێ بە پەتا (تاعوون) بمرێ.

---

[١٢٤٧] تجرید/١، ژمارە: ٣٧١ = ٦٥٢ بخاری. پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ١٠٨٢ = ٤٩١٧ شیحا (بخاری رقم الكتاب/١٠ رقم الباب/٣٢).

**دووەم:** کەسێ بەدەردی ناوسك بمرێ.

**سێیەم:** کەسێ لەئاوا بخنکێ.

**چوارەم:** کەسێ شت بڕوخێ بەسەریا، یا ببێ بەژێرشتەوە.

**پێنجەم:** کەسێ لەرێگەی خودادا شەهید ببێو بکوژرێ.

**روونکردنەوە:**

ژمارەی شەهید، بەپێی کۆمەڵێ بیستراو (ئەثەر)و گێڕانەوەکان دەگاتە چل جۆر، وەك بەندە لەپارچەیێ شیعردا، لەبەرگی سێیەمی ریاضی صالحیندا، لەزنجیرە: ٢٣٥دا، ئەمەم روونکردۆتەوە، تکایە بڕوانە ژمارەکانی زنجیرەی: ٢٣٥ لە ریاض صالحیندا، بەتایبەتی ئەم ژمارانە: ١٣٥٣، ١٣٥٤، ١٣٥٥، ١٣٥٦.

١٢٤٨- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رضى الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « الطَّاعُونُ شَهَادَةٌ لِكُلِّ مُسْلِمٍ »: [١٢٤٨]

بڕوانە ژمارە (١٢٤٧) کەوا لەپێش ئەم ژمارەیەوە:

## (٥٣) بابُ قَوْلِهِ (ﷺ) لا تَزالُ طائِفَةٌ أُمَّتِي ظاهِرِينَ عَلَى الحَقِ لا يَضُرُّهُمْ مَنْ خالَفَهُمْ

## فەرموودەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) {لا تَزالُ مِنْ طائِفَةٌ أُمَّتِي ظاهِرِينَ عَلَى الحَقِ لا يَضُرُّهُمْ مَنْ خالَفَهُمْ}

١٢٤٩- حديث الْمُغِيرَةَ بْنَ شُعْبَةَ عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « لا يَزَالُ نَاسٌ مِنْ أُمَّتِي ظَاهِرِينَ حَتَّى يَأْتِيَهُمْ أَمْرُ اللَّهِ وَهُمْ ظَاهِرُونَ »: [١٢٤٩]

---

[١٢٤٨] بڕوانە ژمارە: (١٢٤٧) (بخاری رقم الكتاب/٥٦ رقم الباب/٣٠).




ئەم فەموودەیە لەژمارە (١٠٩٥)ی پوختـەی موسلیمدا، لـە ثـەوبانەوەیـەو ئاوایە:

عَنْ ثَوْبَانَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّـهِ (صـلى الله عليـه وسـلم): « لاَ تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي ظَاهِرِينَ عَلَى الْحَقِّ، لاَ يَضُرُّهُمْ مَنْ خَذَلَهُمْ حَتَّى يَأْتِيَ أَمْرُ اللَّـهِ وَهُمْ كَذَلِكَ ». {الحديث: ٤٩٢٧ = ٤٩١٢ فم}:

ثەوبان (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خـودای لەسـەر بێ) دەفەرموێ: (کۆمەڵێك، لەم گەلی منە، بە سەربەرزی بەردەوام دەبـن لەسـەر ئەم ئایینی پیرۆزی ئیسلامە، هەڵگری ئاڵای هەق دەبن، چین لەپاش چین، هـەتا نزیکی هاتنی قیامەت، ئەوەی لەدژیان بێ زیانیان پێ ناگەیەنێ!)

ئەم فەرموودەیە لە تەجریدی بوخاریدا ئاوایە:

موعاوییـەی کـوڕی ئـەبو سـوفیان (رەزای خودایـان لێ بـێ) دەفـەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفـەرموێ: (هەرکەسێ کەخودا بیـەوێ تووشی خێرو خۆشی بکا، شارەزای ئایینی دەکا، من تەنیا ئەوەندەم بەدەستە کە ئەم فەرمایشتو شەریعەتە دابەش بکـەمو بـەس، بـەڵام بەشـی گـەورە یابـچووك ئـەوە بەدەسـت خـودا خۆیـەتیو خـودا خـۆی ئـەو بڕیـارە دەدا، وە ئـەم گـەلی ئیسلامەیش هەر بەردەوام دەبن بەسەر بەرزی لەسەر ئەم ئایینی خودایە، هـەتا نـزیکی رۆژی قیامـەت، ئەوەی لەدژیان بـێ زیانیـان پـێ ناگەیـەنێ!). {تەجریـدی بوخاری بەرگی یەکەم، ژمارە: ٦٣ = ٧١، ٣١١٦، ٣٦٤١، ٧٣١٢، ٧٤٦٠ + تاج/١، زنجیرە: ١٤، ژمارە: ٩٨ + تـاج/٥، زنجـیرە: ١٠٩، ژمـارە: ٥٦٠٢ + تـاج/٤، زنجـیرە: ١٩، ژمـارە: ٤٣٥٩، ج/٤}.

---

[١٢٤٩] تجرید/١، ژمارە: ٦٣ = ٧١ بخاری. پوختەی موسلیم/٣، ژمـارە: ١٠٩٥ = ٤٩٢٧ شـیحا (بخـاری رقم الکتاب/٦١ رقم الباب/٢٨).

١٢٥٠- حديث مُعَاوِيَةَ يَقُولُ سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ: « لاَ يَـزَالُ مِنْ أُمَّتِي أُمَّةٌ قَائِمَةٌ بِأَمْرِ اللَّهِ ، لاَ يَضُرُّهُمْ مَنْ خَذَلَهُمْ وَلاَ مَنْ خَالَفَهُمْ حَتَّى يَـأْتِيَهُمْ أَمْـرُ اللَّهِ وَهُمْ عَلَى ذَلِكَ »: [١٢٥٠]

بڕوانه ژماره (١٢٤٩).

## (٥٥) بابُ السَّفرِ قِطعةٌ مِنَ العَذَابِ واستحبابُ التعجيل للمُسافرِ إلى أهلِه بَعْدَ قَضاءِ شُغلِه

## سەفەر پارچەیەكە لە ئێش و ئازار، وا باشە كاتێ ڕێبوار ئیشەكەی تەواو بوو بگەڕێتەوە بۆ ماڵی خۆی بۆ ناو كەسوكاری

١٢٥١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليـه وسـلم) قَالَ: « السَّفَرُ قِطْعَةٌ مِـنَ الْعَـذَابِ، يَمْنَـعُ أَحَـدَكُمْ نَوْمَـهُ وَطَعَامَـهُ وَشَـرَابَهُ، فَـإِذَا قَـضَى أَحَدُكُمْ نَهْمَتَهُ مِنْ وَجْهِهِ فَلْيُعَجِّلْ إِلَى أَهْلِهِ ». قَالَ نَعَمْ. {الحديث: ٤٩٣٨ = ٤٩٢٣ فـم. تجريد البخاري/٢/٢٣٤، رقم: ٨٣٣ = ١٨٠٤، ٢٠٠١، ٥٤٢٩ فتح البـاري + ريـاض الصالحين/٢/٣٦، رقم: ٩٨٤/١}:

ئـەبو هـورەیرە (ڕەزای خـودای لێ بـێ) دەفـەرموێ: خۆشەویـست (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) دەفـەرموێ: (سـەفەر پارچـەیەكە لـەئێش و ئـازارو سـزاو مەینەت، خەوو خۆراك و خواردنەوەتان لێ هەراسان دەكا، جا لەبەرئـەوە هەركـە فرمانی خۆتان بەئەنجام گەیاندو مەبەستی سەفەرەكەتان هاتـەدی، ئـیتر خێـرا. بەبێ درەنگ بڕۆنەوە بۆلای كەسوكارتان). {تاج/٤، زنجیرە: ٢٤، ژمارە: ٤٣٨٧}.

---

[١٢٥٠] بڕوانە ژمارە: (١٢٤٩) (بخاری رقم الكتاب/٦١ رقم الباب/٢٨).

## (٥٦) باب كَرَاهَةِ الطُرُوقِ - وَهُوَ الدُخُولُ لَيلاً - لِمَنْ وَرَدَ مِنْ سَفَر
## ناباشه ڕێبوار كه دهگهڕێتهوه له ڕێبواریی به شهو له ناكاوا، له پڕ خۆی بكا به ماڵا

١٢٥٢- عَنْ أَنَسٍ (رضى الله عنه) قَالَ كَانَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) لاَ يَطْرُقُ أَهْلَهُ ، كَانَ لاَ يَدْخُلُ إِلاَّ غُدْوَةً أَوْ عَشِيَّةً: [١٢٥٢]

ئهنهس (ڕهزای خودای لێ بێ) فهرمووی: پێغهمبهر (دروودی خودای لهسهر بێ) كاتێ له ڕێبواری دهگهڕایهوه، بهشهو لهناكاوا، نهیدهدا بهسهر كهس و كاریدا، یا سهرلهبهیانیان دهڕۆیشتهوه بۆ ماڵهوه، یا سهر لهئێواران!).

ئهمهیش دهقێكی تری ئهم فهرموودهیه، له ژماره (١١١٨)ی پوختهی موسلیمدا، لهبهرگی سێدا:

عَنْ جَابِرِ بن عبدالله (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَنْ يَطْرُقَ الرَّجُلُ أَهْلَهُ لَيْلاً، يَتَخَوَّنُهُمْ أَوْ يَلْتَمِسُ عَثَرَاتِهِمْ. {الحديث: ٤٩٤٧ = ٤٩٣٢ فم. تجريد/٢، رقم: ٨٣١ = ١٨٠١. رياض الصَّالحين/٣، تسلسل/١٧٥، رقم: ٩٨٥}:

جابیری كوڕی عهبدوڵڵا (ڕهزای خودایان لێ بێ) فهرمووی: پێغهمبهر (دروودی خودای لهسهر بێ) ڕێگهی ئهوهی نهدهدا كهپیاو، لهشهوا، لهناكاوا خۆی بكا بهماڵا، مهبهستی ئهوهبێ كه ژنهكهی تاقی بكاتهوه ئایا ناپاكی دهكا یانا، یا لهههڵهو سهرسمی خێزانی خۆی بگهڕێ!!).

١٢٥٣- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رضي الله عنهما أَنَّ النبي صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: إذا دَخَلْتَ لَيْلًا فَلاَ تَدْخُلْ عَلَى أَهلِكَ، حَتَّى تَسْتَحِدَّ الْمُغِيبَةُ، وَتَمْتَشِطَ

---

[١٢٥٢] تجرید/٢، ژماره: ٨٣١ = ١٨٠١ بخاری. پوختهی موسلیم/٣، ژماره: ١١١٨ = ٤٩٤٧ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٢٦ رقم الباب/١٥).

الشَّعِثَةُ.(الحديث ٥٢٤٦، أطرافه في: ٤٤٣، ١٨٠١، ٢٠٩٧، ٢٣٠٩، ٢٣٨٥، ٢٣٩٤، ٢٤٠٦، ٢٤٧٠، ٢٦٠٣، ٢٦٠٤، ٢٧١٨، ٢٨٦١، ٢٩٦٧، ٣٠٨٧، ٣٠٨٩، ٣٠٩٠، ٤٠٥٢، ٥٠٧٩، ٥٠٨٠، ٥٢٤٣، ٥٢٤٤، ٥٢٤٥، ٥٢٤٦، ٥٢٤٧، ٥٢٦٧، ٦٣٨٧): [١٢٥٣]

جابیر کوڕی عەبدوڵلا -ڕەزای خودایان لێ بێ- فەرمووی: پێغەمەر -درودی خوای لەسەر- فەرمووی: (کاتێ لەسەفەرو شتی وا دەگەڕێنەوە، ئەگەر بەشەو دەگەیشتنەجێ، وابکەن کەلەپێشدا ئاگاداریان بکەنەوە، هەتا ژن سەری خۆی شانە بکاو، دەرمانی حەمام بەکاربێنێ بۆ لابردنی مووی زیادەی لەشی). ئەمە دەقی گێڕانەوەی ئەم فەرموودەیە لەتاجول ئوصولدا. (بڕ: تاج/٢ ل/١٨ ز/٤٧ ژ/٧ + ٥ + ٨ + ٦ ش/د/ت/ن = شەیخین: بوخاری و موسلیم و ئەبوداوود و تیرمیزی و نەسائی).

## ڕوونکردنەوە:

ئەم فەرموودەیە جۆرێکە لە ئەدەبی نهێنی نێوانی ژن و مێرد، نموونەیەکە بۆ ڕێنمایی ژن و مێرد، سەبارەت بەو کردارو ڕەفتارانەی کەدەبن بەهۆکاری پتەوبوونی نێوانیان.

---

[١٢٥٣] تجرید/٥، ژمارە: ١٧٨٥ - ٥٢٤٦ بخاری. مسلم: ٧١٥ - ٤٩٤١ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٦٧ رقم الباب/١٠).

## ٣٤- كِتَابُ الصَّيْدِ وَالذَّبَائِحِ
## نامەی ڕاوو شكارو سەربڕاوەكان

{بڕوانــە: تــاجول ئوصــول بــەكوردی/٣، زنجـیرە: ١، لاپــەڕە: ١٤٨ چــاپی چــوارەم، ژمــارە: ٢٥٤٩ هــەتا ژمــارە: ٢٦٣٥ + مختــصر صــحيح البخــاری المــسمّى ب(التجريد الصريـح)/٥، زنجيرە: ٧٥، لە ژمـارە: ١٨٢٦ هـەتا ژمـارە: ١٨٣٩ + مختـصر صحيح مسلم/٣، لەژمارە: ١٢٣٩ هەتا ژمـارە: ١٢٦١ + فيقهـی ئاسـان/٢، زنجـيرە: ٣٥٨ هەتا زنجيرە: ٣٧٥} + {شـەرحی بلـوغ المـرام/٣، لـەزنجيرە: ٨٥، لاپـەڕە: ٢٠٨ هـەتا زنجيرە: ٨٧، لە ژمارە: ١٣٥٧ هەتا ژمارە: ١٣٨٣}.

### (١) بابُ الصَّيدِ بالكلابِ المُعلَمَةِ
### باسی ڕاوكردن بە سەگی ڕاوی فێرە ڕاو

١٢٥٤- عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ (رضى الله عنه) قَالَ قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّا نُرْسِلُ الْكِلاَبَ الْمُعَلَّمَةَ . قَالَ « كُلْ مَا أَمْسَكْنَ عَلَيْكَ » . قُلْتُ وَإِنْ قَتَلْنَ قَالَ « وَإِنْ قَتَلْنَ » . قُلْتُ وَإِنَّا نَرْمِى بِالْمِعْرَاضِ . قَالَ « كُلْ مَا خَزَقَ ، وَمَا أَصَابَ بِعَرْضِهِ فَلاَ تَأْكُلْ»:(١٢٥٤)

عەدی كوڕی حاتەم (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: عـەرزی پێغەمبـەرم كرد: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! ئێمـە ڕاو دەكـەین، بەسـەگی فێـرە ڕاو، فـەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (گۆشتی ئەو نێچیرانە بخۆ، كە ئـەو سـەگانە ڕاوی دەكەن بۆت). گوتم: با سەگەكان نێچیرەكەش بكوژنو بەرلەوە سەری ببڕم گیانی

(١٢٥٤) بخاری. ژبائح وصيه: ٥٤٧٧ مسلم: ٤٩٤٩ شيحا (بخاری رقم الكتاب/٧٢ رقم الباب/٣).

دەرچێ هەر بیخۆم؟ فەرمووی: (بەڵێ، با بیشی کوژن) بۆ زانینی واتای تەواوی ئەم فەرموودەکە بڕوانە: ژمارە: (١٢٤١)ی پوختەی موسلیم کە دەفەرموێ:

عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنِ الْمِعْرَاضِ؟ فَقَالَ: «إِذَا أَصَابَ بِحَدِّهِ، فَكُلْ، وَإِذَا أَصَابَ بِعَرْضِهِ فَقَتَلَ فَإِنَّهُ وَقِيذٌ فَلاَ تَأْكُلْ». وَسَأَلْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، عَنِ الْكَلْبِ؟ فَقَالَ: «إِذَا أَرْسَلْتَ كَلْبَكَ وَذَكَرْتَ اسْمَ اللّٰهِ، فَكُلْ، فَإِنْ أَكَلَ مِنْهُ فَلاَ تَأْكُلْ، فَإِنَّهُ إِنَّمَا أَمْسَكَ عَلَى نَفْسِهِ». قُلْتُ: فَإِنْ وَجَدْتُ مَعَ كَلْبِي كَلْبًا آخَرَ، فَلاَ أَدْرِي أَيُّهُمَا أَخَذَهُ؟ قَالَ: «فَلاَ تَأْكُلْ، فَإِنَّمَا سَمَّيْتَ عَلَى كَلْبِكَ، وَلَمْ تُسَمِّ عَلَى غَيْرِهِ». {الحديث: ٤٩٥٤ = ٤٩٣٨ فم. تجريد/٥، زنجيره: ٧٥، رقم: ١٨٢٦ = ٥٤٧٥، ١٧٥، ٢٠٥٤، ٥٤٧٦، ٥٤٧٧، ٥٤٨٣، ٥٤٨٤، ٥٤٨٥، ٥٤٨٦، ٥٤٨٦، تجريد/٥، رقم: ١٨٣٠ = ٥٤٨٤، ٥٤٧٥ فتح الباري = رقم: ١٨٢٦ تجريد، ٥٤٨٧، ٧٣٩٧. ابن ماجة. صيد: ٤٢١٤. تحفة الأشراف: ٩٨٦٠}:

عەدی کوڕی حاتەم (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پرسیم لە پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) ئەی پێغەمبەری خودا! من ڕاودەکەم، جاری واهەیە تیرە کۆڵە، یا نەقیزە، کە بەعەرەبی پێی دەڵێن (میعراض) دەگرمە نەچیرو دەیپێکم، ئەم جۆرە ڕاوە حەڵاڵە یانا؟ فەرمووی: (ئەگەر تیرە کۆڵەت گرتە نەچیرو بە باری تیژییەکەیدا پێکای‌و تێی هەڵچەقی‌و زاماری کرد، ئەوە بیخۆ، چونکە حەڵاڵە، تەنانەت کاتێ دەگەیتە سەری مردبوو هەر حەڵاڵە، بەمەرجێ نەگەنی بێ، بەڵام ئەگەر لەسەر باری پانی ئەنگاوتی‌و کوشتی‌و فریای سەربڕینی نەکەوتی‌و بەوتیرە مردار بوویەوە، ئەوە مەیخۆ، چونکە ئەوە بەزەبر مردارەوە بووەو بەر ئەو مەوقووزەیە دەکەوێ کەخودا لە قورئاندا حەرامی کردووە، کە ناسراوە بە (مَوْقُوذَة).

وەلێشم پرسی لەبارەی نەچیری راوکراو بەسەگی فێرمڕاو، عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! من سەگی فێرە راوم هەیە کە دەیانکەمە نەچیر دەیگرن بۆ من، وە لەکاتی بەرەڵلاکردنیاندا کە دەیانکەمە نەچیرەکە ناوی خودا دەهێنم، ئەی ئەمە چۆنە؟ فەرمووی: (کاتێ سەگی فێرە راوی خۆتت بەرەڵلا کردە گیانی نەچیرو ناوی خودات لێ هێنا، ئیتر لە گۆشتی نەچیرەکە بخۆ، بەمەرجێ سەگەکە لێی نەخواردبێ، دەنا لێی مەخۆ چونکە لەکاتی وادا سەگەکە راوی بۆ خۆی کردووە نەوەك بۆ تۆ).

عەرزیم کرد: قوربان! ئەگەر وا رێکەوت، سەگێ تریش لەگەڵ سەگەکەی مندا، لەسەر نێچیرەکە بوو، وە نەم دەزانی کە کامیان گرتوویەتی، ئەی ئەوە چۆنە؟ فەرمووی: (لێی مەخۆ، چونکە تۆ ناوی خودات لە سەگەکەی خۆت هێناوە، وەناوی خودات لەسەگی تر نەهێناوە).

١٢٥٥- عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ قَالَ سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قُلْتُ إِنَّا قَوْمٌ نَصِيدُ بِهَذِهِ الْكِلاَبِ . فَقَالَ « إِذَا أَرْسَلْتَ كِلاَبَكَ الْمُعَلَّمَةَ وَذَكَرْتَ اسْمَ اللَّهِ ، فَكُلْ مِمَّا أَمْسَكْنَ عَلَيْكُمْ ، وَإِنْ قَتَلْنَ إِلاَّ أَنْ يَأْكُلَ الْكَلْبُ ، فَإِنِّى أَخَافُ أَنْ يَكُونَ إِنَّمَا أَمْسَكَهُ عَلَى نَفْسِهِ ، وَإِنْ خَالَطَهَا كِلاَبٌ مِنْ غَيْرِهَا فَلاَ تَأْكُلْ »: [١٢٥٥]

**له ژماره (١٣٥٨)ى بەرگى سێى شەرحى بلوغ المرام ئاوايە:**

وَعَنْ عَدِيِّ بنِ حَاتِمٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) { "إِذَا أَرْسَلَتَ كَلْبَكَ فَاذْكُرِ اسْمَ اَللَّهِ عليه، فَإِنْ أَمْسَكَ عَلَيْكَ فَأَدْرَكْتَهُ حَيًّا فَاذْبَحْهُ، وَإِنْ أَدْرَكْتَهُ قَدْ قُتِلَ وَلَمْ يُؤْكَلْ مِنْهُ فَكُلْهُ، وَإِنْ وَجَدْتَ مَعَ كَلْبِكَ كَلْبًا غَيْرَهُ وَقَدْ قُتِلَ فَلَا تَأْكُلْ: فَإِنَّكَ لَا تَدْرِي أَيُّهُمَا قَتَلَهُ، وَإِنْ رَمَيْتَ سَهْمَكَ فَاذْكُرِ اسْمَ اَللَّهِ، فَإِنْ غَابَ

---

[١٢٥٥] بڕوانە ژمارە: (١٣٥٨) (بخارى رقم الكتاب/٧٢ رقم الباب/٧).

عَنْكَ يَوْماً، فَلَمْ تَجِدْ فِيهِ إِلَّا أَثَرَ سَهْمِكَ، فَكُلْ إِنْ شِئْتَ، وَإِنْ وَجَدْتَهُ غَرِيقاً فِي اَلْمَـاءِ، فَلَا تَأْكُلْ" } مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، وَهَذَا لَفْظُ مُسْلِمٍ.

{تەجرید/٥، زنجیره: ٧٥، ژماره: ١٨٢٦ = ٥٤٧٥، ١٧٥، ٢٠٥٤، ٥٤٧٦، ٥٤٧٧، ٥٤٨٣، ٥٤٨٤، ٥٤٨٥، ٥٤٨٦، تەجرید/٥، ژمارە: ١٨٣٠ = ٥٤٨٤، ٥٤٧٥ بوخاری. مختصر صحيح مسلم/٣، ژماره: ١٢٤١ = شيحا ٤٩٥٤ = صحيح مسلم (محمد فؤاد): ١٩٢٩}:

**لە موختەصەری صەحیحی موسلیمدا ئاوایە:**

عەدی کوڕی حاتەم (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پرسیم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەی پێغەمبەری خودا! من ڕاو دەکەم، جاری وا هەیە تیرەکۆڵە، یا نەقیزە، کە بەعەرەبی پێی دەڵێن: (میعراض) دەگرمە نەچیرو دەیپێکم، ئەم جۆرە ڕاوە حەڵاڵە یان نا؟

فەرمووی: (ئەگەر تیرە کۆڵەت گرتە نەچیرو بەباری تیژییەکەیدا پێکای‌و تێی هەڵچەقی‌و زاماری کرد، ئەوە بیخۆ، چونکە حەڵاڵە، تەنانەت کاتێ دەگەیتە سەری مردبوو هەر حەڵاڵە، بەمەرجێ نەگەنی بێ، بەڵام ئەگەر لەسەر باری پانی ئەنگاوتی‌و کوشتی‌و فریای سەربڕینی نەکەوتی‌و بەو تیرە مردار بوویەوە، ئەوە مەیخۆ، چونکە ئەوە بەزەبر مردارەوە بووەو بەر ئەو مەوقووزەیە دەکەوێ کە خودا لە قورئاندا نادروستی کردووە، کەناسراوە بە (مَوْقُوذة). وەڵێشم پرسی لەبارەی نەچیری ڕاوکراو بەسەگی فێرەڕاو. عەرزیمکرد: ئەی پێغەمبەری خودا! من سەگی فێرەڕاوم هەیە کە دەیانکەمە نەچیر دەیگرن بۆمن، وە لەکاتی بەرەڵڵا کردنیاندا، کە دەیانکەمە نەچیرەکە ناوی خودا دەهێنم، ئەی ئەمە چۆنە؟ فەرمووی: (کاتێ سەگی فێرەڕاوی خۆتت بەرەڵڵاکردە گیانی نەچیرو ناوی خودات لێ هێنا، ئیتر لەگۆشتی ئەو نەچیرە

بخۆ، بەمەرجێ سەگەکە لێی نەخواردبێ، دەنا لێی مەخۆ چونکە لەکاتی وادا سەگەکە راوی بۆ خۆی کردووە نەوەك بۆ تۆ).

عەرزیمکرد: قوربان! ئەگەر وا رێکەوت، سەگێ تریش لەگەڵ سەگەکەی مندا، لەسەر نێچیرەکە بوو، وەنەم دەزانی کە کامیان لەپێشا گرتوویەتی، ئەی ئەوە چۆنە؟ فەرمووی: (لێی مەخۆ، چونکە تۆ ناوی خودات لە سەگەکەی خۆت هێناوە، وەناوی خودات لەسەگی تر نەهێناوە). {تاج/٣، زنجیرە: ٦، ژمارە: ٢٥٨٩}.

**روونکردنەوە:**

١- عەدی کوڕی حاتەمی تائی، کەناسراوە بەجوامێری‌و بەخشندەیی، وەك دەڵێن: فیسار ئەوەندە بەخشەرو چاکەکارە دەڵێی حاتەمی تائییە. لەساڵی نۆی کۆچیدا عەدی ئیسلام بووە، لەپێشا مەسیحی بووە، لەسەر ئایینی عیسای کوڕی مەریەم بوو، ئامادەی ئازادکردنی وڵاتی عێراق بوو، لەپاشا لەکووفە نیشتەجێ بوو، لەجەنگی صەفیندا لەگەڵ ئیمامی عەلی بوو، خۆی دەیفەرموو: (ئەوەتی موسوڵمان بووم، هەموو کاتێ کەبانگی داوە دەستنوێژم بووە!)

لەدوا ساڵی شەستی کۆچی مردووە، دەڵێن: تەمەنی دەیدا لەسەدو بیست ساڵ، هەندێ تر دەڵێن: سەدو هەشتا ساڵ ژیاوە، پیاوێکی زۆر سەخی بوو، هەمیشە بەشەوقەوە چاوەڕوانی هاتنی نوێژەکانی دەکرد، لەبوخاری‌و موسلیمدا فەرموودەی هەیە. (بڕوانە: تەجرید/٥، لاپەڕە: ١١٧، ژمارە: ١٨٢٦ = ٥٤٧٥ بخاری + مختصر صحیح مسلم/١، ژمارە: ٤١٢، لاپەڕە: ٤٨٤ چاپی یەکەم).

٢- ئەمەیش وەرگەڕاوی گێڕانەوەی کتێبەکەیە.

عەدی کوڕی حاتەم (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێم: (کاتێ سەگەکەت دەکەیتە نەچیر، ناوی

خودای لێ بهێنەو لەو کاتەدا کە بەرەڵلای دەکەیت بڵێ: (بسم الله: بەناوی خـودا) جا ئەگەر سەگەکە نەچیرەکەی گرتو بەزیندوویی فریـای کـەوتیت ئـەوا سـەری ببڕە، وە ئەگەر چوویتە سەر نەچیرەکەو روانیت کوژراوە، وەلێی نەخوراوە، ئەوا بیخۆ، بـەلام ئەگـەر کاتـێ دەچیتە سـەر نەچیرەکەو بینیـت سـەگی تـر لەگـەڵ سـەگەکەی تـۆدا لەسـەریەتی، لەهـەمان کاتـدا کوژراویـشەو گیـانی تیـادا نـەماوە، ئەوە لێی مەخۆ، چونکە تۆ نازانیت سەگەکەی تۆ کوشـتوویەتی، یـان سـەگەکەی تر کەهی تۆ نییە. وەکاتێ تیر دەهاوێژیت بۆ نەچیر، ناوی خودا بهێنـەو لـەکاتی تێگرتنەکـەدا بڵـێ: (باســم الله: بـەناوی خـودا) تەنانـەت ئەگـەر لـەپاش شـەوو ڕۆژێکـیش نێـچیرەکەت دۆزیـەوەو تـەنیا شـوێنی تیرەکـەی تـۆی پێـوە بـوو وە مردبوو ئەوا بیخۆ، ئەگەر گیانی تیا مابوو، ئەوا سەری ببڕەو بیخۆ، بەلام ئەگەر دینیت لەناو ئاوا بوو ئەوا مەیخۆ، مەبادا بەئاوەکە خنکابێ). {تاج/٣، زنجیرە: ٦، ژمارە: ٢٥٨٩}.

١٢٥٦- عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ (رضى الله عنه) قَالَ سَـأَلْتُ النَّبِـيَّ (صـلى الله عليـه وسلم) عَنِ الْمِعْرَاضِ فَقَالَ « إِذَا أَصَابَ بِحَدِّهِ فَكُلْ ، وَإِذَا أَصَابَ بِعَرْضِهِ فَلاَ تَأْكُـلْ ، فَإِنَّهُ وَقِيذٌ » . قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أُرْسِلُ كَلْبِى وَأُسَمِّى ، فَأَجِدُ مَعَهُ عَلَـى الـصَّيْدِ كَلْبًـا آخَرَ لَمْ أُسَمِّ عَلَيْهِ ، وَلاَ أَدْرِى أَيُّهُمَا أَخَذَ . قَالَ « لاَ تَأْكُلْ ، إِنَّمَا سَمَّيْتَ عَلَـى كَلْبِـكَ وَلَمْ تُسَمِّ عَلَى الآخَرِ »: [١٢٥٦]

بۆ واتای ئەم فەرموودەیە بڕوانە ژمارەی دوای خۆی.

١٢٥٧- عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ رَضِي اللَّه عَنْه قَالَ: سَـأَلْتُ النَّبِـيَّ صَـلَّى اللَّـه عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ عَنْ صَيْدِ الْمِعْرَاضِ قَالَ مَا أَصَابَ بِحَدِّهِ فَكُلْهُ وَمَـا أَصَـابَ بِعَرْضِـهِ فَهُـوَ وَقِيـذٌ وَسَأَلْتُهُ عَنْ صَيْدِ الْكَلْبِ فَقَالَ مَا أَمْـسَكَ عَلَيْـكَ فَكُـلْ فَـإِنَّ أَخْـذَ الْكَلْـبِ ذَكَـاةٌ وَإِنْ

---

[١٢٥٦] بڕوانە ژمارە: (١٢٥٧) (بخاری رقم الكتاب/٣٤ رقم الباب/٣).

وَجَدْتَ مَعَ كَلْبِكَ أَوْ كِلَابِكَ كَلْبًا غَيْرَهُ فَخَشِيتَ أَنْ يَكُونَ أَخَذَهُ مَعَهُ وَقَدْ قَتَلَهُ فَلَا تَأْكُلْ فَإِنَّمَا ذَكَرْتَ اسْمَ اللَّهِ عَلَى كَلْبِكَ وَلَمْ تَذْكُرْهُ عَلَى غَيْرِهِ.(الحديث ٥٤٧٥ أطرافه في: ١٧٥، ٢٠٥٤، ٥٤٧٥، ٥٤٧٦، ٥٤٧٧، ٥٤٨٣، ٥٤٨٤، ٥٤٨٥، ٥٤٨٦، ٥٤٨٧، ٧٣٩٧): [١٢٥٧]

عەدی کوڕی حاتەم (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پرسیم لە پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- ئەی پێغەمەری خودا! من ڕاودەکەم، جاری واهەیە تیرە کۆڵە، کەبەعەرەبی پێ‌ی دەڵێن (میعراض) دەگرمە نەچیرو دەیپێکم، ئەم جۆرە ڕاوە حەلاڵە یانا؟ فەرمووی: (ئەگەر تیرە کۆڵەت گرتە نەچیرو بەباری تیژییەکەیدا پێکای وتێ‌ی هەڵچەقی و زاماری کرد، ئەوە بیخۆ، چونکە حەلاڵە، تەنانەت کاتێ دەگەیتە سەری مردبوو هەر حەلاڵە، بەمەرجێ نەگەنی بێ، بەلام ئەگەر لەسەرباری پانی ئەنگاوتی، وە فریاری سەربڕینی نەکەوتی و بەوتیرە مردار بوویەوە، ئەوە مەیخۆ، چونکە ئەوە بەزەبر مردارەوەبووە و بەرئەو مەوقووزەیە دەکەوێ، کەخودا لەقورئانا حەرامی کردووە، کەناسراوە بە (مَوقوذة). وە لێشم پرسی لەبارەی نەچیری ڕاوکراو بەسەگی فێرە ڕاو، عەرزم کرد: ئەی پێغەمەری خودا! من سەگی فێرە ڕاوم هەیە کەدەیانکەمە نەچیر دەیگرن بۆمن، وە لەکاتی بەرەڵلاکردنیانا کە دەیانکەمە نەچیرەکە ناوی خودا دەهێنم، ئەی ئەمە چۆنە؟ فەرمووی: (کاتێ سەگی فێرە ڕاوی خۆتت بەرەڵلاکردە گیانی نەچیرو ناوی خودات لێ هێنا، ئیتر لەگۆشتی نەچیرەکە بخۆ، ئەگەر بیشی کوژێ هەر لێی بخۆ، بەمەرجێ سەگی تری لەگەڵ نەبێ، کە کەسێ ڕەوانەی نەکردبێ‌و لەکاتی ڕاوەکەدا بسم الله نەکرابێ، چونکە گرتنی سەگەکە، کە نەچیرەکە دەگرێ ئەوە دادەنرێ بەسەربڕین، جائەگەر لەگەڵ سەگەکەی

---

[١٢٥٧] تجريد/٥، ژمارە: ١٨٢٦ - ٥٤٧٥ بخاری. مسلم: ٤٩٤٩ (بخاری رقم الكتاب/٧٢ رقم الباب/١).

خۆتا، یا لەگەڵ سەگەکانی خۆتا روانیت سەگی تریش هەبوو، وە مەترسی ئەومت هەبوو کە ئەویش بەشداری کردووە لە کوشتنی نەچیرەکەدا، وە کەسێ لەکاتی بەرەڵلاکردنیدا بۆ گیانی نەچیرەکە کەسێ ناوی خودای نەهێناوە، ئەوە مەیخۆن چونکە تۆ بەس ناوی خودات لەسەر ڕەوانەکردنی سەگەکانی خۆت هێناوە). (تاج/٤ ز-٦ ل-٢٢ ژ- ٤+١+٣+٥+٦+٧+٨+١٠ + ز-٧ ل-٢٥ هەتا ز-١١ ل-٣١) + (فیقهی ئاسان/٣ ل-٩٠٢ ز-٣٥٩ + ز-٣٥٧ + ز-٣٥٨).

١٢٥٨- عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ (رضى الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « إِذَا أَرْسَلْتَ كَلْبَكَ وَسَمَّيْتَ فَأَمْسَكَ وَقَتَلَ ، فَكُلْ ، وَإِنْ أَكَلَ فَلاَ تَأْكُلْ ، فَإِنَّمَا أَمْسَكَ عَلَى نَفْسِهِ ، وَإِذَا خَالَطَ كِلاَبًا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهَا فَأَمْسَكْنَ وَقَتَلْنَ فَلاَ تَأْكُلْ ، فَإِنَّكَ لاَ تَدْرِى أَيُّهَا قَتَلَ ، وَإِنْ رَمَيْتَ الصَّيْدَ فَوَجَدْتَهُ بَعْدَ يَوْمٍ أَوْ يَوْمَيْنِ ، لَيْس بِهِ إِلاَّ أَثَرُ سَهْمِكَ ، فَكُلْ ، وَإِنْ وَقَعَ فِي الْمَاءِ فَلاَ تَأْكُلْ »: [(١٢٥٨)]

**لە پوختەی موسلیما، لەژمارە (١٢٣٩)دا، ئاوایە:**

عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ لِى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِذَا أَرْسَلْتَ كَلْبَكَ فَاذْكُرِ اسْمَ اللَّهِ، فَإِنْ أَمْسَكَ عَلَيْكَ فَأَدْرَكْتَهُ حَيًّا فَاذْبَحْهُ. وَإِنْ أَدْرَكْتَهُ قَدْ قَتَلَ وَلَمْ يَأْكُلْ مِنْهُ، فَكُلْهُ، وَإِنْ وَجَدْتَ مَعَ كَلْبِكَ كَلْبًا غَيْرَهُ، وَقَدْ قَتَلَ. فَلاَ تَأْكُلْ، فَإِنَّكَ لاَ تَدْرِي أَيُّهُمَا قَتَلَهُ، وَإِنْ رَمَيْتَ سَهْمَكَ فَاذْكُرِ اسْمَ اللَّهِ، فَإِنْ غَابَ عَنْكَ يَوْمًا فَلَمْ تَجِدْ فِيهِ إِلاَّ أَثَرَ سَهْمِكَ، فَكُلْ إِنْ شِئْتَ، وَإِنْ وَجَدْتَهُ غَرِيقًا فِى الْمَاءِ فَلا تَأْكُلْ». {الحديث: ٤٩٥٨ = ٤٩٤٢ فم. تجريد/٥، لاپەڕە: ١١٦، زنجیرە: ٧٥، ژمارە: ١٨٢٦ = ٥٤٧٥، ١٧٥، ٢٠٥٤، ٥٤٧٥، ٥٤٧٦، ٥٤٧٧، ٥٤٨٣، ٥٤٨٤، ٥٤٨٥. ٥٤٨٦، ٥٤٨٧، ٧٣٩٧. فتح البارى} :

---

(١٢٥٨) تجريد/٥، ژمارە: ١٨٢٦ = ٥٤٧٥ بخارى. پوختەی موسلیم: ١٢٣٩ - ٤٩٥٨ شيحا.

عەدی کوڕی حاتەم (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێم: (کاتێ سەگی فێرە راوی خۆتت بەرەڵا کردە گیانی نەچیر ناوی خودا بهێنە، جا ئەگەر نەچیرەکەی گرت بۆتو بەزیندوویی پیاگەیشتیت، ئەوا سەری ببڕە، ئەگەر فریاشی نەکەوتیو بەرلەوە تۆ گەیشتیتە سەری، ئەو کوشتی، بەڵام لێی نەخواردبوو، ئەوا لەم کاتەیشدا ئەو نەچیرە کوژراوە حەڵاڵەو بیخۆ، بەڵام ئەگەر روانیت وا لەگەڵ سەگەکەی تۆدا، سەگێکی تریش هەیە لەسەر نەچیرەکە، وە نەچیرەکە کوژراوە، ئەوا لێی مەخۆ، چونکە تۆ نازانی سەگەکەی تۆ کوشتوویەتی کەناوی خودات لێ هێناوە، یا سەگەکەی تر کوشتوویەتی، کە نازانی خاوەنەکەی لەکاتی بەرەڵا کردنیدا بۆ گیانی نێچیرەکە، ناوی خودای هێناوە یانا، کاتێکیش تیر دەگریتە نەچیرێ، ناوی خودا بهێنەو بیسمیللا بکە، ئەگەر نەچیرە زامارەکە رۆژێ نەدۆزرایەوەو بەو زامارییەشەوە خۆی شاردەوەو دوایی دۆزیتەوەو روانیت بەس شوێنەواری تیرەکەی تۆی واپێوە، ئەوا ئەگەر حەزدەکەیت حەڵاڵەو بیخۆ، بەڵام ئەگەر نەچیرە پێکراوەکە کە دۆزیتەوە لەناوا خنکابوو، ئەوا مەیخۆ، چونکە نازانی کە تیرەکەی تۆ کوشتوویەتی، یا ئاوەکە خنکاندوویەتی). {تاج/٣، لاپەڕە: ١٦٧، زنجیرە: ٦، ژمارە: ٢٥٨٩، چ/٤ = چاپی چوارەم}.

١٢٥٩- عَنْ أَبِي ثَعْلَبَةَ الْخُشَنِيِّ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ قَالَ قُلْتُ يَا نَبِيَّ اللّٰهِ إِنَّا بِأَرْضِ قَوْمٍ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ أَفَنَأْكُلُ فِي آنِيَتِهِمْ؟ وَبِأَرْضِ صَيْدٍ أَصِيدُ بِقَوْسِي وَبِكَلْبِي الَّذِي لَيْسَ بِمُعَلَّمٍ وَبِكَلْبِي الْمُعَلَّمِ فَمَا يَصْلُحُ لِي؟ قَالَ: أَمَّا مَا ذَكَرْتَ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ: فَإِنْ وَجَدْتُمْ غَيْرَهَا فَلَا تَأْكُلُوا فِيهَا وَإِنْ لَمْ تَجِدُوا فَاغْسِلُوهَا وَكُلُوا فِيهَا وَمَا صِدْتَ بِقَوْسِكَ فَذَكَرْتَ اسْمَ اللّٰهِ فَكُلْ وَمَا صِدْتَ بِكَلْبِكَ الْمُعَلَّمِ فَذَكَرْتَ اسْمَ اللّٰهِ فَكُلْ وَمَا صِدْتَ

بِكَلْبِـكَ غَيْـرِ مُعَلَّـمٍ فَأَدْرَكْـتَ ذَكَاتَـهُ فَكُـلْ.(الحـديث ٥٤٧٨ طرفـاه في: ٥٤٧٨، ٥٤٩٦):[1259]

ئـەبو سـەعلەبەی خوشـەنی (رەزای خـوای لێ بـێ) فـەرمووی گـوتم: ئـەی پێغەمەری خودا! ئێمـە لـەوڵاتی شـامین، دراوسـێی خـاوەن نامـەکانین و لـەوڵاتی ئەواندایـن، واین لەگـەڵ مەسـیحیو جولەکـەدا، وەلحـاڵ ئـەوان لەمەنجەڵـەکانیانا گۆشتی بەراز دەکوڵێنن لەقاپو حاجەتـەکانیانا مـەیو بـادەو ئـارەق دەخۆنـەوە. لەم حاڵەدا ئێمە چارمان چیـیە، ئایا لەو حاجەتەیانا شت بخۆین، یـا بخۆینـەوە؟ فـەرمووی: (ئەگـەر دەفـری ترتـان دەسـت کـەوت لـەوەدا بخـۆنو بخۆنـەوە، بـەڵام ئەگەر حاجەتی ترتان دەست نەکەوت، بەئاو پاك بیانشۆرنو ئـیتر تیایانـدا شـت بخۆنو بخۆنەوە). عەرزیشم کرد: قوربان ئێمە واین لەوڵاتێ نەچیری زۆرە، هـەم بەتیرو کەوان ڕاودەکـەم، هـەم بەوسـەگەم کەمەشـقی ڕاوی نـەکردووە، هـەم بـەو سەگەیشم ڕاودەکەم کەفێرە ڕاوەو لەشەرعا ناودارە بە (کەلبی موعەللەم: سـەگی فێرکراو) جا لەم جۆرە ڕاوە کامەیان حەڵاڵە بۆم؟ فەرمووی: (ئـەوەی کـە بـەتیر ڕاوی دەکـەی وە نـاوی خـودات لێ هێنـاوە بیخـۆ، وە ئـەوەی کـە بەسـەگی مەشـقدیدەی فێـرە ڕاو، ڕاوی دەکـەی و نـاوی خـوات لێهێنـاوە بیخۆ، وە ئـەوەی کەبەسـەگی فێرنـەکراو ڕاوی دەکـەیو فریـای دەکـەویت کـەپێش ئـەوەی مـردار ببێتەوە سەری ببڕی بیخۆ). (تاج/٤ ل-٦٦ ز-١٩ ژ-٦).

---

[1259] تجرید/٥، ژمارە: ١٨٢٧ = ٥٤٧٨ بخاری. پوختەی موسلیم/١٢٤٠ = ٤٩٦٠ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٧٢ رقم الباب/٤).

**ڕوونکردنەوە:**

ئـەبو ثـەعلەبـەی خوشـەنی، لـە هاوەڵـە پێـشینەکانی پێغەمبـەرە (دروودی خودای لەسەر بـێ) لـە پـەیمانی (بەیعـەتی شـەجەرە)دا، لەخزمـەت پێغەمبـەردا پـەیمانی وەرگـرت. {بڕوانـە: ژمـارە: ١٢١٢، تەجریـد =ژمـارە: ٢٩٥٨ فـەتحولباری. بەرگی/٣، لاپەڕە: ٣٣٥، چاپی یەکەم = لاپەڕە: ٣٣٢، چ/٢}.

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ناردی بۆناو هۆزەکەی خـۆی، لەسـەر دەستی ئەودا هۆزەکـەی قـەبووڵی ئیـسلامیان کـرد، لەجـەنگی صـەفیندا، لەگـەڵ کەسـیان نـەبوو، بەشـداری ئـەم جەنگـەی نـەکرد، دەفـەرموون: هـەموو شـەوێ دەچـووە دەرەوە، تەماشـایەکی وردی ئاسمـانی دەکـرد، ئەوسـا دەگەڕایـەوەو سەجدەیەکی ئایاتی دەبـرد. {بڕوانـە: التـاج الجـامع للأصـول/١، ص٣١٢. السجدة لطلقِ الآیات بەرگی/١، زنجیرە: ١٧٢، ژمارە: ٩٣٤ وەرگەڕاوە کوردییەکە}.

هەرچی بـەوردی، سـەرنجی دەدەی

دەریای نەفسوونەو گـەردوونی بێ پەی!

تەلیـــسماوییە، دنیـــا لەچـــاویا

تنۆکـــــێ نــــاوەو وەهـــــا لــــەناویا

گـەر چـرات دەوێ بـۆ دڵو دەروون

بەرچـــاوی چـــاوت تـــەواو ببـــێ ڕوون

بەچاوی ژیـری سـەرنجی گـەردوون

بـدەو وردبـەرۆ، لـە بـوون و نـەبوون!!

ئەبو ثەعلەبە دەفەرموێ: (لەخودا دەخوازم کەمن لەسەرەمەرگا، وەك ئێـوە کە لەکاتی گیانەڵادا دەکەونـە لرخـە لـرخ، مـن ئـاوا نەکەومـە لرخـە لـرخ) ئـەبو زاهیریە دەفەرموێ: (جا شەوێ ئـەبو سـەعلەبە شـەو نوێـژدەکا، لـەناو جەرگـەی

شەوا، لەناو سەجدەدا فەرمانی هەق بەجێ دەهێنێ‌و دەمرێ، لەوكاتەدا كچەكەی دخەوێ، لەخەویدا دەبینێ كەوا باوكی مردووە، كچەكە لەخەو رادەچەنێ‌و هاواردەكا: كوا باوكم؟ دەڵێن: وا لەنوێژگاكەی خۆی سەرگەرمی شەو نوێژە، جالای خۆیەوە بانگی دەكا: بابە، بابە! وەڵام نابێ، جا رادەكا بۆلای، دەڕوانێ بە مردوویی واله كوڕنووشدا، كە رایدەوەشێنێ دەكەوێ بەلادا!

ئەبو سەعلەبە لەبوخاریدا سێ فەرموودەی هەیە، ئەم فەرموودەیەی ئێرە (متفق علیە)یە. كۆمەڵێ لە مێژوو نووسانی هاوڕێیانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموون: لەساڵی حەفتاو پێنجی كۆچیدا لەشام مردووە).

مامۆستا حاجی مەلا موحەممەدی رەنیس، كە مامۆستای گەلاڵەی لای ماوەت بو، جەڵتەیەكی سەخت لێی دەدا، لە خەستەخانە دەیخا، سێ كەس لە كوڕەكانی گێڕایانەوە گوتیان: (نەخۆشینەكەی زۆر گران بوو، بەردەوام دووعای دەكردو دەیفەرموو: خودایە! لەم سەرە مەرگەدا نوێژم نەچێ، كوڕەكانی دەیانگوت حەزمان دەكرد: كەنزایێ تر بۆ خۆی، یا بۆ ئێمە بكا، بەڵام هەر ئەوە نزاكەی بوو: (خودایە! نوێژم نەچێ!) گوتیان: ئاخرجار دەستنوێژی عەصرمان بۆ گرت‌و لەسەر قەرەوێڵەكە بەرەو قیبلە رامان كێشا، نوێژێكی جوانی رێكوپێكی بەدڵی خۆی كردو لەپاش سلاوەدانەوە، هەندێ ویردو قورئانی لەبەر خوێندو بەر لەبانگی شێوان، زۆر بەئاسانی وەك خەوی لێ بكەوێ گیانی دەرچوو!!

ئێستایش بەپشتی خودای گەورە، بۆ بەهرەی تەواو لەم بابەتە، لەشەرحی بلوغ المرام/٣ ژمارە (١٣٥٧) لەگەڵ راڤەكەیدا راگوێزدەكەین. (بڕوانە: ژمارە: ١٨٢٧ تجرید):

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم): {"مَنِ اتَّخَذَ كَلْباً، إِلَّا كَلْبَ مَاشِيَةٍ، أَوْ صَيْدٍ، أَوْ زَرْعٍ، اِنْتَقَصَ مِنْ أَجْرِهِ كُلَّ يَوْمٍ




قِيرَاطٌ"} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ. {تەجریدی بوخاری/٣، ژمارە: ١٠٢١ = ٢٣٢٢، ٢٣٢٣ بوخاری. مختصر صحيح مسلم/٣، ژمارە: ١٢٤٤ = ٤٠٠٧ = صحيح مسلم/ محمد فؤاد/١٥٧٥}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرموی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەر کەسێ سەگێ ڕابگرێ، سەگی پاسی ئاژەڵو سەگی ڕاوو سەگی پاسی زەوی‌و زارو مەزراو کشتوکاڵ نەبێ، هەموو ڕۆژێ ئەندازەیێ لەپاداشی کردەوەی باشی کەم دەبێتەوە).

پێشەوا زوهری دەفەرموێ: کاتێ ئەم فەرموودەیەی ئەبوهورەیرە باسکرا بۆ ئیبنو عومەر، کە ئەم ڕستەیەی واتیادا:

(سەگی پاسی زەوی‌و مەزرا نەبێ) ئیبنو عومەر فەرمووی: ڕەحمەتی خودا لە ئەبوهورەیرە بێ، خۆی خاوەنی مەزرا بوو، بۆیە وا گرنگی داوە بەم ڕستەی (سەگی پاسی زەوی‌و مەزرا نەبێ). {تاج/٢، زنجیرە: ١٧١، ژمارە: ١٩١٨ + تاج/٣، زنجیرە: ٦، ژمارە: ٢٥٨٧ چ/٤ + ریاض/٤، زنجیرە: ٣٠٦، ژمارە: ١/١٦٨٨}.

## ڕوونکردنەوە:

بەپێی یاسانامەی ئیسلام سەگ پیسە، وەزیانی زۆرە لەزۆر ڕووەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشا شەرعی پیرۆز ڕێگەی سوود وەرگرتن‌و کەڵکوەرگرتنی لەسەگ داوە، بەهەموو چەشنەکانییەوە، بەڵام ئەو کەسەی کە سەگ ڕادەگرێ دەبێ چەند خاڵێ ڕەچاو بکا، وەك پاك‌و تەمیزی‌و پاکژکردنی، لەسەر ئەم شێوەیە:

**یەكەم: دروستە سەگ بۆ ئەم مەبەستانە ڕابگیرێ:**

١- بۆ پاسو ئاگاداری، وەك پاسی ڕانو سامانو ماڵ، لەدزو جانەوەری زیانەخرۆ، وەك گورگو چەقەڵو بەراز، یان بۆ پاسی منالّی ساوا وەك لەلە، یا بۆ پاسو ئاگاداری پیاوو ژنی كەفتەكار لەماڵەوە.

٢- بۆ ڕاووشكار، وەك: تووولەو تانجیو سەگی ڕاوی تر.

٣- سەگی پۆلیسی، بۆ دۆزینەوەی تاوانو بۆ زۆر مەبەستی ڕەوای تر، وەك لە كاتی بوومەلەرزەو كارەساتی سروشتیدا، تەرمی ژێر داروپەردوو ئەدۆزێتەوە، یان مرۆڤی گیرخواردووی ژێر رووخاویو شتی وا دەدۆزێتەوە، یان مادددە سڕكەرەكانو باروتو تەقەمەنی شاراوە بەنیازی خراپ ئاشكرا ئەكا، یان لەزۆر رووی تری شەرعییەوە سوودو قازانج بەكۆمەڵگا دەگەیەنێ.

٤- سەگی چاوساغ لە ئەوروپاو لەزۆر ولاتانی تر دەبن بە چاوساغ بۆ كوێرو ئەمانەو لەپێشیانەوە دەڕۆنو ئەوانیش بەهۆی پەتێكەوە شوێنیان دەكەون، هەتا دەگەنە شوێنی مەبەست.

٥- بۆ كاركردن، وەك دەبینین، لەوڵاتی ئالاسكا، لەناو ئەسكیمۆكاندا، لەبەر زۆری ساردیو سەهۆڵبەندان، سەگ بەكاردەهێنن بۆ ڕاكێشانی گالیسكەو عەرەبانەی سەربەفر، وە چەند سەگێ ڕایدەكێشن، وەك لەزۆر شوێن سەگ فێر دەكەن مەشقی پێ دەكەنو زەمیلە دەكەنە ملیو دەچێ لەبازار لەلای مامیل گۆشتو سەوزەو شتی تر دەكڕێو دەگەڕێتەوە بۆ ماڵی خاوەنیو خاوەنەكە ناوی شتەكە دەنووسێو دەیخاتە زەمیلەكەی ملیو دەیبا بۆ مامیلەكەو ئەویش پێویست ئەنجام دەدا.

**دووەم: سەگ لەم سەردەمەی ئێمەداو لەدێرینیشدا بۆ زۆر شتی تر بەکار دەهێنرێ، وەك:**

١- سەگی گەمەو یاری، وەك مەیموونی لۆتی، وەك لەسێرك و ئەمانەدا دەیبینین، وەك سەگ بۆ جوانی، وەك خولیاو هیوایە.

٢- بۆ هەندێ کاری نارەوا، کەپێویست ناکا ناوی بەرین.

٣- بۆ شەرە سەگ و شتی تری واو بۆ قومارو بۆرپبۆرێن.

٤- کێلگەی سەگ هەیە، لەکۆریاو ئەو وڵاتانەی کە سەگ دەخۆن، بۆ خواردنی گۆشتەکەی، وەك کێلگەی پەلەوەرو ئاژەڵی وڵاتی خۆمان. وە بۆ زۆر مەبەستی تریش سەگ ڕائەگیرێ.

**سێیەم: جا ئەوەی کە ئەرکی موسوڵمانە ئەمەیە:**

١- بەپێی توانا، خۆی لەسەگ دوور بگرێ، وە بۆ ناچاری نەبێ، بەپێی برگەی (یەکەم) بەکاری نەهێنێ.

٢- لەپێشدا بیکوتی، بە لقاحی دژی هاری.

٣- ئەگەر ناچار بوو، وەك ئەوە لەکێلگەی سەگا ئیش بکا، یان سەگی پۆلیسی پەروەردە بکا، دەستێ جلی تایبەتی هەبێ، بەپێی کاتی پێویست، وەك بەدلە عەمەل، بەکاری بهێنێ و لەپاشا دایکەنێ. وەهەر کاتێ شوێنێکی بەتەڕی بەر سەگ کەوت گڵاوی دەر بکا، وە ئەوەندەی دەتوانێ، جێگەی سەگ و کولانەکەی و شوێنەکەی، پاك و پوخت ڕابگرێ، وەبرسی و تووونی نەکات و بەخۆڕایی ئازاری نەدات، چونکە لە فەرمووددا هەیە: (ژنێ بەهۆی تێراوکردنی سەگێکەوە دەچێتە بەهەشت، وە ژنێ تر بەهۆی ئازاردانی پشیلەیەکەوە دەچێتە دۆزەخەوە).

٤- جا بەنیازی سوود وەرگرتنی ڕەوا لەسەگ، دروستە پەروەردەیش بکرێو بەتوتکەیی گەورە بکرێ، وە لەڕووی یاسانامە (شەرع)ەوە، ئەم جۆرە کردارانە دروستەو قەیدی نییەو بەر ئەو نەهیە ناکەوێ کە لەڕاگرتنی سەگ کراوە، بەلاّم ئەوەندە هەیە کارکردن بەو سەوداو مامەڵەی کە سەگ ئەنجامی دەدا، یا کردنی هەندێ تەصەڕوفاتی سەگ بە بەلگەو نیشانە لەسەر هەندێ بڕیار ئەوە باسێکی دوورو درێژەو پێویستی بە لێکۆڵینەوەی پسپۆڕان هەیە لەهەموو روویەکەوە.

**چوارەم:**

١- حەنەفییەکان دەڵێن سەگ پاکە، پیس نییە، بەلاّم بەرماوەکەیو لیکەکەیو ئارەقو هەموو تەڕییەکی پیسە، وەك بەدەق دەڵێن: {إنَّ الكَلْبَ لَيْسَ بِنَجِسِ العَيْنِ، ولِكنْ سؤْرُهُ وَرُطُوبَاتُهُ نَجِسَةٌ} (حاشينة ابن عابدين ٢٠٤/١).

٢- مالیکییەکان دەڵێن: سەگ خۆیو ئارەقیو فرمێسکیو لیکیو هەمووی پاکە، طاهرولعەینە. بەلاّم لەپاش تۆپین پیسە. بەدەق دەڵێن: {الكَلْبُ طَاهِرُ العَيْنِ} (الشرح الصغير على أقرب المسالك إلى مذهب مالك – ٤٣/١ – ٤٤).

٣- شافیعیو حەنبەلییەکان دەڵێن: سەگ نەجیسولعەینە {يرى الشَّافِعِيَّةُ وَالحَنَابِلَةُ: أَنَّ الكَلْبَ نَجِسُ العَيْنِ} (الأم ٨/١، والقلوبي وعميرة ٦٩/١، والمغنى لأبن قدامة ٣٣/١). بۆ موسوڵمان هەیە کە پەیڕەوی یەکێ لەم مەزهەبانە بکات.

)

## ٣) باب تحريم أكْلِ ذِي نابٍ مِنَ السِباعِ، وَكُلِ ذي مخلبٍ مِنَ الطَيْرِ
## خواردنی گۆشتی دڕندەی کەڵبەدار نادروستە، هەروا هەر باڵندەیێ چنگ‌و نینۆکی تیژی هەبێ، خواردنی گۆشتەکەی نادروستە

١٢٦٠- عَنْ أَبِي ثَعْلَبَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أنَّ رَسُولُ اللّٰهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْ أَكْلِ كُلِّ ذِي نَابٍ مِنَ السِّبَاعِ.(الحديث ٥٥٣٠ طرفاه في: ٥٧٨٠، ٥٧٨١): [١٢٦٠]

ئەبو سەعلەبەی خوشەنی (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: هەر دڕندەیێ کە کەڵبەی هەبێ، پێغەمەر خواردنی گۆشتەکەی قەدەغە کردووە. (تاجی کوردی/٤ ل/١٤ ژ/٣ ژ/٩) + (فیقهی ئاسان/٣ ل/٩١٤).

لە ژمارە (١٣٣٢)ی پوختەی موسلیمدا ئاوایە:

عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ أَكْلِ كُلِّ ذِي نَابٍ مِنَ السِّبَاعِ وَعَنْ كُلِّ ذِي مِخْلَبٍ مِنَ الطَّيْرِ. {الحديث: ٤٩٧٠ = ٤٩٥٥ فم}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕێگری دەکرد لەخواردنی گۆشتی دڕندەی کەڵبەدارو لەخواردنی گۆشتی باڵندەیێ کە چنگ‌و چڕنووکی هەبێ‌و ڕاوی پێبکا، خواردنی گۆشتی ئەم دوو جۆرە جانەوەرەی قەدەغە کردووە. {تاج/٣، زنجیرە: ٣، ژمارە: ٢٥٧٣}.

---

[١٢٦٠] تجرید/٥، ژمارە: ١٨٣٥ - ٥٥٣٠ بخاری. مسلم: ٤٩٦٥ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٧٢ رقم الباب/٢٩).

## (٤) باب إباحة ميتة البحر
## خواردنی گیانداری ناوی مردوو ڕەوایە

١٢٦١- حديث سَمِعْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ يَقُولُ بَعَثَنَا رَسُولُ اللَّهِ – صلى الله عليه وسلم – ثَلاَثَمِائَةِ رَاكِبٍ أَمِيرُنَا أَبُو عُبَيْدَةَ بْنُ الْجَرَّاحِ نَرْصُدُ عِيرَ قُرَيْشٍ ، فَأَقَمْنَا بِالسَّاحِلِ نِصْفَ شَهْرٍ فَأَصَابَنَا جُوعٌ شَدِيدٌ حَتَّى أَكَلْنَا الْخَبَطَ ، فَسُمِّيَ ذَلِكَ الْجَيْشُ جَيْشَ الْخَبَطِ ، فَأَلْقَى لَنَا الْبَحْرُ دَابَّةً يُقَالُ لَهَا الْعَنْبَرُ ، فَأَكَلْنَا مِنْهُ نِصْفَ شَهْرٍ وَادَّهَنَّا مِنْ وَدَكِهِ حَتَّى ثَابَتْ إِلَيْنَا أَجْسَامُنَا ، فَأَخَذَ أَبُو عُبَيْدَةَ ضِلَعًا مِنْ أَضْلاَعِهِ فَنَصَبَهُ فَعَمَدَ إِلَى أَطْوَلِ رَجُلٍ مَعَهُ – قَالَ سُفْيَانُ مَرَّةً ضِلَعًا مِنْ أَعْضَائِهِ فَنَصَبَهُ وَأَخَذَ رَجُلاً وَبَعِيرًا – فَمَرَّ تَحْتَهُ قَالَ جَابِرٌ وَكَانَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ نَحَرَ ثَلاَثَ جَزَائِرَ ، ثُمَّ نَحَرَ ثَلاَثَ جَزَائِرَ ، ثُمَّ نَحَرَ ثَلاَثَ جَزَائِرَ ، ثُمَّ إِنَّ أَبَا عُبَيْدَةَ نَهَاهُ: [١٢٦١]

ئەم فەرموودەیە بەچەندین گێڕانەوە هاتووە، لە تەجریدا، لە ژمارە (١٦٠٥)ی بەرگی چوارا ئاوایە:

عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضيَ اللهُ عَنْهُما) انَّهُ قَالَ: (لَمَّا بَعَث رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَعْثا قِبَلَ السَّاحِلِ وَامَّرَ عَلَيْهِمْ اباعُبَيْدَةَ بْنَ الْجَرَّاحِ وَهُمْ ثلاث مِائَةٍ فَخَرَجْنَا وَكُنَّا بِبَعْض الطريقِ فَنِيَ الزَّادُ فَامَرَ ابُو عُبَيْدَةَ بازْوَادِ الْجَيْشِ فَجُمِعَ فَكَانَ مِزْوَدَيْ تَمْرٍ فَكَانَ يَقُوتُنَا كُلَّ يَوْمٍ قَلِيلا قَلِيلا حَتَّى فَنِيَ فَلَمْ يَكُنْ يُصِيبُنَا الا تَمْرَةٌ تَمْرَةٌ فَقُلْتُ: مَا تُغْنِي عَنْكُمْ تَمْرَةٌ فَقَالَ: لَقَدْ وَجَدْنَا فَقْدَهَا حِينَ فَنِيَتْ ثمَّ انْتَهَيْنَا الَى الْبَحْرِ فَاذا حُوتٌ مِثلُ الظرِبِ فَاكَلَ مِنْهَا الْقَوْمُ ثَمَانِيَ عَشْرَةَ لَيْلَةً ثمَّ امَرَ ابُو عُبَيْدَةَ بِضلَعَيْنِ مِنْ اضلاعِهِ فَنُصِبا ثمَّ امَرَ بِرَاحِلَةٍ فَرُحِلَتْ ثمَّ مَرَّتْ تَحْتَهُمَا فَلَمْ تُصِبْهُمَا). (الحديث: ٤٣٦٠، اطرافه في: ٢٤٨٣، ٢٩٨٣، ٤٣٦١، ٤٣٦٢، ٥٤٩٣، ٥٤٩٤):

---

[١٢٦١] بخاری/٤، ژمارە: ١٦٠٥ = ٤٣٦٠ بخاری. پوختەی موسلیم: ١٣٢٦ = ٤٩٧٤ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٦٤ رقم الباب/٦٥).

وعنهُ (رَضيَ اللهُ عنهُ) في روايةٍ انه قالَ: فَالْقَى لَنَا الْبَحْرُ دَابَّةً يُقَالُ لَهَا الْعَنْبَرُ فَاكَلْنَا مِنْهُ نِصْفَ شَهْرٍ وَادَّهَنَّا مِنْ وَدَكِهِ حَتَّى ثابَتْ الَيْنَا اجْسَامُنَا (الحديث: ٤٣٦١،طرفه في: ٤٣٦٠).

وعنهُ في روايةٍ اخرى: قَالَ ابُو عُبَيْدَةَ: (كُلُوا فَلَمَّا قَدِمْنَا الْمَدِينَةَ ذَكَرْنَا ذلِكَ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ كُلُوا رِزْقًا اخْرَجَهُ اللَّهُ اطعِمُونَا انْ كَانَ مَعَكُمْ فَاتَاهُ بَعْضُهُمْ بعُضوِ فَاكَلَهُ). (الحديث: ٤٣٦٢، طرفه في: ٤٣٦٠).

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەشکرێکی سێ سەد کەسی نارد بۆ قەراخی دەریا، وە ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەرراحی کرد بەسەر لەشکریان، من خۆم لەو لەشکرا دابووم، سێ سەد سوار بووین، دەرچووین هەتا گەیشتینە جێگەیێ توێشوومان پێ نەما، خۆراکمان تەواو هاتە کزی، تووشی برسێتیەکی سەخت بووین، لەتاوانا بەگەلاکوتك گەلا دارمان دەوەراندو دەمانخوارد! جا ئەبو عوبەیدە فەرمانی کرد، هەموو توێشووەکانی لەشکرەکەیان کۆکردەوە، هەمووی پڕ دوو تۆیشە بەرە خورما بوو، ئیتر هەموو ڕۆژێ، بەکەمە کەمە دەیژی یاندین، هەتا ئەوەیش نەما، و تەنیا ڕۆژانەیەکی سەرو دەنك خورمامان پێ دەبرا وەهبی کوڕی کیسان فەرمووی بە جابیرم گوت: جا تاقەدەنکێ خورما بەکەڵکی چیتان دەهات؟ فەرمووی: وەك چۆن منالی ساوا مەمکی دایکی دەمژێ، ئاوا ئەودەنکە خورمایەمان دەمژی، وەئاومان دەکرد بەسەریدا، ئیتر بەشی ئەو ڕۆژە تائێوارێی دەکردین، کاتێ ئەوەیش نەما ئەوسا هەستمان کرد بەسوودی بوونەکەی و نرخیمان زانی.

لە پاشا گەیشتینە سەردەریا، ڕوانیمان وا نەهەنگێك وەك یالێ وەهایە، لەکەنار دەریاکە بەمردوویی کەوتووە، ئیتر برادەران هەژدەشەو لێیان خواردو

خۆمان بەپیوەکەی چەوردەکرد، هەتا لەشمان بووزایەوە، ئەوجا ئەبوعوبەیدە فەرمانی کرد دوو پەرا سووی ئەو نەهەنگەیان ڕاست کردەوە و لەبنەوەکەمێ بلاویان کردنەوەو لەسەرەوە نووکەکانیان نووساندن بەیەکەوە، لەچەشنی دوولا شیپانەی دەروازە، ئەوجا فەرمانی کرد وشترێکی زەبەلاحیان کۆپان کردو پیاوێکی فیلەتەنمان تیادا بوو لەسەر ئەو کۆپانەوە سواری ئەو وشترەی کردو بە ژێر ئەو دوو پەراسووەدا ڕۆیشت سەری نەیدا لەپەراسووەکان.

دەفەرموێ: ئەبو عوبەیدە فەرمووی: (دەی لێی بخۆن) جاکاتێ هاتینەوە بۆ مەدینە، باسەکەمان عەرزی حەزرەت کرد، فەرمووی: (بخۆن لەو رزق و ڕۆزییە پاکە کە خودا رەخساندوویەتی، دەرخواردی ئێمەیش بدەن لێی، ئەگەر لاتان ماوە) جاهەندێ لەبرادەران لەگۆشتی ئەو نەهەنگەی لەلا مابوو، بۆیهێنا، پێغەمبەریش لێی خوارد) (بڕوانە: تاج/٤ ل/٩ ز/٢ ف/١ - گیانلەبەری ئاوی ومرداروە بوویشی دەخورێ).

له ژماره (١٣٢٦)ی پوختەی موسلیما، لەبەرگی/٣ دا ئاوایە:

عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: بَعَثَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَمَّرَ عَلَيْنَا أَبَا عُبَيْدَةَ نَتَلَقَّى عِيرًا لِقُرَيْشٍ، وَزَوَّدَنَا جِرَابًا مِنْ تَمْرٍ لَمْ يَجِدْ لَنَا غَيْرَهُ، فَكَانَ أَبُو عُبَيْدَةَ يُعْطِينَا تَمْرَةً تَمْرَةً، قَالَ: فَقُلْتُ: كَيْفَ كُنْتُمْ تَصْنَعُونَ بِهَا؟ قَالَ: نَمَصُّهَا كَمَا يَمَصُّ الصَّبِيُّ، ثُمَّ نَشْرَبُ عَلَيْهَا مِنَ الْمَاءِ فَتَكْفِينَا يَوْمَنَا إِلَى اللَّيْلِ، وَكُنَّا نَضْرِبُ بِعِصِيِّنَا الْخَبَطَ، ثُمَّ نَبُلُّهُ بِالْمَاءِ فَنَأْكُلُهُ، قَالَ: وَانْطَلَقْنَا عَلَى سَاحِلِ الْبَحْرِ فَرُفِعَ لَنَا عَلَى سَاحِلِ الْبَحْرِ كَهَيْئَةِ الْكَثِيبِ الضَّخْمِ، فَأَتَيْنَاهُ فَإِذَا هِيَ دَابَّةٌ تُدْعَى الْعَنْبَرَ، قَالَ: قَالَ أَبُو عُبَيْدَةَ: مَيْتَةٌ، ثُمَّ قَالَ: لاَ بَلْ نَحْنُ رُسُلُ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ وَقَدِ اضْطُرِرْتُمْ فَكُلُوا، قَالَ: فَأَقَمْنَا عَلَيْهِ شَهْرًا، وَنَحْنُ ثَلاَثُ مِائَةٍ حَتَّى سَمِنَّا، قَالَ: وَلَقَدْ رَأَيْتُنَا نَغْتَرِفُ مِنْ وَقْبِ عَيْنِهِ بِالْقِلاَلِ الدُّهْنَ وَنَقْتَطِعُ مِنْهُ الْفِدَرَ كَالثَّوْرِ، أَوْ كَقَدْرِ

الثَّوْرِ، فَلَقَدْ أَخَذَ مِنَّا أَبُو عُبَيْدَةَ ثَلاَثَةَ عَشَرَ رَجُلاً فَأَقْعَدَهُمْ فِي وَقْبِ عَيْنِهِ، وَأَخَذَ ضِلَعًا مِنْ أَضْلاَعِهِ، فَأَقَامَهَا، ثُمَّ رَحَلَ أَعْظَمَ بَعِيرٍ مَعَنَا، فَمَرَّ مِنْ تَحْتِهَا، وَتَزَوَّدْنَا مِنْ لَحْمِهِ وَشَائِقَ، فَلَمَّا قَدِمْنَا الْمَدِينَةَ، أَتَيْنَا رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَذَكَرْنَا ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ: «هُوَ رِزْقٌ أَخْرَجَهُ اللَّهُ لَكُمْ، فَهَلْ مَعَكُمْ مِنْ لَحْمِهِ شَيْءٌ فَتُطْعِمُونَا»؟ قَالَ: فَأَرْسَلْنَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْهُ فَأَكَلَهُ. {الحديث: ٤٩٧٤ = ٤٩٥٩ فم. تجريد/٤، لاپەڕە: ٣٥٦، رقم: ١٦٠٥ = ٤٣٦٠، ٢٤٨٣، ٢٩٨٣، ٤٣٦١، ٤٣٦٢، ٥٤٩٣}:

جابیر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەشکرێکی سێ سەد کەسی نارد بۆ قەراخی دەریا، وە ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕراحی کرد بەسەر لەشکریان، من خۆم لەو لەشکرەدا بووم، سێ سەد سوار بووین، ناردینی منەی کاروانێکی قوڕەیشمان دەکرد، پڕ هەمانەیێ خورمای پێماندا، جگە لەوە هیچی تر نەبوو بماندانێ، دەرچووین، ئەبو عوبەیدە ڕۆژی سەرو یەك دەنك خورمای پێمان دەدا، فەرمووی: منیش بە جابیرم گوت: جا تاقە دەنکێ خورما، بەکەڵکی چیتان دەهات‌و چیتان لێ دەکرد؟ فەرمووی: وەك چۆن منالّی ساوا مەمکی دایکی دەمژێ، ئاوا ئەو دەنکە خورمایەمان دەمژی‌و ئاومان دەکرد بەسەریدا، ئیتر بەشی ئەو ڕۆژە تا ئێواریێ دەکردین، بە گەڵا کوتکیش گەڵای دارشیلان (قەرظ: سلم)مان دەوەراندو بەناو تەڕمان دەکردو دەمانخوارد.

فەرمووی: لەپاشا گەیشتینە سەر کەناری دەریا، ڕوانیمان وا لەوێ لە دوورەوە، شێوە تەپۆڵکە لمێکی زەبەلاحمان لێ دەرکەوت، کە چووین بۆ سۆراخی، ڕوانیمان وا لاشەی نەهەنگێکە کەپێی دەگوترێ: عەنبەر، چونکە بۆنی خۆشی عەنبەر، لەناو ڕیخۆڵەکانی دەردەهێنرێ، لەکەنار دەریاکە بەمردوویی کەوتووە،

فەرمووی: ئەبو عوبەیدە فەرمووی: (ئەمە مردارەوە بووە، لەبەرئەوە حەرامەو نادروستە، کەواتە لێی مەخۆن).

لەپاشا بڕیاریداو فەرمووی: راستە کە ئەمە مردارەوە بووە، بەڵام لێی بخۆن، بۆ ئێمە حەڵاڵە، چونکە یەکەم: ئێمە نێردراوانی پێغەمبەری خوداین‌و پێغەمبەر ناردووینی بۆ ئەرکێکی ئایینی پیرۆز، دووهەمیش: ئێمە ناچارین‌و لێمان قەوماوەو کەوتووینەتە تەنگانەی برسێتییەوە، کەواتە لێی بخۆن. فەرمووی: جایەك مانگی رەبەق لەسەری دامانکوتاو، ئەو سێ سەد کەسە دەستمانکرد بە لێخواردنی، هەتا تەواو قەڵەو بووین‌و هەناوێکمان تێ هاتەوە.

بەچاوی خۆم دەمدی کە بە کووپەو گۆزەی گەورە رۆنمان لە کالانەی چاوی هەڵدەگۆزی، وە پارچەی وامان لێ دەبڕی بەقەد لاکی جوانە گایەك دەبوو، ئەبو عوبەیدە سیازدە پیاوی لێ هەڵبژاردین، هەر سیازدەیان لە کالانەی چاویدا دانیشتن‌و جێیان بۆوە، ئەوجا ئەبو عوبەیدە فەرمانی کرد دوو پەراسووی ئەو نەهەنگەیان راست کردەوەو لەبنەوە کەمێ بڵاویان کردنەوەو لەسەرەوە نووکەکانیان نووساندن بەیەکەوە، لەچەشنی دوولا شیپانەی دەرگای دەروازە، ئەوجا فەرمانی کرد وشترێکی زەبەلاحیان کۆپانکردو پیاوێکی فیلە تەنمان تیادا بوو، لەسەر ئەو کۆپانەوە سواری ئەو وشترەی کردو بەژێر ئەو دوو پەراسووەدا رۆیشت سەری نەیدا لە پەراسووەکان. برێ لە گۆشتەکەیمان پارچە پارچە کردو زەردەمانکردو نیوە کوڵمان کرد، لەگەڵ خۆمانا بردمانەوە بۆ مەدینە، کاتێ چووینەوە خزمەتی حەزرەت (درוودی خودای لەسەر بێ) ئەمەمان باسکرد بۆی، فەرمووی: (ئەوە رۆزی‌و رزقێکی پاك‌و پیرۆز بووە، خودا رەخساندوویەتی بۆتان، ئایا لەو گۆشتەتان لەلاماوە، هەتا دەرخواردی ئێمەیشی بدەن؟).

فەرمووی: جا لەو گۆشتە بەشی پێغەمبەرمان دا، لێی خوارد. {تاج/٣، لاپەڕە: ١٥٤، زنجیرە: ٢، ژمارە: ٢٥٦١ ج/٤}.

**روونکردنەوە:**

لە فەتحولمولهیمدا دەفەرموێ: لە (دائرة المعارف البريطانية)دا دەڵێ: جاری وا هەیە (٣٠) سیی مەتر درێژە، کێشی (سەنگی: وەزنی) دەگاتە (١٣٦٠٠٠) سەدو سیی‌و شەش هەزار کیلۆ، گەورەترین گیانلەبەری ئاوییە.

## (٥) باب تحريم لَحْمِ الحُمُرِ الإِنسِيَّةِ
## خواردنی گۆشتی کەری ماڵی نادروستە

١٢٦٢- عَنْ عَلِيٍّ بْنِ ابِي طالِبٍ (رَضيَ اللهُ عنهُ)انَّ رَسُولَ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَهَى عَنْ مُتْعَةِ النِّسَاء يَوْمَ خَيْبَرَ وَعَنْ اكْلِ لُحُومِ الْحُمُرِ الانْسِيَةِ (الحديث: ٤٢١٦، اطرافه في: ٥١١٥، ٥٥٢٣، ٦٩٦١): [١٢٦٢]

ئیمامی عەلی (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەکاتی غەزای خەیبەردا، پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) ژن سیغەکردنی قەدەغە کرد، هەروا خواردنی گۆشتی کەری ماڵیشی قەدەغە کرد. ( بڕوانە: تاج/٣ ل/١٤٧ ز/٦٠- باسی سیغەکردن حەرامە ف/١+ ٢+ ٣+ ٤ ).

١٢٦٣- عَنْ أَبِی ثَعْلَبَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: حَرَّمَ رَسُولُ اللّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) لُحُومَ الْحُمُرِ الأَهْلِيَّةِ. {الحديث: ٤٩٨٣ = ٤٩٦٨ فم. بخاری. ذبائح وصيد: ٥٥٢٧}: [١٢٦٣]

---

[١٢٦٢] تجرید/٤، ژمارە: ١٥٧٤ = ٤٢١٦ بخاری. مسلم: ٤٩٨١ شيحا (بخاری رقم الكتاب/٦٤ رقم الباب/٣٨).

ئـەبو ئـەعلەبـە (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خواردنی گۆشتی کەری ماڵی نادروست کردووە).

١٣٦٤- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما) قَالَ نَهَى النَّبِىُّ (صلى الله عليه وسلم) عَنْ أَكْلِ لُحُومِ الْحُمُرِ الأَهْلِيَّةِ. (١٣٦٤)

ئیبنو عومەر (رەزای خودا لەخۆیو لەباوکی بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) رێگری دەکرد لەخواردنی گۆشتی کەری ماڵی.

١٣٦٥- حديث ابْنَ أَبِى أَوْفَى (رضى الله عنهما) يَقُولُ أَصَابَتْنَا مَجَاعَةٌ لَيَالِيَ خَيْبَرَ ، فَلَمَّا كَانَ يَوْمُ خَيْبَرَ وَقَعْنَا فِى الْحُمُرِ الأَهْلِيَّةِ ، فَانْتَحَرْنَاهَا فَلَمَّا غَلَتِ الْقُدُورُ ، نَادَى مُنَادِى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) اكْفَئُوا الْقُدُورَ ، فَلاَ تَطْعَمُوا مِنْ لُحُومِ الْحُمُرِ شَيْئًا . قَالَ عَبْدُ اللَّهِ فَقُلْنَا إِنَّمَا نَهَى النَّبِىُّ (صلى الله عليه وسلم) لأَنَّهَا لَمْ تُخَمَّسْ . قَالَ وَقَالَ آخَرُونَ حَرَّمَهَا الْبَتَّةَ . وَسَأَلْتُ سَعِيدَ بْنَ جُبَيْرٍ فَقَالَ حَرَّمَهَا الْبَتَّةَ. (١٣٦٥)

عەبـدوڵڵای کـوڕی ئـەبو ئـەوفا فـەرمووی: لـە شـەوەکانی پـێش غـەزای خەیبەردا، تووشی برسێتی سەخت بووین، جا کە لەڕۆژی ئازادکردنی قەڵاکەدا، دەستمان لەکەری ماڵی تاڵانی گیربوو، دەستمانکرد بە سەربڕینیان، گۆشتەکە لە مەنجەڵەکانا، بەسەر ئاگرەکەوە دەکوڵا، قوڵتە قوڵتی بوو، لەوکاتەدا، جاڕچی بـە فەرمانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بانگـەوازی هەڵدا: (لـە گۆشـتی ئەم کەرانە هیچ مەخۆن).

---

(١٣٦٣) بخاری ژبائح وصید: ٥٥٢٧، پوختەی موسلیم: ١٣٢٩ - ٥٥٢٧ شیحا (بخاری رقم الكتـاب/٧٢ رقم الباب/٢٨).

(١٣٦٤) بخاری. مغازی: ٤٢١٥ مسلم: ٤٩٨٤ (بخاری رقم الكتاب/٦٤، رقم الباب/٣٨).

(١٣٦٥) بخاری. فرض الخمس: ٣١٥٥ بخاری. مسلم: ٤٩٨٦ شیحا (رقم الكتاب/٥٧، رقم الباب/ ٢٠).

عەبدوڵڵا (واتە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئەوفا فەرمووی: گوتمان: ڕەنگ بێ لەبەرئەوە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەیی لێمان کردبێ، کە لەگۆشتی ئەم کەرانە نەخۆین، چونکە پێنج یەکی لێ دەرنەکراوە، عەبدوڵڵا فەرمووی: کەسانی تریش گوتیان: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەبێ چەندو چوون، بەئێجگاری گۆشتی کەریماڵی نادروست کردووە.

١٢٦٦- عَنِ الْبَرَاءِ وَعَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي أَوْفَى (رضی الله عنهم) أَنَّهُمْ كَانُوا مَعَ النَّبِيِّ (صلی الله علیه وسلم) فَأَصَابُوا حُمُرًا فَطَبَخُوهَا، فَنَادَى مُنَادِي النَّبِيِّ (صلی الله علیه وسلم) أَكْفِئُوا الْقُدُورَ.[١٢٦٦]

بەراءو عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئەوفا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرموویان: لە غەزایەکا لەخزمەتی پێغەمبەردا بووین، کەری تاڵانیمان دەستکەوت، سەرمان بڕین و دەستمان کرد بەگۆشت لێنان، لەگۆشتی ئەو گوێ درێژانە، جا جاڕچی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بانگەوازی هەڵدا کە مەنجەڵەکان قلێپ بکەنەوەو لەو گۆشتانە مەخۆن.

١٢٦٧- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضی الله عنهما) قَالَ لاَ أَدْرِي أَنَهَى عَنْهُ رَسُولُ اللَّهِ (صلی الله علیه وسلم) مِنْ أَجْلِ أَنَّهُ كَانَ حَمُولَةَ النَّاسِ ، فَكَرِهَ أَنْ تَذْهَبَ حَمُولَتُهُمْ ، أَوْ حَرَّمَهُ فِي يَوْمِ خَيْبَرَ ، لَحْمَ الْحُمُرِ الأَهْلِيَّةِ.[١٢٦٧]

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودا لەخۆی و لەبابی) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەڕۆژی ئازادکردنی قەڵای خەیبەردا خواردنی گۆشتی کەری ماڵی نادروست کرد، جا نازانم لەبەرئەوە نادروستی کرد، کە گوێ

---

[١٢٦٦] بخاری. مغازی/٤٢٢١ مسلم: ٤٩٨٨ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٦٤، رقم الباب/٣٨).
[١٢٦٧] بخاری. مغازی: ٤٢٢٧. مسلم: ٤٩٩٢ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٦٤، رقم الباب/٣٨).

درێژ بارە بەریانە، نەبادا بەهۆی خواردنی گۆشتەکەیەوە بارە بەریان نەمێنێ، یا هەروا گۆشتەکەی نادروست کردووە.

١٢٦٨- عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ (رضى الله عنه) أَنَّ النَّبِىَّ (صلى الله عليه وسلم) رَأَى نِيرَانًا تُوقَدُ يَوْمَ خَيْبَرَ. قَالَ « عَلَى مَا تُوقَدُ هَذِهِ النِّيرَانُ». قَالُوا عَلَى الْحُمُرِ الإِنْسِيَّةِ . قَالَ: «اكْسِرُوهَا ، وَأَهْرِقُوهَا». قَالُوا أَلاَ نُهْرِيقُهَا وَنَغْسِلُهَا قَالَ « اغْسِلُوا »:[(١٢٦٨)]

سەلەمەی کوڕی ئەکوەع (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەڕۆژی ئازادکردنی قەڵای خەیبەردا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کۆمەڵێ ئاگری لەبن کۆمەڵێ مەنجەڵا بینی دەگڕان فەرمووی: (ئەم ئاگرانە لەژێر چی چێشتێکا دەگڕێن؟) یاران گوتیان: لەژێر گۆشتی کەریماڵیدا دەگڕێن، کەوان لەناو مەنجەڵەکانا بەسەر ئاگرەکانەوە. فەرمووی: (مەنجەڵەکان بشکێنن و گۆشتاوەکەی ناویشیان بڕێژن) یاران گوتیان: ئەی بۆچی گۆشتاوەکە نەرێژین و مەنجەڵەکان نەشۆرین؟ فەرمووی: (دە باشە وابکەن، گۆشتاوەکان قلْپ بکەنەوەو مەنجەڵەکان بشۆرن).

## (٦) بابٌ: فِي أَكْلِ لُحُومِ الخَيْلِ
## گۆشتی ئەسپو ماین دروستەو دەخورێ

١٢٦٩- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رضى الله عنهما) قَالَ نَهَى رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَوْمَ خَيْبَرَ عَنْ لُحُومِ الْحُمُرِ ، وَرَخَّصَ فِى الْخَيْلِ:[(١٢٦٩)]

---

(١٢٦٨) مسلم: ٤٩٩٣ شيحا (بخارى رقم الكتاب/٤٦ رقم الباب/٣٢).

(١٢٦٩) بخارى. مغازى: ٤٢١٩ پوختەی موسلیم: ١٣٢٧ = ٤٩٩٧ شيحا (بخارى رقم الكتاب/٦٤، رقم الباب/٣٨).

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەڕۆژی غەزای خەیبەردا، جڵەوگیری کرد لەخواردنی گۆشتی کەری ماڵی، وە ڕێگەی خواردنی گۆشتی ئەسپو ماینی دا. {تاج/٢، زنجیرە:١، ژمارە: ٢٥٥٣}.

١٢٧٠- عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ (رضى الله عنهما) قَالَتْ نَحَرْنَا عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) فَرَسًا فَأَكَلْنَاهُ. [١٢٧٠]

ئەسمائی کچی ئەبوبەکری صدیق (ڕەزای خودا لەخۆیو لەباوکی) فەرمووی: لەسەردەمی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) لەمەدینە، ئەسپێکمان سەربڕیو گۆشتەکەیمان خوارد. {تاج/٣، ژمارە: ٢٥٥٤، زنجیرە:١}.

## (٧) باب: إباحة الضب
## خواردنی گۆشتی بزنمژە دروستە

١٢٧١- حديث ابْنَ عُمَرَ (رضى الله عنهما) قَالَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) « الضَّبُّ لَسْتُ آكُلُهُ وَلاَ أُحَرِّمُهُ »: [١٢٧١]

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودا لەخۆیو لەباوکی) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (من بۆ خۆم گۆشتی بزنمژە ناخۆم وە بەنادروستیشی دانانێم).

بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم باسە، ئەم دوو فەرموودەیە لەپوختەی موسلیم ژمارە: (١٣٢٣)و (١٣٢٤) ڕاگوێز دەکەین:

---

[١٢٧٠] تجرید/٥، ژمارە: ١٨٣٢ = ٥٥١١ بخاری پوختەی موسلیم/١٣٢٨ = ٤٩٩٩ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٧٢، رقم الباب/٢٤).

[١٢٧١] بخاری. مسلم: ٥٠٠٣ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٧٢ رقم الباب/٣٣).

عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ: أَخْبَرَهُ أَنَّ خَالِدَ بْنَ الْوَلِيدِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) (الَّذِي يُقَالُ لَهُ: سَيْفُ اللَّهِ) أَخْبَرَهُ أَنَّهُ دَخَلَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى مَيْمُونَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) وَهِيَ خَالَتُهُ وَخَالَةُ ابْنِ عَبَّاسٍ، فَوَجَدَ عِنْدَهَا ضَبًّا مَحْنُوذًا، قَدِمَتْ بِهِ أُخْتُهَا حُفَيْدَةُ بِنْتُ الْحَارِثِ مِنْ نَجْدٍ، فَقَدَّمَتِ الضَّبَّ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، وَكَانَ قَلَّمَا يُقَدَّمُ إِلَيْهِ طَعَامٌ حَتَّى يُحَدَّثَ بِهِ وَيُسَمَّى لَهُ، فَأَهْوَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَدَهُ إِلَى الضَّبِّ، فَقَالَتِ امْرَأَةٌ مِنَ النِّسْوَةِ الْحُضُورِ: أَخْبِرْنَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) بِمَا قَدَّمْتُنَّ لَهُ، قُلْنَ: هُوَ الضَّبُّ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَرَفَعَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَدَهُ، فَقَالَ خَالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ: أَحَرَامٌ الضَّبُّ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «لاَ وَلَكِنَّهُ لَمْ يَكُنْ بِأَرْضِ قَوْمِي، فَأَجِدُنِي أَعَافُهُ»، قَالَ خَالِدٌ: فَاجْتَرَرْتُهُ فَأَكَلْتُهُ، وَرَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَنْظُرُ فَلَمْ يَنْهَنِي.
{الحديث: ٥٠٠٩ = ٤٩٩٦ فم. أبو داود. أطعمة: ٣٧٩٥. نسائي. صيدو ذبائح: ٤٣٢٧}:

عەبدوڵلای کوڕی عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: خالیدی کوڕی وەلید، کەپێی دەگوترێ: سیف الله: شمشێری خودا، هەواڵی پێمدا فەرمووی: لەگەڵ پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەر بێ) چووین بۆ ماڵی مەیموونە، کە هاوسەری پێغەمبەر بوو، وە پووری منو ئیبنو عەبباس بوو، خوشکی دایکمان بوو، بزن مژەیەکی برژاویان دانا بۆی، کە حەفیدەی کچی حاریث لە نەجدەوە هێنابووی بەدیاری بۆ مەیموونەی خوشکی، دەستووری پێغەمبەر وابوو، کە خواردەمەنییەکیان دادەنا بۆی، بۆیان ڕوون دەکردەوە کە چییەو ناویان دەهێنا بۆی، جا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەستی درێژکرد بۆی کەلێی بخوا، ئافرەتێ لە ئامادەبوان گوتی: ئەی ژنگەل! عەرزی پێغەمبەر بکەن کە ئەوە چییە کەوا خەریکە دەیخوات. ژنەکانیش گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا!

ئەوە گۆشتی بزن مژەیە کە بۆمان داناویت. ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستی کێشایەوە، خالیدی کوڕی وەلید فەرمووی: منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا بزن مژە حەرامە؟ فەرمووی: (نەء، حەرام نییە، بەلاّم لەولاّتی ئێمە نییە، لەبەرئەوە دەبینم دڵم نایبات). خالید فەرمووی: جا منیش رام کێشا بۆلای خۆم و لەبەرچاوی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستم کرد بەخواردنی، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەیبیی لێ نەکردم لەخواردنی). {تاج/٣/١٥٠، زنجیرە: ١، ژمارە: ٢٥٥٢}.

عَنْ أَبِى سَعِيدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْـهُ): أَنَّ أَعْرَابِيًّـا أَتَـى رَسُـولَ اللَّـهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: إِنِّى فِى غَائِطٍ مَضَبَّةٍ وَإِنَّهُ عَامَّـةُ طَعَـامِ أَهْلِـى، قَـالَ: فَلَـمْ يُجِبْـهُ، فَقُلْنَـا: عَاوِدْهُ، فَعَاوَدَهُ، فَلَمْ يُجِبْهُ ثَلاَثًا، ثُمَّ نَادَاهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِى الثَّالِثَةِ فَقَالَ: «يَا أَعْرَابِيُّ! إِنَّ اللَّهَ لَعَنَ أَوْ غَضِبَ عَلَى سِبْطٍ مِنْ بَنِى إِسْرَائِيلَ فَمَسَخَهُمْ دَوَابَّ يَدِبُّونَ فِى الأَرْضِ، فَلاَ أَدْرِى لَعَلَّ هَذَا مِنْهَا، فَلَسْتُ آكُلُهَا وَلاَ أَنْهَى عَنْهَـا». {الحديث: ٥٠١٨ = ٥٠٠٥ فم}:

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: عەرەبێکی سارانشین هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! من نیشتەجێی شیوو دۆلێکم بزن مژەی زۆرە، خۆراکی زۆرینەی کەسوکارەکەمە ئایا دروستە یانا؟ فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وەلاّمی نەدایەوە، ئێمەیش پێمان گوت: پرسیارەکەی لێ دووبارە بکەرەوە، ئەویش دووبارەیکردەوە، بەلاّم وەلاّمی نەدایەوە تاسێ جار، جا لەپاش جاری سێیەم بانگی کردو پێی فەرموو (دروودی خودای لەسەر بێ): (ئەی کاکەی عەرەب! خودای گەورە نەفرەت و لەعنەتی کردووە، لە بەرەبابێ لە بەرەبابەکانی نەوەی ئیسرائیل و غەزەبی لێ گرتوون و کردوونی بە جانەوەرو

دەعباو دەعەجانیو لەناو ئەم زەوییەدا دەخولێنەوەو دێنو دەچن، منیش نازانمو مەترسی ئەوەم هەیە کە ئەمەیش لەوان بێ، جا لەبەرئەوە نەخۆم دەیخۆمو نە بەکەسیش دەڵێم مەیخۆن!).

**ڕوونکردنەوە:**

ئەمەی کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەم فەرموودەیەدا دەیفەرموێ، کە بۆیە گۆشتی بزن مژە ناخوا، چونکە دەترسێ بزن مژە لەو تیرەو بەرە بابانەبن لەبەنی ئیسرائیل، کە خودا کردوونی بە مەیموونو بەراز، ئەمە لەپێش ئەوەدا بووە کە خودا ئاگاداری بکا: (کە خودای گەورەو سەروەر هەر هۆزێکی فەوتاندبێ، یا هەر هۆزێکی سزا دابێو کردبنی بە مەیموونو بەراز، بنەبڕی کردوونو وەچەی لێ نەخستوونەتەوە). {بڕوانە: موسلیم. قەدەر. ژمارە: ٦٧١٤ + تاج/٥، لاپەڕە: ٣٥٩، ژمارە: ٥١٦٨، زنجیرە: ٨ ج/٤. تاج الأصول. المجلد الخامس. مبحث (الآجال والأرزاق محدودة) ص١٩٤. دار الفكر بيروت. الطبقة الرابعة}.

١٢٧٢- حديث ابْنَ عُمَرَ عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) غَيْرَ هَذَا قَالَ كَانَ نَاسٌ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) فِيهِمْ سَعْدٌ فَذَهَبُوا يَأْكُلُونَ مِنْ لَحْمٍ ، فَنَادَتْهُمُ امْرَأَةٌ مِنْ بَعْضِ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) إِنَّهُ لَحْمُ ضَبٍّ فَأَمْسَكُوا ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) « كُلُوا – أَوِ اطْعَمُوا – فَإِنَّهُ حَلاَلٌ – أَوْ قَالَ لاَ بَأْسَ بِهِ . شَكٌّ فِيهِ – وَلَكِنَّهُ لَيْسَ مِنْ طَعَامِي »:[١٢٧٢]

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: کۆمەڵێ لە یارانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سەعدی کوڕی ئەبو وەققاصیشیان

---

[١٢٧٢] بخاري. أخبار الآحاد: ٧٢٦٧ مسلم: ٥٠٠٦ (بخاري رقم الكتاب/٩٥، رقم الباب/٦).

تێدابوو، لەخزمەتی پێغەمبەردا خەریکی خواردنی گۆشت بوون، یەکێ لە هاوسەرەکانی پێغەمبەر بانگی لێیان کرد: کە ئەوە گۆشتی بزنمژەیە، ئەوانیش وازیان لەخواردنی هێنا، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێیان: (بخۆن گۆشتی بزنمژە حەڵاڵە) یا فەرمووی: (قەیدی نییە، ئێوە بیخۆن، من بۆیە نایخۆم چونکە من تا ئێستا نەم خواردووە).

١٢٧٣- عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ: أَخْبَرَهُ أَنَّ خَالِدَ بْنَ الْوَلِيدِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) (الَّذِي يُقَالُ لَهُ: سَيْفُ اللَّهِ) أَخْبَرَهُ أَنَّهُ دَخَلَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) عَلَى مَيْمُونَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) وَهِيَ خَالَتُهُ وَخَالَةُ ابْنِ عَبَّاسٍ، فَوَجَدَ عِنْدَهَا ضَبًّا مَحْنُوذًا، قَدِمَتْ بِهِ أُخْتُهَا حُفَيْدَةُ بِنْتُ الْحَارِثِ مِنْ نَجْدٍ، فَقَدَّمَتِ الضَّبَّ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، وَكَانَ قَلَّمَا يُقَدَّمُ إِلَيْهِ طَعَامٌ حَتَّى يُحَدَّثَ بِهِ وَيُسَمَّى لَهُ، فَأَهْوَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَدَهُ إِلَى الضَّبِّ، فَقَالَتِ امْرَأَةٌ مِنَ النِّسْوَةِ الْحُضُورِ: أَخْبِرْنَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) بِمَا قَدَّمْتُنَّ لَهُ، قُلْنَ: هُوَ الضَّبُّ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَرَفَعَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَدَهُ، فَقَالَ خَالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ: أَحَرَامٌ الضَّبُّ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «لاَ وَلَكِنَّهُ لَمْ يَكُنْ بِأَرْضِ قَوْمِي، فَأَجِدُنِي أَعَافُهُ»، قَالَ خَالِدٌ: فَاجْتَرَرْتُهُ فَأَكَلْتُهُ، وَرَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَنْظُرُ فَلَمْ يَنْهَنِي.
{الحديث: ٥٠٠٩ = ٤٩٩٦ فم. أبو داود. أطعمة: ٣٧٩٥. نسائي. صيدو ذبائح: ٤٣٢٧}: [١٢٧٣]

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: خالیدی کوڕی وەلید، کەپێی دەگوترێ: سیف الله: شمشێری خودا، هەواڵی پێمدا فەرمووی: لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) چووین بۆ ماڵی مەیموونە، کە

[١٢٧٣] بخاری. أطعمة: ٥٣٩١. مختصر صحیح میلم: ١٣٢٣ = ٥٠٠٩ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٧٠ رقم الباب/١٠).

هاوسەری پێغەمبەر بوو، وە پووری منو ئیبنو عەبباس بوو، خوشکی دایکمان بوو، بزن مژمیەکی برژاویان دانا بۆی، کە حەفیدەی کچی حاریث لە نەجدەوە هێنابووی بەدیاری بۆ مەیموونەی خوشکی، دەستووری پێغەمبەر وابوو، کە خواردەمەنییەکیان دادەنا بۆی، بۆیان روون دەکردەوە کە چییەو ناویان دەهێنا بۆی، جا پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) دەستی درێژکرد بۆی کەلێی بخوا، ئافرەتێ لە ئامادەبوان گوتی: ئەی ژنگەل! عەرزی پێغەمبەر بکەن کە ئەوە چییە کەوا خەریکە دەیخوات. ژنەکانیش گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوە گۆشتی بزن مژمیە کە بۆمان داناویت. ئیتر پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) دەستی کێشایەوە، خالیدی کوڕی وەلید فەرمووی: منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا بزن مژە حەرامە؟ فەرمووی: (نەء، حەرام نییە، بەلام لەوڵاتی ئێمە نییە، لەبەرئەوە دەبینم دڵم نایبات). خالید فەرمووی: جا منیش رام کێشا بۆلای خۆمو لەبەرچاوی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) دەستم کرد بەخواردنی، پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) نەیبی لێ نەکردم لەخواردنی). {تاج/٣/١٥٠، زنجیرە: ١، ژمارە: ٢٥٥٢}.

١٢٧٤- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضی الله عنهما) قَالَ أَهْدَتْ أُمُّ حُفَيْدٍ خَالَةُ ابْنِ عَبَّاسٍ إِلَى النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) أَقِطًا وَسَمْنًا وَأَضُبًّا ، فَأَكَلَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) مِنَ الأَقِطِ وَالسَّمْنِ ، وَتَرَكَ الضَّبَّ تَقَذُّرًا. قال إبن عباس: فَأُكِلَ عَلَى مَائِدَةِ رَسُولِ اللهِ (صلى الله عليه وسلم) ولوا كان حَرَاماً مَا أُكِلَ عَلَى مَائِدَةِ رسول الله (صلى الله عليه وسلم).[١٢٧٤]

ئیبنو عەبباس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئوم حەفیدەی پوورم، هەنێ کەشكو هەنێ رۆنو چەند بزنمژمیەکی بەدیاری هێنا بۆ پێغەمبەر

(١٢٧٤) مسلم: ٥٠١٤ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٧٠ رقم الباب/١٠).

(دروودی خودای لەسەر بێ)، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە کەشكو رۆنەكەی خوارد، بەلام لە گۆشتی بزنمژەكەی نەخوارد، چونكە قیزی لێ كردەوە.

ئیبنو عەبباس فەرمووی: بەلام كەسانی تر لەسەر خواردنی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەگۆشتی ئەو بزنمژەیان خوارد، دەی ئەگەر بزنمژە نادروست بوایە، لەسەر سفرەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەدەخورا.

## (٨) باب إباحة الجَرَادِ
## خواردنی كوللە دروستە

١٢٧٥- عَنْ ابْنَ أَبِي أَوْفَى رَضِيَ اللَّه عَنْهمَا قَالَ غَزَوْنَا مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّـه عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ سَبْعَ غَزَوَاتٍ أَوْ سِتًّا كُنَّا نَأْكُلُ مَعَهُ الْجَرَادَ.(الحديث ٥٤٩٥): [١٢٧٥]

عەبدوللای كوڕی ئەبو ئەوفا -ڕەزای خودا لەخۆیو باوكی- فەرمووی: حەوت غەزا -یا شەش غەزا- مان لەگەڵ پێغەمەر خۆیدا -دروودی خوای لەسەر بێ- كرد، كە لەو غەزایانەدا، لەگەل پێغەمەردا كوللەمان دەخوارد. (تاجی كوردی/٤ ل/٣ ژ/٢ + ل/١٠ ژ/٣).

---

[١٢٧٥] تجرید/٥، ژمارە: ١٨٣١ = ٥٤٥٩ بخاری. مسلم: ١٩٥٢ = مختصر صحیح مسلم: ١٣٢٥ = ٥٠١٩ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٧٢ رقم الباب/١٣).

## (٩) باب إباحة الأرنب
## خواردنی کەرویشك دروستە

١٢٧٦- عَنْ أَنَسٍ (رضى الله عنه) قَالَ أَنْفَجْنَا أَرْنَبًا بِمَرِّ الظَّهْرَانِ، فَسَعَى الْقَوْمُ فَلَغَبُوا، فَأَدْرَكْتُهَا فَأَخَذْتُهَا، فَأَتَيْتُ بِهَا أَبَا طَلْحَةَ فَذَبَحَهَا، وَبَعَثَ بِهَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) بِوَرِكِهَا – أَوْ فَخِذَيْهَا قَالَ فَخِذَيْهَا لاَ شَكَّ فِيهِ – فَقَبِلَهُ. قُلْتُ وَأَكَلَ مِنْهُ قَالَ وَأَكَلَ مِنْهُ:[١٢٧٦]

**لەژمارە (١٠٩٨)ی تەجریددا ئاوایە:**

حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ حَدَّثَنَا شُعْبَةُ عَنْ هِشَامِ بْنِ زَيْدِ بْنِ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ أَنْفَجْنَا أَرْنَبًا بِمَرِّ الظَّهْرَانِ فَسَعَى الْقَوْمُ فَلَغَبُوا فَأَدْرَكْتُهَا فَأَخَذْتُهَا فَأَتَيْتُ بِهَا أَبَا طَلْحَةَ فَذَبَحَهَا وَبَعَثَ بِهَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِوَرِكِهَا أَوْ فَخِذَيْهَا فَقَبِلَهُ قُلْتُ وَأَكَلَ مِنْهُ قَالَ وَأَكَلَ مِنْهُ ثُمَّ قَالَ بَعْدُ قَبِلَهُ) (الحديث ٢٥٧٢، طرفاهُ في: ٥٤٨٩، ٥٥٣٥):

**ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەمەڕو ظەهران کەروێشکێکمان هەڵسان، پیاوگەل نیشتنە سەری تاماندوو بوون، بەڵام من نیشتمە سەری هەتا گرتم، ئەوجا بردم بۆ ئەبوطەلحە، ئەبوطەلحە سەری بڕیو هەردوو سمتەکەی نارد بۆ پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) یا فەرمووی: هەردوو ڕانەکەی نارد بۆی- پێغەمبەریش(دروودی خوای لەسەر بێ) وەریگرت.(تاج/٤ف/-٣ز-١)**

**لەژمارە (١٣٢٢)ی پوختەی موسلیمدا ئاوایە:**

---

[١٢٧٦] **تجرید/٣، زمارە: ١٠٩٨ = ٢٥٧٢ بخاری. مسلم: ١٩٥٣ - پوختەی موسلیم: ١٣٢٢ = ٥٠٢٢ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٥١ رقم الباب/٥).**

**عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: مَرَرْنَا فَاسْتَنْفَجْنَا أَرْنَبًا بِ(مَرِّ الظَّهْرَانِ)، فَسَعَوْا عَلَيْهِ، فَلَغَبُوا، قَالَ: فَسَعَيْتُ حَتَّى أَدْرَكْتُهَا، فَأَتَيْتُ بِهَا أَبَا طَلْحَةَ، فَذَبَحَهَا، فَبَعَثَ بِوَرِكِهَا وَفَخِذَيْهَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، فَأَتَيْتُ بِهَا رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَقَبِلَهُ. {الحديث: ٥٠٢٢ = ٥٠٠٩ فم. تجريد/٣، رقم: ١٠٩٧ = ٢٥٧٢، ٥٤٨٩، ٥٥٣٥. أبو داود. أطعمة: ٣٧٩١. ترمذي. أطعمة: ١٧٨٩. نسائي. صيدو ذبائح: ٤٣٢٢. ابن ماجة. صيد: ٣٢٤٣. تحفة الأشراف: ١٦٢٩}:**

**ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەمەڕو ظەهران کەروێشکێکمان هەڵسان، کوڕ گەل نیشتنە سەری تا ماندوو بوون، بەلام من نیشتمە سەری هەتا گرتم، ئەوجا بردم بۆ ئەبوطەلحەی زڕبابم، ئەبو طەلحە سەری بڕیو هەردوو سمتەکەیو هەردوو رانەکەی نارد بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) من بۆیم برد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وەری گرت). {تاج/٣، لاپەڕە: ١٤٩، زنجیرە: ١، ژمارە: ٢٥٥١}.**

## (١٠) باب إباحة ما يُستَعانُ بِهِ عَلَى الإصْطِيَادِ وَالعَدُوِ وكَراهة الحذف
## هەرشتێ ببێ بە هۆکاری رەوا بۆ راوکردن، یان بۆ دژایەتی دوژمن دروستە

**١٢٧٧- عَنْ عَبْدِاللَّهِ بْنِ مُغَفَّلٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّهُ رَأَى رَجُلًا يَخْذِفُ فَقَالَ لَهُ: لَا تَخْذِفْ فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنِ الْخَذْفِ أَوْ كَانَ يَكْرَهُ الْخَذْفَ وَقَالَ: إِنَّهُ لَا يُصَادُ بِهِ صَيْدٌ وَلَا يُنْكَى بِهِ عَدُوٌّ وَلَكِنَّهَا قَدْ تَكْسِرُ السِّنَّ وَتَفْقَأُ الْعَيْنَ ثُمَّ رَآهُ بَعْدَ ذَلِكَ يَخْذِفُ فَقَالَ لَهُ: أُحَدِّثُكَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ نَهَى**

عَـنِ الْخَـذْفِ أَوْ كَـرِهَ الْخَـذْفَ وَأَنْـتَ تَخْـذِفُ لَـا أُكَلِّمُـكَ كَـذَا وَكَـذَا.(الحـديث ٥٤٧٩):[١٣٧٧]

عەبدوڵڵای کوڕی موغەففەل (ڕەزای خوای لێ بێ) پیاوێکی بینی پەلەپیتکەی دەتەقان، پێی فەرموو: پەلەپیتکە مەهاوێژە، چونکە پێغەمـەر ـدروودی خـوای لەسەر بێ- ڕێگەی ئەوەی نەداوە، یا حەزی لەوە نەبوو، وە دەیفەرموو: (ئەوە نە نێچیری پێ ڕاودەکرێ و نـەدوشمنی پـێ کوڵـەوار دەکـرێ، بـەڵام بەپێـچەوانەوە دوورنیـە کـە ددانـی کەسـێ بـشکێنێ، یـا چـاوی دۆسـتێ کوێربکـا!) جـا ماوەیـێ لـەوەدوا دیـسان عەبـدوڵڵا پیاوەکـەی دییـەوە، پەلەپیتکـەی دەهاویـشتەوە، جـا عەبدوڵڵا بەکابرای گوت: من فـەرموودەی پێغەمـەر ـدروودی خـوای لەسـەر بێـ- بۆ تۆ دەگێڕمەوە، کـە پێغەمـەر ـدروودی خـوای لەسـەر بـێ- ڕێگـەی پەلەپیتکە هاویشتن نادات، کەچی تۆ هـەرواز نـاهێنی، جـا کـەوای لێهات، هـەتا ئەوەنـدە و ئەوەندە قسەت لەگەڵ ناکەم). (تاج/٤ ل/٢٥ ژ/٦ ژ/١٠ ش/د).

**ڕوونکردنەوە:**

ئەم فەرموودەیە گەورەترین ڕاڤەو ڕوونکردنەوەیە بۆ ئەو فەرموودانەی تـر، کەرێگـەی قـسە دابـڕین نـادەن و بـەناڕەوا و نادروسـتی دادەنـێن، بـەپێی ڕێـسای (الحدیث یفسر بعضە بعضا: فەرموودەکان لەناو خۆیانـا دەبـن بەشـەرح و ڕاڤـەو ڕوونـکردنەوە بۆ یەکتری).

جا لەسەر ئەم بنیاتە دروستە کـە موسـوڵمان، پـتر لەسـێ ڕۆژ، قـسە لەکەسـێ دابڕێ، بەمەرجێ قسە دابڕین و قـسە نـەکردنەکـە لەبـەر ڕەزای خوابـێ، نـەوەك

[١٣٧٧] تجرید/٥، ژمارە: ١٨٢٨ = ٥٤٧٩ بخاری، مـسلم: ١٩٥٤ = ٥٠٢٣ شـیحا + پوختـەی موسـلیم/٢، ژمارە: ١٢٤٦ = ٥٠٢٦ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٧٢ رقم الباب/٥).

بۆ هەواو هەوەس بێ. (بڕ: ریاض الصالحين/٤ ل/١١٧٥ ز/٢٨٠ هەتا زنجیرەکە تەواو دەبێ) + (تاجی کوردی/٩ ل/٦٤ ز/٢٢ تاکۆتایی).

## (١٢) باب النَّهي عَنْ صبر البَهَائِم
## نانەوەی ئاژەڵ بە نیشانە نادروستە

١٢٧٨- عَنْ هِشَامَ بْنَ زَيْدِ بْنِ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، قَالَ: دَخَلْتُ مَعَ جَدِّي أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) دَارَ الْحَكَمِ بْنِ أَيُّوبَ، فَإِذَا قَوْمٌ قَدْ نَصَبُوا دَجَاجَةً يَرْمُونَهَا، قَالَ: فَقَالَ أَنَسٌ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) أَنْ تُصْبَرَ الْبَهَائِمُ. {الحديث: ٥٠٣٠ = ٥٠١٨ فم. بخاري. ذبائح: ٥٥١٣. تجريد/٥، رقم: ١٨٣٣ = ٥٥١٥ فتح الباري} : (١٢٧٨)

هیشامی کوڕی زەیدی کوڕی ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەتی ئەنەسی کوڕی مالیکی باپیرەما چووم بۆ ماڵی حەکەمی کوڕی ئەییوب، روانیمان وا کۆمەڵێ مریشکێکیان ناوەتەوە بە نیشانەو تیریان تێدەگرت، ئەو تیرانەی کە لێی نەئەدا دەیانـدا بـەخاوەنی مریشکەکە، فەرمووی: جا باپیرەم ئەنەس فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) رێگەی نەدەدا کە ئاژەڵو گیانلەبەر بنرێتەوە بەنیشانەو لەسەر ئەو شێوەیە بکوژرێت!). {ریاض/٤، زنجیرە: ٢٨٢، ژمارە: ١٦٠١، لاپەڕە: ٥٤، چاپی: دووەم + ١٦٠٢/١٣ - ٦٧}.

ئەمەی رۆیشت دەقی ژمارە (١٢٤٧)ی پوختەی موسلیم بوو، ئەمەیش دەقێکی تری ئەم فەرموودەیە لە تەجریدی بوخاریدا: ژمارە: (١٨٣٣).

---

(١٢٧٨) بخاری. ذبائح: ٥٥١٣، پوختەی موسلیم: ١٢٤٧ = ٥٠٣٠ شیحا + تجرید/٥، ژمارە: ١٨٣٣ = ٥٥١٥ بخاری. (بخاری رقم الکتاب/٧٢ رقم الباب/٢٥).

عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ رَحِمَهُ الله قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ ابْنِ عُمَرَ فَمَرُّوا بِفِتْيَةٍ أَوْ بِنَفَرٍ نَصَبُوا دَجَاجَةً يَرْمُونَهَا فَلَمَّا رَأَوُا ابْنَ عُمَرَ تَفَرَّقُوا عَنْهَا وَقَالَ ابْنُ عُمَرَ مَنْ فَعَلَ هَذَا؟ إِنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَعَنَ مَنْ فَعَلَ هَذَا.(الحديث ٥٥١٥):

سەعیدی کوڕی جوبەیر -ڕەحمەتی خوای لێ بێ- فەرمووی: لەخزمەتی عەبدوڵلای کوڕی عومەردا بووم، لەلای تاقمێ لاوی قورەیشەوە ڕەت بوو، مریشکێکیان نابۆوە بەنیشانە و تیریان تێدەگرت، ئەو تیرانەی کەلێی نەئەدا، دەیاندا بەخاوەن مریشکەکە، کە چاویان کەوت بە ئیبنوعومەر، لەشەرمانا هەڵهاتن‌و بڵاوەیان لێ کرد، ئیبنوعومەر فەرمووی: کێ ئەمەی کردووە، ئەمە ئیشی چ بێ ویژدانێکە، دەك نەفرینی خودای لێ بێ، چونکە پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- لەعنەتی کردووە لەوکەسەی کە گیانلەبەر دەنێتەوە بەنیشانە). (ریاض/٤ ژ/٢٨٢ ل/١١٨٠ ژ/٢ + تاجی کوردی/٤ ژ/٩ ل/٢٨ ژ/٣).

**ڕوونکردنەوە:**

سەعیدی کوڕی جوبەیر -ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێ بێ- پێشەوایەکی گەورەو شکۆمەندە لەفەرموودەزانەکان، لەچینی شوێنکەوتوانە، کەناسراون بە تابعین، چینی دووەمی موسوڵمانان، سەعیدو عەکرەمە و عەتای کوڕی رەباح، لەفەقێ گەورەو ناودارەکانی ئیبنو عەباس بوون، سەعید وەك زانایەکی گەورەبوو، زاهیدێك و خواناسێکی گەورەیش بوو، هەمیشە سەرگەرمی خواپەرستی بوو، بەخزمەت زۆر لەگەورە پیاوانی سەحابە گەیشتووە، وەك عەبدوڵلای کوڕی عومەر وە عەبدوڵلای کوڕی عەباس، خەڵکێکی زۆر لەتابیعین شاگردو فەقێ بوون، وەك ئیمامی زوهری. حەجاج بەناهەق کوشتی، دوعای لەحەجاج کرد،

کەلەپاش ئەو زاڵ نەبێ بەسەرکەسی تردا، وە نزاکەی گیرابوو، وە لەپاش شەهیدبوونی سەعید، حەجاج وەك شێتی لێ هات، چەند رۆژێ ژیاو مرد، لە کۆڵە مانگی ساڵی نەوەدو پێنجی کۆچیدا حەجاج سەعیدی کوڕی جوبەیری شەهید کرد. دەڵێن: لەکاتی دادگایی کردنی لەبەردەمی حەجاج دا، حەجاج پێی دەڵێ: داوای لێبوردنم لێ بکە دەنا دەدەم لەگەردنت، سەعیدیش دەفەرموێ: خۆم بەتاوانبار نازانم هەتا داوای لێبوردنت لێ بکەم، لەئەنجاما حەجاج بە دڕندەکانی بەردەستی دەڵێ: بیبەن بۆ بەرقەنارەکە لەگردنی بدەن، بەڵام لەرێ ئەگەر قسەی کرد، بیگێڕنەوە بۆلای خۆم، کەدەیبەن سەعید لەرێ پێدەکەنێ، دەیگێڕنەوە بۆ لای حەجاج، لێی دەپرسێ: بۆ پێدەکەنیت؟ دەڵێ: لەزۆرداریی تۆو لەبێ‌وەیی منو لەبێباکی خودا!! هەروا دەڵێن: پاش ئەوەی حەجاج سەعید شەهید دەکا، وەك شێتی لێ دێ، بەشەو وەك گا دەبۆڕێنێ و دەڵێ: کوا سەعید بیهێنن بۆم، مەیکوژن، بەڵام تازە چ سوود، کار لەکار تەرازابوو.

مێژوونوسی گەورە ئیبنو خەلەکان دەفەرموێ: (ناو هەناوی حەجاج تووشی خۆرە بوو بوو، پزیشك دەچێتە سەری، پارچەیێ گۆشت بەپەتێ بەقورگیا شۆڕدەکاتەوە، پاش تاوێ دەری دەهێنێ، کرمێکی زۆری پێوە دەنووسێ، خوا تووشی لەرزوتایەکی وای کردبوو، لەسەرمانا گەرمی نەدەبۆوە، مەقاڵی پڕ لەئاگری مەشقەڵانیان بەدەوریدا ریزکردبوو. پێستەکەی دەسوتاندا، بەخۆی نەدەزانیو گەرمی نەدەبۆوە!).

لەلای شێخ حەسەنی بەصری -ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێ بێ- حەجاج سکاڵای حاڵی خۆی دەکا، شێخ حەسەن پێی دەفەرموێ: (چەندەم پێ گوتیت کەئازاری پیاوچاکان مەدە، تۆ هەر بەگوێت نەکردم لاساریت کرد..).

حەجاج دەڵێ: ئەی حەسەن: داوای ئەوەت لێ ناکەم کەداوا لەخوا بکەی کەچاکم بکاتەوە، بەڵام داوات لێ ئەکەم کەداوا لەخوابکەی کە بەزوویی گیانم بکێشێ و لەمەزیاتر سزاو ئێش و ئازارم نەدا..).

کەسانێکی زۆر لەوانەی کەلەنزیکەوە بوون دەیانگوت: (حەجاج لەپڕ لەخەو ڕادەپەڕی بەشەڵەژاوی، وەك گا دەیبۆڕاند: خزمینە! سەعیدی کوڕی جوبەیر لەمەزیاتر چی تری لەمن دەوێ، هەرچەند دەمەوێ چاوم بچێتە خەو، سەعید دەست دەخاتە بەربینم و دەمتاسێنێ و دەیەوێ بمخنکێنێ). حەجاج وای هەست دەکرد کە بانگکەرێ دەزریکێنێ بەناو گوێچکەیدا و پێی دەڵێ: (ئەی دوژمنی خودا! لەسەرچی سەعیدی کوڕی جوبەیرت کوشت؟!). خودایە لەگەڵ سەعیدی کوڕی جوبەیردا حەشرمان بکەی. (سبحان الله!). کاتێ کاوەی کوڕم لەگەڵ کوڕێکی کەرکوکی تردا لەڕێی پێنجوێن، لەلایەنی کۆمەڵێ چەتەوە، بۆ پارەو پوول و سەیارە کوژران، لەبیرو باوەڕی بەندەدا، کەئەوە گەورەترین تاوان بوو. کوڕ کوژرا، ماڵ بڕاو دزرا، ئوتومبێل فڕێنرا، کەوتینە باروودۆخێکی واوە دەنگمان بەخوا نەبێ بەکەس نەدەگەیشت، سیو دووساڵ لەغەریبی، بەدڵشکاوی و بەئازاردراوی، بەسەر و ڕیشی سپییەوە، خۆشی خۆشی گەڕاینەوە ناو وڵاتی خۆمان، کەچی کۆمەڵێ کوردی نامەردی سەربەم لایەنە کوردییە بەناو پێشمەرگانە، کەلەڕاستیدا جاش مەرگەن، نەوەك پێشمەرگە، وەك دووپشکی عەربەت و کوڵەمیباب دایان پێمانەوە. جا لەماڵەوە منو دایکی کاوە دەستمان کرد بەپاڕانەوەو قورئان خوێندن و قورئان هەڵبڕین و قووروسکاندان، گاور بەزەیی پیامانا دەهاتەوە، ئاگامان لەهیچ نەبوو، مێشێ دوژمنمان نەبوو، هیچ خەبەرێ نەبوو، ڕۆژێ دووپیاو لەخەڵکی ئەو ناوچەیە هاتن بە پرسمانەوە. ئێمەش ڕێزێکی شایانمان لێ گرتن، دڵم خەبەری دا کەئەمانە شتێ لەدڵیاندایە.

لەبەر ئەوە یەکی کتێبێکی تاجی کوردیم بە دیاری پێیان داو گوتم پێیان: ئەمە نوێنەری ئێمەیە لەلای ئێوە. ئەوانیش بەخەیاڵی خۆیان ئێمە ماڵە مەلایەکی هەژاری خودای بێ کەسین و تەواو، لەبەرئەوە جێگەی مەترسی نین بۆیان.

جا رۆژێ جەژنی مەولوود (یا جەژنی میعراج) بوو، پاش عەصر دەعوەت کرابووم، بۆ مزگەوتی گەورە، لەو ئاهەنگەدا لەناو مەلاکانا دانیشتبووم، خزمێکم هات، گوتی: کابرایەك والەدەرەوە داوات دەکات، کەچووم دەڕوانم واپیاوێ ڕانکو چۆغەیەکی ڕەشی وا لەبەردا، لەناو حافظەکانا لەبەردەم مەرقەدەکەی کاك ئەحمەدی شێخ دا دانیشتووە، کەمنی دی گوتی: تۆ نووری فارسی باوکی کاومیت؟ گوتم: بەڵێ بۆچی؟ گوتی: دەبڕۆ دەمانچەیێ بێنەو بمکوژەو ڕزگارم بکە، من یەکێکم لەوکۆمەڵەی کە کوڕەکەی تۆمان کوشتووە، گوتم: بابچینە ژوورێ لە ژووری حافظەکان، لەوێ گوتی: ناڕۆم هەتا نەمکوژی، ژیانم لێ تاڵ بووە، شەوتا بەیانی نەقیبێکی عەسکەری دێتە گیانم، ئازارم دەدا دەست دەخاتە بەربینم، هەتا بەیانی دەمتاسێنێ، هەموو شەوێ پێم دەڵێ: رۆژ لە رۆژ خراپترت لێ دەکەم، ئەگەر نەچی بۆلای باوکی کاوەو ئەم تاوانە ئاشکرا نەکەیت!! گوتی: ئێوە نازانن هەرشەوێکم مردنێکە، منیش لەگەڵ خزمەکەما هەرچی گوت لەبارەی تاوانەکەوە لەکوتە کاغەزێ بەپەلە نوسیمان، ئەوجا پێم گوت: من لێرەدا، لەپەنا قەبری کاك ئەحمەدی شێخا – غەرقی رەحمەتی خودابێ- پیاو ناکوژم، بەڵام تۆ برۆ با ئەو پۆلیسو ئینزیباتانە پێت نەزانن، ڕێزی مزگەوتەکە نەشکێ، بەیانی سەعات نۆ وەرەوە بۆ فلان دوکان، گوتی باشە. بەڵام ئێستا بێ یان بەیانی نەمکوژی ناڕۆم، کەچوومەوە بۆ ماڵەوە هەموو گوتیان: چۆن هەڵەی وات کردووە تازە نایەتەوە، بەڵام من دڵنیابووم کە قورئان

کەمەندکێشی کردووەو بەدەست خۆی نییە دێتەوە، چونکە کابرا زۆر پەرێشان و لەحاڵێکی سەیرایوو.

کەبەیانی چووین بۆ دوکانەکە، لەوێ گوتی: مـن لەسـەعات هەشـتەوە لێـرەم، ئەمشەوم لەهەموو شەوێ ناخۆشتربوو، نەقیبەکە هاتەوە سەرم، پێی گوتم: ئـەو پیاوە لەخۆت ڕازی نەکەیت خراپترت لێ دەکەم.

جا گوتم بابچین بۆلای مدیری شورتە، کەئەوکاتە: کاك سەلاّح چاوشـین بـوو، وەکاك سەلاّح عەقیدێکی شورتەی پسپۆڕی بانگ کرد، بـە حـزووری ئێمـەو کـاك سـەلاّح و چـەند پـسپۆڕێکی تـری پـۆلیس لەنووکـەوە تاوانەکـەی روون کـردەوە، وەیەکـە یەکـە تاوانبارەکـانی نـاونووس کـرد، وەهـۆی ئـەم خۆتەسـلیم کـردن و اعتراف کردنەی وەك پێشوو روونکردەوە، کەژیانی لێ تاڵ بووەو خەوو خـواردنی لێ هەراسان بووە. کە ئیفادەکەی تەواو بوو، ئەوجا بەمنی گوت: دە درمنگە کـەی دەمکوژیتو رزگارم دەکەیت؟ منیش پێم گوت: من لەم لەحزمیەوە تـۆم بەخـشی، وە داواشم لەکاك سەلاّح و شـورتەکانی تـر کـرد، کـە رێـزی ئـەو کابرایـە بگـرن و ئـازاری نــەدەن، وە ئــەوانیش وایــان کــرد، هــەتا ئــەنجامی دادگــایی، لــەپاش هەمووشــتێ، لەگــەڵ باوکەکەیــدا زۆر هــەوڵمان دا هــەتا بــەردرا، لــەماوەی حەپـسەکەیدا مناڵـەکان خزمـەتێکی زۆریـان کـرد. ئـەوەی کـەلێرەدا دەمـەوێ ئاماژەی پێ بکەم ئەم خاڵانەیە:

١. لــەپاش خــۆ تەســلیم کــردن و زەبتــی ئیفادەکــەی و کەشــفی تاوانەکـەی لەئازارەکەی ڕزگاری بوو.

٢. لــەتاوانبارە نــاو تۆمارکراوەکــان لــەدادگا، هەشــتیان لەشەڕەســەگی شــڕە خۆریدا کوژران و بەر شـەقی قورئـان کـەوتن و دەسـتی ئێمـەیان پێـوە خوێنـاوی نەبوو.

٣. مەلای ئەو گوندەی کە دووپیاوەکەی هاتن بۆ بوارتاقی کردنەوە بۆ ماڵی ئێمە، بۆیگێرامەوە، گوتی: رۆژێ باوکی یەکێ لەوتاوانبارانەی کە کورەکەی تۆیان کوشتووە، هات بۆ مزگەوت، کتێبێکی بەدەستەوە بوو، گوتی: مەلا ئەم کتێبە چی لێ بکەم ئەمە ماڵی منی وێران کرد، کەتەماشام کرد: کتێبەکە بەرگێکی تاج بوو بەکوردی، تۆ بەدیاری دابووت بەباوکی ئەو تاوانبارەکە کورەکەی لەجەردەییدا، لەرێگەی پێنجوێن کوژرابوو.

٤. لەرێگەی خزمێکمانەوە، رۆژێ کابرایێ هات، گوتی: بە ئوتومبیلێکی بەرازیلی (ع)ت بۆ دەکوژم، کە (ع) یەکێ بوو لە بکوژەکان، منیش دەرم کردو بەخزمەکەمانم گوت: من بەگولله کەس ناکوژم، قورئانەکەمم نیشانداو گوتم: من ئەمە چەکی دەستمەو بەس. دەوری مانگێکی پێ چوو، عومەر چاوشین ئەوکابرایەی کوشتو لەکوردوستانا دەنگی دایەوە و کردیان بەیەکێ لەپێنج پاڵەوانەکان!.

سەعیدی کوری جوبەیر —رەزاو رەحمەتی خوای لێ بێ- چل ساڵ لەریزی یەکەمی جەماعەتا بووە، جەماعەتی نەفەوتاوە، لەوماوەیەدا پشت ملی مەئمومی نەدیوە، لەتەدریبی راوی دا دەفەرموێ: فەرمووده زانی گەورە یەحیای کوری سەعید —رەزاو رەحمەتی خوای لێ بێ- دەفەرموێ: (مورسەلاتی کوری جوبەیر لەلام باشترە لە مورسەلاتی عەطاء). وە هەروەها لە تەدریبی راوی ئیمامی سیووطیدا —رەزاو رەحمەتی خوای لێ بێ- دەفەرموێ: (کۆمەڵێ لەزانا گەورەکان، کەیەکێ لەوان سەعیدی کوری جوبەیرە —رەزاو رەحمەتی خوای لێ بێ- رێگەی نوسینەوەی فەرموودەیان دەدا، وە خۆشیان دەیانکرد، هەروەك رێگەی زەبتی فەرموودەیان ئەدا، وە خۆشیان دەیانکرد). (ضبط) بریتیە لەنوختە و سەر و بۆرو ژێر و زەنەکردن بۆ وشە، لەگەڵ نوسینی اعراب

بۆی، هەتا وشەو ڕستە بەپێی ڕێنووس و ڕێزمان کۆنترۆڵ بکرێن و دوایی بەجوانی و بەڕەوانی، بەبێ هەڵە لەبەربکرێ، یا بنوسرێ.

١٢٧٩- عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: مَرَّ ابْنُ عُمَرَ بِفِتْيَانٍ مِنْ قُرَيْشٍ قَدْ نَصَبُوا طَيْرًا، وَهُمْ يَرْمُونَهُ، وَقَدْ جَعَلُوا لِصَاحِبِ الطَّيْرِ كُلَّ خَاطِئَةٍ مِنْ نَبْلِهِمْ، فَلَمَّا رَأَوْا ابْنَ عُمَرَ تَفَرَّقُوا، فَقَالَ ابْنُ عُمَرَ: مَنْ فَعَلَ هَذَا؟ لَعَنَ اللَّهُ مَنْ فَعَلَ هَذَا، إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَعَنَ مَنِ اتَّخَذَ شَيْئًا فِيهِ الرُّوحُ غَرَضًا. {الحديث: ٥٠٣٥ = ٥٠٢٣ فم. تجريد/٥/١٣٥، رقم: ١٨٣٣ = ٥٥١٥ فتح الباری}[١٢٧٩]:

سەعیدی کوڕی جوبەیر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەتی عەبدوڵڵای کوڕی عومەردا بووم، لەلای تاقمێ لاوی قوڕەیشەوە ڕەت بووین، باڵندەیەکیان نابۆوە بەنیشانەو تیریان تێدەگرت، ئەو تیرانەی کە لێی نەدەدا دەیاندا بەخاوەن مریشکەکە، کە چاویان کەوت بە ئیبنو عومەر، لەشەرمانا هەڵهاتن و بڵاوەیان لێکرد، ئیبنو عومەر فەرمووی: کێ ئەمەی کردووە؟ ئەمە ئیشی چی بێ ویژدانێکە، دەك نەفرینی خودای لێ بێ، چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەفرەت و لەعنەتی کردووە لەو کەسەی کە گیانلەبەر، هەر گیانلەبەرێ بێ، دەنێتەوە بەنیشانە). {تاج/٣، زنجیرە: ٩، ژمارە: ٢٦٠٢ ج/٤ + ریاض/٤، زنجیرە: ٢٨٢، ژمارە: ١٦٠١ چاپی دووەم}.

---

[١٢٧٩] تجرید/٥، ژمارە: ١٨٣٣ = ١٥١٥ بخاری. پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ١٢٤٨ = ٥٠٣٥ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٧٢ رقم الباب/٢٥).

## ( پوختەیەکی کورتی نامەی خواردنەکان )

١- هەر خۆراکێ لە کاتی خواردنیدا ناوی خودای لێ نەهێنرێ شەیتان بە حەلاڵی دەزانێو لێی دەخواتو پیتو فەڕی نامێنێ.

٢- شەیتان نەفامو نەزان بەکاردەهێنێ بۆ گەیشتن بە مەبەستی گڵاوی خۆی، شەیتان شت دەخواتو دەخواتەوە.

٣- دروست نییە لە خواردنو خواردنەوەی حەرام ناوی خودا بهێنرێ، بەڵکوو کاری وا گاڵتەکردنە بە ئایین. خوا پەنامان بدا.

٤- سوننەتە خواردنو خواردنەوە بەدەستی راست بێ، مەگەر لەبەر ناچاری.

٥- واباشە مرۆڤ لەبەردەمی خۆیەوە بخوات، مەگەر هۆیەکی رەوا هەبێ.

٦- سوپاس کردنی خودا لەسەر نانو ئاو سوننەتە.

٧- زەخیرە خستن بۆ بژێویی خێزان بەپێی باوی ناسراوی ناو کۆمەڵ پەسەندە.

٨- کۆمەڵێ گیاندار کە گۆشتیان دەخورێ یا ناخورێ.

٩- دروست نییە نەنگو رەخنە لەنانو ئاو بگیرێ، بەڵام شتێ کە دڵ نەیبا، واباشە بەزۆر نەیخۆیت.

١٠- خۆڵو گڵو قوڕو بەردو دارو درەختو گژوگیاو پووشو رووەك بەگشتیو کانو کانزا، وەك خوێو قیرو نەوتو بەنزینو غازو ئاوو زەهرو ژەهرو هەرچی تر هەیە لەسەر زەوی، گیانلەبەرو پاشەڕۆو بەرهەمی گیانلەبەری لێ دەرچێ، ئەمانە هەموو لە بنەڕەتدا پاکن، لەبەرئەوە حەرام نین، بەڵام بەم سێ مەرجە:

أ/ زیان لەگیانو جەستەو هۆشی مرۆڤ نەدەن، ئەگەر شتی وا رووبدا، خواردنو خواردنەوەیان نادروستەو تاوانە، وەك کەسێ ئەوەندە نەوت، یا زەهر،

يا گووژاڵك بخوات كه بيكوژێ، يا شەل‌و شێت‌و گێڕو ویڕی بكا يا هەر زيانێكی تری لێبدا.

ب/ لەشەرعا، بە پيس، يا بەحەرام دانەنرابێ، وەك مەی‌و بادەو تلياك‌و هەموو ماددەيەكی سەرخۆشكەرو بكوژو پيس يا حەرام.

ج/ تێكڵاوی شتی پيسی شەرعی نەبووبن‌و بەشتی پيس پيس نەبووبن. وەك بەردێكی جيقناوی، يا دارێكی گڵاو بوو.

١١- خواردن‌و خواردنەوەكان‌و گيانلەبەران لەپێشەوە بڕيارەكانيان زانران، گەرچی بەكورتيش بوو.

١٢- پێشەوا نەوەوی (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: هەموو جارێ كەسێ كە دەيەوێ گيانلەبەرێ سەر ببڕێ، با لەپێشا ئاژەڵەكە، يا پەلەوەرەكە، بەرەو رووگە، لەسەر لای چەپ پاڵ بخات، ئەگەر بزن‌و مەڕو شتی تری وابوو. سەری ئاژەڵەكە بەدەستی چەپی بگرێ وەقاچی راستی دابنێ لەسەر لاملی لای راستی، لەكاتی دەستكردن بەسەربڕينی، ناوی خودا بهێنێ‌و باش وايە كە بڵێ: (بسمِ اللهِ وَاللهُ أكبرُ). وە بەجوانی سەری ببڕێ بەچەقۆيەكی تيژ، هەتا زيادە ئازاری نەدات. {بڕوانە: تاج/٣، زنجيرە: ١٣، ژمارە: ٢٦١٦} .

# ٣٥- كِتَابُ الأَضَاحِي
## نامەی قوربانی

{بڕوانە: فیقهی ئاسان/٢، زنجیرە: ٣٦٧ هەتا زنجیرە: ٣٧٥ لە لاپەڕە: ٩٩١وە هەتا لاپەڕە: ١٠١٣ + تەجریدی بوخاری/٥، لاپەڕە: ١٣٥، زنجیرە: ٧٦، لە ژمارە: ١٨٣٨وە هەتا ژمارە: ١٨٣٩ + مختصر صحيح مسلم/٣، لاپەڕە: ٣٠٨ چاپی یەکەم، زنجیرە: ٣٦، لە ژمارە: ٩٩٦وە هەتا ژمارە: ١٢٦١ + تاجول ئوصول/٣، لاپەڕە: ١٩٠، زنجیرە: ١٦، ژمارە: ٢٦٣٦ هەتا لاپەڕە: ٢٤٣، زنجیرە: ٢٨، ژمارە: ٣٧٦١ + ریاضی صالحين/٢، زنجیرە: ١١١ هەتا زنجیرە: ١١٦ لە ژمارە: ٧٥٧وە هەتا ژمارە: ٧٧٨، زنجیرە: ١١٦} + {شەرحی بلوغ المرام/٣، لەژمارە: ١٣٧٢ هەتا ژمارە: ١٣٨٠ = زنجیرە: ٨٦ بەتەواوی} .

### (١) باب وَقتها
### باسی کاتەکەی

١٢٨٠- عَنِ جُنْدَبُ بْنُ سُفْيَانَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: شَهِدْتُ الأَضْحَى مَعَ رَسُولِ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَلَمْ يَعْدُ أَنْ صَلَّى وَفَرَغَ مِنْ صَلاَتِهِ سَلَّمَ، فَإِذَا هُوَ يَرَى لَحْمَ أَضَاحِيَّ قَدْ ذُبِحَتْ قَبْلَ أَنْ يَفْرُغَ مِنْ صَلاَتِهِ، فَقَالَ: «مَنْ كَانَ ذَبَحَ أُضْحِيَّتَهُ قَبْلَ أَنْ يُصَلِّيَ، أَوْ نُصَلِّيَ، فَلْيَذْبَحْ مَكَانَهَا أُخْرَى، وَمَنْ كَانَ لَمْ يَذْبَحْ فَلْيَذْبَحْ بِاسْمِ اللَّهِ».
{الحديث: ٥٠٣٧ = ٥٠٢٥ فم. بخاري. عيدين: ٩٨٥، ٥٥٠٠، ٥٥٦٢، ٦٦٧٤، ٧٤٠٠. نسائي. ضحايا: ٤٣٨٠. ابن ماجة. أضاحي: ٣١٥٢. تحفة الأشراف: ٣٢٥١} : [١٢٨٠]

---

[١٢٨٠] بخاری. عیدین: ٩٨٥. مختصر صحيح مسلم = پوختەی موسلیم: ١٢٥٢ = ٥٠٣٧ شیحا (بخاری رقم الكتاب/١٣ رقم الباب/٢٣).

**جونـدوبی کـوڕی سـوفیان (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: ڕۆژی جـەژنی قوربان، لە خزمەتی پێغەمبـەردا (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) ئامـادەی نوێـژی جەژنی قوربان بووم، هەر کە لەنوێژی جەژن بوویەوە، یەکسەر بەبێ دواکـەوتن سلاوی دایەوە، کەچی چاوی بەگۆشـتی قوربـانی کـەوت، کـە بەرلـەوە پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەبەرنوێژیی نوێـژی جـەژن ببێتـەوە سـەربڕابوون، فەرمووی: (هەرکەسێ قوربانی سەربڕێ، پێش ئەوە کە نوێژی جـەژنی کردبـێ، با لەجێگەی ئەوە ئاژەڵێ تر سەرببڕێ) یا فەرمووی: (بەرلـەوە کـە ئێمـە نوێـژی جەژنمان ئەنجام دابێ، با لەباتی ئەوە قوربانییەکی تربکا، بـەلام ئـەوەی کەهـەتا دوا تەواو بوونی نوێژی جەژن سەری نەبڕیوە، بانـاوی خـودای لێ بێنـێو سـەری ببڕێ!).**

**ڕوونکردنەوە:**

**لەمەزهـەبی ولاتـی کـوردەواری خۆمانـا، کـە مەزهـەبی ئیمـامی شـافیعییە (ڕەزاو ڕەحمـــەتی خـــودای لێ بـــێ) کـــاتی قوربـــانی دەســـت پێـــدەکا، لـــەپاش خۆرکەوتنو تێپەڕبوونی ئەوەندە کە بەشی کردنی نوێژی جەژنو دوو وتاربکا، وە هـەتا ڕۆژی چـوارەمی جـەژنی قوربـان، کاتەکـەی بـەڕۆژو بەشـەو بەردەوامـە هـەتا بـانگی شـێوانی شـەوی چـواردەی مـانگ، ئـیتر نوێـژی جـەژن کرابـێ، یـا نەکرابێ، شاربێ یا گوند جیاوازی نییە.**

**١٢٨١- حَدَّثَنَا الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ (رضى الله عنهما) قَالَ ضَحَّى خَالٌ لِـى يُقَـالُ لَـهُ أَبُو بُرْدَةَ قَبْلَ الصَّلاَةِ ، فَقَالَ لَهُ رَسُـولُ اللَّـهِ (صـلى الله عليـه وسـلم): «شَـاتُكَ شَـاةُ لَحْمٍ». فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ عِنْدِى دَاجِنًا جَذَعَةً مِـنَ الْمَعَـزِ . قَـالَ « اذْبَحْهَـا وَلَـنْ**

تَصْلُحَ لِغَيْرِكَ » . ثُمَّ قَالَ « مَنْ ذَبَحَ قَبْلَ الصَّلاَةِ فَإِنَّمَا يَذْبَحُ لِنَفْسِهِ ، وَمَنْ ذَبَحَ بَعْدَ الصَّلاَةِ فَقَدْ تَمَّ نُسُكُهُ ، وَأَصَابَ سُنَّةَ الْمُسْلِمِينَ». [١٢٨١]

**لەژمارە (٥٠١)ی تەجریدی بوخاریدا ئاوایە:**

عَنْ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ خَطَبَنَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَ الْأَضحَى بَعْدَ الصَّلَاةِ، فَقَالَ: (مَنْ صَلَّى صَلَاتَنَا، وَنَسَكَ نُسُكَنَا فَقَدْ أَصَابَ النُّسُكَ، وَمَنْ نَسَكَ قَبْلَ الصَّلَاةِ، فَإِنَّهُ قَبْلَ الصَّلَاةِ وَلَا نُسُكَ لَهُ). فَقَالَ أَبُو بُرْدَةَ بْنُ نِيَارٍ، خَالُ الْبَرَاءِ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَإِنِّي نَسَكْتُ شَاتِي قَبْلَ الصَّلَاةِ، وَعَرَفْتُ أَنَّ الْيَوْمَ يَوْمُ أَكْلٍ وَشُرْبٍ، وَأَحْبَبْتُ أَنْ تَكُونَ شَاتِي أَوَّلَ مَا يُذبَحُ فِي بَيْتِي، فَذبَحْتُ شَاتِي وَتَغَدَّيْتُ قَبْلَ أَنْ آتِيَ الصَّلَاةَ، قَالَ: (شَاتُكَ شَاةُ لَحْمٍ). قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ فَإِنَّ عِنْدَنَا عَنَاقًا لَنَا جَذعَةً، هِيَ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ شَاتَيْنِ أَفَتَجْزِي عَنِّي؟ قَالَ: (نَعَمْ، وَلَنْ تَجْزِيَ عَنْ أَحَدٍ بَعْدَكَ). (الحديث:٩٥٥):

**بەرائی کوڕی عازب (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: لەڕۆژی جەژنی قوربانـدا لەپاش کردنی نوێژی جەژن پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ) وتارێکی فەرموو: تیایدا فەرمووی: (کەسێ وەك ئێمە ئەم نوێژە بکائەوجا وەك ئێمە قوربانی بکا، ئەوە یاسای قوربانی کردنی پێکاوە، بەلاّم کەسێ لەپێش نوێژی جەژندا قوربانی سەرببڕێ‌ئەوە بری قوربانی ناکەوێ، چونکە لەپێش نوێژەوە بووە! ).**

**ئەبو بوردەی خالّم فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا ! دەسا من قوربانییەکەمم لەپێش کردنی نوێژی جەژندا سەربڕی، چونکە وامزانی کەئەمڕۆ جەژنەو ڕۆژی شت خواردنو شت خواردنەوەیە، وەپێم خۆش بوو**

---

**[١٢٨١] تجرید/١، ژمارە: ٥٠١ = ٩٥١ بخاری. پوختەی موسلیم: ١٣٥٣ = ٥٠٤٦ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٧٣ رقم الباب/٨).**

کەیەکەم شت کەلەماڵەکەما سەربڕێ ئەو قوربانییەبێ، لەبەر ئەوە ئاژەڵێکی وردەم سەربڕی‌و کردم بەقوربانی، وەپێش ئەوەی کەبێم بۆ نوێژی جەژن قاوەلتی بەیانیم کردووە. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (ئەوە بری قوربانی ناکەوێ، دادەنرێ بەکوشتییەکی ئاسایی) خاڵیشم عەرزی کرد: باشە ئەی پێغەمبەری خودا! گێسکە مێیەکمان هەیە، لەباری دڵی من دا لەدووبزنی سەرە باشترە، ئەگەر ئەو گێسکە مێیە بکەم بەقوربانی بری قوربانی دەکەوێ یانا؟ فەرمووی: (بەڵێ بری قوربانی دەکەوێ، بەلام بەس بۆتۆ بری دەکەوێ، بۆکەسی تر شتی‌وا نابێ، کردنی گێسك بەقوربانی تایبەتمەندە بەتۆوە). (ت/٤/٣٩/٧).

**راڤەو شیکردنەوە:**

(شات) واتە: مەڕیابزن، واتە: ئاژەڵی وردە، چونکە ئاژەڵ ناوە بۆچوار شت، وەك لەئەحمەدیدا ئاماژە دەکاکە (ئەنعام)-واتە: ئاژەڵ- ناوی بزن‌و مەوڕ و ووشترو گایە.

لە ژمارە: (١٢٥٣)ی پوختەی موسلیما ئاوایە:

عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «إِنَّ أَوَّلَ مَا نَبْدَأُ بِهِ فِي يَوْمِنَا هَذَا أَن نُصَلِّي، ثُمَّ نَرْجِعُ فَنَنْحَرُ، فَمَنْ فَعَلَ ذَلِكَ فَقَدْ أَصَابَ سُنَّتَنَا، وَمَنْ ذَبَحَ فَإِنَّمَا هُوَ لَحْمٌ قَدَّمَهُ لأَهْلِه، لَيْسَ مِنَ النُّسُكِ فِي شَيْءٍ»، وَكَانَ أَبُو بُرْدَةَ بْنُ نِيَارٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَدْ ذَبَحَ فَقَالَ: عِنْدِي جَذَعَةٌ خَيْرٌ مِنْ مُسِنَّةٍ، فَقَالَ: «اذْبَحْهَا وَلَنْ تَجْزِيَ عَنْ أَحَدٍ بَعْدَكَ». {الحديث: ٥٠٤٦ = ٥٠٣٤ فم. تجريد/١، رقـــــم: ٥٠٠ = ٩٥١، ٩٥٥، ٩٦٥، ٩٦٨، ٩٧٦، ٩٨٣، ٥٥٤٥، ٥٥٥٧، ٥٥٦٠،

٥٥٦٣، ٦٦٧٣. أبو داود. أضاحي: ٢٨٠٠. ترمذي. أضاحي: ١٥٠٨. نسائي. عيدين: ١٥٦٢ + تجريد/١/٤٧٧، ذمارة: ٥٠٠/٩٥١}:

بەرائی کوڕی عازیب (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەم ڕۆژەمانا، کە یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربانە، یەکەم شت لەڕێو ڕەسمی جەژن کە دەستی پێدەکەین ئەومیە کە نوێژی جەژن دەکەین، ئینجا دەگەڕێینەوەو قوربانی سەردەبڕین، جا ئەوەی کەئاوا بکا ئەوە یاساو سوننەتی ئێمەی پێکاوە، بەڵام ئەوەی لەپێش نوێژدا قوربانی سەربڕێ ئەوە دانانرێ بە قوربانیو فڕی بەسەر قوربانییەوە نییە، بەڵکوو ئەوە گۆشتەو کردوویەتی بۆ کەسوکاری خۆی).

ئەبو بوردەی کوڕی نییاز (ڕەزای خودای لێ بێ) قوربانییەکەی خۆی لەپێش نوێژدا، سەربڕیبوو، عەرزی حەزرەتی کرد: گێسکێکم هەیە لە چێرێ باشترە ئایا دەبێ کە بیکەم بەقوربانی؟ فەرمووی: (سەری ببڕەو بیکە بە قوربانی، بەڵام لەپاش تۆ گێسك بۆ کەسی تر دروست نییە کەبیکا بە قوربانی). {تاج/٣، زنجیرە: ١٣، ژمارە: ٣٦٢١}.

١٢٨٢- حَدَّثَنَا أَنَسٍ قَالَ قَالَ النَّبِيُّ – صلى الله عليه وسلم – «مَنْ ذَبَحَ قَبْلَ الصَّلاَةِ فَلْيُعِدْ» . فَقَامَ رَجُلٌ فَقَالَ هَذَا يَوْمٌ يُشْتَهَى فِيهِ اللَّحْمُ . وَذَكَرَ مِنْ جِيرَانِهِ فَكَأَنَّ النَّبِيَّ – صلى الله عليه وسلم – صَدَّقَهُ ، قَالَ وَعِنْدِى جَذَعَةٌ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ شَاتَيْ لَحْمٍ ، فَرَخَّصَ لَهُ النَّبِيُّ – صلى الله عليه وسلم – فَلاَ أَدْرِى أَبَلَغَتِ الرُّخْصَةُ مَنْ سِوَاهُ أَمْ لاَ. [١٢٨٢]

ئەنەس (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ لەپێش نوێژی جەژنا، قوربانی سەربڕێ،

---

[١٢٨٢] بخاری عیدین: ٩٥٤، مسلم: ٥٠٥٢ شیحا (بخاری رقم الکتاب/١٣ رقم الباب/٥).

ئەوە برێتی قوربانی ناکەوێ، با دووبارەی بکاتەوە) پیاوێ هەڵسا گوتی: ئەمڕۆ ڕۆژێکی وایە کە خەڵك حەزیان لە گۆشتەو دەمرو دراوسێش هەژارییان واتیادا، تا زوو گۆشتیان پێ بدرێ باشترە، وەك بڵێی پێغەمبەر قسەکەی پەسەندبکا وابوو، ئەوجا پیاوەکە گوتی: گێسکێکم هەیە.......تاد).

١٢٨٣- عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَعْطَاهُ غَنَمًا يَقْسِمُهَا عَلَى صَحَابَتِهِ فَبَقِيَ عَتُودٌ فَذَكَرَهُ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: (ضَحِّ بِهِ أَنْتَ). (الحديث ٢٣٠٠، أطرافه في: ٢٥٠٠، ٥٥٤٧، ٥٥٥٥):[١٢٨٣]

عوقبەی کوڕی عامیر(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) بڕکەیێ رانی پێم دا، کە دابەشی بکەم بەسەر هاوڕێکانم دا بۆ قوربانی، گێسکێ مایەوە، عەرزی پێغەمبەرم کرد: قوربان! گێسکێ ماوەتەوە، فەرمووی: (ئەویش بکە بە قوربانی بۆ خۆت) (فیقهی ئاسان\ل —٥٠٠ز-٢٢٠).

## ڕوونکردنەوە:

١- عوقبەی کوڕی عامیری جوهەنی، هاوەڵێکی ناوداری پێغەمبەرە، فەرموودەی زۆری لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە، کۆمەڵێ لەهاوەڵان و پەیڕەوان (سەحابەو تابعین) فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە، ئەبو سەعیدی کوڕی یونس دەڵێ: عوقبە قورئانخوێن و فەرائیززان و شەرعزانێکی جوان بوو، زمانڕەوان و شاعیرو نووسەر بوو، هەموو قورئانی لەبەر بوو، قورئانێکی بۆخۆی نووسیبوو، لەسەر شێوەی تەئلیفی موصحەفی عوسمان نەبوو، لەئاخیرەوە

---

[١٢٨٣] تجرید/٢، ژمارە: ١٠١٢ = ٢٣٠٠ بخاری. مسلم: ١٩٦٧ = ٥٠٥٧ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٤٠ رقم الباب/١).

نووسرا بوو (كَتبَهُ عُقْبَهُ بْن عَامِرِ بِيَدِهِ = عوقبەی كوڕی عامیر ئەم قورئانەی بەدەستی خۆی نووسیوە) فەرمایشتەكەی ئەبو سەعید تەواو بوو.

عوقبە بەرید بوو، ئەو موژدەی ئازاد كردنی شاری دیمەشقی برد بۆ ئیمامی عومەر، لایەنگیری موعاویە بوو، لەشەڕی صەفیندا لەگەڵ موعاوییە بوو، ماوەیێ موعاویە كردی بەكارمەندی سەر میصر، لەسەردەمی موعاوییەدا عەمری خودایكرد. (ڕەزاو ڕەحمەتی خودای گەورەی لێ بێ).

## (٣) باب إستحباب الضَّحِيَّةِ وَذَبْحُهَا مُبَاشَرَةً بِلاَ تَوْكِيلٍ والتسمية والتكبير قوربانی كردن سوننەتە، وا پەسەندە قوربانیكەر خۆی بە دەستی خۆی قوربانییەكەی سەرببڕێ‌و نوێنەر نەگرێ، وە لەسەرەتاوە ناوی خودا بهێنێ‌و ئەڵڵاهوئەكبەر بكات

١٢٨٤- عَنْ أَنَس بنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) {أَنَّ اَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) كَانَ يُضَحِّي بِكَبْشَيْنِ أَمْلَحَيْنِ، أَقْرَنَيْنِ، وَيُسَمِّي، وَيُكَبِّرُ، وَيَضَعُ رِجْلَهُ عَلَى صِفَاحِهِمَا. وَفِي لَفْظٍ: ذَبَحَهُمَا بِيَدِهِ} مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ. وَفِي لَفْظٍ: {سَمِينَيْنِ} وَلِأَبِي عَوَانَةَ فِي "صَحِيحِهِ" : {ثَمِينَيْنِ}. بِالْمُثَلَّثَةِ بَدَلَ اَلسِّينِ وَفِي لَفْظٍ لِمُسْلِمٍ، وَيَقُولُ: {بِسْمِ اَللَّهِ. وَاَللَّهُ أَكْبَرُ}. {بخاری. أضاحی/٥٥٥٨، ٥٥٦٥. مختصر صحيح مسلم/٣، ژمارە: ١٢٥٦ = شيحا/٥٠٦١ = مسلم/فؤاد/١٩٦٦. نسائی. ضحايا/٤٤٢٧. ابن ماجة. أضاحی/٣١٢٠. تحفة الأشراف/١٢٥٠}: [١٢٨٤]

ئەنەسی كوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ڕۆژی جەژنی قوربان، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دوو بەرانی تەوی شاخداری كرد

---

[١٢٨٤] بخاری. أضاحی: ٥٥٥٨، ٥٥٦٥. پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١٢٥٦ = ٥٠٦١ شيحا = مسلم ترقيم محمد فؤاد/١٩٦٦ (بخاری رقم الكتاب/٨٣ رقم الباب/١٤).

بەقوربانی، بەدەستی خۆی سەری بڕین، فەرمووی: وە ناوی خودای هێناو ئەللاهوئەکبەری کرد بەم شێوەیە: (بِاسْمِ اللَّهِ وَاللَّهُ أَكْبَرُ) وەقاچی ڕاستی دانا لەسەر لاملیان، وەلەسەر لای چەپ پاڵی خستن‌و بەدەستی چەپی سەری بەرانەکانی گرت‌و بەدەستی ڕاستی چەقۆکەی گرت، ئەنجا سەری بڕین. {تاج/٣، زنجیرە: ١٤، ژمارە: ٢٦٢٣}.

**ڕوونکردنەوە:**

١- زاناکان دەفەرموون: ئەو بەهرانەی لەم فەرموودەیە وەردەگیرێن:

آ- بەران کردن بەقوربانی باشترە لەمەڕ، واتە: بەشێوەی گشتی نێر لەمێ باشترە بۆ قوربانی.

ب- هەتا قەڵەوتر بێ خێرترە، چونکە لەهەندێ گێڕانەوەدا: (دوو بەرانی قەڵەوی کرد بەقوربانی).

ج- ئەو شتەی کە دەکرێ بەقوربانی بەهادار بێ، چونکە لەهەندێ گێڕانەوەدا دەفەرموێ: (ثمینین - دوو بەرانی بەنرخ).

## (٤) بابُ جَوَازِ الذَّبحِ بِكُلِ ما أنهَرَ الدَّمَ، إلاَ السنَّ والظفر وسائِرَ العِظَامِ
## سەربڕین بە هەر شتێ دەبێ، کە فیچقە بە خوێن بکا ددان‌و نینۆک‌و هەموو ئێسقانێکی لێ دەرچێت

١٢٨٥- عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّا لاَقُو الْعَدُوِّ غَدًا، وَلَيْسَتْ مَعَنَا مُدًى؟ قَالَ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « أَعْجِلْ أَوْ أَرْنِي، مَا أَنْهَرَ الدَّمَ وَذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ، فَكُلْ لَيْسَ السِّنَّ وَالظُّفُرَ، وَسَأُحَدِّثُكَ، أَمَّا السِّنُّ فَعَظْمٌ، وَأَمَّا الظُّفُرُ فَمُدَى الْحَبَشَةِ». قَالَ وَأَصَبْنَا نَهْبَ إِبِلٍ وَغَنَمٍ فَنَدَّ مِنْهَا بَعِيرٌ، فَرَمَاهُ رَجُلٌ بِسَهْمٍ فَحَبَسَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِنَّ لِهَذِهِ الإِبِلِ أَوَابِدَ كَأَوَابِدِ الْوَحْشِ،

فَـإِذَا غَلَـبَكُمْ مِنْهَـا شَـيْءٌ فَاصْـنَعُوا بِـهِ هَكَـذَا». {الحـديث: ٥٠٦٥ = ٥٠٥٣ فـم. تجريـد/٣/١٦٨، ژمـاره: ١٠٧٧ = ٢٥٠٧، ٣٠٧٥، ٥٤٩٤، ٥٥٠٢، ٦٠٥٥، ٥٥٠٩، ٥٥٤٣، ٥٥٤٤، ترمـــذى. أحكـــام: ١٤٩٢. نـــسائى. صـــيد: ٤٣٠٨، ٤٤٢٢، ٤٤٢٣}:[١٢٨٥]

رافيعـى كـوڕى خـەديج (رەزاى خـوداى لىٚ بـىٚ) فـەرمووى: گـوتم: ئـەى پێغەمبەرى خودا! ئێمە سبەينىٚ دەگەين بەدوژمن، وەچەقۆيشمان پىٚ نييە، ئايا بەلەتە قاميش‌و بەچەقۆى بـەردين‌و شتى واى تـر ئـاژاڵ سـەربىرين؟ فـەرمووى (درووودى خـوداى لەسـەر بىٚ): (گورجبـە) يـا فـەرمووى: (دەسـتوبردى لێكـە، تـا لەژێر دەستتا مردار نەبێتەوە، ئـيتر بەھەرچى سـەرى دەبـڕى باشـە، بەمـەرجىٚ فيچقە بەخوێن بكاو لەكاتى سەربڕيندا خوێنەكە پەلەميزكە ببەستىٚ، وەنـاوى خوداى لىٚ ببرىٚ، وە بەمـەرجىٚ ئـەو شـتە ددان‌و نينـۆك نـەبىٚ، ئـەوە لێـى بخۆن، پێـشت بڵێم كـە لەبەرچـى دروسـت نييـە شـت بـەددان‌و بـە نينـۆك سـەربىرىٚ، چـونكە ددان ئێـسكەو ئێـسكيش كوڵـەو تيژنييـەو بـەزۆرى مـردارى دەكاتـەوە، نينـۆكيش چـەقۆى حەبەشييەكانە، فـەرمووى: جـا تـالآنى وشـترو رانمـان ھێنـا، وشترىٚ لە تالآنييەكە تەرا بوو، پياوىٚ تيرێكى پێوە ناو، گلى دايەوە، وە بەو تێرە وشترەكە مرد، پێغەمبـەريش (درووودى خـوداى لەسـەر بـىٚ) فـەرمووى: (ھەنـدىٚ وشتر ھەن سڵ‌و سركن، وەك جانەوەرى كێوى سرك‌و تۆڕ وان، جا ئەگەر شتى وا روويداو چارتان نەدەكرد، وەك ئەمە ئاواى لىٚ بكەن). {تاج/٢، زنجيرە: ٧، ژمارە: ٢٥٩٦}.

---

[١٢٨٥] تجريد/٣، ژمارە: ١٠٧٧ = ٢٥٠٧ مختـصر صحيح مـسلم = پوختـەى موسـليم: ١٢٥٠ = ٥٠٦٥ ترقيم وتخريج الشيخ مأمون شيحا لصحيح مسلم (بخارى رقم الكتاب/٧٢ رقم الباب/٢٣).

١٢٨٦- عَنْ رَافِعِ بن خديج رضي الله عنه قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِذِي الْحُلَيْفَةِ فَأَصَابَ النَّاسَ جُوعٌ وَأَصَبْنَا إِبِلاً وَغَنَمًا وَكَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي أُخْرَيَاتِ النَّاسِ فَعَجِلُوا وذبحوا فَنَصَبُوا الْقُدُورَ فَأَمَرَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِالْقُدُورِ فَأُكْفِئَتْ، ثُمَّ قَسَمَ، فَعَدَلَ عَشَرَةً مِنْ الْغَنَمِ بِبَعِيرٍ فَنَدَّ مِنْهَا بَعِيرٌ فطلَبوهُ فأعياهُم وكانَ فِي الْقَوْمِ خَيْلٌ يَسِيرَةٌ فَطَلَبُوهُ فَأَعْيَاهُمْ فَأَهْوَى إِلَيْهِ رَجُلٌ بِسَهْمٍ فَحَبَسَهُ اللَّهُ ثمَّ قَالَ: (إِنَّ هَذِهِ الْبَهَائِمُ أَوَابِدُ كَأَوَابِدِ الْوَحْشِ فَمَا غلبَكُم منها فَاصْنَعُوا بِهِ هَكَذَا). فَقَالَ: جَدِّي إِنَّا نَرْجُو أَوْ نَخَافُ أَنْ نَلْقَى الْعَدُوَّ غَدًا وَلَيْسَ مَعَنَا مُدًى، أَفَنَذْبَحُ بِالْقَصَبِ؟ فَقَالَ: (مَا أَنْهَرَ الدَّمَ وَذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ فَكُلُوهُ، لَيْسَ السِّنَّ وَالظُّفُرَ وَسَأُحَدِّثُكُمْ عَنْ ذَلِكَ: أَمَّا السِّنُّ فَعَظْمٌ وَأَمَّا الظُّفُرُ فَمُدَى الْحَبَشَةِ) (الحديث ٢٤٨٨، أطرافُـــــهُ في: ٢٥٠٧، ٣٠٧٥، ٥٤٩٨، ٥٥٠٣، ٥٥٠٦، ٥٥٠٩، ٥٥٤٣، ٥٥٤٤): [١٢٨٦]

رافیعی كوڕی خەدیج (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: لەذولحولەیفە لەخزمەت پێغەمبەردا بووم، لەشكرەكەی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) توشی برسێتی بوون، جا وشترو ئاژەڵی تالآنیان وەدەست كەوت، فەرمووی: پێغەمبەر خۆی(دروودی خوای لەسەر بێ) لەدوای سوپاكەوە بوو، خەڵكەكەش پەلەیان بوو، دەستیان كرد بەئاژەڵ سەربڕینو مەنجەڵیان خستە سەر ئاگر، هەتا كاتێ پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) هاتە بەرەوە، بەم حاڵەی زانی وەك تەمێ كردنێ بۆیان، فەرمانی دا مەنجەڵە گۆشت ومەرگەكانیان قڵپ كردەوە، ئەوجار پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) خۆی دەستكەوتەكەی دابەش كرد، وە دە سەر پەزی بەیەك وشتر دانا، جا لەم نێوانەدا، وشترێ بەلەسە

---

[١٢٨٦] تجرید/٢، ژمارە: ١٠٧٧ = ٢٤٨٨ = مسلم/محمد فؤاد/١٩٦٨ = ٥٠٦٥ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٤٧ رقم الباب/٣).

بوو، تەرا بوو، کەوتنە شوێنی، چاریان نەکرد، ماندووی کردن لەناو لەشکرەکەدا چەند وڵاخێکی بەرزەی کەم هەبوو، جا پیاوێ لەیاریدەدەران تیرێکی پێومناو خودا بەو تیرە گلی دایەوە.

ئەوجا پێغەمبەر(درووودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەندێ لەم ئاژەڵانە سڵو سرکن، وەك جانەوەری کێوی سرك‌و تۆڕەن جائەگەر شتی‌وا رووی داو چارتان نەدەکرد، کە بەشێوەی ئاسایی سەری بېڕن، ئەوە وەك ئەمە ئاوای لێ بکەن، ئەوە بری سەربڕینەکەی دەکەوێ) رافیع فەرمووی: گوتم: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! ئێمە لەشەڕداین‌و لەگەڵ دوژمن داین‌و دوورنیە سبەینێ بەرەنگاری یەکتر نەبین، جا ئەگەر ویستمان ئاژەڵ سەربڕین چەقۆو کێردی پێویستمان پێ نییە، ئایا بەتەڵە قامیشی تیژو چەقۆی بەردین حەیوان سەربڕین؟ فەرمووی: (گورج بەو دەستو بردی لێ بکەو بەشتی زۆر کول مرداری مەکەرەوە، ئیتر بەهەرچی سەری دەبڕی باشە، بەمەرجێ فیچقە بەخوێنەکە بکاو لەکاتی سەربڕین دا، خوێنەکە پەلە میزکە ببەستێ، وەناوی خودای لێ ببرێ، وە بەمەرجی ئەوەش، ئەو شتەکە پێی سەردەبڕرێ ددان‌و نینۆك نەبێ، ئیتر لێی بخۆ، چونکە ئەوە حەڵاڵە، پێشت بڵێم کەلەبەرچی دروست نییە شت بەددان‌و بەنینۆك سەربېڕێ، چونکە ددان ئێسکەو ئێسکیش کولەو تیژ نییە، وبەزۆری مرداری دەکاتەوە.

نینۆکیش چەقۆی حەبەشییە ناموسوڵمانەکانە، ئەوان دەستووریان وایە، زۆرینەی کات ئاژەڵ بەنینۆك دەخنکێنن‌و دەیخۆن، دەی چاولێکردنیان لەم بێ شەرعیەدا نادروستە).




**راڤەو شیکردنەوە:**

لەم جۆرە کاتانەدا ئەگەر پاش پێکانی ئاژەڵە بەلەسە بووەکە، بەئاسانی دەتوانرا سەربڕێ ئەوە دەبێ بەسەربڕین حەڵاڵ بکرێ، بەڵام ئەگەر مەودای سەربڕین نەبوو ئەوە پێکانەکەی برێتی سەربڕین دەکەوێ‌و بەوە حەڵاڵ دەبێ، هەندێ شت هەیە هەڵەیەکی بڵاوە، وەك مل هەڵکێشانی چۆلەکەو شتی تری وەك چۆلەکە، ئەوە حەرامە، بەوە حەڵاڵ نابێ.

**روونکردنەوە:**

رافیعی کوڕی خەدیج (رەزای خودای لێ بێ) مەدینەییە، لەیاریدەدەرانە. لەهۆزی ئەوسە، لەرۆژی جەنگی بەدردا، لەبەر ئەوەی کە مێردمناڵ بوو. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) رێگەی نەدا پێی کە بەشداری لەو غەزایەدا بکا، بەڵام لەرۆژی جەنگی ئوحوددا پەسەندی کرد بەجەنگاوەرو. رێگەی پێدا کە بەشداریی تیادا بکات، لەم جەنگەدا تیرێ بەریکەوت، شوێنی ئەو تیرە، لەپاش دەوری حەفتاساڵێ، هەڵی دایەوەو بووبە تێراوێ‌و، لەحەفتاو چواری کۆچیدا، لەتەمەنی هەشتاو شەش ساڵیدا، ئەو تیراوێیە کوشتی، لەمەدینە مرد، ئیبنو عومەر نوێژی مردووی لەسەر تەرمەکەی کردو، تەرمەکەی بەرێکرد، کۆمەڵێ ژن، بەقیژەو هاوار، شوێنی تەرمەکەی دەکەون، بۆ سەر گۆڕستان، ئیبنو عومەر پێیان دەفەرموێ: (وس بن، ئەم پیرە مێردە گوناهبار مەکەن، خۆی پیرەمێردێکی ئیختیارە، بەرگەی سزای خودای گەورە ناگرێ!). {بڕوانە: تەجرید/١، ژمارە: ١٠٢٥ + پوختەی موسلیم ژمارە: ٥١٣}.

## (٥) بابُ بَيَانِ مَا كَانَ مِنَ النَهْيِ عَنْ أَكْلِ لُحُومِ الأضاحي بَعْدَ ثلاثٍ في أوّلِ الإسْلاَمِ وَبَيان نَسْخِهِ وَ إِبَاحَتِه إِلى مَتَى شَاءَ

## له سه‌ره‌تای ئیسلامه‌وه له پاش تێپه‌ڕبوونی سێ ڕۆژ به‌سه‌ر قوربانیدا، با قوربانیکار لێی نه‌خوات وه نه‌مه‌یش هه‌ڵوه‌شاوه‌ته‌وه، وه مه‌ودای پێ دراوه هه‌تا چه‌ند ڕۆژ ده‌یه‌وێ لێی بخوات

١٢٨٧- حَدَّثَنَا عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما) قال: قَالَ رَسُولُ اللَّـهِ (صلى الله عليه وسلم): «كُلُوا مِنَ الأَضَاحِيِّ ثَلاَثًا». وَكَانَ عَبْدُ اللَّهِ يَأْكُلُ بِالزَّيْتِ حِينَ يَنْفِرُ مِنْ مِنًى ، مِنْ أَجْلِ لُحُومِ الْهَدْيِ. [١٢٨٧]

عه‌بدوڵڵای کوڕی عومه‌ر (ره‌زای خودایان لێ بێ) فه‌رمووی: پێغه‌مبه‌ر (دروودی خودای له‌سه‌ر بێ) فه‌رمووی: (هه‌تا تێپه‌ڕبوونی سێ ڕۆژ به‌سه‌ر سربڕینی قوربانیدا، قوربانیکار دروسته که لێی بخوات).

جا عه‌بدوڵڵای کوڕی عومه‌ر، له‌به‌ر ئه‌م فه‌رمانه‌ی پێغه‌مبه‌ر (دروودی خودای له‌سه‌ر بێ) له‌پاش سێ ڕۆژه‌که‌ی مانه‌وه‌ی حاجی له‌خاکی مینا، له‌گۆشتی قوربانی نه‌ده‌خوارد، به‌ڵکوو که خاکی مینای به‌جێ ده‌هێشت به‌ڕۆن‌و زه‌یتوونه‌وه شتی ده‌خوارد، نه‌بادا له‌گۆشتی قوربانی بخوات.

١٢٨٨- حَدَّثَنَا عَائِشَةَ (رضى الله عنها) قَالَتِ الضَّحِيَّةُ كُنَّا نُمَلِّحُ مِنْهُ ، فَنَقْدَمُ بِهِ إِلَى النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) بِالْمَدِينَةِ فَقَالَ « لاَ تَأْكُلُوا إِلاَّ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ ». وَلَيْسَتْ بِعَزِيمَةٍ، وَلَكِنْ أَرَادَ أَنْ يُطْعِمَ مِنْهُ وَاللَّهُ أَعْلَمُ. [١٢٨٨]

عائیشه‌ی هاوسه‌ری پێغه‌مبه‌ر (دروودی خودا له‌سه‌ر پێغه‌مبه‌رو ره‌زای خودا له‌هه‌موو هاوسه‌رو هاوه‌ڵانی بێ) فه‌رمووی: له‌مه‌دینه، گۆشتی قوربانیمان

[١٢٨٧] (بخارى رقم الكتاب/٧٣ رقم الباب/١٦).

[١٢٨٨] بخارى. أطعمه: ٥٤٢٣ پوخته‌ی مسلم: ١٢٥٩ = ٥٠٧٦ شيحا (بخارى رقم الكتاب/٧٣ رقم الباب/١٦).

سوێردەکرد تا بۆن نەکا، ئەوجا ناوبەناو پێشکەشمان دەکرد بە پێغەمبەر، فەرمووی: (بەس هەتا سێ ڕۆژ لەگۆشتی قوربانی بخۆن).

فەرمووی: ئەم ڕێگرییەی پێغەمبەر، لەبەر ئەوەنەبوو، کە خواردن لەگۆشتی قوربانی لەپاش سێ ڕۆژ نادروست بێ، بەڵکوو لەبەرئەوە بوو کە دەوڵەمەندەکان بەشی ئاتاجو هەژارەکان بدەن لە گۆشتی قوربانی.

ئەمەیش دەقی گێڕانەوەیەکی تری ئەم فەرموودەیە، نەقڵی دەکەین، لە بەرگی سێی موختەصەری صەحیحی موسلیم، ژمارە (١٢٥٩):

عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِى بَكْرٍ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ وَاقِدٍ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ أَكْلِ لُحُومِ الضَّحَايَا بَعْدَ ثَلاَثٍ. قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِى بَكْرٍ: فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِعَمْرَةَ، فَقَالَتْ: صَدَقَ، سَمِعْتُ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) تَقُولُ: دَفَّ أَهْلُ أَبْيَاتٍ مِنْ أَهْلِ الْبَادِيَةِ حِضْرَةَ الأَضْحَى، زَمَنَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «ادَّخِرُوا ثَلاَثًا ثُمَّ تَصَدَّقُوا بِمَا بَقِىَ»، فَلَمَّا كَانَ بَعْدَ ذَلِكَ قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ النَّاسَ يَتَّخِذُونَ الأَسْقِيَةَ مِنْ ضَحَايَاهُمْ وَيَحْمِلُونَ فِيهَا الْوَدَكَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «وَمَا ذَاكَ»؟ قَالُوا: نَهَيْتَ أَنْ تُؤْكَلَ لُحُومُ الضَّحَايَا بَعْدَ ثَلاَثٍ، فَقَالَ: «إِنَّمَا نَهَيْتُكُمْ مِنْ أَجْلِ الدَّافَّةِ الَّتِى دَفَّتْ فَكُلُوا وَادَّخِرُوا وَتَصَدَّقُوا». {الحديث: ٥٠٧٦ = ٥٠٦٤ فم. بخاري. أطعمة: ٥٤٢٣، ٥٤٣٨، ٥٥٧٠، ٦٦٨٧، ترمذي. أضاحي: ١٥٤٧. أبو داود. أضاحي: ٢٨١٢. نسائي. أضاحي: ٤٤٣١. ابن ماجة. أضاحي: ٣١٩٧. تحفة الأشراف: ١٧٩٠١}:

عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوبەکر، فەرمووی: عەبدوڵڵای کوڕی واقید (ڕەحمەتی خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕێگری دەکرد لەوە کە قوربانیکار، لەپاش تێپەڕبوونی سێ شەو لە گۆشتی قوربانی خۆی بخوات. عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوبەکر فەرمووی: ئەمەم باسکرد بۆ عەمرە،

فەرمووی: ڕاست دەکا، من بۆخۆم لە عائیشەم بیست (ڕەزای خودای لێ بێ) دەیفەرموو: لەڕۆژی جەژنی قوربانا، لەسەردەمی پێغەمبەر خۆیدا (دروودی خودای لەسەر بێ) چەند کەسێ لە خەڵکی سارانشینەکان، هاتن بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ مەدینە، بە ئومێدی یارمەتی، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەم بۆنەیەوە فەرمووی: (لە گۆشتی قوربانییەکانتان، بۆتان هەیە ئەگەر بتانەوێ بەشی سێ ڕۆژی خۆتانی لێ هەڵبگرن، ئیتر چی لەوە زیاتربوو بیبەخشنەوە). جا لەدوا ئەو ساڵە، هەندێ کەس عەرزی حەزرەتی کرد: قوربان! کەسانێ لەپێستی قوربانییەکانیان کوندەو مەشکەو هیزە دروست دەکەن‌و پیوی تواوەی تیا هەڵدەگرن، ئایا شتی وادەبێ؟ فەرمووی: (بۆچی چی بووە تا ئێوە ئەم پرسیارە بکەن؟).

عەرزیان کرد: ئەی ئەوە نەبوو کەتۆ ڕێگریت دەکرد لەوە کە لەپاش سێ ڕۆژ لە گۆشتی قوربانی خۆمان بخۆین؟ دەی کردنی پێستی قوربانی بە کوندەو مەشکەو هیزە بەر ئەم نەهیە ناکەوێ؟ لەوەڵاما فەرمووی: (ئەوە ئەوجارە بۆیە نەهیم لێ کردن لەخواردنی گۆشتی قوربانییەکانتان لەپاش سێ شەو، هەتا یارمەتی ئەو سارا نشینە هەژارانە بدەن، کە ڕەویان کردبوو بۆلای ئێوە تا دەستگیرۆییەکیان بکەن، جا دروستە کە لەگۆشتی قوربانی خۆتان بخۆن‌و لێی قایمە بکەن‌و لێشی ببەخشنەوە). {تاج/٣، زنجیرە: ٢٥، ژمارە: ٢٧٤٠}.

١٢٨٩- حَدَّثَنَا جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رضى الله عنهما) يَقُولُ كُنَّا لاَ نَأْكُلُ مِنْ لُحُومِ بُدْنِنَا فَوْقَ ثَلاَثِ مِنًى ، فَرَخَّصَ لَنَا النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ: «كُلُوا وَتَزَوَّدُوا». فَأَكَلْنَا وَتَزَوَّدْنَا: [١٢٨٩]

---

[١٢٨٩] تجريد/٢، ژمارە: ٨٠٦ = ١٧١٩ بخاری. مسلم/محمد فؤاد/١٩٧٢ - مسلم: ٥٠٧٨ شيحا (بخاری رقم الكتاب/٢٥ رقم الباب/١٢٤).

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لەپێشا لەپاش سێ ڕۆژەکەی مانەوەی حاجی لەخاکی مینا، لەگۆشتی قوربانیو لە گۆشتی ئاژەڵی دیاری بەیتمان نەدەخوارد، بەلام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەمبارەیەوە، مۆڵەتی پێمانداو فەرمووی: (هەم بخۆنو هەم تێشووی لێ بکەن) ئیتر ئێمەیش وامان دەکرد، هەم لێمان دەخواردو هەم لێمان هەڵدەگرت.

١٢٩٠- عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الْأَكْوَعِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ ضَحَّى مِنْكُمْ فَلَا يُصْبِحَنَّ بَعْدَ ثَالِثَةٍ فِي بَيْتِهِ مِنْهُ شَيْءٌ فَلَمَّا كَانَ الْعَامُ الْمُقْبِلُ قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ نَفْعَلُ كَمَا فَعَلْنَا عَامَ الْمَاضِي؟ قَالَ: كُلُوا وَأَطْعِمُوا وَادَّخِرُوا فَإِنَّ ذَلِكَ الْعَامَ كَانَ بِالنَّاسِ جَهْدٌ فَأَرَدْتُ أَنْ تُعِينُوا فِيهَا.(الحديث ٥٥٦٩): [١٢٩٠]

سەلەمەی کوڕی ئەکوەع (ڕەزای خوای لێ بێ) فەمووی: پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (هەرکەسێ لە ئێوە قوربانی دەکا، بابیکا، بەلام نابێ لەپاش سێ شەو لەگۆشتی ئەو قوربانیە لەماڵیا بمێنێ، جالە ساڵی ئایندەدا عەرزیان کرد: ئەی پێغەمەری خودا! ئەمساڵیش وەك پار بکەینەوە؟ فەرمووی: نەء، هەم خۆشتان لێی بخۆنو هەم بەشی خەڵکی تریشی لێ بدەن و هەم قایمە (إدخار)یشی لێ بکەن، پار بۆیەکا وام گوت، چونکە پار ساڵەکەی نەهاتیو گرانی بوو، خەڵکەکە پەرۆش بوونو حاڵیان پەرێشان بوو، ویستم ئێوەیش یاریدەیان بدەنو دستگیرۆیی خەڵك بکەن). (تاج/٤ ل-٤٥ ش/د/ت/ن).

---

[١٢٩٠] تجرید/٥، ژمارە: ١٨٣٨ = ٥٥٦٩ بخاری. مسلم: ١٩٧٤ - ٥٠٨٢ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٧٣ رقم الباب/١٦).

**روونكردنەوە:**

ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوە كەبڕیار بەهۆی كاتو هۆكار دەگۆڕێ، هۆی حەرامبوونی قایمەكاریو إدخار، زیاتر لەسێ شەو، لەساڵی پێشوودا بەهۆی گرانیەوە بوو، كاتێ ساڵی داهاتوو دێ هۆكارەكە كە گرانیە نامێنێ بڕیاری حەرامبوونیش دەگۆڕێ بە بڕیارێ كە بگونجێ لەگەڵ كاتو سەردەمی نوێدا، كە قایمەكاری دروستە.

## (٦) باب الفَرعِ وَالعَتيرة
## باسی فەرعو عەتیرە

١٢٩١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «لاَ فَرَعَ وَلاَ عَتِيرَةَ»، زَادَ ابْنُ رَافِعٍ فِي رِوَايَتِهِ: وَالْفَرَعُ أَوَّلُ النِّتَاجِ كَانَ يُنْتَجُ لَهُمْ فَيَذْبَحُونَهُ. {الحديث: ٥٠٨٨ = ٥٠٧٧ فم. تجريد/٥/١٠١، ژمارە: ١٨٢٥ = ٥٤٧٣، ٥٤٧٤}: [(١٢٩١)]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (نەفەرەع هەیەو نەعەتیرە). {ش/د/ت/ن = بوخاریو موسلیمو ئەبو داودو تەرمەزیو نەسائی = تاج/٣/١٨٨، زنجیرە: ١٢، ژمارە: ٢٦١١} لە گێڕانەوەی بوخاریدا: ئیمامی زوهری لە تەفسیری فەرەعو عەتیرەدا دەفەرموێ: (فەرەع یەكەم نۆبەرەی ئاژەڵە، جاران لەسەردەمی نەزانیدا، سەریان دەبڕی بۆ بتە سەركەشەكانیان، كەهۆی گومڕابوونیان بوو، عەتیرەش جۆرە كوشتییەك بوو، لەدەی یەكەمی مانگی ڕەجەبا، ئاژەڵێكیان بەناوی عەتیرەوە

---

[(١٢٩١)] تجرید/٥، ژمارە: ١٨٢٥ = ٥٤٧٣ بخاری. پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١٢٦٠ = ٥٠٨٨ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٧١ رقم الباب/٣).

سەردەبڕی، بەناوی پەرستشەوە) لەگێڕانەوەی موسلیمدا دەفەرموێ: لە گێڕانەوەی ئیبنو رافیعدا ئەمەی پترە: (فەرەع نۆبەرەی ئاژەڵەکانیان بوو، کە گەورە دەبوو سەریان دەبڕیو دەیانکرد بەخێر).

**ڕوونکردنەوە:**

**کورتو پوخت**، بەکوردی پەتی عەرزی ئازیزانی خۆم دەکەم: (ئەو خێرو چاکەو عیبادەتو ڕەفتارو عادەتانەی کە لەسەردەمی نەزانی پێشهاتنی ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا، بەهەر ناوێکەوە کراون، لەپاش هاتنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام ئەمە بڕیارەکەیانە:

١- ئەگەر ئیسلام ئیقراری کردنو پووچی نەکردنەوە، ئەوە لەسەر ئەو شێوەیە دەکرێن، کەلە یاسانامەی خوادا، پێغەمبەری خۆشەویستو ئازیزو نازدار ڕوونی کردوونەتەوە بۆمان، ئەمانەیش زۆر زۆرن. وەك: حەجو عەمرەو گرتنی ڕۆژوو قوربانیو سیلەی ڕەحمو ریش هێشتنەوەو ڕێزی بەیتو ژنهێنانو ناوهێنانی خوداو چاو ڕشتنو مارەییو خوازبێنیو ناشتنی مردوو، وەك: میوانداریو مافی هاوسێو هاوڕێو گەورەو بچووکیو خوێندنو ڕاوکردنو کەشتوکاڵو ڕاگرتنو بەخێوکردنی ئاژەڵو کەسابەتو بازرگانیو زۆر شتی تریش کەهەر زۆر زۆرن.

٢- بەڵام ئەگەر ئیسلام ڕێگەی پێ نەدانو پووچی کردنەوە، ئەوە بەهیچ جۆرێ دروست نییە کەبکرێن، وەك: بەشەو بەڕۆژوو بوونو فرە ژنی بەبێ ژمارەو مارەکردنی باوەژنو نەسیئیو حامو وەصیلەو بەحیرەو سائیبەو بتپەرستیو کچ زیندە بەچاڵکردنو بێ بەشکردنی ژن لە کەلەپوورو زۆر شتی تر کەلە قورئانو سوننەتدا باسکراونو قەدەغە کراون.

٣- ئەگەر لەئایینی پیرۆزی ئیسلامدا لەبەر هۆیەك نەهیان لێ کرابوو، یا لە ئایینی پیرۆزی ئیسلاما، بەچاكو خراپ باسیان نەکرابوو، وە لەجۆری بتپەرستیو بێ فەرمانی خودا نەبوون ئەوە بەپێی بنەمای بنەرەت لەشتەکاندا رەوابوونە، رەوایەو کردنی بەنیازی پاك کارێ باشە، بەمەرجێ بەنیازی لاسکایی ئەوانەوە نەبێ ئەم جۆرەیش وەك: کردنی فەرەعو عەتیرە، کە بەنیازی پاك بکرێن، بۆ سوپاسی خوداو یارمەتی هەژاران، نەوەك بۆ لاسکایی بتپەرستان، چونکە زاناکان دەفەرموون: نەهیی کردن لە فەرەعو عتیرە، کاتێ دەکرێ، کە لەبەر لاسایی بێبڕواکان بێ، بەلآم ئەگەر بەو نیازە نەبێو بەنیازێکی پاك ئەنجام بدرێن کارێکی پەسەندە بۆ روونکردنەوەی زیاتر بڕوانە: تەجریدی بوخاری، بەرگی پێنجەم، ژمارە: ١٨٢٥، زنجیرە: ٧٤، لاپەڕە: ١٠٢ (روونکردنەوە).

بۆ تەواوکردنی ئەم بابەتە ئەم باسە لە ژمارە: (١٨٢٢) و (١٨٢٣) و (١٨٢٤)و (١٨٢٥)ی تەجریدی بوخاریو لە ژمارە: (١٣٨٥)ی شەرحی بلوغ المرامەوە راگوێز دەکەین.

## ٧- كتاب العقيقة

عَنْ أَبِي مُوسَى رَضِي اللّٰه عَنْه قَالَ: وُلِدَ لِي غُلَامٌ فَأَتَيْتُ بِهِ النَّبِيَّ صَلَّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَسَمَّاهُ إِبْرَاهِيمَ فَحَنَّكَهُ بِتَمْرَةٍ وَدَعَا لَهُ بِالْبَرَكَةِ وَدَفَعَهُ إِلَيَّ وَكَانَ أَكْبَرَ وَلَدِ أَبِي مُوسَى.(الحديث ٥٤٦٧ أطرافه في: ٢٢٢، ٦٠٠٢، ٦٣٥٥):

**ئەبوموسا (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: کوڕێکم لەدایك بوو، بردم بۆ خزمەتی پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- ناوی نا ئیبراهیم، بەدەنکێ خورما مەلاشوی شیرین کرد، لەسەر ئەم شێوەیە: پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- دەنکە خورماکەی تەواو جوی، ئەوجا ماجوومی خورماکەی تفاندە ناودەمی منالەکە، لەپێشا ناوی نا ئەوسا مەلاشووی شیرین کرد، وە پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- نزای پیرۆزی و پیتو فەڕی بۆ منالەکە کردو ئەوسا دایەوە دەستم فەرمووی: ئەوکوڕە نۆبەرەی منالەکانم بوو). (تاج/٤ ز-١١ ل-٣٢ ژ/٥+٣+٤+٢+١ + تاج/١٠ ز-٦٤ ل-١٦٠ ژ-٣+٤ + فیقهی ئاسان بەرگی سێیەم لاپەڕە:٩٣٨ ز/٣٧٣)، بۆ زێدە سوودو بەهرە بڕوانە ئەم شوێنانە کە ئاماژەیان بۆ کرا.**

عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُما أَنَّهَا حَمَلَتْ بِعَبْدِ اللّٰهِ بْنِ الزُّبَيْرِ بِمَكَّةَ قَالَتْ فَخَرَجْتُ وَأَنَا مُتِمٌّ فَأَتَيْتُ الْمَدِينَةَ فَنَزَلْتُ بِقُبَاءٍ فَوَلَدْتُهُ بِقُبَاءٍ ثُمَّ أَتَيْتُ بِهِ رَسُولَ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَوَضَعْتُهُ فِي حَجْرِهِ ثُمَّ دَعَا بِتَمْرَةٍ فَمَضَغَهَا ثُمَّ تَفَلَ فِي فِيهِ فَكَانَ أَوَّلَ شَيْءٍ دَخَلَ جَوْفَهُ رِيقُ رَسُولِ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثُمَّ حَنَّكَهُ بِالتَّمْرَةِ ثُمَّ دَعَا لَهُ وَبَرَّكَ عَلَيْهِ وَكَانَ أَوَّلَ مَوْلُودٍ وُلِدَ فِي الْإِسْلَامِ فَفَرِحُوا بِهِ فَرَحاً شَدِيداً لأَنَّهُمْ قِيلَ لَهُمْ: إِنَّ الْيَهُودَ قَدْ سَحَرَتْكُمْ فلاَ يُولَدُ لَكُمْ.(سبق بتمامه في: رقم ١٨١٨ – المجلد الرابع في الترجمة الكردية):

عَنْ سَلْمَانَ بْنِ عَامِرٍ الضَّبِّيُّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ مَعَ الْغُلَامِ عَقِيقَةٌ فَأَهْرِيقُوا عَنْهُ دَمًا وَأَمِيطُوا عَنْهُ الْأَذَى.(الحديث ٥٤٧٢ طرفه في: ٥٤٧١):

سەلمانی کوڕی عامیری زەببی (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست - دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: حەزرەت -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمووی: (حەوتم بۆ کوڕ دەکرێ، کەواتە خوێنی بۆبکەن و ئاژەڵێکی دەست بدا بۆ قوربانی بۆ بکەن بەحەوتم، وە ئازارو لیمانو شتی وای لێ دووربخەرەوە). (تاج/٤ ز-١١ ل-٣١ ژ-١).

**ڕوونکردنەوە:**

لەدوا فەرموودەی ژمارە: ١٨٢٥ وە رونکردنەوەی شیاو لەسەر بابەتەکەو لەسەر سەلمانی کوڕی عامیر دەنوسین.

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: (لَا فَرَعَ وَلَا عَتِيرَةَ) وَالْفَرَعُ أَوَّلُ النِّتَاجِ كَانُوا يَذْبَحُونَهُ لِطَوَاغِيتِهِمْ وَالْعَتِيرَةُ فِي رَجَبٍ.(الحديث ٥٤٧٣ طرفه في: ٥٤٧٤):

ئەبو هورەیرە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: (نەفەرەع هەیەو نە عەتیرە) زوهری لەتەفسیری فەرەعو عەتیرەدا دەفەرموێ: (فەرەع یەکەم نۆبەرەی ئاژەڵە، جاران لەسەردەمی نەزانیدا سەریان دەبڕی بۆ بتە سەرکەشەکانیان کەهۆی گومڕا بوونیان بوون، عەتیرەش جۆرە کوشتیەك بوو، لەدەی یەکەمی مانگی ڕەجەبا ئاژەڵێکیان بەناوی عەتیرەوە سەردەبڕی بەناوی پەرستشەوە). (تاج/٤ ز-١٢ ل-٢٣ ژ-١+٢+٣) + (مغنى المحتاج/٤ ص-٢٩٦).

**روونكردنەوە:**

**لەموغنی موحتاجا، لەم بابی حەوتمەدا، لە حەوتمدا، بەنەقڵ لە ئیبنو سوراقەوە دەفەرموێ: (خێرترین سەربڕاوی سوننەت ئاژەڵی دیاریی خانەی خودایە، کەپێی دەگوترێ هەدیی بەیت، ئەوجا قوربانی سوننەت، ئەوجا حەوتم، ئەوجا عەتیرە، ئەوجا فەرەع، ...) فەرمایشی موغنی تەواو.**

**کەواتە: فەرەع، کە نۆبەرەی ئاژەڵە، کاتێ گەورەبوو، ئەگەر خاوەنەکەی بیکا بە خێرو سەری ببڕێ دەبێ، هەروەها کەسێ لەدەی یەکەمی مانگی ڕەجەبا، یا لەمانگی ڕەجەبا ئاژەڵێ بکا بەخێرو سەری ببڕێ بەناوی عەتیرەوە، یا بەناوی ڕەجەبییەوە دەبێ. لەسەر فەرمایشتی ئیبنو سوراقە لەخێرترین سەربڕاوی سوننەتە. گەرچی خەتیب دەفەرموێ: (ئەم دووشتە ناباشنو مەکروهن) لەبەر هەواڵەکەی بوخاری پێشەوە: (لافرع ولا عتيرة). وادیارە مەبەستی ئیبنو سوراقە (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەوەیە: کە کردنی ئەم دووشتە کاتێ ناباشە کەلەبەر لاسکایی بتپەرستەکان بێ، بەڵام ئەگەر بەنیازێکی پاکی موسوڵمانانەبێ، وەك مەولوودی و خێری موتڵەق و سوپاسی خودا لەسەر نازو بەهرەکانی، کارێکی پەسەندو جوانەو ناباشی نییە. وە زۆر شتی تری لەم بابەتە کە لەسەردەمی نەزانیدا کراوەو شەرع نەهی لێکردووە، کەلەسەر شێوەی بتپەرستان بکرێو مەبەست لاسکایی ئەوان بێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشا ڕێگەی پێ دراوەو لەئیسلاما گەڵێ جار ئەوکارە واجبە وەك حەج، یا سوننەتە وەك: ڕیش هێشتنەوەو چاوڕشتن و مارەیی و خوازبێنیو ژنهێنانو خێرکردنو ڕێزگرتنی کەسوکارو سیلەی ڕەحمو زۆرشتی تر.**

روونکردنەوە:

یەکەم: پوختەی بڕیارەکانی حەوتم: أحکام العقیقە:

١. حەوتم سوننەتێکی گەورەیە، لەشەرعا ئەو ئاژەڵەیە لەڕۆژی حەوتەما دەکرێ بەحەوتم بۆ منداڵی تازە لەدایك بوو، یالە ژیانیدا، یا لەپاش مردن بۆیدەکرێ بەحەوتم.

٢. ئەو ئاژەڵەی دەکرێ بەحەوتم دەبێ هەموو مەرجەکانی ئاژەڵی قوربانی تیابێ و دەست بدا بۆ قوربانی. دەبێ لەتەمەنو جۆرو بێنەنگیو ساغیدا، دەق وەك ئاژەڵی قوربانی وابێ، کەواتە: تەنیا مەڕو بزنو ڕەشە وڵاخ و گامێش و حوشتر، هیماڵییان نەك هی کێوییان، بەهەموو جۆرەکانیانەوە دەکرێن بەحەوتم. وەك مەڕی دووگدارو مەڕی بێ دووگو بزنی شاخدارو بزنی کۆڵو بزنی مەرەزو مەڕی عەرەبیو مەڕی کوردیو حوشتری ئاسیاییو حوشتری ئەفریقی و حوشتری یەك کۆپارە و حوشتری دوو کۆپارە و مانگای عێراقیو مانگای هۆڵەندیو ...تاد. جۆری کێوی ئەم ئاژەڵانە دەست نادەن بۆ قوربانی و حەوتم. هەریەکێ لەم چوار جۆرە ئاژەڵە ماڵیانە، مەرجی تایبەتی خۆیان هەیە، لەباسی قوربانیدا بەدوورو درێژی باسکراون. گامێش لەهەموو رووبەکەوە، وە لەهەموو بابەتێکی شەرعیدا، بڕیار و حوکمی ڕەشەوڵاخی هەیە بەبێ زیادو کەم.

٣. کاتی قوربانی، لەمەزهەبی خۆمانا، کەمەزهەبی ئیمامی شافیعیە – ڕەحمەتی خودای لێ بێ- چوار رۆژەی جەژنی قوربانە، بەڵام حەوتم کاتی دیاریکراوی بۆ نییە، گەرچی وا سوننەترە، لەرۆژی حەوتەمی لەدایك بوونی منالا حەوتمی بۆ بکرێ (بۆ زانینی بڕیارەکانی قوربانی، کەحەوتم وەك ئەو

وایه، لەزۆر رووەوە بڕوانە: تاجی کوردی، بەرگی چوارەم، زنجیرە:١٣، لاپەڕە:٣٦ هەتا کۆتایی زنجیرە١٥ ل-٤٣).

٤. کاتی حەوتم لەودەمەوە دەست پێ دەکا، کەمناڵەکە لەدایك دەبێ، لەوکاتەوە حەوتم بۆ هەقداری مناڵەکە سوننەتە، هەتا کاتی باڵقبوونی مناڵەکە، وە دەبێ لەماڵ و پارەی خۆی بیکا، نەوەك لەماڵی مناڵەکە، وە لەکاتی باڵقبوونەوە حەوتم بۆ مناڵەکە خۆی سوننەتە هەتا کاتی مردن، وەدەبێ لەماڵی خۆی بیکات. ئەمەی کە بڵێین: حەوتم لەسەر هەقدارە، واتە: وەلی، مەزهەبی ئیمامی شافیعی‌یە، هەقدار وەك: باوکی، باوکی باوکی، برای، مامی، ئامۆزای.

٥. ئایا بێجگە لەهەقدار (وەلی) کەسی تر، لەخزم‌و بیانی، بۆیان هەیە حەوتم بۆ کەسێ بکەن؟ بەڵێ بۆیان هەیە، تەقلیدی ئەو زانایانە بکەن کەهەقدارییان بەمەرج نەگرتووە، کەواتە: دایك‌و خوشك‌و باپیرەو خاڵ‌و نەنکی دایکیش دەتوانن حەوتم بۆ منالی کەسوکاریان بکەن. چونکە پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- حەوتمی بۆ حەسەن‌و حوسەینی کچەزای کرد، باوك‌و دایکی حەسەن‌و حوسەین ئەوکاتە لە ژیانا بوون. ئەوەیش کەدایك‌و نەنك و پوور و خاڵ‌و خزمێ کەژن بێ بۆیان هەیە کەحەوتم بکەن بۆ منالی کەس‌و کاریان، فەرموودەکەی عائیشەیە کەبەدەق دەفەرموێ: (أَمَرَنَا رَسُولَ اللّهِ صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ نَعِقَّ عَنِ الغُلَامِ بِشَاتَيْنِ وَعَنِ الجَارِيَةِ بِشَاةٍ). ئەوەتا لەم فەرموودە صەحیحەدا عائیشە دەفەرموێ: (پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- فەرمانی پێمان کردووە کە بۆکوڕ ...تاد). چونکە ئەم جۆرە دەربڕین‌و تەعبیرە ژن‌و پیاو، وەك یەك دەگرێتەوە (بڕوانە: فیقهی ئاسان/٣ ل-٩٣٩ ز-٣٧٣= تەجریدی صەحیح = مختصر صحيح البخاری/٣ ل-٣٤ ژ-١٣). گوتمان: حەوتم بۆ هەقدار (وەلی)و کەسوکار سوننەتە هەتا مناڵەکە رەسیدە دەبێ، بەلام لەپاش رەسیدە

بوون بۆ منالەکە خۆی سوننەتە، هەتا زووتـر بیکا باشـترە، وە لەهـەر تەمـەنێکا بیکا دەبێ، وەلەهەر کوێ بیکا دەبێ، وە دەتوانێ وەکیل بگـرێ کـە بـۆی بکـا. لای شـافیعیەکان تـەنیا بـۆ هەقـدار حـەوتم سـوننەتەو بـۆ خـودی منالەکـە لـەپاش رەسیدەبوونی. عەسقەلانی لەفەتحولباریدا دەفەرموێ: (گەرچی شافیعییەکان وا دەفـەمون، بـەلام وشـەی (یُـذبَحُ) لەفەرموودەکـەدا، بـەفیعلی بینـا مـەجهوول، بەلگەی ئەوەیە کە حەوتمکەر دیاریکراونییە و نادیارە، کەواتە: دروستە هەموو کەسێ، خزم بێ، یا بێگانە، حەوتمی بۆبکا (بڕ: شەرحی فەرموودەی ژمـارە: ٥٤٧١ لە فتح الباریدا وە ژمارەکانی دوای ئەو).

٦. سوننەتە بۆ کوڕ دووسەر ئاژەڵی وردە (بزنو مەڕ) بکرێ بەحەوتم، وە بـۆ کچ یەك سەر ئاژەڵی وردە. ئەصڵی سوننەتەکە بەیەك سـەر بـۆ کـوڕ، یـا بـۆ کـچ جێ بەجێ دەبێ، واتە: مەرج نییە بۆ کوڕ دووسەر بکرێ، یـەك سـەریش دەبـێ، یا بۆ کچ هەریەك سەر بکرێ، دوو سەریش بۆ کچ دەبێ.

٧. دروستە گایەك، یا وشترێك بکرێ بەحەوتم، یا حەوت یەکی ڕەشەولاخێك، یا حەوت یـەکی حوشـترێ بکـرێ بـە حـەوتم، وە دروسـتە زیـاتریش بکـرێ، وەك کەسێ دەسەر ئاژەڵ بکا بە حەوتم، بۆ کوڕ، یا بۆ کـچ. ئاژەڵـەکان نێـربن، یـا مـێ بن دەبن. چونکە لـە عیبـاداتی سامانیدا، ئەنـدازەی دیـاریکراو. زۆرینـەی کـات، مەرج نییە، بەڵکوو بۆ دیاریکردنی لای کەمی ئەنـدازەی دیـاریکراوە، بـۆ نموونـە زەکاتی پێنـج وشتر مەڕێکە، یا بزنێکە، بەلام دروستە وشترێ بـدرێ بـەزەکاتیانا، فیدیەی تەمەتتوع لەحەجا مەڕێکە یا بزنێکە بەلام دەتـوانرێ حوشـترێ بـدرێ، وە زۆر شـتی تـری لـەم بابەتـە، وەك دانـی ئەنـدازەی زیـاتر لـەو ئەندازەیـەی کەدیاریکراوە بـۆ سـەرفترە، لـە ئـەنواردا دەفـەرموێ: (ئەگـەر زیـاتر لەئەنـدازەی پێویستی، لەسەرفترە، یا لەزەکات دا، بەپێشیاوی، پێویـستە لەسـەر وەرگـر، پـێی

بلێ کەئەندازەی پێویست ئەوەندەیە). واتە: ئەگەر زەکاتدەر بەئارەزووی خۆی زیاتریدا دەبێت. (بڕ: موغنی موحتاج/١ ص-٣٧٠ تنبیه).

٨. سکێ دوانەبێ دوو حەوتمی بۆ دەکرێ، زیاتر بێ زیاتری بۆ دەکرێ.

٩. نێرو مێ (واتە: خونثا) بڕیاری کچی هەیە، واتە ئەصڵی سوننەتەکە بەیەك سەر دێتە جێ، زیاتریشی بۆ بکرێ خێرترە.

١٠. کۆیلەو بەندە حەوتمی بۆ دەکرێ هەر کەسێ بۆی بکا دەبێ، کاتێ ئازادبوو خۆی بیکا بۆ خۆی ئەگەر بۆی نەکرابوو (بڕوانە: ژمارە-٣٠).

١١. منداڵی زینا حەوتمی بۆدەکرێ، هەرکەسێ بۆی بکا دەبێ، یا لەکاتی گەورەبوو خۆی بیکا بۆ خۆی (بڕوانە: ژمارە-٣٠) لەدواوە.

١٢. ئەگەر یەك سەر ڕەشەوڵاخ، یا یەك سەر وشتر بۆ حەوت منداڵ سەربڕێ دەبێ و بڕێتی حەوتمی هەر حەوت منداڵەکە دەکەوێ، ئیتر زیندووبن، یا مردووبن، یا هەندێکیان زیندووبن‌و هەندێکیان مردووبن دەبێ.

١٣. ئەگەر چەند کەسێ وشترێ، یا ڕەشەوڵاخێ، یا گامێشێ، بەهاوبەشی سەربڕن، هەموو حەوت یەکێکی ئەو وڵاخە دەست دەدا بۆ حەوتم، یا بۆ قوربانی، یا بۆ گۆشت. کەواتە: ئەگەر موحەمەد و ئەحمەد و مەحمود، یەکی سەد دیناریان دا، وە حەسەن چوارسەد دیناری دا، وە بەوپارەیە بەهاوبەشی گایەکیان کڕی، ئەوە دروستە موحەمەد حەوت یەکی خۆی بکا بەحەوتم ئەحمەد بیکا بەقوربانی، مەحموود حەوت یەکی خۆی بکا بەفدیەی تەمەتتوعی حەج، حەسەن بەشێ لە چوار بەشەکەی خۆی بکا بە قوربانی. بەشێتری بکا بە حەوتم، بەشێ تری بکا بەفیدیەی تەمەتتوع، بەشی چوارەمی بکا بەگۆشت بۆ خۆی و ماڵو منداڵی بیخۆن، یا بیفرۆشێ، یا هەرچی لێدەکا. وەك بەخشین‌و دیاری‌و شتی تریوا. ئەم جۆرە نموونەیێ هەر لەکاتی قوربانیدا

جێ بەجێ دەکرێ، کە برێتییە لەچوار رۆژەی جەژنی قوربان، چونکە قوربانییان واتیادا، ئەگەر قوربانیان تیانەبوو هەموو کاتێ دەبێ.

١٤. نیەتو تەمەنی ئاژەڵی حەوتم و جۆری و چۆنێتی و ساغیو بێ نەنگیو لێخواردنو لێبەخشین لەگۆشتەکەی، رێك وەك قوربانی سوننەت وایە، هەرچی لەقوربانی سوننەتدا مەرجبێ لەحەوتمیشدا مەرجە، وە گۆشتی قوربانی سوننەت بۆ کێ دروستە لێی بخوات بۆ حەوتمیش هەروا.

١٥. سوننەتە حەوتم بۆ مردویش بکرێ، چی پێش رۆژی حەوتەمی تەمەنی مردبێ، چی پاش ئەو رۆژە مردبێ، تەمەنی مردووەکە هەرچەنێ بێ حەوتمی بۆ دەکرێ، وە هەروەها تەمەنی زیندوو، کەواتە: حەوتم بۆ نێر، بۆ مێ، بۆ زیندوو، بۆ مردوو، بۆ بچوك، بۆ گەورە دەکرێ، وە هەرکەسێ بیکا دەبێ. تەنانەت ئەگەر کەسێ بەگەورەیی بمرێ، وەخۆی حەوتم بۆ خۆی نەکا، حەوتمی بۆدەکرێ.

١٦. حەوتم چەند جار دەکرێ؟ وەڵام یەکجار دەکرێ.

١٧. سوننەتە لەکاتی سەربڕینی حەوتم دا، حەوتمکار بڵێ: (بسم الله اللهم هذا منك و اليك) واتە: بەناوی خودا، خوایە! ئەمە هی خۆتە و بۆخۆتە. حەوتم بۆ کراوەکە دیاری بکا، وەك بڵێ: ئەمە حەوتم بێ بۆ باوکم یا بۆ دایکم یا بۆ فیساری کوڕم یا کچم ... تاد.

١٨. سوننەتە لەکاتی گزنگدانی خۆردا حەوتم سەر ببڕێ.

١٩. ئەوەی کە لەرۆژی حەوتەمی لەدایکبوونی منالا سوننەتە بۆی بکرێ:

أ) سوننەتە حەوتم لەرۆژی حەوتەی منالەکەدا بۆی بکرێ تەنانەت ئەگەر لەوەو پێشیش بۆی کرابوو، سوننەتە لەرۆژی حەوتەم دا، دووبارە بکرێتەوە.

ب) لەهەمان رۆژدا، لەپاش سەربڕینی حەوتمەکەی، ئەگەر حەوتمی بۆکرا ناوێکی جوانی لێبنرێ، ئەگەر حەوتمیشی بۆ نەکرێ هەروا. وە سوننەتە منالی لەبارچوویش ناوبنرێ، وە ئەگەر نەدەزانرا کە کوڕە یان کچە، ناوێکی هاوبەشی لێ بنرێ، وەك: ئاوات و نەوروز لەکوردیدا، کەهەم دەست دەدەن بۆ کوڕ هەم بۆ کچ.

ج) ئەوجا سەری منالەکە، کوڕبێ یا کچ، بەتەواوی بتاشرێ، وە سەنگی ئەوە زێڕ یا زیو بکرێ بەخێر و بدرێ بەهەژارێ، یا بەکەسێ کە زەکاتی پێ بشێ، وە سوننەتە بانگ بدرێ بەگوێی راستیدا، وەقامەت بکرێ بەگوێی چەپیدا، وە بۆ پیرۆزی و موفەڕکی، کوڕ بێ یا کچ، ئەم ئایەتەش بخوێنێ بە گوێچکەی راستیدا: (إِنِي أُعِيذُها بِكَ وَ ذُرِيَتِهَا مِنُ الشَيطَانِ الرَجِيمِ) لە موغنی موحتاجا ئاماژە بۆ ئەوە دەکا، کە سورەتی (قُلْ هُوَ اللهُ أحَد)یش بخوێنرێ بەگوێچکەی ڕاستیدا. وە مەلاشوی منالەکە بەشیرینی شیرین بکرێ. (بڕ: فیقهی ئاسان، بەرگی سێیەم، لاپەڕە:٩٤٠ ز-٣٧٤).

د) ئەگەر کەسێ بەمنالی سەری نەتاشرابوو، وە ئەوخێرەی بۆ نەکرابوو، بۆی هەیە کاتێ خۆی گەورەبوو، بەقەد پارەی سەنگی ئەو مووە، ئەگەر لەڕۆژی حەوتەیدا بتاشرایە بکا بەخێرو بیدات بەهەژارێ. (بڕ: مغنی محتاج – عقیقه).

ە) سوننەتە بۆ حەوتمکار، ژن بێ یا پیاو، یا نێرو مێ، ئەگەر خۆشی ئاژەلی حەوتمەکە سەرنەبڕێ، لەکاتی سەربڕیندا، ئامادەبێ بەدیار سەر بڕینەکەوەبێ، لەوکاتەدا کەوەکیلەکەی سەری دەبڕێت.

٢٠ سوننەتە لەگۆشتی حەوتم بەشی مامانەکەی لێ بدرێ، تەنانەت ئەگەر منالەکە خۆی رەسیدە بوو، وە خۆی حەوتمی کرد بۆ خۆی، ئەگەر مامانەکە مابوو، بەشی بدات، واباشە سەروپێکەی پێ بدرێت.

٢١. هەروا سوننەتە ئەم ئاژەڵی حەوتمە بەکوڵاوی پێشکەش بکرێبە مەردوم و لەکاتی کوڵانەکەیدا شیرینی تێکەڵ بکرێ، بەنیازی نوقڵانەی باش، کە رەفتار و کردارو گوتاری شیرینو جوان بێت. سوننەتە ئەوەندەی بکرێ ئێسقانەکانی نەشکێنرێ، بەڵام ئەگەر ئێسکەکانیشی بشکێنرێ، یا بەگۆشتیو بەنەکوڵاوی دابەشبکرێ بەسەر خەڵکا ناباش نیە.

٢٢. سوننەتە بەخورما، یا بەشیرینی تر مەڵاشووی شیرین بکرێ، لەکاتی ناونانیدا، یا لەکاتی لەدایکبوونیدا، بەڵام بەخورما باشترە.

٢٣. سوننەتە منالی لەبارچوو، ئەگەر هاوارێ، قیژەێ، گریانێ، خۆکرژ کردنێ، یاهەر نیشانەیەکی تری ژیانی لێ بینرا، حیسابی گەورەی بۆ بکرێ، کەواتە: دەشۆرێ، کفن دەکرێ، نوێژی لەسەردەکرێ، دەنێژرێ، و حەوتمی بۆ دەکرێ وە ناوێکی شیاوی لێ دەنرێ، کچ بوو ناوی کچانەی لێ دەنرێ، کوڕ بوو ناوی کوڕانەی لێ دەنرێ. (مغنی المحتاج/١ ص-٣٤٩).

٢٤. لەبارچوو بەمنالێ دەگوترێ کە مانگەکانی تەواو بوونی منالی، لەسکی دایکیدا تەواو نەکردبێ، کەواتە: ئەگەر منالێ نۆ مانگ یا زیاتر لەسکی دایکیدا ما، دوایی لەبارچوو، وە بەمردویی لەدایك بوو، بەگەورە دادەنرێ و مامەڵەی گەورەی بۆدەکرێ، با هیچ نیشانەیەکی ژیانیشی لێ نەبینرێ.

٢٥. ئایا دروستە بەهای حەوتم بە پارەیی لەباتی حەتمو گۆشتەکەی بدرێ بەهەژاران، یا ئاژەڵەکە بەساغی بدرێ بەهەژارێ، یا بەچەند کەسێ، وەك ئاژەڵو ماڵی زەکات؟ بۆ پرسیاری یەکەم: بەڵێ، کەسێ تەقلیدی ئیمامی ئەحمەد

بكا لەم بابەتەدا بۆی هەیە پارەی حەوتمەکە بدا بەهەژاران، هەروەك بۆ سەرفترە تەقلیدی ئیمامی حەنەفی دەکەین، لەباتی خۆراك پارەدەدەین. چونکە ئیمامی ئەحمەد -ڕەحمەتی خوای لێ بێ- دەفەرموێ: (کردنی حەوتەم پێباشترە هەتا ئەوەی کە بەهاکەی بە پارەیی بکرێ بە خێرو دابەش بکرێ بەسەر هەژاراندا). بۆ پرسیاری دووەمیش: دەڵێین: وا سوننەتە کە ئاژەڵەکە سەر ببڕێ لەماڵی حەوتمکارەکەدا، بەڵام ئەگەر بەزیندوییش بدرێ بەهەژارێ یا بەچەند هەژارێ دەبێ بەقیاس لەسەر بەهاکەی. خاڵێکی گرنگ هەیە ڕوونی دەکەینەوە: مەرجی عیباداتی سامانی، وەك مەرجی خواپەرستی جەستەیی و گوتاری نییە، کە نەبوونی مەرجەکەی خواپەرستییەکە پووچ دەکاتەوە، بگرە لە عیبادەتەوە دەبێ بەگوناه و تاوان، بەوێنە: ڕووکردنە ڕووگەو دەسنوێژ مەرجن بۆ نوێژی فەرز، جا ئەگەر کەسێ بەبێ مەهانەی ڕەوا بە ئارەزوو نوێژ پشتەو ڕووگە بکا تاوانە، یا بەبێ دەستنوێژ بیکا تاوانە، بەڵام ئەگەر کارێ بدا بەزەکاتا، یا قەلەمونێ، یا کەڵشێرێ بکا بەقوربانی، بە نیازێکی پاك، یا مەڕێکی شەل بکا بەقوربانی، یا لەپاش کردنی قوربانی، یا کردنی حەوتم دەرکەوت ئاژەڵەکە مەرجێ لەمەرجەکانی قوربانی تێدانییە، لەم کاتانەدا بەکردنی ئەم کارانە تاوانبار نابێ، بەڵکوو خێری دەگا، وەك ئەوپارەیە، یا ئەو ئاژەڵە، یا ئەو گیانلەبەرەی کردبێ بەخێرو سەدەقەی ئاسایی وایە، ئەوەندە هەیە خێری قوربانییەکە، یا حەوتمەکە، یا نەزرەکە، یا زەکاتەکەی ناگات، وە لەسەریەتی فەرزی ئەم شتانە لەکاتێکی تردا بکا، بەکردنی ئەمانە فەرزەکەی لەکۆڵ ناکەوێ وەگەڵێ کەمتر لەخێری سوننەتەکەی بۆدەنووسرێ.

٣٦. لە ئەنواری ئەردەبیلی دا -ڕەحمەتی خودای لێبێ- دەفەرموێ: (کەراهەتی هەیەو ناباشە کە بەخوێنی حەوتمەکە، سەری حەوتم بۆ کراو

خوێناوی بکرێ) لە موغنی موحتاجیش دا هەروا دەفەرموێ، بەڵام دەش فەرموێ: (هەندێ لەزانایان دەڵێن شتی وا ناباش نییەو دروستە چونکە فەرموودەی لەسەرە).

٢٧. نیەتهێنان مەرج نییە کەهەر لەکاتی سەربڕیندا بێ، ئەوە سوننەتە، وەك لەخاڵی ژمارە (١٧)دا ڕابوورد، بەڵام دروستە لەپێشیشا نیەت بهێنێ و بڵێ: ئەم مەڕە یا ئەم مانگایە حەتم بێ بۆ فیسارەکەس، وە لەپاشا هەر لەکاتێ ویستی سەری ببڕێ، وە ئیکتیفا بەو نێتە پێشینەبکات. بەڵام واباشە لەکاتی سەربڕیندا نیەت بهێنرێت لەهەموو حاڵەتێکا، بەڵام دروست نییە نێتەکە دوابخرێ، چونکە لەنێتی قوربانیدا، نیەت پێشخستن دروستە، بەڵام نیەت پاشخستن دروست نییە.

٢٨. سوننەتە وەك قوربانی، حەوتمکار خۆی حەوتمەکەی سەربڕێ، بەڵام بۆ ژنو نێرو مێو کەسێ نەتوانێ شت سەرببڕێ وەکیل بگرن سوننەتە کەپیاو سەری ببڕێ بەدەستی خۆی، بەڵام ئەگەر کەسێکی وەهایش بکا بەوەکیل، کەسەربڕاوی دەستی حەلاڵ بێ، ئەوە دروستە و دەبێ و کەراهەتی نییە، لەگەڵ ڕەچاوکردنی تەواوی خاڵی(٢٩).

٢٩. لەکاتی وەکیل گرتن دا کامیان نیەت بهێنن؟ وەڵامی ئەم پرسیارە شێوەکار و نمونەی زۆرە:

أ) حەوتمکار وەکیلێ بگرێ و بیکا بە وەکیلی نیەتهێنانیش، وەك ئەوەی موسوڵمانێ کەبۆخۆی سوننەت بێ حەوتمی خۆی سەربڕێ، بکا بەوەکیل و بڵێ: تۆ وەکیلی من بە حەوتمێکم بۆ سەربڕەو، خۆشت وەکیلی نیەتهێنان بە.

ب) حەوتمکار خۆی نیەت بهێنێ و بڵێ نیەتمە ئەم گایەم کرد بەحەوتم، یا نیەتمە ئەم مەڕە دەکەم بەحەوتم، ئیتر کەسێ بکا بەوەکیلی سەربڕینی ئاژەڵەکە. وەکیلەکە سەری ببڕێ ئەوەندە بەسە، یا وەکیلەکە لەکاتی

سەربڕینەکەدا نیەتیش نەهێنێ، بەڵام مەرجە کاتێ ئاژەڵەکە دەداتە دەستی وەکیلەکە نێتی ئەوەبێ کەبیکا بەحەوتم.

ج) حەوتمکاریش نیەت بهێنێ و وەکیلەکەش نیەت بهێنێ دەبێ.

د) دروستە حەوتمکار کابرایەکی خاوەن نامە وەك جولەکەو مەسیحی بکا بەوەکیل، کە گۆشتی سەربڕاویان حەڵاڵ بێ، کە حەوتمەکەی یا قوربانیەکەی بۆ سەرببڕێ، بەڵام دەبێ حەوتمکارەکە، یا قوربانی کەرەکە خۆیان نیەت بهێنن، دروست نییە کە بۆئەم دووشتە، واتە: بۆ قوربانیو حەوتم کافر بکرێ بەوەکیلی نییەتهێنان. بۆ ژن و نێرو مێو پیاوێ نەتوان بێ، وەکیل گرتن سوننەتە، واباشە بیکەن بە وەکیلی نیەتهێنان ئەگەر وەکیلەکە موسوڵمان بوو، واباشە کە خۆشیان نیەت بهێنن.

هـ) دروستە کە کەسێ بکرێ بەوەکیل، کە لەشوێنی تایبەت حەوتمی بۆبکا، وەك ئەوە بەکەسێ بڵێ: وەکیلی من بە لەدیکەی خۆمان، یا لە گەڕەکی خەبات، یالە هەرشوێنێ بەباشی دەزانیت، ئاژەڵێکم بۆ بکە بە حەوتم بۆ خۆم، یا بۆ کچە مردووەکەم، یا بۆ فیسارەکەس، یابە حاجییەکا پارەبنێرێ بۆ مەککەو مەدینە لەوێ بۆی بکا بەحەوتم یا بەقوربانی، یا بەخێر ... وەهەروەها.

٣٠. ئەگەر کەسێ شایان بوو بۆ حەوتم کردن، وە بەزەینی بەهێزی خۆی باوەڕی وابوو کە: بەمناڵی حەوتمی بۆ نەکراوە، وەك ئەوە بزانێ لەکاتی لەدایك بوونی ئەودا، دایكو باوکی هەژاربوون، یا خۆیان پێی بڵێن حەوتممان بۆت نەکردووە، ئەوە سوننەتە حەوتم بۆ خۆی بکا. واتە: مرۆڤ کاتێ گەورە دەبێ، ئەگەر بەشایەتو بەڵگە چەسپا کەحەوتمی بۆ کراوە ئەوا باشە، دەنا بۆی هەیە حەوتم بۆ خۆی بکات.

٣١. دروسته مرۆڤ قوربانی، یا حەوتم، یا خێرێ تر بکا بۆ خۆی، وە کەسانێ تر بکا بەهاوبەش‌و شەریکی خۆی لەخێرو پاداشەکەیدا، بەپێی فەرموودەکەی موسلیم: (پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- دوو بەرانی کرد بە قوربانی و فەرمووی: خودایە قەبوڵی بفەرموو لە موحەمەدو کەسوکاری موحەمەدو لە ئومەتی موحەمەد). لەموغنی موحتاجا، وا دەفەرموێ.

٣٢. قوربانی‌و حەوتم بۆ سك ناکرێ هەتا لەدایك نەبێ، بەڵام دروستە کەسێ بڵێ: ئەگەر ئەم سکە لەدایکبوو ئەو وشترەی بۆ دەکەم بە حەوتم، ئەوە دادەنرێ بەحەوتمی نەزر کراو، پێویستە لەسەری کەبۆی بکا لەپاش لەدایکبوون.

٣٣. فەرمایشتی هەرە دروست ئەوەیە کەئاژەڵی ئاوس دەست نادا بۆ قوربانی و بۆ حەوتم، جا واباشە ئاژەڵی ئاوس نەکرێ بەقوربانی‌و حەوتم، بەڵام لەلای هەندێ زانا ئاوسیش دەست دەدا بۆ قوربانی و بۆ حەوتمیش. لەبەر ئەوە دروستە تەقلیدی ئەم زانایە بکرێ لەکاتی روودانی شتی وادا، تەنانەت تەقلیدی پاش عەمەلیش دروستە، ئەگەر کەسێ قوربانی کرد، کاتێ گۆشتەکەیان دابەشکرد، دەرکەوت ئاژەڵەکە ئاوسە، دروستە تەقلیدی پاش عەمەل بکاو قوربانییەکەی یا حەوتمەکەی دادەمەزرێ، ئەوەیش کە دەڵێن: قوربانی ئاوس دروست نییە، ئەوە مەعنای وانییە کە گۆشتەکەی حەرامە، نەء بەڵکو گۆشتەکەی حەڵاڵە، بەڵکوو دەکرێ بەخێریش.

٣٤. ئاماژەو ئیشارەتی کەڕولاڵ، کەتێگەیەنەربێ، وەکو قسەی قسەکاروایە، هەموو ئاماژەێی لەبابەتی خۆیدا بڕیاری لەوبابەتەدا پێ دادەمەزرێ: (إشارة الأخرس المفهمة كنطق الناطق).

٣٥. سەربڕین و قوربانی و حەوتم کردن لەشەودا، بەشێوەی گشتی ناباشە، واتە: مەکرووهە.

٣٦. دوو ڕەگی ئەم چوار ئاژەڵە لەناو خۆیانا دەبێ، بەڵام دەبێ بۆ تەمەن، باوك و دایكەكەی كامیان مەرجە تەمەنی زۆرتربێ، ئەو تەمەنە بۆ بەچكە دووڕەگەكەیان ڕەچاو بكرێ، كەواتە دووڕەگێ لەبەران و بزن بێ، دەبێ دوو ساڵی تەواو كردبێ و پێی نابێتە سێ ساڵ، وە بۆیەك كەسیش دەبێ، لەڕەشەوڵاخ و وشتربێ، دەبێ پێی نابێتە شەش ساڵ، بەڵام بۆ حەوت كەس دەبێ. بەڵام دوو ڕەگێ لە مەڕی ماڵی و لەمەڕی كێوی بێ، یا لەگای ماڵی و گای كێوی بێ نابێ.

**دووەم:** سەلمانی كوڕی عامیری ئەلضەببی، سەحابەی پێغەمەرە، لە بوخاریدا بەس ئەم فەرموودەیەی هەیە، لەشاری بەصرە دادەنیشت، شێخی بوخاری ئەم فەرموودەی لەسەلمانەوە بەم چەند شێوەیە دەرهێناوە، واتە: اخراج كردووە. یەكەم: بە مەوقووفی لەسەر سەلمان، دووەم: بە موعەللەقی مەوقووف لەسەر سەلمان، سێیەم: بە موعەللەقی مەوصولی مەرفووع. شێخی بوخاری ئەم فەرموودەیەی لەسەلمانی كوڕی عامیرەوە، بە پێنج شێواز (طریق) دەرهێناوە ئاوا:

١. بە مەوقوفی لەسەر سەلمان، لە شێخی بوخارییەوە هەتا سەلمان پەیوەستە. واتە: موصولە، واتە: مەوصولی مەوقوف.

٢. بە موعەللەقی مەرفووع، لە ڕشتەكەیدا حەمادی واتیا بەپێی مەرجی شێخی بوخاری نییە. واتە: حەممادی كوڕی سەلەمە لە رجالی صەحیحی بوخاری نیە.

٣. موبهەمی موعەللەقی مەرفوع.

٤. موعەللەقی مەوقوف لەسەر سەلمان.

٥. هەڵئەگرێ مەرفووعی موتتەصلیل بێ، وە شێخی عەسقەلانی دەفەرموێ: ئەم شێوازی پێنجەمی ئەم فەرموودەیە: زۆربەی فەرمووده زانەكان بە موصوڵی

دادەنێن. وەك مامۆستا ئیبنو صەلاح لە (علوم الحدیث)دا ئەوەی بڕیارداوە. وەهەڵیش دەگرێ موعەللەقی مەرفووع بێ.

ئەم پێنج شێوازە هیچیان بەپێی مەرجی بوخاری نین، بەڵام لەبەرئەوەی فەرموودەکە، لەئەصلاّ، لە بنەڕەتدا صەحیحەو دروستە زیانی نیە، چونکە مەرفوعەو لەڕێگەی زۆری ترەوە بەصەحیحی ڕیوایەت کراوە، بەڵام ئەو ڕێگە ساغو دروستانە دەست بوخاری نەکەوتوون.

**سێیەم:** عەسقەلانی (رەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێ: نامەی حەوتەمو فەرەعو عەتیرە دوازدە فەرموودەی لەخۆی گرتووە، سیانیان بێڕشتەن، تەعلیقن، ئەوانی تریان پەیوەستن، هەشتیان دووبارەن، پوختەکەیان چوار فەرمودەیە، کەئەمانەن:

١. ژمارە: ٥٧٤٠ فەرمودەکەی ئەنەس، داستانی مردنی براکەی و لەدایکبوونی برایەکی تری، لە تەجریدەکەدا لێرەدا نییە، موسلیمیش گێڕاویەتیەوە.

٢. ژمارە: ١٨٢٥ تەجرید = ٥٤٧٢ فەتح = فەرمووەکەی ئەبوهورەیرە (لاَ فَرَعَ وَلَا عَتِيرَةَ) موسلیمیش گێڕاویەتیەوە.

٣. ژمارە: ١٨٢٤ تەجرید = ٥٤٧٢ فەتح = فەرموودەکەی سەلمان (مَعَ الغُلَامِ عَقِيقَةٌ) لە موسلیمدا نییە، واتە: لە ئەفرادی بوخاریە.

٤. فەرموودەکەی سەموورەی کوڕی جوندوب، کەلە تەجریدەکەدا نییە، وە ژمارەی نییە، وە وا لەدوا ژمارە: ٥٤٧٢ وەوە، ئەمیش لەئەفرادی بوخارییە لەموسلیم دا نییە.

## پوختەیەکی کورتی بڕیارەکانی قوربانی:

١. قوربــانی ســونەتێکی گەورەیــە، ســوننەتە هــەموو موســوڵمانێك، هــەموو جــەژنی قوربانــێ، ئەگــەر هــەیبوو قوربــانی بکــا، ژمــارە بــۆکردنی قوربــانی دانەنراوە.

٢. قوربانی دوو جۆری هەیە: قوربانی سوننەت، قوربانی واجب. قوربانی سوننەت بۆ هەموو کەسێ هەیە کەلێی بخوات، یابەشی بدرێ لێی. بەڵام قوربانی پێویست، کەتەنیا بەنەزر پێویست ئەبێ، کەپێشی ئەگوترێ قوربانی نەزرکراو دەبــێ گــشت گۆشــتەکەی بکــا بــەخێرو بیبەخــشێتەوە، بەســەر هــەژارانا، نابــێ نەخۆیو نەکەسێ ژێواری لەسەری بێ لێی بخوات، نابێ بەشی دەوڵەمەندیشی لێ بدا، مەبەست لەهەژار کەسێکە، زەکاتی پێ بشێ.

٣. لەبەرئــەوەی گوتــەی نــەزرکردن جۆری زۆرە و بۆهــەموو کەســێ بەباشــی کــۆنترۆڵ نــاکرێ، واباشــە لــەکاتی قوربــانی کــردنو مەولوودیــدا، قوربانیکــەر، یــا مــەولوودیکار ئــاوا بڵــێ: (ئــەم ئاژەڵــەم کــرد بــەقوربانی ســوننەت، کــە بۆهــەموو کەسێ هەبێ لێی بخوات، یــا ئــەم ئاژەڵــەم کــرد بــە مــەولوودیی ســوننەت، کەهــەم خۆمو هەم هەموو کەسێ بۆی هەبێ کەلێی بخوات وە ئەگەر لــەکاتی ســەربڕیندا ئەم نییەتە دووبارە بکاتەوە زۆرباشە).

٤. کاتی قوربانی سەربڕین دەست پێ دەکا بــە تێپــەڕبوونی مــاوەی دوو ڕکــات نوێژو دوو وتار لەپاش هەتاوکەوتنی ڕۆژی یەکەمی جەژنی قوربان، وە دەمێنــێ هەتا ڕۆژ ئاوا بوونی ڕۆژی سێیەمی پاش ڕۆژی یەکەمی جەژن، کە تێکڕا دەکاتە چوار ڕۆژ، ڕۆژی جەژنو سێ ڕۆژەی پاش جەژن.

٥. ئەو ئاژەڵانــەی کــە بۆقوربــانی دەســت دەدەن ئەمانــەن: وشــترو ڕەشــەوڵاخو مەڕو بزن. بەهــەموو جۆرەکانیانــەوە، گامێــشیش لــەزاراوی شــەرعا بەڕەشــەوڵاخ دادەنرێ.

٦. تەمەنی ئاژەڵی قوربانی: بزن دووساڵی تەواوکردبێ و پێی نابێتە ساڵی سێیەمەوە، مەڕ ساڵێکی تەواوکردبێ‌و پێی نابێتە ساڵی دووەم. ڕەشەوڵاخ دەبێ دووساڵی تەواو کردبێ‌و پێی نابێتە ساڵی سێیەمەوە. وشتر دەبێ پێنج ساڵی تەواوکردبێ‌و پێی نابێتە شەشەوە.

٧. قوربانی بۆ مردوو دەکرێ، ئەگەر خۆی ڕایسپاردبێ کە قوربانی بۆ بکەن، هەندێ زانایان دەفەرموون: مردووەکە ڕاسپێریشی نەکردبێ بۆی دەکرێ، دروستە تەقلیدی ئەو زانایانە بکرێ.

٨. زۆر لەبڕیارەکانی قوربانی لەباسی حەوتمەدا ڕابوورد لە تەجریددا، لەکۆتایی ژمارە/١٨٢٥ ی تەجرید = ڕوونکردنەوەیێ.

وَعَنْ سَمُرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اَللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وسَلَّم) قَالَ: {"كُلُّ غُلَامٍ مُرْتَهَنٌ بِعَقِيقَتِهِ، تُذْبَحُ عَنْهُ يَوْمَ سَابِعِهِ، وَيُحْلَقُ، وَيُسَمَّى"} رَوَاهُ اَلْخَمْسَةُ، وَصَحَّحَهُ اَلتِّرْمِذِيُّ.

{صحيح الجامع: ٤١٨٤، الصحيح المسند/٤٥٤}:

**له تاجول ئوصولا ئاوایه:**

له سەموورەوە (ڕەزای خودای لێ بێ) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەموو کوڕێ ڕێگەی نادرێ کە تکاو شەفاعەت بکا بۆ باوکی‌و دایکی، ئەگەر بەمناڵی بمرێ، هەتا حەوتمی بۆ نەکرێ، هەق وایە کە لەرۆژی حەوتەیدا، حەوتمی بۆ سەربڕن‌و سەری بتاشن‌و ناوی بنێن). {تاج/٣، زنجیرە: ١١، ژمارە: ٢٦٠٦ ج/٤}.

**ڕوونکردنەوە:**

١- حەوتم کردن بۆ منداڵ کە لەدایك دەبێ سوننەتێکی گەورەیە.

٢- هەق وایە لەڕۆژی حەوتەمیدا حەوتمی بۆ بکەنو سەری بتاشنو ناوی بنێن، ئەگەر لەوە پێشیش بێ، یان لەوە پاشیش بێ دەبێ.

٣- ئەو ئاژەڵەی دەکرێ بەحەوتم، دەبی دەست بدا بۆ قوربانی، واتە: دەبێ لەتەمەنو بێ نەنگیو ساغیدا دەق وەك ئاژەڵی قوربانی وا بێ، هەروا لەهەموو ڕوویەکی ترەوە.

٤- ئەو ئاژەڵانەی دەکرێن بەقوربانی تەنیا وشترو ڕەشە وڵاخو بزنو مەڕەو بەس، هی ماڵیان، هی کێویان نابێ، ئیتر لەڕەگەزی نێر بن یا لەڕەگەزی مێ دەبن. گامێشیش بە ڕەشەوڵاخ دادەنرێ، تەنیا ئەم ئاژەڵانەیش بۆ حەوتم دەبنو بەس.

٥- بزن، یا مەڕ بۆ یەك حەوتم دەست دەدەن، بەڵام وشترو ڕەشەوڵاخ بۆ حەوت کەس دەست دەدەن، وە ئەگەر بۆ یەك منداڵیش بکرێن بەحەوتم لەمەڕێ، یا لەبزنێ خێرترە، ژمارەی ئەو ئاژەڵانەی دەکرێن بەحەوتم، ئەندازە دانەنراوە بۆی.

٦- سوننەتە لەکاتی سەربڕینی حەوتمدا، حەوتمکار، یا سەربڕی وەکیلی بڵێ: {بَسمِ اللّهِ اللّهُمَّ هَذا مِنكَ وَإلَيْكَ. ئەوجا بڵێ: ئەمە حەوتمە بۆ فیسارەکەس، ناوی حەوتم بۆ کراوەکە دیاری بکا، وەك ئەوە بڵێ: بِسْمِ الله ئەم مەڕە دەکەم بەحەوتم بۆ ئەحمەدی کوڕم کە تازە لەدایك بووە} .

٧- سوننەتە لەکاتی گزنگدانی خۆردا حەوتم سەربڕێ.

٨- سوننەتە لەپێش سەربڕینی حەوتمدا، سەری منداڵەکە کوڕ بێ یان کچ بتاشرێو بکێشرێ بەزێڕ، یان بەزیودا، وە ئەو زێڕە، یان ئەو زیوە بدرێ بەکەسێ کە زەکاتی پێ دەشێ، یان بەهاکەی پێ بدرێ.

٩- سوننەتە بەخورما، یان بەشیرینی تر، مەلاشووی شیرین بکرێ.

١٠- سوننەتە لەکاتی ناوناندا، بانگ بدرێ بەگوێچکەی راستیداو قامەت بکرێ بەگوێچکەی چەپیدا، یا لەپاش لەدایك بوون.

١١- حەوتم لەشەرعا ئەو ئاژەڵەیە، کە لەرۆژی حەوتەمدا، دەکرێ بەحەوتم بۆ منالی تازە لەدایك بوو، یان لەژیانیدا لەهەر تەمەنێکا بێ، یان لەپاش مردن بۆی دەکرێ بەحەوتم.

١٢- سکێ دوانە بێ دوو حەوتمی بۆ دەکرێ، زیاتر زیاتری بۆ دەکرێ، بەمەرجێ کە لەدایك دەبێ نیشانەی ژیانی پێوە بووبێ، یان لەنۆ مانگ کەمتر نەبووبێ.

١٣- نێرو مێ (واتە: خونثی) بڕیاری کچی هەیە.

١٤- منالی زینا حەوتمی بۆ دەکرێ، هەرکەسێ بۆی بکا دەبێ.

١٥- حەوتم یەکجار دەکرێو بەس، بەلام دروستە لەرۆژی حەوتەمدا دووبارە بکرێتەوە، ئەگەر لەوە پێش بۆی کرابوو.

١٦- مەرج نییە کەیەك سەر ئاژەڵ بکرێ بە حەوتم، دروستە کەسێ دە وشتر، یان بیست گا لە یەك کاتدا بکا بە حەوتم بۆ کچێ.

١٧- بۆ زانینی تەواوی بڕیارەکانی حەوتم بە دوورو درێژی بڕوانە: (تەجریدی بوخاری، بەرگی پێنجەم، لاپەڕە: ١٠٣، چاپی یەکەم، زنجیرە: ٧٤ — نامەی حەوتم — یانێ کەوا لەپاش ژمارە: (١٨٢٥) وە).

## ٣٦- كِتَابُ الأَشْرِبَةِ
## نامەی خواردنەوەکان
### (١) باب تَحريمِ الخَمرِ، وبيان أنَّهَا تَكُونُ مِنْ عَصِيرِ العنب وَمَنْ التَّمرِ وَالبَسرِ وَالزَّبيبِ
### مەیو بادە نادروستە، لە دۆشاوی تریو لە خورما، لە بەرسیلەی خورماو لە میوژو لە شتی تریش دروست دەکریٚ

١٢٩٢- عَنْ عَلِيّ بْنَ أبِي طالب كرَّم الله وجهه قَالَ: كَانَتْ لِي شَارِفٌ مِنْ نَصِيبِي مِنَ الْمَغْنَمِ يَوْمَ بَدْرٍ، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) أَعْطَانِي شَارِفًا مِنَ الْخُمُسِ يَوْمَئِذٍ، فَلَمَّا أَرَدْتُ أَنْ أَبْتَنِيَ بِفَاطِمَةَ بِنْتِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) وَاعَدْتُ رَجُلاً صَوَّاغًا مِنْ بَنِي قَيْنُقَاعَ يَرْتَحِلُ مَعِيَ فَنَأْتِي بِإِذْخِرٍ أَرَدْتُ أَنْ أَبِيعَهُ مِنَ الصَّوَّاغِينَ، فَأَسْتَعِينَ بِهِ فِي وَلِيمَةِ عُرْسِي، فَبَيْنَا أَنَا أَجْمَعُ لِشَارِفَيَّ مَتَاعًا مِنَ الأَقْتَابِ وَالْغَرَائِرِ وَالْحِبَالِ وَشَارِفَايَ مُنَاخَانِ إِلَى جَنْبِ حُجْرَةِ رَجُلٍ مِنَ الأَنْصَارِ، وَرَجَعْتُ حِينَ جَمَعْتُ مَا جَمَعْتُ، فَإِذَا شَارِفَايَ قَدِ (اجْتُبَّتْ) أَسْنِمَتُهُمَا وَبُقِرَتْ خَوَاصِرُهُمَا، وَأُخِذَ مِنْ أَكْبَادِهِمَا، فَلَمْ أَمْلِكْ عَيْنَيَّ حِينَ رَأَيْتُ ذَلِكَ الْمَنْظَرَ مِنْهُمَا، قُلْتُ: مَنْ فَعَلَ هَذَا؟ قَالُوا: فَعَلَهُ حَمْزَةُ بْنُ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، وَهُوَ فِي هَذَا الْبَيْتِ فِي شَرْبٍ مِنَ الأَنْصَارِ، غَنَّتْهُ قَيْنَةٌ وَأَصْحَابَهُ، فَقَالَتْ فِي غِنَائِهَا: أَلاَ يَا حَمْزَ لِلشُّرُفِ النِّوَاءِ، فَقَامَ حَمْزَةُ بِالسَّيْفِ فَاجْتَبَّ أَسْنِمَتَهُمَا، وَبَقَرَ خَوَاصِرَهُمَا فَأَخَذَ مِنْ أَكْبَادِهِمَا، فَقَالَ عَلِيٌّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): فَانْطَلَقْتُ حَتَّى أَدْخُلَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) وَعِنْدَهُ زَيْدُ بْنُ حَارِثَةَ، قَالَ: فَعَرَفَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فِي وَجْهِيَ الَّذِي لَقِيتُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «مَا لَكَ»؟ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَاللَّهِ مَا رَأَيْتُ كَالْيَوْمِ قَطُّ عَدَا حَمْزَةُ عَلَى نَاقَتَيَّ فَاجْتَبَّ أَسْنِمَتَهُمَا وَبَقَرَ خَوَاصِرَهُمَا وَهَا هُوَ ذَا فِي بَيْتٍ مَعَهُ شَرْبٌ، قَالَ: فَدَعَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) بِرِدَائِهِ فَارْتَدَاهُ، ثُمَّ انْطَلَقَ يَمْشِي،

وَاتَّبَعْتُهُ أَنَا وَزَيْدُ بْنُ حَارِثَةَ، حَتَّى جَاءَ الْبَابَ الَّذِي فِيهِ حَمْزَةُ، فَاسْتَأْذَنَ فَأَذِنُوا لَهُ، فَإِذَا هُمْ شَرْبٌ، فَطَفِقَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَلُومُ حَمْزَةَ فِيمَا فَعَلَ فَإِذَا حَمْزَةُ مُحْمَرَّةٌ عَيْنَاهُ، فَنَظَرَ حَمْزَةُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، ثُمَّ صَعَّدَ النَّظَرَ إِلَى رُكْبَتَيْهِ، ثُمَّ صَعَّدَ النَّظَرَ، فَنَظَرَ إِلَى سُرَّتِهِ، ثُمَّ صَعَّدَ النَّظَرَ، فَنَظَرَ إِلَى وَجْهِهِ، فَقَالَ حَمْزَةُ: وَهَلْ أَنْتُمْ إِلاَّ عَبِيدٌ لأَبِي؟ فَعَرَفَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَّهُ ثَمِلٌ، فَنَكَصَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى عَقِبَيْهِ الْقَهْقَرَى، وَخَرَجَ وَخَرَجْنَا مَعَهُ. {الحديث: ٥١٠١ = ٥٠٩٠ فم. تجريد/٣، رقم: ١٠٤٣ = ٢٣٧٥، ٢٠٨٩، ٣٠٩١، ٤٠٠٣، ٥٧٩٣. أبو داود. خراج، إمارة: ٢٩٨٦. تحفة الأشراف: ١٠٠٦٩} : [١٣٩٢]

عەلی کوڕی ئەبو طالیب (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە تالآنەکەی غەزای ڕۆژی بەدر، کە لەم نەبەردەدا لەخزمەتی پێغەمبەردا بووم، وشترە مێنگەیەکی سەرەم بەرکەوت. وە لەپێنج یەکی تالآنی ئەو ڕۆژەش پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وشترێکی تری وای داپێم، بوون بەدووان، کاتێ کەویستم فاطیمەی کچی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بگوێزمەوە، کە مارەبڕم بوو، ڕۆژێ لەبەر دەرگای پیاوێکی ئەنصاریدا، دوو وشترەکەمم یەخ دا، بەنیازی ئەوەی کەبچم باریان بکەم لەسرِناتك (إذخر) وە بارە سورِناتکیان پێ بهێنم‌و لەبازاڕ بیفرۆشم‌و دەسگیرۆیی خۆمی پێ بکەم، بۆ نانی شایی گواستنەوەی فاطیمە، دەسبارێکی شارەزای زەڕەنگەریشم پەیدا کرد، لە جوولەکەکانی بەنی قەینوقاع بوو، کە لەگەڵم بێت بۆ ئەو دەشتە، بۆ هێنانی سورِناتك، هەتا بیفرۆشین بە زەڕەنگەرەکان، بۆ ئیش‌و کاری کوورەی زەڕەنگەرییەکەیان، ئەوا من سەرگەرمی ئەوەم کە تفاق بۆ وشترەکانم

---

[١٣٩٢] تجرید/٣، ژمارە: ١٠٤٣ = ٢٣٧٥ بخاری. پوختەی موسلیم/١٢٦٣ = ٥١٠١ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٥٧ رقم الباب/١).

کۆبکەمەوە، لە کۆپانو خەرارو رەشکەو گوریس، کاتێ تفاقەکەم کۆکردەوەو گەڕامەوە بۆلای وشترەکانم، دەبینم وا هەردوو وشترەکانم دووگیان بڕاوەو کەلەکەیان هەڵدڕاوەو جەرگیان دەرهێنراوەو براوە! کە ئەم دیمەنە سامناکەم بینی چاوم پەڕییە تەوقی سەرمو گوتم: ئەمە کێ وایکردووە؟ گوتیان: حەمزەی کوڕی عەبدولموتتەلیب وایکردووە، وا لەمماڵەدا، لەگەڵ کۆمەڵێ مەینۆشدا لە یاریدەدەران (ئەنصار) خەریکن بادە دەنۆشن، کەنیزەکێکی گۆرانی بێژ گۆرانی بۆ خۆیو هاوڕێکانی دەڵێ، بەدەم چڕینەوە گوتوویە (وافیر):

أَلاَ يَا حَمْزُ لِلشُّرُفِ النِّوَاءِ
وَهُنَّ مُعَقَّلاَتٌ بِالفِنَاءِ
ضَعِ السِّكِّينَ فِي اللَّبَّاتِ مِنْهَا
وَضَرِّجْهُنَّ حَمْزَةُ بِالدِّمَاءِ
وَعَجِّلْ مِنْ أَطَايِبِهَا لِشَرْبٍ
قَدِيراً مِنْ طَبِيخٍ أَوْشِوَاءِ

واتە:

ئەی حەمزە! ئادەی ئەو وشترانە
کەوان لە حەوشە، کۆت لەپایانە
بیانگەوزێنە لە خوێنی خۆیان
مەنجەڵ هەڵێنجە لە گۆشت و بۆیان
بەزمێ سازکە، بۆ ئەم مەستانە
بە مەرگەو کەباب، بەزمێ شاهانە

ئیتر حەمزەیش بەشمشێرەوە رادەپەڕێو پەلاماریان دەداو بەشمشێرەکەی دووگیان دەبڕێو کەلەکەیان کون دەکاو لە جەرگەکەیان دەبڕێو دەیبات. عەلی (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کە ئەم دیمەنە سامناکەم بینی راچەنیمو چووم بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەتا سکاڵا لەدەستی بکەم لەلای پێغەمبەر، چونکە حەمزە مامی حەقی منو پێغەمبەر بوو، کە چوومە خزمەتی، زەیدی کوڕی حاریثەی لەخزمەتا بوو، فەرمووی: پێغەمبەر بە رەنگی رووما زانی کەتووشی چورتومێ بووم، لەبەرئەوە، یەکسەر فەرمووی: (ئەوە چیتە بۆ وا پەرێشانی؟) گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! بەخودا، قەد ناهەقی وەك ئەمرۆم نەدیوە، حەمزە دەستدرێژی کردووە لەهەردوو وشترەکەم، سەرگوزشتەکەم لەنووکەوە گێرایەوە بۆیو عەرزیشم کرد: ئێستایش وا لەومالەدا، کۆمەلێ مەینۆشی وا لەگەڵدا. ئەمەیش لەپێش ئەوەدا بوو کەمەیو بادە نادروست ببێ. جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) داوای عاباکەیی کردو کردیە بەریو بەپێ کەوتەڕێ، منو زەیدی کوڕی حاریثەیش شوێنی کەوتین، هەتا گەیشتینە بەردەرگای ئەو ماڵەی کە حەمزەو برادەرەکانی لەوێ بوون، داوای مۆڵەتی چوونە ژوورەوەی کردو مۆڵەتی پێدرا، پێغەمبەر چووە ژوورەوە، ئەوان مەست بوون، خەریکی خواردنەوە بوون، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەحەمزە تووڕە بوو، سەرکۆنەیکرد لەسەر ئەم کاروبارە ناشایستەیە کە کردوویەتی، تەماشامان کرد حەمزە مەستە، چاوەکانی بەهۆی مەستییەوە سوور بووە، جا حەمزە لەنووکی پێی پێغەمبەرەوە دەستی کرد بە تەماشاکردنی پێغەمبەر، هەتا تەوقی سەری، ئەوجا بەسەرخۆشی گوتی: ئێوە خۆتان بەچی دەزانن، ئێوە کە بەرەبابی عەبدوللای برامو بەرەبابی ئەبو طالیبی برامن، وەك خولامو کۆیلەی عەبدولموتتەلیبی باوکم وابوون!

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) کەڕوانی وا بەد مەستە وازی لێ هێناو پاشاو پاش گەڕایە دواوە، وەلای ئەوانی چۆڵکرد، نەبادا حەمزە بەهۆی مەستییەوە کاری ناشیرینتر بکا، ئیتر ئەو دەرچوو، ئێمەیش لەخزمەتیدا دەرچووین، لەوەدوا پێغەمبەر دوو وشترەکەی بەحەمزە بژارد.

١٢٩٣- عَنْ أَنَسٍ (رضى الله عنه) كُنْتُ سَاقِيَ الْقَوْمِ فِي مَنْزِلِ أَبِي طَلْحَةَ ، وَكَانَ خَمْرُهُمْ يَوْمَئِذٍ الْفَضِيخَ ، فَأَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) مُنَادِيًا يُنَادِي « أَلاَ إِنَّ الْخَمْرَ قَدْ حُرِّمَتْ » . قَالَ فَقَالَ لِي أَبُو طَلْحَةَ اخْرُجْ فَأَهْرِقْهَا ، فَخَرَجْتُ فَهَرَقْتُهَا ، فَجَرَتْ فِي سِكَكِ الْمَدِينَةِ فَقَالَ بَعْضُ الْقَوْمِ قَدْ قُتِلَ قَوْمٌ وَهْيَ فِي بُطُونِهِمْ . فَأَنْزَلَ اللَّهُ ( لَيْسَ عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ جُنَاحٌ فِيمَا طَعِمُوا ) الآيَةَ: [١٢٩٣]

ئەنەس (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ لەماڵی ئەبو طەلحەی زڕبابم، مەی‌و بادەم دەگێڕا بەسەر مەینۆشانەوە، لەو سەردەمەدا مەی‌و بادەی خەڵکەکە فەضیخ بوو، کە وشەیەکی عەرەبییە، کە جۆرە عەرەقێکە لە بەرسیلەی خورما دروست دەکرێ، لەوکاتەدا، جاڕچی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بانگەوازی هەڵدا: (ئاگاداری، وا مەی‌و بادەو ئارەق نادروست بوو).

ئەنەس فەرمووی: جا ئەبو طەلحە بەمنی فەرموو: (بڕۆ لەدەرەوە ئارەقەکە بڕێژە، منیش چووم لەدەرەوە ڕشتم، جا چۆڕاوگەی ئارەق بەناو کۆڵانەکانی شاری مەدینەدا دەڕۆیشت، جا هەندێ کەس گوتیان: ئەبێ حاڵی ئەوانە چۆن بێ، کە کاتێ شەهیدبوون، پڕ سکیان لەمەی بوو؟!) جا خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە کە دەفەرموێ: ﴿لَيْسَ عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا

[١٢٩٣] تجريد/٤، ژمارە: ١٦٥٧ = ٤٦١٧ بخاری. مسلم: ١٩٨٠ - ٥١٠٣ شيحا (بخاری رقم الكتاب/٤٦ رقم الباب/٢١).

وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ جُنَاحٌ فِيمَا طَعِمُوا﴾ واتە: ئەوانەی کە لەمەوپێش خاوەنی باوەڕ بەخوداو بە پێغەمبەر بوونو کردەوە باشەکانیان کردووە، وە بەرلەوە شتێ کە حەرام بکرێ، لەو شتەیان خواردووە، یا لێیان خواردۆتەوە، لەسەرئەوە گوناهیان ناگات).

بۆ رووونکردنەوەی پتر ژمارە (١٦٥٧م)ی تەجریدی بوخاری دەنووسین:

عن انسُ بْنُ مَالِكٍ (رَضيَ اللهُ عنهُ) قال: مَا كَانَ لَنَا خَمْرٌ غَيْرُ فَضيخِكُمْ هَذا الَّذي تُسَمُّونَهُ الْفَضيخَ فَانِّي لَقَائِمٌ اسْقِي ابا طلْحَةَ وَفُلانًا وَفُلانًا اذ جَاء رَجُلٌ فَقَالَ وَهَلْ بَلَغَكُمْ الْخَبَرُ؟ فَقَالُوا: وَمَا ذاكَ؟ قَالَ: حُرِّمَتْ الْخَمْرُ قَالُوا: اهْرِقْ هَذِهِ الْقِلالَ يَا انَسُ قَالَ: فَمَا سَالُوا عَنْهَا وَلا رَاجَعُوهَا بَعْدَ خَبَرِ الرَّجُلِ. (الحديث: ٤٦١٧- طرفه في: ٢٤٦٤- ٤٦٢٠- ٥٥٨٠- ٥٥٨٢- ٥٥٨٣- ٥٥٨٤- ٥٦٠٠- ٥٦٢٢- ٧٢٥٣):

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جاران مەی وبادەی ئێمە تەنیائەوجۆرە مەی وبادەیەبوو، کەئێوەناوتان ناوە فەضیخ کەجۆرە عەرەقێکە لەبەر سیلەی خورما دروست دەکرێت، جاجارێك وەستابووم خەریك بووم بادەم دەدا بەئەبو تەڵحە ی زربابم وفیسارە کەس و فیسارە کەس، لەم کاتەدا لەناکاو پیاوێك هات گوتی: ئەرێ هەواڵەکەتان پێ نەگەیشتووە؟ گوتیان کام هەواڵ؟ پیاوەکە فەرمووی : مەی قەدەغەکراوە واتە ئارەق حەرام کراوە.ئیتر بەبێ چەن وچوون ولێکۆڵینەوە یەکسەر بەمنیان گوت : ئەی ئەنەس !ئەم کوپە مەیانە برژێنە، وەمنیش هەموویانم رژاند.

**ڕوونکردنەوە:**

ئەم فەرموودەیە وچەند فەرموودەیەکی تری لەم بابەتە کە لەپێشەوە ڕەت بوون، بەڵگەیەکی ڕۆشنی ئەوەن کەکار بەهەواڵی تاکەکەس دەکرێت کە لەشەرعا ناسراوە بەعەمەل بەخەبەری واحید. بڕوانە : ژمارە : ٣٨ تەجرید = ٤٠فەتح = بەرگی ١ل —٥٧+ژمارە: ٢٥٢ت = ٣٩٩ف = بەرگی/١ ل/٢٦٣ + تاج/٦ ز/٦ ل/١٣٩ ف/١٥، ١٦، + فیقهی ئاسان بەرگی سێیەم ل/٨٢٣ ز/٣٢٩.

## (٥) باب كَرَاهَةِ إِنْتِبَاذِ التَّمْرِ وَالزَّبِيبِ مَخْلُوطَيْنِ
## نا باشە خورماو مێوژ تێکەڵ بکرێنو بکرێن بە سرکە

١٢٩٤- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الأَنْصَارِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): أَنَّهُ نَهَى أَنْ يُنْبَذَ التَّمْرُ وَالزَّبِيبُ جَمِيعًا، وَنَهَى أَنْ يُنْبَذَ الرُّطَبُ وَالْبُسْرُ جَمِيعًا. {الحديث: ٥١١٧ = ٥١٠٧ فم}: [(١٢٩٤)]

جابیری کوڕی عەبدوڵڵای ئەنصاری (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕێگری دەکرد لەوە کە خورماو مێوژ تێکەڵ بکرێنو ئەوسا بکرێن بەخۆشاو، هەروا ڕێگری دەکرد لەومیش کە فەریکە خورماو بەرسیلەی خورما تێکەڵ بکرێنو بکرێن بە خۆشاو. {بڕوانە: تەجرید/٥، ژمارە: ١٨٤٥ - ٥٦٠٢ فتح الباری}.

١٢٩٥- عَنْ أَبِي قَتَادَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: نَهَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنْ يُجْمَعَ بَيْنَ التَّمْرِ وَالزَّهْوِ وَالتَّمْرِ وَالزَّبِيبِ وَلْيُنْبَذْ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا عَلَى حِدَةٍ.(الحديث ٥٦٠٢): [(١٢٩٥)]

---

(١٢٩٤) تجرید/٥، ژمارە: ١٨٤٥ - ٥٦٠٢ بخاری. پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١٢٧٠ = ٥١١٧ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٧٤ رقم الباب/١١).

ئەبو قەتادە (رەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- نەهی کردووە لەوە کەدووشت پێکەوە لەیەك دەفرا بکرێن بەخۆشاو، وەك خورماو بەرسیلەی ئالو بۆلی خورما، یا وەك خورماو مێوژ، یا هەریەکێ لەم دووە سەربەخۆ خۆی بەتەنها بخووسێنرێ و بکرێ بەخۆشاو).

**(٦) بابُ النَّهْيِ عَنِ الإنتِباذِ في المُزَفْتِ والدُّبَّاءِ وَالحَنتَمِ وَالنقيرِ وبيان أنَهُ مَنسُوخٌ نا باشە خۆشاو لە کوولەکەو بەستووی زفتدراوودا بکرێ، وە ئەمە لە پێشا وابوو، لە پاشا ئەم بڕیارە پووچکرایەوە**

١٢٩٦- حَدَّثَنِي أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « لاَ تَنْتَبِذُوا فِي الدُّبَّاءِ ، وَلاَ فِي الْمُزَفَّتِ »: [١٢٩٦]

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لە کوولەکەو بەستووی زفتدراوودا سرکەو خۆشاو مەکەن).

١٢٩٧- عَنْ عَلِيٍّ (رضى الله عنه) نَهَى النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) عَنِ الدُّبَّاءِ وَالْمُزَفَّتِ: [١٢٩٧]

عەلی (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەهی دەکرد لە کوولەکەو لە دەفری زفتدراو.

١٢٩٨- عَنْ إِبْرَاهِيمَ قُلْتُ لِلأَسْوَدِ هَلْ سَأَلْتَ عَائِشَةَ أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ عَمَّا يُكْرَهُ أَنْ يُنْتَبَذَ فِيهِ فَقَالَ نَعَمْ قُلْتُ يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ عَمَّا نَهَى النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم)

---

[١٢٩٥] تجريد/٥، ژمارە: ١٨٤٥ = ٥٦٠٢ بخاری. مسلم/ محمد فؤاد/١٩٨٨ = ٥١٠٨ شيحا (بخاری رقم الكتاب/٧٤ رقم الباب/١).

[١٢٩٦] مسلم: ٥١٣٦ شيحا (بخاری رقم الكتاب/٧٤ رقم الباب/٤).

[١٢٩٧] بخاری. أشربه:٥٥٩٥، مسلم: ٥١٤١ شيحا (بخاری رقم الكتاب/٧٤ رقم الباب/٨).

أَنْ يُنْتَبَذَ فِيهِ قَالَتْ نَهَانَا فِي ذَلِكَ أَهْلَ الْبَيْتِ أَنْ نَنْتَبِذَ فِي الدُّبَّاءِ وَالْمُزَفَّتِ . قُلْتُ أَمَا ذَكَرْتِ الْجَرَّ وَالْحَنْتَمَ قَالَ إِنَّمَا أُحَدِّثُكَ مَا سَمِعْتُ ، أَفَأُحَدِّثُ مَا لَمْ أَسْمَعْ: [(١٣٩٨)]

ئیبراهیم (ڕەحمەتی خودای لێ بێ)فەرمووی: گوتم بە ئەسوەد: ئایا لە عائیشەی دایکی باوەڕدارانت نەپرسیوە، سەبارەت بە ناباشی سرکەو خۆشاوکردن لە هەندێ دەفردا؟

فەرمووی: بەڵێ لێم پرسی، گوتم: ئەی دایکی باوەڕداران! ئایا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەچی دەفرێکا پێی ناباش بوو سرکەو خۆشاو بکرێ؟ فەرمووی: نەیی کردووە لە ئێمە کە کەسوکاری خانەوادەی ئەوین، کە لە کوودیو بەستووی زفتدراودا سرکەو خۆشاو بکەین، ئیبراهیم فەرمووی: بە ئەسوەدم گوت: ئایا لەم بارەیەوە، باسی کووپەو بەستووی نەکرد؟ ئەسوەد فەرمووی: چیم لە عائیشە بیستووە باسی ئەوەم بۆ کردی، شتێ کە لێیم نەبیستبێ چۆن بڵێم بیستووە؟!

١٢٩٩- عن ابْنَ عَبَّاسٍ (رضى الله عنهما) عن النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: «وَأَنْهَاكُمْ عَنِ الدُّبَّاءِ وَالنَّقِيرِ وَالْحَنْتَمِ وَالْمُزَفَّتِ»: [(١٢٩٩)]

ئەمە گێڕانەوەی ژمارە (١٣٧٢)ی پوختەی موسلیمە:

عَنْ زَاذَانُ قَالَ: قُلْتُ لابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما): حَدِّثْنِي بِمَا نَهَى عَنْهُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) مِنَ الأَشْرِبَةِ بِلُغَتِكَ، وَفَسِّرْهُ لِي بِلُغَتِنَا، فَإِنَّ لَكُمْ لُغَةً، سِوَى لُغَتِنَا، فَقَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) عَنِ الْحَنْتَمِ، وَهِيَ الْجَرَّةُ، وَعَنِ الدُّبَّاءِ، وَهِيَ الْقَرْعَةُ، وَعَنِ الْمُزَفَّتِ، وَهُوَ الْمُقَيَّرُ، وَعَنِ النَّقِيرِ، وَهِيَ النَّخْلَةُ تُنْسَحُ نَسْحًا، وَتُنْقَرُ نَقْرًا، وَأَمَرَ أَنْ يُنْتَبَذَ فِي الأَسْقِيَةِ. {الحديث: ٥١٦٨ = ٥١٥٨ فم} :

---

[(١٢٩٨)] بخاری. أشربه: ٥٥٩٥، مسلم: ٥١٤١ شيحا (بخاری رقم الكتاب/٧٤ رقم الباب/٨) .

[(١٢٩٩)] پوختەی موسلیم: ١٣٧٢ = ٥١٦٨ شيحا (بخاری رقم الكتاب/٢٤ رقم الباب/١).

زازان (رەحمــەتی خــودای لێ بــێ) فــەرمووی: عــەرزی عەبــدوڵڵای کــوڕی عومەرم کرد (رەزای خودایان لێ بێ): ئەوشتانەی کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەســەر بــێ) نــەهی کــردووە لەخواردنــەوەیان، بــەزمانی خۆتــان، کــە زاراوەی قورەیشە، پێمان بڵێو بەزمانو زاراوی خۆجێیی خۆشمان بۆمان واتــاو راڤەبکە، چونکە زمــانی ئێوە جیــاوازی هەیــە لــەزمانی ئێمــە. ئیبنــو عومــەر فــەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) نەهی کردووە لــە خواردنــەوەی خۆشــاوی نــاو ئــەم دەفرانــە، چــونکە زۆر زوو دەترشــێنو تونــد دەبــنو دەبــن بــە ئــارەق: بەستوو، واتە: کووپەڵە، کودیی: واتــە: کوولەکە، زفــت دراو، واتــە: شــتێ بــەزفت رووکــەش کرابــێ، کۆتکــە: واتــە: بنکــی دارخورمــا کــە توێکڵەکــەی پــاك دەکــەنو ناوەکەی هەڵدەکۆڵن، وە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی کرد کە خۆشاو لەکوندەو جەوەندەو شتی وادا بکەن، نەك لەو دەفرانەدا، چونکە ئەوانە شــتیان زۆر زوو تێــدا دەترشــێ، دوور نییــە کــە ســرکەو خۆشــاوو دۆشــاوەکە ببن بەمەیو ئارەقو خاوەنەکەیان بەوە نــەزانێ). {تــاج/٣، زنجیرە: ٢٥، ژمــارە: ٢٧٣٩ ج/٤} + {بڕوانــە: ژمــارە: ١ لەپێــشەوە رابــورد} + {تــاج/٣، ژمــارە: ٢٧٣٨} + {تاج/٣، زنجیرە: ٢٥، ژمارە: ٢٧٣٩ ج/٤}.

١٣٠٠- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رضى الله عنهما) قَالَ لَمَّا نَهَى النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) عَنِ الأَسْقِيَةِ قِيلَ لِلنَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) لَيْسَ كُلُّ النَّاسِ يَجِدُ سِقَاءً فَرَخَّصَ لَهُمْ فِي الْجَرِّ غَيْرِ الْمُزَفَّتِ: [١٣٠٠]

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (ڕەزای خودا لە خۆیو لە باوکی بێ) فــەرمووی: کاتێ پێغەمبــەر (دروودی خــودای لەســەر بــێ) ڕێگــری لــە موســوڵمانان کــرد، کــە

[١٣٠٠] تجرید/١، ژمارە: ٤٩ = ٥٣ بخاری. پوختەی موسلیم/١، ژمــارە: ١ - ١١٦ شیحا (بخــاری رقــم الکتاب/٧٤ رقم الباب/٨).

سرکەو خۆشاو تەنیا لە جەوەندەو مەشکەدا بکەن، عەرزیانکرد: هەموو کەسێ دەفری چەرمینی نیە، جا ئەویش مۆڵەتی دا پێیان کە کووپەی زفتنەدراو بەکار بهێنن.

## ڕوونکردنەوە:

بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم فەرموودانەو بۆ زانینی تەواوی ناوی ئەم جۆرە دەفرانەی کە لەم کۆمەڵە فەرموودەیەدا هاتوون، فەرموودەی ژمارە: (١)ی پوختەی موسلیم لە دواوە بە تەواوی ڕاگوێز دەکەین، بە پشتی خودا، کە ئەمە دەقەکەیەتی:

عَنْ أَبِي جَمْرَةَ، قَالَ: كُنْتُ أُتَرْجِمُ بَيْنَ يَدَيِ عَبْدِاللّهِ بْنِ عَبَّاسٍ وَبَيْنَ النَّاسِ، فَأَتَتْهُ امْرَأَةٌ تَسْأَلُهُ عَنْ نَبِيذِ الْجَرِّ، فَقَالَ: إِنَّ وَفْدَ عَبْدِ الْقَيْسِ أَتَوْا رَسُولَ اللّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ رَسُولُ اللّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « مَنِ الْوَفْدُ؟ أَوْ مَنِ الْقَوْمُ؟ ». قَالُوا: رَبِيعَةُ. قَالَ: « مَرْحَبًا بِالْقَوْمِ أَوْ بِالْوَفْدِ غَيْرَ خَزَايَا وَلاَ النَّدَامَى ». قَالَ: فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ! إِنَّا نَأْتِيكَ مِنْ شُقَّةٍ بَعِيدَةٍ، وَإِنَّ بَيْنَنَا وَبَيْنَكَ هَذَا الْحَيَّ مِنْ كُفَّارِ مُضَرَ، وَإِنَّا لاَ نَسْتَطِيعُ أَنْ نَأْتِيَك إِلاَّ فِى شَهْرِ الْحَرَامِ، فَمُرْنَا بِأَمْرٍ فَصْلٍ نُخْبِرْ بِهِ مَنْ وَرَائَنَا، نَدْخُلُ بِهِ الْجَنَّةَ. قَالَ: فَأَمَرَهُمْ بِأَرْبَعٍ، وَنَهَاهُمْ عَنْ أَرْبَعٍ، قَالَ: أَمَرَهُمْ بِالإِيمَانِ بِاللَّهِ وَحْدَهُ. وَقَالَ: « هَلْ تَدْرُونَ مَا الإِيمَانُ بِاللَّهِ وَحْدَهُ؟». قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: « شَهَادَةُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، وَإِقَامُ الصَّلاَةِ، وَإِيتَاءُ الزَّكَاةِ، وَصَوْمُ رَمَضَانَ، وَأَنْ تُؤَدُّوا خُمُسًا مِنَ الْمَغْنَمِ ». وَنَهَاهُمْ عَنِ الدُّبَّاءِ، وَالْحَنْتَمِ، وَالْمُزَفَّتِ. قَالَ شُعْبَةُ: وَرُبَّمَا قَالَ: النَّقِيرِ. وَرُبَّمَا قَالَ الْمُقَيَّرِ. وَقَالَ: « احْفَظُوهُ وَأَخْبِرُوا بِهِ مِنْ وَرَائِكُمْ ». وَزَادَ ابْنُ مُعَاذٍ فِي حَدِيثِهِ عَنْ أَبِيهِ قَالَ: وَقَالَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لِلأَشَجِّ، أَشَجِّ عَبْدِ القَيْسِ: « إِنَّ فِيكَ لَخَصْلَتَيْنِ يُحِبُّهُمَا اللَّهُ: الْحِلْمُ وَالأَنَاةُ». (الحديث رقم ١١٦

والحديث رقم ١١٧ صحيح مسلم بِشرح الإمام النووي، تحقيق الشيخ خليل مأمون شيخا – دار المعرفة. بيروت – لبنان. الطبعة الثانية عشر ١٤٢٦هـ ٢٠٠٦م طرفه في: ١١٥، الإيمان رقم/١٢٧ حسب ترقيم فتح المُلْهِم بِشَرْح صحيح مسلم تأليف الشيخ شبير أحمد العثماني. أخرجه البخاري في: ٥٣، ٨٧، ٥٢٣، ١٣٩٨، ٣٠٩٥، ٣٥١٠، ٤٣٦٨، ٤٣٩٦، ٦١٧٦، ٧٢٦٦، ٧٥٥٦ مختصر صحيح البخاري المسمَّى بالتجريد الصّرِيح. رقم: ٤٩. أخرجه أبو داود في: ٣٦٩٢، ٤٦٧٧، أخرجه الترمذي في: ١٥٩٩، ٢٦١١. واخرجه النسائي في: ٥٠٤٦، ٥٠٤٦، ٧٥٠٨. تحفة الأشراف (٦٥٢٤). {م١/٣٥ – ٣٦ = صحيح مسلم ج/١ ص٣٥ – ٣٦. چاپی استنبول}.

ئەبو جەمرە (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: لە خزمەتی ئیبنو عەباس دا بووم، (رەزای خودای لێ بێ)، تەرجومانیم لە نێوانی ئەوو خەڵکەکەدا دەکرد، ئەگەر بە باشی لە زاراوی یەکتری تێ نەگەیشتنایە، من لە یەکتریم حاڵی دەکردن، لەکاتی قسەو گفتوگۆو وەڵامو پرسیاردا، لەسەر داوای ئیبنو عەباس خۆی دوو مانگ لە خزمەتیدا مامەوە، تەرجومانیم بۆ دەکرد. جارێ ئافرەتێ هاتە خزمەتی، لەبارەی خۆشاوی بەستووەوە پرسیاری لێ کرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەیی لێ کرد لەوە، کە لە بەستوودا خۆشاو بکەن. (بەستوو واتە: کووپە).

ئەبوجەمرە فەرمووی: منیش عەرزیم کرد: خۆ من کووپەڵەیەکی سەوزم هەیە، خۆشاوی تیا دەکەمو لێی دەخۆمەوە، فەرمووی شتی وا مەکە، چونکە کاتێ کە نوێنەرەکانی هۆزی عەبدولقەیس هاتن بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)، فەرمووی: (ئەم نوێنەرانە کێن؟ یا فەرمووی: ئەم خزمانە کێن؟) گوتیان: لە خێڵی عەبدولقەیسن، کە دەچێتەوە سەر هۆزی رەبیعە. پێغەمبەریش پێی فەرموون: (خزمینە! بەخێر بێن، ئێوە لە ئیسلام بوون دوا نەکەوتوون، هەتا بەهۆی ئەوەوە تەریقیو شەرمەزاریتان بەسەر بێ،

وەكارێكی واشتان لە دژی ئیسلام نەكردووە، كە پەشیمانی لەدوا بێ). عەرزیان كرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئێمە لە ڕێگەیەكی دووری پڕ زەحمەتەوە هاتووین، سەرەڕای ئەوەیش ئێمە كە دێین بۆ خزمەتی تۆ، بۆ مەدینە، بەسەر ئاواییەكا دێین، كە لە كافرەكانی هۆزی موضەرن، لەبەرئەوە ناتوانین بێین بۆ خزمەتت، مەگەر لە مانگە حەرامەكانا، كە هەراو شەڕو شۆڕیان تیادا قەدەغەیە، كە ئەم چوار مانگەن: نێو جەژنان (ذوالقعدة)و قوربانو موحەڕەمو ڕەجەب. ئادەی بفەرموو، ئامۆژگارییەكی روونو ئاشكرامان پێ بفەرموو، كە گەڕاینەوە بۆ وڵاتی خۆمان، بە خەڵكەكەی لای خۆمانی رابگەیەنینو، هەموو پابەندی ببینو كارو رەفتی پێ بكەین، هەتا بەهۆی جێبەجێ كردنی ئەو فەرمانەی تۆوە بچینە بەهەشت. فەرمووی: وە لەبارەی ئەو دەفرانەوە كە خواردنەوەیان تێ دەكرێ پرسیاریان لێكرد، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێ كردن بە چوار شتو، نەهیی لێ كردن لە چوار شت:

**یەكەم:** فەرمانی پێ كردن بە باوەڕهێنان بە خودای تاكو تەنیا. فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (ئایا دەزانن بڕواهێنان بە خودای تاكو تەنها چییەو چۆنە؟) گوتیان: خواو پێغەمبەری خوا باشی دەزانن. فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (بریتییە لە شایەتمان لەسەر ئەم شێوەیە: أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلـه إِلاَّ الله وَحْدَهُ لاَشَرِيكَ لَـهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحمداً رَسُولُ اللهِ: بە زمان شایەتی دەدەمو بە دڵ باوەڕ دەكەم، كە بێجگە لە یەزدانی پاك هیچ خودایەكی تر نییە، خوایەكی تاكو تەنهایە، بێ هاوەڵە، هیچ هاوبەشی نییە، بەهەمان شێوە، بەدەمو بەدڵ، شایەتی دەدەمو باوەڕم هەیە كە موحەممەدی كوڕی عەبدوڵلا فروستادەو پێغەمبەری خوایە).

**دووەم:** فەرمانی پێكردن بە كردنی نوێژ بە رێكو پێكی.

**سێیەم:** فەرمانی پێكردن بە دانی زەكات.

**چوارەم: فەرمانی پێکردن بە گرتنی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان.**

وە فەرمانیشی پێیان کرد: کە لە دەستکەوتی تالآنی جەنگیش پێنج یەك بدەن). وە پێشگیریشی لێکردن لەم چوار شتە، کە بەکاریان نەهێنن بۆ دروست کردنی خۆشاوو سرکەو دۆشاو، چونکە شتی ناویان زۆر زوو دەترشیٚو تونـد دەبیٚو دەبیٚ بە ئارەقو مەیو بادە، نەیی لێکردن لە بەکارهێنانی کوولەکەو کوپەڵەو بەستووی زفت دراوو کۆتکە دار، کە بۆکردنی خۆشاوو شتی وا بەکاریان بهێنن).

فەرمووشی (درووودی خودای لەسەر بیٚ): (ئەم فەرمایشتانەیش کە لەم ماوەیەدا لەمنتان بیستووە، باش لەبەریان بکەنو رایان بگەیەنن بە خەڵکی وڵاتی خۆیشتان).

ئیمامی موسلیم (ڕەحمەتی خودای لیٚ بیٚ) دەفەرمویٚ: عەبدوڵلآی کوڕی موعاز، لە گێڕانەوەی خۆیدا، بۆ ئەم فەرموودەیە، کە لە موعازی باوکیەوە دەیگێڕێتەوە، ئەمەی پترە:

پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بیٚ) بە سەرۆکی شاندەکەی فەرموو، کە ناسراو بوو بە ئەشەججی سەرۆکی هۆزی عەبدولقەیس: (دوو ڕەفتاری پەسەندو جوان لە تۆدا هەن، خودا خۆشی دەویٚنو ڕەزای لەسەریانە، کە بریٚتین لە هێمنیو لە سەلاریو لەسەر خۆیی). (رياض الصالحين/ ٢ ژمارە: ٦٣٢، لاپەڕە: ١٧٠ وەرگەڕاوە کوردیەکەی، التاج الجامع للأصول في أحاديث الرسول/٤ لاپەڕە: ٨٥ ژمارە: ٣، ٤، ٥، ٦ = ژمارە/٢٧٣٨، ٢٧٣٩، ٢٧٤٠، ٢٧٤١، چ/٤. وەرگەڕاوە کوردیەکەی. موسلیم لە ئەبو سەعدی خودرییەوە، ژمارە: ١١٨و ١١٩و ١٢٠).

**ڕوونکردنەوە:**

١. بڕیاری ئەم فەرموودەیە، لەم فەرموودەی تری پێغەمبەردا، روون کراوەتەوە کە دەفەرموێ: (من بە ئێوەم گوتبوو کە لەهەندێ دەفرو حاجەتدا شت مەخۆنەوە، یا شتی تیا دروست مەکەن، بەڵام حاجەت خۆی لەخۆیا شت حەڵاڵ، یا حەرام ناکا، ئەوەندە هەیە کە هەموو سەر خۆشکەرێ حەرامە). (موسلیم ٥١٧٥، ٥١٧٦، ٥١٧٧) کەواتە ئێستا دروستە لەم دەفرانەدا سرکەو خۆشاوو دۆشاو بکرێ.

٢. بۆ ژیاننامەی ئیبنو عەباس بڕوانە: (تەجریدی صەریح/١، لاپەڕە/١٩، ژمارە/٥).

٣. ئەبو جەمرە ناوی نەمری کوڕی عیمرانە، فەرموودەی لە ئیبنو عەباس‌و ئیبنو عومەرو سەحابەی ترو تابیعینەوە گێڕاوەتەوە، بە کۆی دەنگ جێگەی متمانەی فەرمووده زانەکان بووە، لە پیاوانی صەحیحەینە، باوکی قازی بەصرە بووە، لە شاری سەرخەس، لە ساڵی ١٢٨ کۆچیدا مردووە، (رەزاو رەحمەتی خودای لێ بێ).

ئەشەجج ناوی مونزیری کوڕی عائیز بوو، پێغەمبەر ناوی نا ئەشەجج، بە کوردی واتە: کونج، چونکە دەموچاوی کونج بوو، (کچێکی ژنی مونقیزی کوڕی حیان بوو، مونقیز لەسەردەمی نەزانیدا، بۆ بازرگانی دەچوو بۆ مەدینە، جارێ لەپاش کۆچ کردن، لیفەو خورمای برد بۆ فرۆشتن بۆ مەدینە، لەوێ بە خزمەت پێغەمبەر دەگاو موسوڵمان دەبێ‌و سوورەتی فاتیحەو عەلەق فێردەبێ‌و دەگەڕێتەوە بۆ هەجەر، پێغەمبەر نامەیەکی پیادا دەنێرێ بۆ هۆزی عەبدولقەیس، کە موسوڵمان ببن، بەڵام چەند رۆژێ نامەکە دەرناخات، ژنەکەی سەرنج دەدا مێردەکەی گۆڕاوەو نوێژ دەکا، بە باوکی خۆی دەڵێ: مونقیز ئەوەتی لە مەدینە گەڕاوەتەوە گۆڕاوە لەبەر چاوم، دەست‌و پای دەشوا روو

دەکاتە ئەم لایە، واتە: قیبلەو پشتی دەچەمێنێتەوەو تەوێڵی لەسەر زەوی دائەنێ، ئەوەتی لە یەثریب گەڕاوەتەوە ئەمە کاریەتی، جا مونقیزو ئەشەجج کۆدەبنەوەو لەم بارەیەوە گوفتوگۆ دەکەنو ئەشەجج موسوڵمان دەبێو نامەکەی پێغەمبەر دەگەیەنێ بە هۆزەکەیو موسوڵمان دەبنو بڕیار دەدەن کە شاندێ بە نوێنەری ئەوان بچێت بۆ خزمەتی حەزرەت ... تاد).

## (٧) باب بيان أنَّ كُلَّ مُسكرٍ خَمرٌ وَأنَّ كُلَّ خَمرٍ حَرَامٌ
## هەر شتێ سەرخۆشکەر بێ مەیو بادەیە، وە هەموو مەیو بادەیەکیش نادروستە

١٣٠١- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْها) قَالَتْ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّـهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) عَنِ الْبِتْعِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ): «كُـلُّ شَـيءٍ أَسْكَرَ فَهُـوَ حَرَامٌ». {الحديث: ٥١٨٠ = ٥١٧١ فم. بخاري. وضوء: ٢٤٢، ٥٥٨٥، ٥٥٨٦. ترمذي. أشربة: ١٨٦٣. أبو داود. أشربة: ٣٦٨٢. نسائي. أشربة: ٥٦٠٧. تحفة الأشراف: ١٧٧٦٤} :[١٣٠١]

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پرسیارکرا لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەتع حەرامە یانا؟ بەتع شەرابی خەڵکی یەمەن بوو، لەهەنگوین دروست دەکرا. فەرمووی: (هەر خواردنەوەیێ سەرخۆشی ببەخشێو مرۆڤ مەست بکا نادروستەو حەرامە، ئیتر بەهەر ناوێ بێ ئەوە گرنگ نییە، بایستی نادروستی سەرخۆشکردنە، کە سەرخۆش کردن هەبوو،

---

[١٣٠١] بخاری. وضوء، ٢٤٢، پوختەی موسلیم/٣، ژمارە، ١٢٦٥ = ٥١٨٠ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٦٥ رقم الباب/٦٠).

نادروستیو قەدەغە بوونیش هەیە!). {تاج/٣، لاپەڕە: ٢٣٤، زنجیرە: ٢٥، ژمارە: ٢٧٤٢ چ/٤}.

١٣٠٢- حديث أبي موسى ومعاذ، بَعَثَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) جَدَّهُ أَبَا مُوسَى ، وَمُعَاذًا إِلَى الْيَمَنِ فَقَالَ «يَسِّرَا وَلاَ تُعَسِّرَا ، وَبَشِّرَا وَلاَ تُنَفِّرَا ، وَتَطَاوَعَا » . فَقَالَ أَبُو مُوسَى يَا نَبِيَّ اللَّهِ ، إِنَّ أَرْضَنَا بِهَا شَرَابٌ مِنَ الشَّعِيرِ الْمِزْرُ ، وَشَرَابٌ مِنَ الْعَسَلِ الْبِتْعُ . فَقَالَ « كُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ »: (١٣٠٢)

ئەبو بوردەی کوڕی ئەبو مووسا فەرمووی: باوکم فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) منو موعاذی کوڕی جەبەلی نارد بۆ یەمەن، فەرمووی پێمان: (کار ئاسان بکەن، کار گران مەکەن، وە موژدەی خۆش بدەن بە خەڵکان، بە هەڕەشەو گوڕەشەی زۆر خەڵکان لە ئیسلام مەتەکێننەوە، وە لەناو خۆشتانا گوێڕایەڵی یەکتری بن).

جا ئەبو مووسا فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! لە وڵاتی ئێمە کە یەمەنە، خواردنەوەیێ هەیە، لە جۆ دروست دەکرێ، پێی دەگوترێ: (موزر) وە خواردنەوەیەکی تر هەیە لە هەنگوین دروست دەکرێ، پێی دەگوترێ (بوتع).

فەرمووی: (هەموو سەرخۆشکەرێ نادروستە).

---

(١٣٠٢) بخاری. وضوء: ٢٤٢، مسلم: ٥١٧٩ شیحا. پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١٣٦٥ = ٥١٨٠ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٦٥ رقم الباب/٦٠).

## (٨) بابُ عُقُوبَةُ مَنْ شَرِبَ الخَمْرَ إِذا لَمْ يَتُبْ مِنهَا، بِمَنعَهُ إِيَاها في الآخِرَةِ
## ئەوەی لە جیهانا ئارەق بخواتەوە، ئەگەر تەوبەی لێ نەکا، لەو جیهانا نایخواتەوە

١٣٠٣- عَنْ عَبْدِاللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ مَنْ شَرِبَ الْخَمْرَ فِي الدُّنْيَا ثُمَّ لَمْ يَتُبْ مِنْهَا حُرِمَهَا فِي الْآخِرَةِ.(الحديث ٥٥٧٥):[١٣٠٣]

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر -ڕەزای خوایان لێ بێ- فەرمووی: پێغەمەر -درودی خوای لەسەر بێ- دەفەموێ: (هەموو سەرخۆشکەرێ ئارەقە، وە هەموو سەرخۆشکەرێ حەرامە، وەهەر کەسێ لەجیهانا ئارەق بخواتەوەو فێری ببێو تادەمرێ تەرکی نەکاو وازی لێ نەهێنێ و تەوبەی لێ نەکا، ئەوە لەبەهەشتا چەشکەی ناکات). (تاج/٤ ل/٩٠ ز/٢٦ ژ/١ ش/د/ت/ن). (بڕ: ریاض/٢ ز/١١١ ل/٢٦٢ – ٢٧٢ ز/١١٦).

## (٩) باب إِبَاحَةِ النَّبِيذِ الَّذِى لَمْ يَشْتَدَّ وَلَمْ يَصِرْ مُسْكِراً
## خۆشاوێ کە تووند نەبووبێو سەرخۆشکەر نەبێ دروستەو نادروست نیە

١٣٠٤- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ دَعَا أَبُو أُسَيْدٍ السَّاعِدِىُّ رَسُولَ اللَّهِ – صلى الله عليه وسلم – فِى عُرْسِهِ ، وَكَانَتِ امْرَأَتُهُ يَوْمَئِذٍ خَادِمَهُمْ وَهْىَ الْعَرُوسُ ، قَالَ سَهْلٌ تَدْرُونَ مَا سَقَتْ رَسُولَ اللَّهِ – صلى الله عليه وسلم – أَنْقَعَتْ لَهُ تَمَرَاتٍ مِنَ اللَّيْلِ ، فَلَمَّا أَكَلَ سَقَتْهُ إِيَّاهُ.[١٣٠٤]

---

[١٣٠٣] تجريد/٥، ژمارە: ١٨٤٠ = ٥٥٧٥ بخاری. مسلم/محمد فؤاد/٢٠٠٣ = ١٣٦٦ = پوختەی موسلیم - مسلم ترقيم شيحا: ٥١٩٢ (بخاری رقم الكتاب/٧٤ رقم الباب/١).

[١٣٠٤] بخاری. ايمان و نذور: ٦٦٨٥، ٥١٦٠. مسلم: ٥٢٠١ شيحا (بخاری رقم الكتاب/٦٧ رقم الباب/٧١).

سەهلی کوڕی سەعد فەرمووی: ئەبو ئوسەیدی ساعیدی فەرمووی: پێغەمبەرم (دروودی خودای لەسەر بێ) بانگکرد بۆ سەر شاییەکەم، ژنەکەم (کە بووك بوو) خۆی خزمەتی دەکردین، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە نانخواردن بووەوە، ژنەکەم خۆشاوی دەرخواردا، کە لە شەوەوە خوساندبووی بۆی. {بڕوانە: تاج/٢، زنجیرە/٣٩، ژمارە: ٢١٢٣ و ٢٧٥٨} هەروا بڕوانە ژمارە: (١٣٠٥).

ئەمەیش گێڕانەوەیەکی تری ئەم فەرموودەیە، ڕاگوێزی دەکەین، لەبەرگی دووەم، تاجول ئوصول، ژمارە (٢١٢٣):

١٣٠٥- عَنْ سَهْلٍ قَالَ لَمَّا عَرَّسَ أَبو أُسَيْدٍ السَّاعِدِيُّ دَعَا النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) وَأَصْحَابَهُ ، فَمَا صَنَعَ لَهُمْ طَعَامًا وَلاَ قَرَّبَهُ إِلَيْهِمْ إِلاَّ امْرَأَتُهُ أُمُّ أُسَيْدٍ ، بَلَّتْ تَمَرَاتٍ فِي تَوْرٍ مِنْ حِجَارَةٍ مِنَ اللَّيْلِ ، فَلَمَّا فَرَغَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) مِنَ الطَّعَامِ أَمَاثَتْهُ لَهُ فَسَقَتْهُ ، تُتْحِفُهُ بِذَلِكَ: (١٣٠٥)

سەهل فەرمووی: ئەبو ئوسەیدی ساعیدی لە شاییەکەیدا پێغەمبەرو هاوەڵانی بانگهێشت کرد، ژنەکەی کە بووك بوو خۆی خزمەتی دەکردن، ئوم ئوسەید خۆی نانی بۆ دروست کردنو هەر خۆی نانەکەی دانا بۆیان، هەندێ خورمای لە شەوەوە خوساندبوو، لە قاپێکی بەردیندا، کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە نان خواردن بوویەوە، خورماکەی بە دەستی فلیقانەوەو پاڵاوتیو کردی بە خۆشاوو دای بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خواردیەوە، ئەوەی کرد بە دیاری بۆی.

١٣٠٦- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: ذُكِرَ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) امْرَأَةٌ مِنَ الْعَرَبِ، فَأَمَرَ أَبَا أُسَيْدٍ أَنْ يُرْسِلَ إِلَيْهَا، فَأَرْسَلَ إِلَيْهَا، فَقَدِمَتْ

---

(١٣٠٥) بخاری. نکاح: ٥١٨٢. مسلم: ٥٢٠٣ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٦٧ رقم الباب/٧٧).

فَنَزَلَتْ فِي أُجُمِ بَنِي سَاعِدَةَ، فَخَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَتَّى جَاءَهَا، فَدَخَلَ عَلَيْهَا، فَإِذَا امْرَأَةٌ مُنَكِّسَةٌ رَأْسَهَا، فَلَمَّا كَلَّمَهَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، قَالَتْ: أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْكَ، قَالَ: «قَدْ أَعَذْتُكِ مِنِّي»، فَقَالُوا لَهَا: أَتَدْرِينَ مَنْ هَذَا؟ فَقَالَتْ: لاَ، فَقَالُوا: هَذَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) جَاءَكِ لِيَخْطُبَكِ، قَالَتْ: أَنَا كُنْتُ أَشْقَى مِنْ ذَلِكَ. قَالَ سَهْلٌ: فَأَقْبَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَوْمَئِذٍ حَتَّى جَلَسَ فِي سَقِيفَةِ بَنِي سَاعِدَةَ هُوَ وَأَصْحَابُهُ، ثُمَّ قَالَ: «اسْقِنَا». لِسَهْلٍ، قَالَ: فَأَخْرَجْتُ لَهُمْ هَذَا الْقَدَحَ فَأَسْقَيْتُهُمْ فِيهِ. قَالَ أَبُو حَازِمٍ: فَأَخْرَجَ لَنَا سَهْلٌ ذَلِكَ الْقَدَحَ فَشَرِبْنَا فِيهِ، قَالَ: ثُمَّ اسْتَوْهَبَهُ بَعْدَ ذَلِكَ عُمَرُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، فَوَهَبَهُ لَهُ. {الحديث: ٥٢٠٤ = ٥١٩٥ فم. تجريد/٥، رقم: ١٨٥٥ = ٥٦٣٧ + تجريد/٥، رقم: ١٧٨٨ = ٥٢٥٥، ٥٢٥٧}: [١٣٠٦]

سەهلی کوڕی سەعد (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: نوعمانی کوڕی ئەبولجەون، هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) ئیسلام بوو، عەرزی حەزرەتی کرد: کچێکی بێوەژنم هەیە، لەناو عەرەبا ژنی واجوان کەمە، ئەگەر بفەرمووی لێتی مارە دەکەم؟! پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی باشە، وەلێی مارەکرد لەسەر دوازدە ئۆقیە، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەبو ئوسەیدی نارد لەگەڵ نوعماندا، کە بیگوێزێتەوە بۆی، وە ئەبو ئوسەید ژنەکەی هێنا، ناوی ئومەیمەی کچی نوعمان بوو، نازناوی بینتولجەون بوو، دایەنەکەیشی کە لەلەی بوو لەگەڵیا هاتبوو، لە قەڵای بەنی ساعیدە کە یەکێکە لە قەڵاکانی مەدینە، لەوێ دابەزی، جا ئەبو ئوسەید هەواڵ دەبا بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەوا بینتولجەونمان هێنا بە

---

[١٣٠٦] تجرید/٥، ژمارە: ١٧٨٨ = ٥٢٥٥. پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١٢٨٦ = ٥٢٠٤ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٧٤ رقم الباب/٣٠).

بووکی بۆت، بفەرموو بۆلای هاوسەرەکەت، کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چووە ناو پەردەی بووكو زاوایی، روانی واژنێ بە پەستی دانیشتووەو سەری شۆڕەوە کردووە، کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستی کرد بە گوفتوگۆ لەگەڵیدا، ژنەکە دەڵێ: پەنا دەگرم بەخودا لەتۆ، کەدەستم بۆ بهێنی! ئەویش دەفەرموێ: پەنات برد بۆکەسێ کە شایستەی پەنا پێبردنە، ئەوا تۆم پەنادا لەخۆم. ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دێتە دەرەوەو بەجێی دەهێڵێ. جا خەڵکەکە کە لەحاڵەکە حاڵی دەبن، بە ئومەیمە دەڵێن: دەزانی هەڵەیەکی گەورەت کرد، دەزانی ئەوە کێ بوو کەهاتە ژوورەوە بۆلات؟ دەڵێ: نەء، نازانم کێ بوو؟ گوتیان: ئەوە پێغەمبەری خودا بوو، کەتۆی مارە کردبوو بۆ خۆی، تۆ بەم کردارە ناشایستەیە، ئەو پایە بەرزەت لەکیس خۆتدا، کەشادببیت بەپایەی هاوسەرێتیی پێغەمبەرو بەپێی دەقی قورئانی پیرۆز شادببیت بە پلەی دایکی موسوڵمانان، کە دەفەرموێ: (وَأَزْوَاجُهُ أُمَّهَاتُهُمْ). ئەویش لەپەشیمانیدا بە پەژارەوە گوتی: من لەوە بەدبەختترم کە پیتو فەڕی وام تووش ببێ!).

سەهل فەرمووی: ئەو رۆژە پێغەمبەر خۆیو هاوەڵانی هاتن، تا لەساباتەکەی بەنی ساعیدە دانیشتنو بوون بە میوانمان، پاشان فەرمووی: (ئەی سەعد! خواردنەوەیەکی پاکمان بۆ بهێنە تا بیخۆینەوە). منیش ئالەم جامەدا، کە جامی پێغەمبەر خۆی بوو، خواردنەوەیەکی پاكو حەڵاڵم دەرخوارد دان.

قسە گێڕەوە، کە ئەبو حازیمە فەرمووی: جا سەعد ئەوجامەی دەرهێنا بۆمانو پیشانمانی داو یەکە یەکە ئاومان پێ خواردەوە، بۆ مووفەڕکی، جا لەوەپاش جێنشینی باش عومەری کوڕی عەبدولعەزیز (رەزای خودای لێ بێ)

داوای ئەو جامەی کرد لەسەعد، کەپێی ببەخشێ، سەعدیش جامەکەی بەخشی پێی).

**ڕوونکردنەوە:**

ئەبو ئوسەیدی ساعدی، ناوی مالیکی کوڕی ڕەبیعەیە، خەزرەجییە، ئەنصارییە، ئامادەی غەزای بەدرو غەزاکانی پاش بەدر بووە، لەڕۆژی ئازادکردنی مەککەدا ئالآی ئێلی بەنی ساعیدە بەو بووە، واقیدی دەفەرموێ: پیاوێکی کورتەباڵای سەرو ریش سپی بووە مووی پڕو زۆر بووە، لە کۆتایی تەمەنیدا نابینا بووە، ساڵی شەستی کۆچی لەتەمەنی حەفتاو هەشت ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە، دواترین کەس بووە لەبەدرییەکان کە مردووە، لەمەدینە مردووە. {بڕوانە: تەجرید = مختصر صحیح البخاری/٥، ژمارە: ١٧٨٨ هەتا کۆتایی}.

## (١٠) بابُ جَوَازِ شُرْبِ اللَّبَنِ
## خواردنەوەی شیر دروستە

١٣٠٧- عَنْ الْبَرَاءِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: لَمَّا أَقْبَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) مِنْ مَكَّةَ إِلَى الْمَدِينَةِ، قَالَ: فَأَتْبَعَهُ سُرَاقَةُ بْنُ مَالِكِ بْنِ جُعْشُمٍ، قَالَ: فَدَعَا عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، فَسَاخَتْ فَرَسُهُ، فَقَالَ: ادْعُ اللَّهَ لِي، وَلاَ أَضُرُّكَ، قَالَ: فَدَعَا اللَّهَ، قَالَ: فَعَطِشَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَمَرُّوا بِرَاعِي غَنَمٍ، قَالَ أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): فَأَخَذْتُ قَدَحًا، فَحَلَبْتُ فِيهِ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) كُثْبَةً مِنْ لَبَنٍ، فَأَتَيْتُهُ بِهِ، فَشَرِبَ حَتَّى رَضِيتُ. {الحديث: ٥٢٠٧ = ٥١٩٨ فـم. بخاری. مناقب: ٣٦١٥، ٣٦٥٢، ٣٩٠٨، ٣٩١٧، ٢٤٣٩، ٥٦٠٧. راجع

رقم: ١١٥٥ — المتقدم + تجريد/٤، رقم: ١٥١٧ + تاج/٣، زنجيره: ١٠١، ژماره: ٣١٦٠ + تاج/٣، زنجيره: ١٠١، ژماره: ٣١٥٨}: [١٣٠٧]

بەراء (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە مەککەوە کۆچی کرد بۆ مەدینە، سوراقەی کوڕی مالیکی کوڕی جوعشوم، شوێنی دەکەوێ تا بیکوژێ، یا دیلی بکاو ئەو خەڵاتە وەربگرێ لە قوڕەیش کە بڕیاریان دابوو، بۆ کەسێ پی بکوژێ، یا دیلی بکا. جا پێغەمبەر نزای لێ دەکا کە خودا چارەی بکا، کاتێ لە پێغەمبەرو ئەبوبەکر نزیك دەبێتەوە ماینەکەی سەر سمێ دەداو دەیگلێنێو هەردوو دەستی ماینەکەی لە زەوییەکی ڕەقەنا، هەتا هەردوو ئەژنۆی دا دەچێ، جا سوراقە کە ئەم موعجیزەیە دەبینێ، عەرزی دەکا: نزام بۆ بکە، زیانم نابێ بۆت، ئەویش دەپاڕێتەوە بۆی. فەرمووی: جا لەڕێگە پێغەمبەر تووشی دەبێ، دەگەن بەشوانێ، ئەبوبەکری صەدیق (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: لە کاسەیەکی دارینا، بەقەد ژەمی دۆشینی مەڕێ شیرم تێ دۆشیو بردم بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەویش بەدڵی من لێی خواردەوە).

بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم چیرۆکەی سوراقەی کوڕی مالیك، لە تەجریدی بوخاری، بەرگی چوارەم، ژمارە (١٥١٧) بەتەواوی ڕاگوێز دەکەین:

عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْها) زَوْجَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَتْ: لَمْ اعْقِلْ ابَوَيَ قَط الا وَهُمَا يَدِينَانِ الدِّينَ وَلَمْ يَمُرَّ عَلَيْنَا يَوْمٌ الا يَاتِينَا فِيهِ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) طرَفَيْ النَّهَارِ بُكْرَةً وَعَشِيَةً فَلَمَّا ابْتُلِيَ الْمُسْلِمُونَ خَرَجَ ابُو بَكْرٍ مُهَاجِرًا نَحْوَ ارْض الْحَبَشَةِ حَتَّى اذا بَلَغَ بَرْكَ الْغِمَادِ لَقِيَهُ ابْنُ الدَّغِنَةِ وَهُوَ سَيِّدُ الْقَارَةِ

---

[١٣٠٧] تجريد/٤، ژمارە: ١٥١٧ = ٣٩٠٥ + ٣٩٠٦ بخاری. پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١٢٨٤ = ٥٢٠٧ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٦٣ رقم الباب/٤٥).

فَقَالَ: ايْنَ تُرِيدُ يَا ابا بَكْرٍ؟ فَقَالَ ابُو بَكْرٍ: اخْرَجَنِي قَوْمِي فَارِيدُ انْ اسِيحَ فِي الارْض وَاعْبُدَ رَبِّي. قَالَ ابْنُ الدَّغِنَةِ: فَانَّ مِثْلَكَ يَا ابا بَكْرٍ لا يَخْرُجُ وَلا يُخْرَجُ انَّكَ تَكْسِبُ الْمَعْدُومَ وَتَصِلُ الرَّحِمَ وَتَحْمِلُ الْكَلَّ وَتَقْرِي الضَّيْفَ وَتُعِينُ عَلَى نَوَائِبِ الْحَقِّ فَانَا لَكَ جَارٌ ارْجِعْ وَاعْبُدْ رَبَّكَ بِبَلَدِكَ فَرَجَعَ وَارْتَحَلَ مَعَهُ ابْنُ الدَّغِنَةِ فَطَافَ ابْنُ الدَّغِنَةِ عَشِيَّةً فِي اشْرَافِ قُرَيْشٍ فَقَالَ لَهُمْ: انَّ ابا بَكْرٍ لا يَخْرُجُ مِثْلُهُ وَلا يُخْرَجُ اتُخْرِجُونَ رَجُلا يَكْسِبُ الْمَعْدُومَ وَيَصِلُ الرَّحِمَ وَيَحْمِلُ الْكَلَّ وَيَقْرِي الضَّيْفَ وَيُعِينُ عَلَى نَوَائِبِ الْحَقِّ فَلَمْ تُكَذِبْ قُرَيْشٌ بِجِوَارِ ابْنِ الدَّغِنَةِ وَقَالُوا: لابْنِ الدَّغِنَةِ مُرْ ابا بَكْرٍ فَلْيَعْبُدْ رَبَّهُ فِي دَارِهِ فَلْيُصَلِّ فِيهَا وَلْيَقْرَا مَا شَاءَ وَلا يُؤْذِينَا بِذلِكَ وَلا يَسْتَعْلِنْ بِهِ فَانَّا نَخْشَى انْ يَفْتِنَ نِسَاءَنَا وَابْنَاءَنَا فَقَالَ ذلِكَ ابْنُ الدَّغِنَةِ لابِي بَكْرٍ فَلَبِث ابُو بَكْرٍ بِذلِكَ يَعْبُدُ رَبَّهُ فِي دَارِهِ وَلا يَسْتَعْلِنُ بِصَلاتِهِ وَلا يَقْرَا فِي غَيْرِ دَارِهِ.

ثمَّ بَدَا لابِي بَكْرٍ فَابْتَنَى مَسْجِدًا بِفِنَاءِ دَارِهِ وَكَانَ يُصَلِّي فِيهِ وَيَقْرَا الْقُرْانَ فَيَنْقَذِفُ عَلَيْهِ نِسَاءُ الْمُشْرِكِينَ وَابْنَاؤُهُمْ وَهُمْ يَعْجَبُونَ مِنْهُ وَيَنْظُرُونَ الَيْهِ وَكَانَ ابُو بَكْرٍ رَجُلا بَكَّاءً لا يَمْلِكُ عَيْنَيْهِ اذا قَرَا الْقُرْانَ وَافْزَعَ ذلِكَ اشْرَافَ قُرَيْشٍ مِنْ الْمُشْرِكِينَ فَارْسَلُوا الَى ابْنِ الدَّغِنَةِ فَقَدِمَ عَلَيْهِمْ فَقَالُوا: انَّا كُنَّا اجَرْنَا ابا بَكْرٍ بِجِوَارِكَ عَلَى انْ يَعْبُدَ رَبَّهُ فِي دَارِهِ فَقَدْ جَاوَزَ ذلِكَ فَابْتَنَى مَسْجِدًا بِفِنَاءِ دَارِهِ فَاعْلَنَ بِالصَّلاةِ وَالْقِرَاءَةِ فِيهِ وَانَّا قَدْ خَشِينَا انْ يَفْتِنَ نِسَاءَنَا وَابْنَاءَنَا فَانْهَهُ فَانْ احَبَّ انْ يَقْتَصِرَ عَلَى انْ يَعْبُدَ رَبَّهُ فِي دَارِهِ فَعَلَ وَانْ ابَى الا انْ يُعْلِنَ بِذلِكَ فَسَلْهُ انْ يَرُدَّ الَيْكَ ذِمَّتَكَ فَانَّا قَدْ كَرِهْنَا انْ نُخْفِرَكَ وَلَسْنَا مُقِرِّينَ لابِي بَكْرٍ الاسْتِعْلانَ .

قَالَتْ عَائِشَةُ: فَاتَى ابْنُ الدَّغِنَةِ الَى ابِي بَكْرٍ فَقَالَ قَدْ عَلِمْتَ الَّذِي عَاقَدْتُ لَكَ عَلَيْهِ فَامَّا انْ تَقْتَصِرَ عَلَى ذلِكَ وَامَّا انْ تَرْجِعَ الَيَّ ذِمَّتِي فَانِّي لا احِبُّ انْ تَسْمَعَ الْعَرَبُ انِّي اخْفِرْتُ فِي رَجُلٍ عَقَدْتُ لَهُ فَقَالَ ابُو بَكْرٍ: فَانِّي ارُدُّ الَيْكَ جِوَارَكَ وَارْضَى بِجِوَارِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ وَالنَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَوْمَئِذ بِمَكَّةَ فَقَالَ النَّبِيُّ(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لِلْمُسْلِمِينَ: انِّي ارِيتُ دَارَ هِجْرَتِكُمْ ذاتَ نَخْلٍ بَيْنَ لابَتَيْنِ وَهُمَا الْحَرَّتَانِ

فَهَاجَرَ مَنْ هَاجَرَ قِبَلَ الْمَدِينَةِ وَرَجَعَ عَامَّةُ مَنْ كَانَ هَاجَرَ بِارْضِ الْحَبَشَةِ الَى الْمَدِينَةِ وَتَجَهَّزَ ابُو بَكْرٍ قِبَلَ الْمَدِينَةِ فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى رِسْلِكَ فَانِّي ارْجُو انْ يُؤْذَنَ لِي فَقَالَ ابُو بَكْرٍ وَهَلْ تَرْجُو ذلِكَ بِابِي انْتَ قَالَ: نَعَمْ فَحَبَسَ ابُو بَكْرٍ نَفْسَهُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لِيَصْحَبَهُ وَعَلَفَ رَاحِلَتَيْنِ كَانَتَا عِنْدَهُ وَرَقَ السَّمُرِ وَهُوَ الْخَبَطُ ارْبَعَةَ اشْهُرٍ .

قَالَتْ عَائِشَةُ: فَبَيْنَمَا نَحْنُ يَوْمًا جُلُوسٌ فِي بَيْتِ ابِي بَكْرٍ فِي نَحْرِ الظَّهِيرَةِ قَالَ قَائِلٌ لابِي بَكْرٍ: هَذا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مُتَقَنِّعًا فِي سَاعَةٍ لَمْ يَكُنْ يَاتِينَا فِيهَا فَقَالَ ابُو بَكْرٍ فِدَاءٌ لَهُ ابِي وَامِّي وَاللَّهِ مَا جَاءَ بِهِ فِي هَذِهِ السَّاعَةِ الا امْرٌ قَالَتْ: فَجَاءَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَاسْتَاذَنَ فَاذِنَ لَهُ فَدَخَلَ فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لابِي بَكْرٍ: اخْرِجْ مَنْ عِنْدَكَ فَقَالَ ابُو بَكْرٍ انَّمَا هُمْ اهْلُكَ بِابِي انْتَ يَارَسُولَ اللَّهِ قَالَ: فَانِّي قَدْ اذِنَ لِي فِي الْخُرُوجِ فَقَالَ ابُو بَكْرٍ: الصَّحَابَةُ بِابِي انْتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): نَعَمْ ،قَالَ ابُو بَكْرٍ فَخُذ بِابِي انْتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ احْدَى رَاحِلَتَيَّ هَاتَيْنِ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): بِالثَّمَنِ .

قَالَتْ عَائِشَةُ: فَجَهَّزْنَاهُمَا احَبَّ الْجِهَازِ وَصَنَعْنَا لَهُمَا سُفْرَةً فِي جِرَابٍ فَقَطَعَتْ اسْمَاءُ بِنْتُ ابِي بَكْرٍ قِطعَةً مِنْ نِطاقِهَا فَرَبَطتْ بِهِ عَلَى فَمِ الْجِرَابِ فَبِذلِكَ سُمِّيَتْ ذاتَ النِّطاقَيْنِ قَالَتْ ثمَّ لَحِقَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَابُو بَكْرٍ بِغَارٍ فِي جَبَلِ ثوْرٍ فَكَمَنَا فِيهِ ثلاث لَيَالٍ يَبِيتُ عِنْدَهُمَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ ابِي بَكْرٍ وَهُوَ غُلامٌ شَابٌّ ثقِفٌ لَقِنٌ فَيُدْلِجُ مِنْ عِنْدِهِمَا بِسَحَرٍ فَيُصْبِحُ مَعَ قُرَيْشٍ بِمَكَّةَ كَبائِتٍ فَلا يَسْمَعُ امْرًا يُكْتَادَانِ بِهِ الا وَعَاهُ حَتَّى يَاتِيَهُمَا بِخَبَرِ ذلِكَ حِينَ يَخْتَلِط الظلامُ وَيَرْعَى عَلَيْهِمَا عَامِرُ بْنُ فُهَيْرَةَ مَوْلَى ابِي بَكْرٍ مِنْحَةً مِنْ غَنَمٍ فَيُرِيحُهَا عَلَيْهِمَا حِينَ تَذهَبُ سَاعَةٌ مِنَ الْعِشَاءِ فَيَبِيتَانِ فِي رِسْلٍ وَهُوَ لَبَنُ مِنْحَتِهِمَا وَرَضِيفِهِمَا حَتَّى يَنْعِقَ بِهَا عَامِرُ بْنُ فُهَيْرَةَ بِغَلَسٍ يَفْعَلُ ذلِكَ فِي كُلِّ لَيْلَةٍ مِنْ تِلْكَ اللَّيَالِي الثلاث وَاسْتَاجَرَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَابُو بَكْرٍ رَجُلا مِنْ بَنِي الدِّيلِ وَهُوَ مِنْ بَنِي عَبْدِ بْنِ عَدِيٍّ هَادِيًا خِرِّيتًا وَالْخِرِّيتُ

الْمَاهِرُ بالْهِدَايَةِ قَدْ غَمَسَ حِلْفًا فِي الِ الْعَاصِ بْنِ وَائِلٍ السَّهْمِيِّ وَهُوَ عَلَى دِينِ كُفَّارِ قُرَيْشٍ فَامِنَاهُ فَدَفَعَا الَيْهِ رَاحِلَتَيْهِمَا وَوَاعَدَاهُ غَارَ ثَوْرٍ بَعْدَ ثلاث لَيَالٍ فاتاهما بِرَاحِلَتَيْهِمَا صُبْحَ ثلاث وَانْطَلَقَ مَعَهُمَا عَامِرُ بْنُ فُهَيْرَةَ وَالدَّلِيلُ فَاخَذَ بِهِمْ طَرِيقَ السَّوَاحِلِ. (الحديث: ٣٩٠٥، اطرافه في: ٢١٣٨، ٢٢٦٣، ٢٢٦٤، ٢٢٩٧، ٤٠٩٣، ٥٨٠٧، ٦٠٧٩) .

قَالَ سُرَاقَةَ بْنِ مَالِكِ بْنِ جُعْشُمٍ المدْلجيِّ (رضيَ اللهُ عنْهُ): جَاءنَا رُسُلُ كُفَّارِ قُرَيْشٍ يَجْعَلُونَ فِي رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَابِي بَكْرٍ دِيَةَ كُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مَنْ قَتَلَهُ اوْ اسَرَهُ فَبَيْنَمَا انَا جَالِسٌ فِي مَجْلِسٍ مِنْ مَجَالِسِ قَوْمِي بَنِي مُدْلِجٍ اقْبَلَ رَجُلٌ مِنْهُمْ حَتَّى قَامَ عَلَيْنَا وَنَحْنُ جُلُوسٌ فَقَالَ: يَا سُرَاقَةُ انِّي قَدْ رَايْتُ انِفًا اسْوِدَةً بالسَّاحِلِ ارَاهَا مُحَمَّدًا وَاصْحَابَهُ قَالَ سُرَاقَةُ: فَعَرَفْتُ انَّهُمْ هُمْ فَقُلْتُ لَهُ: انَّهُمْ لَيْسُوا بِهِمْ وَلَكِنَّكَ رَايْتَ فُلانًا وَفُلانًا انْطلَقُوا باعْيُنِنَا.

ثمَّ لَبِثتُ فِي الْمَجْلِسِ سَاعَةً ثمَّ قُمْتُ فَدَخَلْتُ فَامَرْتُ جَارِيَتِي انْ تَخْرُجَ بِفَرَسِي وَهِيَ مِنْ وَرَاءِ اكَمَةٍ فَتَحْبِسَهَا عَلَيَّ وَاخَذتُ رُمْحِي فَخَرَجْتُ بِهِ مِنْ ظَهْرِ الْبَيْتِ فَحَطَطتُ بِزُجِّهِ الارْض وَخَفَضتُ عَالِيَهُ حَتَّى اتَيْتُ فَرَسِي فَرَكِبْتُهَا فَرَفَعْتُهَا تُقَرِّبُ بِي حَتَّى دَنَوْتُ مِنْهُمْ فَعَثَرَتْ بِي فَرَسِي فَخَرَرْتُ عَنْهَا فَقُمْتُ فَاهْوَيْتُ يَدِي الَى كِنَانَتِي فَاسْتَخْرَجْتُ مِنْهَا الازْلامَ فَاسْتَقْسَمْتُ بِهَا اضرُّهُمْ امْ لا فَخَرَجَ الَّذي اكْرَهُ فَرَكِبْتُ فَرَسِي وَعَصَيْتُ الازْلامَ تُقَرِّبُ بِي حَتَّى اذا سَمِعْتُ قِرَاءَةَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُوَ لا يَلْتَفِتُ وَابُو بَكْرٍ يُكْثِرُ الالْتِفَاتَ سَاخَتْ يَدَا فَرَسِي فِي الارْض حَتَّى بَلَغَتَا الرُّكْبَتَيْنِ فَخَرَرْتُ عَنْهَا ثمَّ زَجَرْتُهَا فَنَهَضتْ فَلَمْ تَكدْ تُخْرِجُ يَدَيْهَا فَلَمَّا اسْتَوَتْ قَائِمَةً اذا لاثرِ يَدَيْهَا عُثَانٌ سَاطِعٌ فِي السَّمَاءِ مِثلُ الدُّخَانِ فَاسْتَقْسَمْتُ بالازْلامِ فَخَرَجَ الَّذي اكْرَهُ فَنَادَيْتُهُمْ بالامَانِ فَوَقَفُوا فَرَكِبْتُ فَرَسِي حَتَّى جِئْتُهُمْ وَوَقَعَ فِي نَفْسِي حِينَ لَقِيتُ مَا لَقِيتُ مِنْ الْحَبْسِ عَنْهُمْ انْ سَيَظْهَرُ امْرُ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقُلْتُ لَهُ انَّ قَوْمَكَ قَدْ جَعَلُوا فِيكَ الدِّيَةَ وَاخْبَرْتُهُمْ اخْبَارَ مَا يُرِيدُ النَّاسُ بِهِمْ وَعَرَضتُ عَلَيْهِمْ الزَّادَ

وَالْمَتَاعَ فَلَمْ يَرْزَانِي وَلَمْ يَسْالانِي الا انْ قَالَ اخْفِ عَنَّا فَسَالْتُهُ انْ يَكْتُبَ لِي كِتَابَ امْـنٍ فَامَرَ عَامِرَ بْنَ فُهَيْرَةَ فَكَتَبَ فِي رُقْعَةٍ مِنْ اديمٍ ثمَّ مَضى رَسُولُ اللّهِ (صَلَّى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسلَّمَ).

قَالَ ابْنُ شِهَابٍ فَاخْبَرَنِي عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ انَّ رَسُولَ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) لَقِيَ الزُّبَيْرَ فِي رَكْبٍ مِنْ الْمُسْلِمِينَ كَانُوا تِجَارًا قَافِلِينَ مِنْ الـشَّامِ فَكَسَا الزُّبَيْـرُ رَسُـولَ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَابا بَكْرٍ ثِيَابَ بيَاض وَسَمِعَ الْمُسْلِمُونَ بالْمَدِينَـةِ مَخْـرجَ رَسُولِ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) مِـنْ مَكَّـةَ فَكَـانُوا يَغْـدُونَ كُـلَّ غَـدَاةٍ الَـى الْحَـرَّةِ فَيَنْتَظِرُونَهُ حَتَّى يَرُدَّهُمْ حَرُّ الظهِيرَةِ فَانْقَلَبُوا يَوْمًا بَعْـدَ مَـا اطـالُوا انْتِظـارَهُمْ فَلَمَّـا اوَوْا الَى بُيُوتِهِمْ اوْفَى رَجُلٌ مِنْ يَهُودَ عَلَى اطمٍ مِنْ اطامِهِمْ لامر يَنْظرُ الَيْـهِ فَبَـصُرَ بِرَسُـولِ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَاصْحَابِهِ مُبَيِّضِينَ يَزُولُ بِهِمْ السَّرَابُ فَلَـمْ يَمْلِـكْ الْيَهُـودِيُّ انْ قَالَ باعْلَى صَوْتِهِ يَا مَعَاشِرَ الْعَرَبِ هَذا جَدُّكُمْ الَّذِي تَنْتَظِرُونَ فَثـارَ الْمُـسْلِمُونَ الَـى السِّلاحِ فَتَلَقَّوْا رَسُولَ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِظهْرِ الْحَرَّةِ فَعَـدَلَ بِهِـمْ ذاتَ الْـيَمِينِ حَتَّى نَزَلَ بِهِمْ فِي بَنِي عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ وَذلِكَ يَوْمَ الاثنَيْنِ مِنْ شَهْرِ رَبِيعٍ الاوَّلِ فَقَـامَ ابُـو بَكْرٍ لِلنَّاسِ وَجَلَسَ رَسُولُ اللّهِ (صَلَّى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) صَـامِتًا فَطفِـقَ مَـنْ جَـاءَ مِـنْ الانْصار مِمَّنْ لَمْ يَرَ رَسُولَ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ) يُحَيِّـي ابـا بَكْـرٍ حَتَّـى اصَـابَتْ الشَّمْسُ رَسُولَ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَاقْبَـلَ ابُـو بَكْـرٍ حَتَّـى ظلَّـلَ عَلَيْـهِ بِرِدَائِـهِ فَعَرَفَ النَّاسُ رَسُولَ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عِنْدَ ذلِـكَ فَلَبِـثَ رَسُـولُ اللّـهِ (صَـلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي بَنِي عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ بِضعَ عَشْرَةَ لَيْلَةً وَاسِّسَ الْمَسْجِدُ الَّـذِي اسِّـسَ عَلَى التَّقْوَى وَصَلَّى فِيهِ رَسُولُ اللّهِ (صَلَّى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) ثـمَّ رَكِـبَ رَاحِلَتَـهُ فَـسَارَ يَمْشِي مَعَهُ النَّاسُ حَتَّى بَرَكَتْ عِنْدَ مَسْجِدِ الرَّسُولِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ) بالْمَدِينَـةِ وَهُوَ يُصَلِّي فِيهِ يَوْمَئِذ رِجَالٌ مِنْ الْمُسْلِمِينَ وَكَانَ مِرْبَدًا لِلتَّمْرِ لِـسُهَيْلٍ وَسَـهْلٍ غُلامَـيْنِ يَتِيمَيْنِ فِي حَجْرِ اسْعَدَ بْنِ زُرَارَةَ فَقَالَ رَسُولُ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حِينَ بَرَكَتْ بِـهِ رَاحِلَتُهُ هَذا انْ شَاءَ اللّهُ الْمَنْزِلُ ثمَّ دَعَا رَسُولُ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) الْغُلامَـيْنِ

فَسَاوَمَهُمَا بِالْمِرْبَدِ لِيَتَّخِذَهُ مَسْجِدًا فَقَالا لا بَلْ نَهَبُهُ لَكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ فَابَى رَسُولُ اللَّهِ انْ يَقْبَلَهُ مِنْهُمَا هِبَةً حَتَّى ابْتَاعَهُ مِنْهُمَا ثُمَّ بَنَاهُ مَسْجِدًا وَطفِقَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَنْقُلُ مَعَهُمْ اللَّبِنَ فِي بُنْيَانِهِ وَيَقُولُ وَهُوَ يَنْقُلُ اللَّبِنَ:

هَذا الْحِمَالُ لا حِمَالَ خَيْبَرْ ... هَـذا ابَـرُّ رَبَّنَا وَاطهَرْ

وَيَقُولُ:

اللَّهُمَّ انَّ الاجْرَ اجْرُ الاخِرَهْ ... فَارْحَمْ الانْصار وَالْمُهَاجِرَهْ

(الحديث: ٣٩٠٦):

عائیشه (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەبیرەوەریی من باوك ودایكم بەم ئایینی پیرۆزی ئیسلامە ڕەفتاریان كردووە و ئەوەتی من لە بیرم بێ ئەوان هەر موسوڵمان بوون، هەموو رۆژێكیش پێغەمبەر (درووودی خودای لێ بێ) سەرلەبەیانیان و سەر لەئێواران تەشریفی دەهات بۆماڵمان.كاتێ كە موسوڵمانان دووچاری چەوسانەوەی دەستی بێبڕواكانی هۆزی قوڕەیش بوون و لەتاو زوڵم و زۆری ئەوان،هەریەكەیان بەلایەكا پەرتەوازە بوون، ئەبوبەكریش بەرەو خاكی حەبەشە سەری نایەوە و كۆچی كرد، دەڕوات هەتا دەگاتە بەركولغیمار، لەوێ تووشی ئیبنودوغەننە دەبێ كەسەر گەورەی هۆزی ئەلقارە بوو. پێی دەڵێ: ئەی ئەبوبەكر! ئەوە خێرە بۆكوێ دەچێت؟ دەڵێ:خزمەكانم دەریان پەڕاندووم ودەمەوێ بەولاتانا بگەڕێم و بەبێ پەروا، بۆخۆم خودایخۆم بپەرستم و بەندەیی بۆبكەم ئیبنودوغوننەش دەڵێ: ئەی ئەبوبەكر! تۆو دەركردن؟ شتیوا چۆن دەبێ، شتیوا نەبووەو نەئەبێ، پیاوەتی و مەردایەتی تۆ بێ وینەیە، تۆ پیاوێكی خزم دۆستیت و، دالدەی پیاوی هەژار وبێ نەوایت و، خاوەن نان و دیوەخانیت و، لەكاتی لێقەومانا تۆ پشتو پەنایت، جا ئەوا من بۆت دەبم بە دالدە، كەواتە بگەڕێرەوە لە ولاتی خۆت خودای خۆت بپەرستە.

جا ئەویش دەگەڕێتەوە، ئیبتو دوغوننەش لەگەڵیادێ، وە ئێوارەێی ئیبنو دوغوننە سووڕایەوە بەناو پیاوماقوولان وخانەدانەکانی هۆزی قوڕەیش دا، پێی گوتن: ئەبو بەکر پیاوێکی پیاوانەیە،پیاوی ئەوە نییە کە لەخۆیەوە بڕوا، یا ئێوە بە زۆر دەری بکەن، پیاویوا باش وجوانمەرد چۆن دەردەکرێ، پیاوێکی نانبدەو بەخشندەو کەم وێنەیە، خزم دۆست و خزم پەرستە، پشت و پەنای زەبوونان و پیاوی ناشیو کوڵێیە، خاوەن قۆناخ ودیوەخانەو، لەکاتی سەختی و لێ قەو مانا، فریاڕەسمی پەنا بەرانە!

ئیتر قوڕەیش قسەی ئیبنودوغوننەیان نەشکان ودالّدەدانو پشتگرتنەکەی ئەو یان قە بووڵ کردو، پێیان گوت: بەئەبوبەکر بڵێ: کە لەماڵەکەی خۆیدا، خودای خۆی بپەرستێ و نوێژی تیا بکاو، چەندە ئارەزوو دەکا قورئانی تیا بخوێنێ، بەڵام ئەوەندە هەیە ئازاری ئێمەی پێ نەداو بە ئاشکرا نەیکا.

چونکە مەترسی ئەوەمان هەیە کەژن و منالّ و خێزانمان لە خشتە بەرێو لەرێ دەرکا! جائیبنو دوغەننەش ئەمەی بە ئەبو بەکر گوت، ئەبو بەکریش بەم پێیەو لەسەر ئەم حاڵە ماوەێی مایەوەو لەماڵەوە خۆدای خۆی دەپەرستو نوێژی دەکرد بەڵام بەپێی مەرجەکە، ئاشکرای نەدەکرد، وهەر لەماڵەوەیش قورئانی دەخوێند، پاشان ئەبوبەکر بڕیاری داو، لەبەردەم خانوەکەیدا ، مزگەوتێکی دروست کردو نوێژی تیادا دەکردو، قورئانی تیادا دەخوێند.

جا ژنان و کوڕان و منالانی بتپەرستەکانی لێ خڕ دەبوونەوەو، تەماشای ئەبو بەکریان دەکردو، پێیان سەیربوو، ئەبوبەکر پیاوێکی گرینووکی دڵنەرمی خوشگریان بوو، کە قورئانی دەخوێند گریانی بۆ ڕاگیرنەدەکرا، جا خانەدانەکانی قوڕەیش لەبتپەرستەکان لەم حاڵە تۆقین و ناردیان بە شوێنی ئیبنودو غوننەدا، کاتێ هات بۆ لایان پێیان گوت: ئێمە لەبەر خاتری تۆو

بەدالّدەی تۆ، پەنای ئەبو بەکرمان دا، بەو مەرجە کە لە ماڵی خۆی دا بەبێ قرە خودای خۆی بپەرستێ، کەچی ئەو لەم ڕادەیە ڕەتی کردووەو، ئەوەتانێ لە بەردەم ماڵەکەیدا مزکەوتی دروست کردووەو بە ئاشکرا نوێژی تیادا دەکاو قورئانی تیادا دەخوێنێ، ئێمەش لەوە دەترسین کە ژنان و خاوو خێزانمان لەڕێ دەرکا.

جا پێی بڵێ باوانەکا، ئەگەر حەز دەکا باهەر لەماڵی خۆی دا خودای خۆی بپەرستێ ئەوا بابیکاو، کەسێ هەقی نییە بەسەریەوە، دەنا داوای لێ بکە کە لە پەنای تۆ دەرچێ، چونکە ئێمە حەزناکەین کە پەیمانی تۆ بشکێنین، وە قاییلیش نابین کە ئەبو بەکر ئاوا ئاشکرای بکا، ئیبنو دوغننە هات بۆلای ئەبو بەکر، گوتی: خۆت دەزانیت کە من لەسەر چی پەیمانم لەگەڵ تۆدا بەستووە، جادەبێ هەر ئەوە بکەیت یادەبێ پەیمانەکەمان پووچ بکەینەوەو من لە زامنیت دەردەچم، چونکە حەزناکەم کە عەرەبان ببیستنەوەکە من پەیمانم داوە بە پیاوێك و لە پاشابێ پەیمان دەرچووم ئەبو بەکریش گوتی: ئەوا منیش لە پەناو دالّدەی تۆ دەرچووم و رازیم بە پەنای خودای گەورەو سەروەر ئەو حەلەش پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) هێشتا لەمەککە بوو، فەرمووی بە موسوڵمانان: (هەواری کۆچتانم، لەخەودا، پێ نیشان درا، شوێنێ بوو باخە خورمای زۆر بوو، لە نێوانی دوو شوێنێ بەردەلانی ڕەش دا بوو، واتە: دوو جێگەی بەردەلان، کەبەردی ڕەشیان زۆربێ، ئیتر موسوڵمانان ڕووەو مەدینە کۆچیان کردو، زوربەی ئەوانەی کە کۆچیان کردبوو بۆ حەبەشە گەڕانەوەو چوون بۆ مەدینە، ئەبوبەکریش بەرەو مەدینە تەدارەکی کردو تفاقی خست، بەڵام خۆشەویست (دروودی خودای لێ بێ) پێی فەرموو: (هێواشکە و پەلەمەکە، چونکە من خۆشم بە هیوام کە خودا ڕێگەم پێ بدات و کۆچ بکەم،

ئەبوبەکریش گوتی باوکم و دایکم لەدەورت گەڕێن، بۆچی تۆیش هیوای کۆچ کردنت هەیە؟ فەرمووی: (بەڵێ).

ئیتر ئەبو بەکر خۆی گل دایەوە بەلای پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لێ بێ) هەتا لەم سەفەری کۆچەدا ببێ بەهاوڕێی، وە دوو وشتری خۆی هەبوو، بەمەبەستی ئامادەکردنیان بۆ ئەم سەفەرە چوار مانگ ئالیکی گەلای دار (سەمورە- السمر)ی دانێ، کە بە قەڵەنگ دەیوەرێنن و دەیکەن بەگەڵ. (تاج/٤ ل/٣٠٩ ف/١) .

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەوا ڕۆژێ لەماڵی ئەبوبەکر دانیشتبووین، قرچەی نیوەڕۆ بوو، لەوکاتەدا یەکێ بە ئەبو بەکری گوت: ئەوە پێغەمبەرە (دروودی خودای لێ بێ) دەم و لووتی خۆی هەڵبەستووە، تا نەناسرێتەوە ، جارانی تر لە کاتی وادا نەدەهات بۆ ماڵمان بۆیە ئەبو بەکر فەرمووی: باوك و دایکم بە قوربانی بێ، بەخودا دیارە کارێکی گرنگی هەیە بۆیە لەم کاتەدا هاتووە، پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) گەیشتەجێ و داوای ڕێگەپێدانی: کرد کە بێتە ژوورەوەو ڕێگەی پێ دراو هاتە ژوورەوەو بە ئەبوبەکری فەرموو: (کێت لەلایە بابچنە دەرەوە) ئەبو بەکریش فەرمووی:(ئەی پێغەمبەری خودا! باوکم بەقوربانت بێ غەریبەمان تیادا نییە، هەرکە سوکارەکەی خۆمن، کە کەسوکاری خۆتن فەرمووی: (دەی من خودا ڕێگەی پێ داوم کە دەربچم و کۆچ و باربکەم) ئەبوبەکر فەرمووی: (ئەی پێغەمبەری خودا! باوکم بە قوربانت بێ بمکە بەهاوڕێی خۆت لەم سەفەرە پیرۆزەدا، فەرمووی: (بەڵێ باشە، ئەبو بەکر گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! یەکێ لەم دوو وشترەی من هەڵبگرە بۆ سواریی ڕێگەت. پێغەمبەر(دروودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (باشە بەڵام بە کرێ).

عائیشه - رەزای خودای لێ بێ فەرمووی: جا تفاقێکی زۆر جوانمان بۆ ئامادەکردن و توێشوومان لەتوێشه بەرمیەکا بۆیان کرد، کە برێتی بوو لە مەرێکی قاوورمە، وە ئەسمای خوشکم پارچەیەکی لە پشتێنەکەی خۆی دادڕی و دەمی توێشەبەرکەی پێ بەست، جالەمەوە ناونرا: (ذاتونطاقەین واتە: خاوەنی دوو پشتێن) فەرمووی: ئەو جا پێغەمبەرو ئەبو بەکر چوونە ناو ئەشکەوتی لەکێوی سەور، وەسێ شەو لەوێ خۆیان حەشار دەدەن، عەبدوڵلا کوڕی ئەبوبەکر کە جەهێڵێکی وشیاری وریابوو شەوی لە لایان دەکردەوە، بەڵام شەوەکی شەوی دەگرت بەدەمەوە و لە لای ئەوانەوە دەگەڕایەوە بۆ مەککە، بەیانی لە قورەیش و خەڵکی مەککە وابوو، کە عەبدوڵلا شەوی لە مەککە کردۆتەوە، جا عەبدوڵلا هەرچی بەرگوێ دەکەوت لەو پیلان و فڕو فێڵانەی کە بێ بڕواکانی مەککە دەیانکرد، لە پێغەمبەرو ئەبو بەکر، وەری دەگرت و کەتاریك دادەهات هەواڵی ئەوانەی بۆیان دەبردەوە.

وە عامیری کوڕی فوهەیرەیش،کە نۆکەری ئەبو بەکربوو، لە دەورو بەری ئەوان ڕانەکەی ئەبوبەکری دەلەوەڕاندو بە تاوێ لە پاش شێوان، مێگەلەکەی لەدەرگای ئەشکەوتەکەدا مۆڵ دەدا، ئیتر شیری مەڕیان دەدۆشی و لەگڵێنەیەکا بەبەردی داخی بەرخۆر شلەتێنیان دەکرد، واتە: بەردە داخەکەیان دەخستە ناو جامە شیرەکەوە، تا تۆزێ گەرمی بکا، هەتا خاویی و لیقنی یەکەی نەمێنێ، وەهەموو شەوێ تێرو پڕیان لەو شیرە جوانە دەخواردەوە!

وەسەر لە بەیان واتە: دەمەو بەیان بەتاریك ولێڵەکە، عامیر ڕانەکەی ڕادەداو پیرکەی لێ دەکرد، هەرسێ شەوەکە عامیر ئەمە کاری بوو، پێغەمبەرو ئەبو بەکر، کابرایەکی بەنی دیلی یان بەکرێ گرتبوو، ڕێزانێکی بەدرەقە و شارەزا بوو، سوێند خوارو هاوپەیمانی بنەماڵەی عاصی کوڕی وائیلی ئەل سەهمی بوو، وەلە ئەمانی ئەوان دابوو، وەلێ لەسەر ئایینی بێبڕواکانی قورەیش

بوو، بەڵام پێغەمبەرو ئەبوبەکر بتمانەی پێ دەکەن و هەردوو وشترەکەی دەدەنێو بەڵێن دەدەن بەیەکتر کە لەپاش سێ شەو لەئەشکەوتەکەی چیای سەور یەك بگرنەوە، جا لەکاتی ناوبراودا لەبەیانی شەوی سێیەم دا، هەردوو وشترەکەیان بۆ دەبات، عامیری کوڕی فوهەیرەیش لەگەڵیان دەچێ، وە ڕێزانە شارەزاکەش لە ڕێگەی پێ دەشتە وە دەیان بات، نەوەك لە شارێوە لەبەر شوێنە گومکێ (تاج/٤ ل/٣١٣ ز/١٠١- باسی کۆچ کردن، فەرموودەی ژمارە/٣ ) .

سوراقەی کوڕی مالیکی کوڕی جوعشوص مودلیجی (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ڕابەرو فروستادەکانی بێبڕواکانی قوڕەیش هاتن بۆ ناومان، جاڕیان دەداو گوتیان: هەرکەسێ پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) یا ئەبو بەکر بکوژێ، یادیلیان بکا، خەلاتی دەکەین و لە باتی هەریەکێکیان خوێنبایی خۆیی خەلات دەدەمینێ، کە دەکاتە سەد وشتر، منیش لەناو کۆڕی دانیشتنی هۆزی بەنی مودلیج دا دانیشتبووم کە خزمانی خۆم بوون لەپڕ پیاوێ دەرکەوت، هات بەدیارمانەوە وەستا، ئێمەیش هەر بە دانیشتنەوە گوێ قولاخ بووین، کە بزانین چی هەواڵێکی واپێ، پیاوەکە گوتی: ئەی سوراقە! ئێستا لە پادەشتەکە ڕەشایی چەند زەلامێکم بەدی کرد، وابزانم کە موحەممەدو هاوڕێکانی بوون، سوراقە گوتی: خۆم زانیم کە ئەوانە خۆیان بوون، بەڵام خۆم لێ هەڵە کردو ویستم ئەوانیش چەواشە بکەم ، بۆیە گوتم: ئەوانە ئەوان نەبوون، بەڵام ئەوانەی کە تۆدیوتن و بەوانت زانیون ئەوانە، فیسارەکەس و فیسارە کەس بوون، کەتۆزێ لەمەوبەر بەبەرچاوی خۆمانەوە دەرچوون، ئەنجا تاوێ لە کۆڕەکەدا مامەوە، هەتا نەیانخەمەسەر شەك و تەواو لە هەواڵەکە چەواشەیان بکەم، ئینجا هەڵسام و چوومەوە بەکەنیزەکە کەمم گوت: ماینەکەمم بۆ ببە لەپشت ئەو یاڵەوە ڕای بگرە بۆم، ئەنجا ڕمەکەمم هەڵگرت و لەپشتماڵەوە بەکووڕە کووڕە، بەدزکەوە دەرچووم، نووکی ڕمەکەم دەخشاند لە زەوی و سەرەکەیم شۆڕ کردەوە، هەتا




کەس هەستی پێ نەکاو پێم نەزانن، کەوامن بەنیازی خەلاتەکەی قورەیش دەچم بە شوێن پێغەمبەرو ئەبوبەکردا.

ڕۆیشتم هەتا چوومە لای ماینەکەم و سواری بووم وتێم تەقاند، بە چوار ناڵە بردمی هەتالێیان نزیك بوومەوە، ماینەکەمم سەرسمێکی داو گلاندمی، جا هەڵسامەوە دەستم برد لەتیردانەکەم دانە (ئەزلام) کەمم دەرهێناو، دانەیەکم پێ گرتەوە، تا بزانم زیانم دەبێ بۆیان یانا، جاکە دانەکەم گرتەوە ئەوەی هێنا کە من پێم ناخۆش بوو، کە ئەوە بوو: زیانم نابێ بۆیان، بەڵام بەگوێی دانەم نەکردو سواری ماینەکەم بوومەوەو بە چوار ناڵە بردمی هەتا والێیان نزیك بوومەوە، گوێم لە دەنگی پێغەمبەر بوو قورئانی دەخوێند.

پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) ئاوڕی نەدەدایەوە، بەڵام ئەبوبەکر زۆر ئاوڕی ئەدایەوە، جا دیسان ماینەکەم لەو زەوییە ڕەقەنەدا هەر دوودەستی هەتا ئەژنۆکانی داچوون و هەمدیسانەوە لێی بەربوومەوە، لەپاشاتێم خوڕی، بەڵام زۆر بەگران هەڵسایەوە، زۆر بە زەحمەت دەستەکانی لە زەویەکەدا دەرهێنا!

جاکاتێ کەهەڵسایەوە سەرپێ شوێنی هەردوودەستی گەردێکی شەوقداری لێ هەڵسا بەئاسمانا، وەك دووکەڵ، هەمدیسان بەدانەکە دانەیەکی ترم گرتەوە، دووبارە ئەوە دەرچووەوە کەبەدڵم نەبوو، ئیتر بانگم کردن و ئەمانم پێیان دا، ئە و جا وەستان، منیش سواری ماینەکەم بوومەوەو چووم بۆلایان، بەهۆی ئەوەوەکە بەسەرم هات بەهۆی ئەوانەوەوبەهۆی ئەوەشەوە کەدەستم نەگەیشت پێیان هات بەدڵما: کە کاری پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) سەردەگرێ و حەزرەت سەردەکەوێ، وە عەرزیم کرد: کە هۆزەکەت بڕیاریان داوە هەرکەسێ بەزیندوویی یا بەمردوویی تۆیان بدا بەدەستەوە، خوێنبایی پیاوێ خەلات و مزگێنێ پێ دەدەن! وەتێم گەیاندن کە ئەو خەڵکە چییان لێیان دەوێ، تۆیشە

وشت ومـتم پێـشكەش كـردن، بـەڵام نەهێـچيان لێ وەرگـرتم و نەهێـچيان لێ داوا كردم، جگە لەوەكە فەرمووی: ئاشكرامان مەكە منـيش داوام لێ كـرد كـە نامـەی ئەمانم بۆ بنووسێ، جـا فـەرمانی كـرد بـە عـامیری كوڕی فوهـەیرە لەپارچـەێی چەرما نامەی ئەمانی نووسی بۆم، ئـەوجا پێغەمبـەرو ئـەوان ڕۆیـشتن و منـيش گەڕامەوە بۆ شوێنی خۆم.

ئیبنـو شـەهاب فـەرمووی: لـە ڕێگـە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لـێ بـێ) دەگـات بەزوبـەیری كـوڕی عـەوام، عـورەوەی كـوڕی زوبـەیر بۆیگێڕامـەوە، فەرمووی: پێغەمبەرو ئەبو بەكر، لەم سەفەری كۆچەدا لەڕێ دەگەن بەزوبەیرو كـاروانێ لـە موسـوڵمانان، كـە بازرگـان بـوون و لەشـام گەڕابوونـەوە، زوبـەیر سەرودەسـت بـەرگی سـپی لـە بـەر پێغەمبـەرو ئـەبو بـەكردەكا، لـەو لاشـەوە موسوڵمانەكان لە مەدینە دەبیستنەوە كە وا پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) لەمەككە دەرچووە، جا هەموو بە یانیـانێ دەهـاتن بـە پیریـەوە هـەتا بـەردەلانی یەكە، كەناو دارە بە(ئەلحەرە) ئیتر لەوێ چاوەڕوانیان دەكرد، تا گەرمای نیوەڕۆ زۆری بۆ دەهێنان، ئەوجا دەگەڕانەوە، جا ڕۆژێ زۆر چـاوەنوارِ دەكـەن، كـە هـیچ نابێ دەگەڕێنەوە، هەركە دەگەنە ماڵەوە پیاوێكی جوو دەچێتە سـەر قەلایـەكی خۆیان بۆ تەماشاكردنی شتێ، جا بە ڕێكەوت لە دوورەوە پێغەمبەرو هاوڕێكـانی بەدی دەكا: بەرگەكانیان لە دوورەوە سپی دەكاتەوە، تارماییەكەیان لە نـاو ڕێكـی بیابان (سەراب)دا، كەروێشكە دەكاو دەردەكەوێ!

جا كابرای جووە خۆی پێ ناگیرێ و بەهەموو دەنگی خۆی بانگەواز دەكـاو دەڵێ: ئەی كۆمەڵەی عەرەب! ئەمە ئەو شانازییەتانە كە چاوەنواڕی دەكەن! جـا موسوڵمانەكان پەلاماری چەك دەدەن و دەچـن بـە پـیری پێغەمبـەرەوە (دروودی خودای لـێ بێ) وە لە پشت بەردەلانەكەوە پێی دەگەن، جابەلای ڕاستا دەیانبـات هەتا دەچێتە ناو بنەماڵـەی عـەمری كوڕی عـەوف و لـەوێ دا دەبـەزن، ئەمـەش

ڕۆژی دووشەمە بوو، لەمانگی مەولوود (مانگی ڕەبیعول ئەووەل) وە ئەبوبەکر دەچوو بە پیر خەڵکەوەو لە جیاتی پێغەمبەر چاك و چۆنی لەگەڵ دەکردن، بەڵام پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) خۆی بێ دەنگ دانیشتبوو، جا ئەوانەی لە یاریدەدەران کە پێغەمبەریان نەدیبوو کە دەهاتن ڕۆژ باشییان لە ئەبوبەکر دەکرد.

هەتا هەتاوەکە دەدا لە پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) و ئەبو بەکر دەچێ بەپۆشاکەکەی خۆی سێبەری بۆ دەکا، ئەو ساکە خەڵکەکە پێغەمبەردەناسن، جا پێغەمبەر(دروودی خودای لێ بێ) دەشەو زیاتر لەناو بنەماڵەی عەمری کوڕی عەوف دادەمێنێتەوە، وە ئەو مزگەوتە دا دەمەزرێنێ کە بناغەی لەسەر تەقوا دامەزراوە بە پێی ئایەتی قورئان، وەخۆی نوێژی تیادەکات ، ئینجا سواری ولاخەکەی دەبێ و لەگەڵ خەڵکەکەدا دەڕوا هەتا وشترەکەی لەلای شوێن مزگەوتەکەی ئێستای پێغەمبەردا لەمەدینە چۆك دادەدا، کە لەو سەردەمەدا چەند پیاوێ لەموسوڵمانان لەوێدا نوێژیان دەکرد، کە لەوەپێش جێگە مشتاخی خەرمانی خورمابوو، هی دوو کوڕ بوو، ناویان سوهەیل و سەهل بوو، هەتیو بوون، ئەسعەدی کوڕی زوورارە سەرپەرشتی دەکردن.

جا پێغەمبەر(دروودی خودای لێ بێ) کەوشترەکەی لە ژێر خۆیا چۆکی داداو لەوێ دا پاڵ کەوت و سینگی دادا، فەرمووی: (خودا حەزکا ئەمە جێگەیەتی! لە پاشا پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) هەردوو کوڕەکەی بانگ کردو سەودای شوێن مشتاخەکەی لێ کردن هەتا بیکات بە مزگەوت گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! بەڵکوو دەیبەخشین پێت. پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) قاییل نەبوو، کە بەبەخشین لێیان وەربگرێ، لە ئەنجامدا لێی کڕین و کردی بەمزگەوت، پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) خۆشی لەگەڵ هاوڕێ

یاناخشتی کاڵی دەگواستەوە بۆ دروست کردنەکەی، وەبەدەم خشت گواستنەوەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) سۆزی دەکردو دەیفەرموو:

هــــــذا الحمـــــــال لا حمـــــــال خيـــــــبر
هــــــذا ابـــــــرّ ربنـــــــا واطهـــــــر

واتە:

کــۆڵ ئــەم کۆڵەیــە، نــەک کــۆڵی خەیبــەر
پــاکترەو پــاکترە، خــودای بــانی ســەر

حەزرەت (دروودی خودای لێ بێ) دەشی فەرموو:

اللـــــــهم ان الاجـــــــر اجـــــــرُ الاخـــــــرة
فـــــــارحم الانـــــــصار والمهـــــــاجرة

واتە:

خێـــر ئـــەو خێرەیـــە ســـبەی لەخوانـــە!
ڕەحمـــەت لـــە ئەنـــصار، لەکۆچـــکارانە!

ئیبنو شەهاب واتە: ئیمامی زوهری (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: لە فەرموودەو فەرمایشتدا نەمان بیستووە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لێ بێ) هۆنراوەی تەواوی خوێندبێتەوەو بیکا بەنموونەو سەرمەشق بێجگە لەم هۆنراوانە (تاج/٤ ل/٣١٦ ز/١٠١- باسی کۆچکردن- ف- ٤) بڕوانە: ژمارە: ٢٦٤ تەجرید = ٤٢٨ فەتح = بەرگی یەک لاپەڕە/٢٧٤.

**ڕوونكردنەوە:**

**ئەم بەهرانەو چەند بەهرەی تریش وان لەم فەرموودەیەدا:**

١- موسولمانان لە پێناوی بیرو باوەڕی خۆیاندا تووشی سەختەتیو مەینەتو زیانی گیانی و سامانی دەبن و، دەبێ خۆیان ئامادە بكەن بۆ شتی واو، پشت بە ستنی گەورەیان لە سەر خوابێ.

٢- دروستە موسولمان پەنای ناموسولمان قەبوول بكات. ئەمڕۆ ئەم جۆرە ئەمانە و جیوارو پەنا وەر گرتنە هەر زۆر زۆرە، جێگەی داخە ئێستا لەم ڕۆژگارەی ئێمەدا، زۆرینەی موسولمانان، لە دەست سەرۆكە بەناو موسولمانە ملهوڕەكان هەلْ دێن و، لەناو ولاتانی ناموسولمان دا دەبن بە پەنابەر، ئێستا لەم كاتو ساتەدا نیوەی خەلكی سوریاو دوو ملیۆن زیاتر لە خەلكی عێراق دەربەدەرنو لە تاو سەرۆكە ستەمكارەكانیان پەردەوازەو سەرگەردان بوونو ئاوارەی ولاتانو شاران بوون، عبدولفەتاح سیسیش لە میصر بە شۆفلْ مەیتو تەرمی شەهیدەكان لە مەیدانی اعتصام دەمالێ (إنا لله وإنا إليه راجعون)

٣- عامیری كوڕی فوهەیرە موسولمان بوو، وە موسولمانێكی جوانی لێ دەرچوو. وە ئامادەی غەزای بەدرو ئوحود بووە، لە ڕۆژەكەی بیری مەعوونەدا كوژراوە، لەتەمەنی چل سالی دا، عامیری كوڕی طوفەیل دەیكوژێ، خۆی دەلێ: یەكەم زام كە لە عامیری كوڕی فوهەیرەم كرد نووریكم بینی لەدەمی زامەكەیەوە دەرچوو، دەلێن: پاش شەهید بوونی جەستەكەی ون دەبێ و فریشتە دەینێژن ڕووداوەكەی ڕۆژی بیری مەعوو نە لە سالی چواری كۆچی دابوو.

٤- سوراقەی كوڕی مالیكی مودلیجی، یەكێكە لەهاوڕێ ناودارەكان، كۆمەلێ هەوالی لەناو دەقی فەرموودەكەدا رابورد، پێغەمبەر (درroودی خودای لێ بێ) فەرمووی: (ئای لەو ڕۆژەی كە بازیبەنەكانی كیسرا لەقۆلْ دەكەیت)

وەلەسەردەمی پێشەوا عومەردا کاتێ تاج و پشتین و بازیبەنەکانی کیسرایان هێنا بۆ عومەر، سوراقەی بانگ کردو بازیبەندەکانی کردە هەر دووقۆڵی. سوراقە شاعێرێکی جوان بوو، کۆمەڵێ لەهاوڕێیان فەرموودەکانی ئەو دەگێڕنەوە، وەك: ئیبنوعەباس و جابیر، لەبیست و چواری کۆچی دا کۆچی دوایی کرد (ڕەزای خودای لێ بێ)، یەك فەرموودەی لە بوخاریدایە.

١٣٠٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): إِنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أُتِيَ لَيْلَةَ أُسْرِيَ بِهِ بِإِيلِيَاءَ بِقَدَحَيْنِ مِنْ خَمْرٍ وَلَبَنٍ، فَنَظَرَ إِلَيْهِمَا، فَأَخَذَ اللَّبَنَ، فَقَالَ لَهُ جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلَامُ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي هَدَاكَ لِلْفِطْرَةِ، لَوْ أَخَذْتَ الْخَمْرَ غَوَتْ أُمَّتُكَ. {الحديث: ٥٢٠٨ = ٥١٩٩ فـم. بخاری. أحاديث الأنبياء: ٣٣٩٤، ٣٤٣٧، ٥٥٧٦. ترمذی. تفسیر: ٣١٣٠} :[١٣٠٨]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەو شەوەی کە پێغەمبەریان برد بۆ ئیلییا، واتە: بۆ بەیتولمەقدیس، لەوێ دوو پیاڵە خواردنەوەیان بۆ هێنا، پیاڵەیێ شیرو پیاڵەیێ مەی، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) تەماشایان دەکاو پیاڵە شیرەکە وەردەگرێ، جوبرائیلیش دەفەرموێ: (سوپاس و ستایش بۆ خودا کەتۆی خستە سەر ڕێگەی ڕاستی خۆی، ئەگەر پیاڵە مەیەکەت وەربگرتایە، ئۆمەتت سەریان لێ دەشێواو گومڕا دەبوون). {تاج/٣، زنجیرە: ٢٤، ژمارە: ٢٧٣١}.

---

[١٣٠٨] بخاری. احادیث الأنبیاء: ٣٣٩٤، پوختەی موسلیم: ١٢٨٥ = ٥٢٠٨ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٦٥ رقم الباب/١٧).

## (١١) بابُ في شربِ النبيذِ وتخمير الإناءِ
## خواردنەوەی خۆشاوو سەرداپۆشینی دەفر

١٣٠٩- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِاللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: جَاءَ أَبُو حُمَيْدٍ بِقَدَحٍ مِنْ لَبَنٍ مِنَ النَّقِيعِ فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَلَّا خَمَّرْتَهُ: وَلَوْ أَنْ تَعْرُضَ عَلَيْهِ عُودًا.(الحديث ٥٦٠٥ طرفه في: ٥٦٠٦)؛ [١٣٠٩]

جابیری کوڕی عەبدوللا (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئەبو حومەید لەنەقیع، کە شوێنێکە وا لەشێوی عەقیق، کەبیست فەرسەخ لەشاری مەدینەوە دوورە، جامێ شیری هێنا بۆ پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- سەری دانەپۆشرابوو، پێغەمەر -دروودی خوای لەسەر بێ- پێی فەرموو: (ئەوە بۆچی سەریت دانەپۆشیوە، دەبوو ئەگەر هەر هیچت دەست نەکەوتایە کەبیکەی بەقەباغ بۆی، تەڵەدارێکت بەسەردا ڕایەڵ بکردایە).

## (١٢) باب الأمر بتغطية الإناءِ وَ إيكَاءُ السِّقَاءِ وَ إغْلَاقُ الأبْوَابِ، وَذكر إسم اللهِ عليها و إطفاءِ السراجِ والنار عند النوم وَكَفِّ الصبيان وَالمَوَاشي بَعْدَ المغربِ
## فەرمانکردن بە سەرداپۆشینی دەفرو شتی واو بە بەستنی دەمو هەنگڵی کوندەو مەشکەو جەوەندەو بە داخستنی دەرگاو بە هێنانی ناوی خودا لەم کاتانەداو بە کوژاندنەوەی چراو ئاگر لە کاتی نووستنداو بە گرتنەوەی منداڵو ئاژەڵ لە پاش شێوان

١٣١٠- عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «إِذَا كَانَ جُنْحُ اللَّيْلِ، أَوْ أَمْسَيْتُمْ، فَكُفُّوا صِبْيَانَكُمْ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَنْتَشِرُ حِينَئِذٍ، فَإِذَا ذَهَبَ سَاعَةٌ مِنَ اللَّيْلِ فَخَلُّوهُمْ، وَأَغْلِقُوا الأَبْوَابَ، وَاذْكُرُوا اسْمَ

---

[١٣٠٩] تجريد/٥، ژمارە: ١٨٤٦ = ٥٦٠٥ بخاری. مسلم: ٢٠١١ = محمد فؤاد = ٥٢١٣ شيحا (بخاری رقم الكتاب/٧٤ رقم الباب/١٢).

اللَّهِ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ لاَ يَفْتَحُ بَابًا مُغْلَقًا، وَأَوْكُوا قِرَبَكُمْ، وَاذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ، وَخَمِّرُوا آنِيَتَكُمْ، وَاذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ، وَلَوْ أَنْ تَعْرُضُوا عَلَيْهَا شَيْئًا، وَأَطْفِئُوا مَصَابِيحَكُمْ». {الحديث: ٥٢١٨ = ٥٢٠٩ فـم. تجريد/٣، لاپەڕە: ٤٥٢، رقم: ٣٢٨٠، ٣٣٠٤، ٣٣١٦، ٥٦٢٣، ٥٦٢٤، ٥٦٩٥، ٦٢٩٦. أبو داود. أشربة: ٣٧٢١. تحفة الأشراف/٢٤٤٦} : [١٣١٠]

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کە بەرایی تاریکی شەو دەستی پێکرد) یا فەرمووی: (کە بوو بەئێوارێ، ئیتر لەو دەمەدا مناڵەکانتان بگرنەوەو مەهێڵن لەوکاتەدا بڵاو ببنەوە بەملاو بەولادا، چونکە دێوەکان، واتە: شەیاتینی، حەزیان لەتاریکییە، ڕقیان لە ڕوناکییە، لە تاریکیو ڕەشاییو بارودۆخی وادا، دەکەونە هەڵپەو چالاکی نواندن، بەڵام تاوێ لەشەو تێپەڕیو بوو بەشەوی تەواو، ئیتر ڕێگەی ئاموشۆیان لێ مەگرن، وە دەرگاکانتان دابخەنو ناوی خودا بهێنن، چونکە شەیتان دەرگای داخراو ناکاتەوە، وە دەمبێنی کوندەو مەشکەو جەومەندەو هیزەو خیگەی خۆتان ببەستنو ناوی خودا بهێنن، وە سەری قاپو قاجاخو دەفری خۆتان داپۆشنو ناوی خودا بهێنن، ئەگەر هەر هیچت دەست نەکەوت کە سەری حاجەتو دەفری پێ داپۆشی تەڵێ چیلکەی بەسەردا رابهێڵە، وە چراکانتان بکوژێننەوە). {تاج/٣، زنجیرە: ١٩، ژمارە: ٢٦٨٧، ٢٦٨٨} .

ئەمەیش گێڕانەوەی ئەم فەرموودەیە، لەژمارە (١٣٢٤)ی بەرگی سێی موختەصەری صەحیحی بوخاریدا، کە ناسراوە بە تەجریدی بوخاری:

---

[١٣١٠] تجرید/٣، ژمارە: ١٣٢٤ = ٣٢٨٠ بخاری. مسلم: ٢٠١٢ ترقیم محمد فؤاد لصحیح مسلم - پوختەی مسلم: ١٢٨١ = ٥٢١٨ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٥٩ رقم الباب/١٥).

عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (إِذَا اسْتَجْنَحَ اللَّيْلُ أَوْ قَالَ: جُنْحُ اللَّيْلِ فَكُفُّوا صِبْيَانَكُمْ فَإِنَّ الشَّيَاطِينَ تَنْتَشِرُ حِينَئِذٍ فَإِذَا ذَهَبَ سَاعَةٌ مِنْ الْعِشَاءِ فَخَلُّوهُمْ وَأَغْلِقْ بَابَكَ وَاذْكُرْ اسْمَ اللَّهِ وَأَطْفِئْ مِصْبَاحَكَ وَاذْكُرْ اسْمَ اللَّهِ وَأَوْكِ سِقَاءَكَ وَاذْكُرْ اسْمَ اللَّهِ وَخَمِّرْ إِنَاءَكَ وَاذْكُرْ اسْمَ اللَّهِ وَلَوْ تَعْرُضُ عَلَيْهِ شَيْئًا) (الحديث ٣٢٨٠، أطرافه في: ٣٣٠٤، ٣٣١٦، ٥٦٢٣، ٥٦٢٤، ٦٢٩٥، ٦٢٩٦):

جابیر(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) فەرمووی: (کە سەرەتای شەو داهات) یا فەرمووی: (کەبەرایی تاریکی شەو دەستی پێکرد، ئیتر لەو دەمەدا مناڵەکانتان بگرنەوەو مەهێڵن لەو کاتەدا بڵاو ببنەوە بەم لاو بەولادا، چونکە دێوەکان، واتە: شەیاطینی، حەزیان لەتاریکییە، رقیان لەڕووناکییە، لەتاریکیو ڕەشاییو دۆخی وادا دەکەونە هەڵپەو چالاکی نواندن. بەڵام کاتێ تاوێ لەشێوان تێ پەڕیو بوو بەشەوی تەواو، ئیتر ڕێگەی هاموشۆیان لێ مەگرن. وەدەرگاکەت دابخەو ناوی خودا بهێنە،و لەکاتی پێویستدا چراکەت بکوژێنەوەو ناوی خودا بهێنە، وەدەمبینی کوندەو مەشکەکەت ببەستەو ناوی خودا بهێنە، سەری دەفرو حاجەتەکەت داپۆشەو ناوی خودا بهێنە، خۆ ئەگەر هیچت دەست نەکەوت، چڵێ دار لەسەر باری پانی، لەسەردەمی قاپو حاجەتەکە دابنێو ناوی خودا بهێنە) (تاج/ ٤ل- ٦٤ ز- ١٩ — باسی دەفرو قاپو حاجەت. ف-٢+١+٣).

١٣١١- حديث ابن عمر عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « لاَ تَتْرُكُوا النَّارَ فِي بُيُوتِكُمْ حِينَ تَنَامُونَ »: [١٣١١]

[١٣١١] بخاری: ٦٢٩٣. مسلم: ٥٢٢٥ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٧٩ رقم الباب/٧٩).

ئیبنو عومەر (رەزای خودا لەخۆیو لە حەزرەتی عومەری باوکی بێت) لە پێغەمبەرەوە (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەناو ماڵەکانتانا، کاتێ دەخەون ئاگرەکانتان بکوژێننەوەو بە نەکوژاوەیی بەجێیان مەهێڵن).

١٣١٢- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: احْتَرَقَ بَيْتٌ عَلَى أَهْلِهِ بِالْمَدِينَةِ مِنَ اللَّيْلِ، فَلَمَّا حُدِّثَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) بِشَأْنِهِمْ، قَالَ: «إِنَّ هَذِهِ النَّارَ إِنَّمَا هِيَ عَدُوٌّ لَكُمْ، فَإِذَا نِمْتُمْ فَأَطْفِئُوهَا عَنْكُمْ». {الحديث: ٥٢٢٦ = ٥٢١٧ فم. تجريد/٥، رقم: ١٩٧٣ = ٦٢٩٤ فتح الباري. تحفة الأشراف: ٩٠٤٨} : [١٣١٢]

ئەبو مووسای ئەشعەری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەمەدینە شەوێ، ماڵێ سووتا بەسەر خاوەنەکەیدا، کە ئەم رووداوەیان عەرزی حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) کرد، فەرمووی: (ئاگر دوژمنی ئێوەیە، کە دەخەون لەخۆتانی بکوژێننەوە!). {ریاض/١، زنجیرە: ١٦، ژمارە: ٦/١٦١، لاپەڕە: ١٥٠ - ش} + {ژمارە: ١٣٢٤ تجرید = ٣٢٨٠ فتح الباری = بەرگی/٣، لاپەڕە: ٤٥٢ چاپی یەکەم}.

## (١٣) باب آداب الطَعَامِ وَالشَرَابِ وَأَحكَامِهَا
## باسی دەستوورەکانی خواردەمەنیو خواردنەوەکانو بڕیارەکانی ئەم دوو بابەتە

١٣١٣- عَنْ عُمَرَ بْنَ أَبِي سَلَمَةَ رَضِي اللَّهُ عَنْه يَقُولُ: كُنْتُ غُلَامًا فِي حَجْرِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَكَانَتْ يَدِي تَطِيشُ فِي الصَّحْفَةِ فَقَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ

[١٣١٢] تجرید/٥، ژمارە: ١٩٧٣ = ٦٢٩٤ بخاری. پوختەی موسلیم: ١٤٤٢ = ٥٢١٧ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٧٩ رقم الباب/٤٩).

صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يَا غُلَامُ سَمِّ اللَّهَ وَكُلْ بِيَمِينِكَ وَكُلْ مِمَّا يَلِيكَ. فَمَا زَالَتْ تِلْكَ طِعْمَتِي بَعْدُ.(الحديث ٥٣٧٦، طرفه في: ٥٣٧٧، ٥٣٧٨): [١٣١٣]

عومەری کوڕی ئەبو سەلەمە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: منداڵ بووم، پێغەمبەر -دروودی خوای لەسەر بێ- خۆی بەخێوی دەکردم، چونکە زڕکوڕی بووم، کوڕی ئومموسەلەمە بووم، کە هاوسەری پێغەمبەر بوو، -دروودی خوا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خوا لەهەموو هاوسەرە بەڕێزەکانی-، کەنانم دەخوارد دەستم دەگێڕا بەناو لەگەنەکەدا، بەئارەزووی خۆم، جا حەزرەت -دروودی خوای لەسەر بێ- تەمێی کردمو فەرمووی پێم: (ڕۆڵە: کەنان دەخۆی لەسەرتاوە ناوی خوابێنەو بیسمیلا بکەو، بەدەستی ڕاستت بخۆو لەبەردەمی خۆتەوە بخۆو دەست مەگێڕە بەم لاولای قاپەکەدا، مەگەر لەبەر عوزر).

عومەر (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئیتر لەوساوە هەتا ئێستا هەربەم شێوەیە نان دەخۆم کەپێغەمبەر فێری کردووم. (تاج/٤ ز/١٦ ل/٤٦ ژ/٢ — سەرباسی دەستووری نانخواردن —ش/د/ت + ریاض/١ ز/٣٨ ل/٢٥٠ ژ/٢٩٩ + ریاض/٢ ل/٢٤٨ ز/١٠٠ ژ/٧٢٨).

**ڕوونکردنەوە:**

سوننەتە بەدەستی ڕاست شت بخورێ، مەگەر لەبەرناچاری و مەهانەی ڕەوا، وەك نەخۆشی‌و برین‌و شتی وا، بەزەینم کەسێ چەپەوانە بێ واباشە، کەهەوڵ بدا بە دەستی ڕاست بخوا، بەڵام ئەگەر بۆی زەحمەت بوو، دروستە دەستی چەپی بەکاربهێنێ.

---

[١٣١٣] تجرید/٥، ژمارە: ١٨٠١ = ٥٣٧٦ بخاری. مسلم: ٢٠٢٢ محمد فؤاد - پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١٣٠٠ = ٥٢٣٧ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٧٠ رقم الباب/٢).

عومەری کوڕی ئەبو سەلەمە (ڕەزای خوای لێ بێ) هەنـەزای پێغەمـەر بـووە، لەساڵی دووی کۆچی دا، کاتێ باوكو دایکی کۆچکار بوون، لەخاکی حەبەشە لەدایك بووە، لە ڕۆژەکەی خەندەقا لەگەڵ ئیبنو زوبەیرا، لەناو خەندەقەکەدا بـوون، لەگـەڵ سـوپای ئیمـامی عـەلی دا ئامـادەی جـەنگی ئـەل جەمـەل بـوو، کەلەدژی لەشکری عائیشە بـوو، عـەلی کـردی بـە بەرپرسـی سـەر وڵاتـی فـارسو بەحرەین، کۆمەڵێ فەرمووده دەگێڕێتەوە، لەریجالی صەحیەینە، هەروا لەکتێبە شایـستەکانی تـری فـەرموودەدا فـەرموودەی تـری هەیـە، ئـەم زاتانـە ڕاوی فـەرموودەکانی بـوون: محمـدی کـوڕی، سـەعیدی کـوڕی مـسیب، عـوروە، ئـەبو ئومامـە، وەهبـی کـوڕی کیـسان و کەسـانی تـریش، لەسـەردەمی جێنـشینی عەبدولەلیکی کوڕی مـەروانا، لەمەدینـە ساڵی هەشـتاو سێی کۆچی، بەمـەرگی خوا مـردووە، نزیکـەی هەشـتا ساڵێ ژیـاوە، دوو فـەرموودەی لەبوخاریـدا هەیـە، یەکێکە لەهاوڕێ بچوکەکانی پێغەمەر -دروودی خوای لەسـەر بێ- تەمـەن درێـژ بـووە، بڕوانـە بـەرگی یەکـەم، لاپـەڕە/١١٨ فـەرموودەی ژمـارە/٩٤ بـۆ زانینـی ژیاننامەی ئوم سەلەمەی دایکی.

١٣١٤- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) عَنِ اخْتِنَاثِ الأَسْقِيَةِ أَنْ يُشْرَبَ مِنْ أَفْوَاهِهَا. وفي روايـة: وَاخْتِنَاثُهَـا أَنْ يُقْلَبَ رَأْسُهَا ثُمَّ يُشْرَبَ مِنْهُ. {الحديث: ٥٢٤٠، ٥٢٤١ = ٥٢٣١، ٥٢٣٢ فم. تجريد/٥، لاپەڕە: ١٤٧، رقم: ١٨٥١ = ٥٦٢٦، ٥٦٢٥ فتح البارى} : [١٣١٤]

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) نـەهی دەکـرد لـەوە کـەدەمو هـەنگڵی کونـدەو جەوەنـدەو

---

[١٣١٤] تجرید/٥، ژمارە: ١٨٥١ = ٥٦٢٥ بخاری. پوختەی موسلیم: ١٢٨٧ = ٥٢٤٠ شیحا (بخاری رقم الکتاب/ رقم الباب/ )

مەشـكە، هـەڵپێچ بكـرێ‌و ئینجـا دەمـی پێـوە بنـرێ‌و ئـاوی لێ بخورێتـەوە).
{ریـاض/٢/٢٦٤، زنجـیرە: ١١٢، ژمـارە: ٧٦٢} + {تـاج/٣، زنجـیرە: ١٧، ژمـارە: ٢٦٧٥ ج/٤}.

لەگێڕانـەوەی ژمـارە (٥٢٤١)دا، زوهـری دەفـەرموێ: مەبەسـت ئەوەیـە كـە كوندەكـە، یـا مەشـكەكە دەمەكـەی سـەرەو خـوار بكرێتـەوەو لێـی بخورێتـەوە).
{ریاض/٢، زنجیرە: ١١٢، ژمارە: ٧٦٢}.

## روونكردنەوە:

هۆی ئەم نەهیە چەند شتێكە: وەك دەمی كوندەكە قێزاوی دەبێ‌و خـەڵكی تر قێزی نایێ لێی بخواتەوە، یا بەرە بەرە دەمی كوندەكە، بۆگـەن دەبـێ، یـا ڕێ دەكەوێ، جانەوەرێ، یا شتێ خـراپ چـووەتە نـاو كوندەكـەوەو دەچێتە ناوسكی ئەویـشەوە دەڵـێن: لەسـەردەمی پێغەمبـەردا، پیـاوێ دەم ئـەنێ بـە هـەنگڵی كوندەیەكەوە توولە مارێكی تیادەبێ دەچێتە ناوسكی، یا لەبەرئەوەیە گەڵێ جار ئاو دەپەڕێتە قوڕگی، یا لەبـەر ئەمانـە هـەمووی، زۆریـی هـۆو فـرە هـۆیی كـارێ دروستە.

فـەقێ بـووم لـەپریس، لـەلای هەڵەبجـە، دەروێـشێ دەیـەوێ مـارێ بخـوات، دەینێتـە نـاو هـەردوو قـولی مـشتیەوەو سـەری مارەكـە بەرابـەری دەمـی خـۆی رادەگرێ‌و خۆش خۆش دەڵێ: ها كافر! بتخۆم، مارەكـە وزاق دەداو خـۆی دەكا بەقوڕگیداو دەچێتە ناو گەدەی، جا كێشەیێ بـۆ دەروێشەكە دروسـت دەبـێ، كـە مارەكە دەیەوێ بێتـە دەرەوە، دەروێـشەكە دەكۆكـێ‌و مارەكـە دەگەڕێتـەوە بۆنـاو گـەدەی، لەهانـە سـوورەوە دەروێـشەكەیان بەسـواری كـەرێ بـرد بـۆ هەڵەبجـە،

جامانەیەکی کردبوو بـە لەچك، لـە هەڵەبجـە دەرمانیـان پێـدا مارەکـەی فرێـدا، دیمەنی کەرەکەو دەروێشەکەو لەچکەکەی‌و تۆقاوییەکەیم هەر لەبەر چاوە!!

## (١٥) بابُ في الشُرب مِنْ زَمْزَمَ قائماً
## خواردنەوە لە ئاوی زەمزەم بە ڕاوەستانەوە

١٣١٥- عَنْ عَاصِمٍ عَنِ الشعبيّ: أَنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ رَضِيِ اللّٰهُ عَنْهُ حَدَّثَهُ قَالَ: سَقَيْتَ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ زَمْزَمَ فَشَرِبَ وَهُوَ قَائِمٌ قالَ عَاصِمٌ: فَحَلَفَ عِكْرِمَةُ: مَاكَانَ يَوْمِئِذٍ إلاَّ عَلى بِعَيرٍ. (الحديث ١٦٣٧ – طرفُهُ فى: ٥٦١٧): [١٣١٥]

عاصیم لە شەعبی یەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: ئیبنوعەبباس قسەی بۆ کـردم، فـەرمووی: بەدەسـتی خـۆم لـەئاوی بـیری زەمـزەم ئـاوی خواردنـەوەم پێـشکەش بـە پێغەمبـەر کـرد، بەڕاوەسـتانەوە خواردیـەوە. عاصـیم فـەرمووی: عەکرەمە سوێندی خوارد: کە پێغەمبـەر -دروودی خـوای لەسـەر بـێ- لەوکاتـەدا کە ئەو ئاوەی نۆش کرد، بە سواریی وشترێ بوو). (تاج/٢/٢٦٥ز-١٣٢).

### ڕوونکردنەوە:

عیکریمـە (ڕەحمـەتی خـودای لێ بـێ) یەکێکـە لـەپیاوانی ڕشـتەی ئـەم فەرموودەیە، شاگردو فەقێی ئیبنو عـەبباس بـووە، کۆیلەیـشی بـووە، بـە ڕەگـەز بەربەرە، خەڵکی مەغریبە، فـەرموودەو حـەدیثی لـەزۆر لـەهاوەڵانی پێغەمبـەر وەرگرتووە، یەکێکە لەزانا گەورەکانی سەردەمی خۆی، قورئانزانێکی چاك بـووە، ئەیوب‌و خالیدولحەذذاء فـەقێی بـوون، دەڵێن گوایـە لـەبیروباوەڕدا هـەوا خـوای خەواریج بووە، نـافیع‌و کەسـانی تـر تۆمـەتی درۆیـان لێ دەدا، جێگـەی متمانـەی

---

[١٣١٥] تجرید/٢، ژمارە: ٧٨٣ - مسلم: ٥٢٤٩ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٢٥ رقم الباب/٧٦).

بوخارییە، بەڵام موسلیم بەمەرجێ فەرموودەی عیکریمە دەگێڕێتەوە کە طاووس‌و سەعیدی کوڕی جوبەیری لەگەڵدا بێ، بۆرە گلەییەك لەبوخاری دەکرێ لەسەر عیکریمە کە نەدەبوو حەدیثی عیکریمە لەبوخاریدا ریوایەت بکا، واتە: عیکریمە لەپیاوانی مەرجی بوخارییە، بەڵام لەپیاوانی مەرجی موسلیم نییە، بەڵام بەسە بۆ فەضلی عەکرەمە کەجێگەی متمانەی ئیمامی بوخارییە، عیکریمە گەڕیدە بوو، بەوڵاتانا دەسووڕایەوە، کاتێ ئیبنو عەبباس دەمرێ عیکریمە هێشتا ئازاد نەبوو بوو، عەلی کوڕی ئیبنو عەبباس دەیفرۆشێ بەخالیدی کوڕی موعاوییە، بەچوار هەزار دینار!.

عەکرەمە پێی دەفەرموێ: (هەموو عیلمەکەی باوکتت فرۆشت بەچوار هەزار دینار!). ئەویش پەشیمان دەبێتەوەو سەوداکە هەڵدەوەشێنێتەوەو ئازادی دەکا، لەمەدینە لەتەمەنی هەشتا ساڵیدا مردووە (رەحمەت‌و رەزای خودای لێ بێ) {بڕوانە: تەجریدی بوخاری/١، ژمارە: ٦٦ = ٧٥ بوخاری}.

## (١٦) باب كراهةُ التَنَفُسِ في نَفْسِ الإناءِ واستِحباب التنفسِ ثلاثاً خارِجَ الإناءِ
## نەهی کردن‌و ڕێگرتن لە هەناسەدان لەناو جامەکەدا، لە کاتی خواردنەوەدا، وا پەسەندە کە ئاو بە سێ پشوو بخواتەوە وە لە دەرەوەی جامەکە هەناسە بدات

١٣١٦- عَنْ أَبِى قَتَادَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَهَى أَنْ يُتَنَفَّسَ فِى الإِنَاءِ. {الحديث: ٥٢٥٣ = ٥٢٤٤ فم. تجريد/١، رقم: ١٢١ = ١٥٣، ١٥٤، ٥٦٣٠. ترمذي. أشربة: ١٨٨٩. نسائي. طهارة: ٤٧، ٤٨. ابن ماجة. طهارة: ٣١٣}:

ئەبو قەتادە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کاتێ شت دەخۆنەوە لەناو جامەکەدا هەناسە مەدەن). {ریاض/٢، زنجیرە: ١١٠، ژمارە: ٧٥٩، ٧٦٦}.

١٣١٧- عن ثُمَامَةُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ كَانَ أَنَسٌ يَتَنَفَّسُ فِي الإِنَاءِ مَـرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاَثًـا ، وَزَعَمَ أَنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) كَانَ يَتَنَفَّسُ ثَلاَثًا: (١٣١٧)

ثومامەی کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: دەستووری پێشەوا ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) وابوو، لە کاتی شتخواردنەوەدا، بە سێ بین دەیخواردەوە، یان بە دوو بین دەیخواردەوە، لە دەرەوەی جامەکە سێ هەناسە، یان دوو جار هەناسەی دەدا، وە دەیفەرموو: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو، بە سێ بین، واتە بە سێ جار، شتی دەخواردەوە، وە هەموو جارێ لە دەرەوەی جامەکە سێ هەناسەی دەدا. (بڕوانە: ژمارە: (١٨٥٣)ی تەجریدی بوخاری + ژمارە: (١٢١)ی بەرگی/١ی تەجریدی بوخاری).

## (١٧) باب إستحباب إدارة الماءِ واللَّبَنِ وَنَحْوِهِما عَنْ يَمِينِ المُبْتَدِئِ
## لە کاتی شت خواردنەوەدا، بەلای ڕاستی دەستپێکەرداخواردنەوەکە دەگێڕدرێ، ئەوە پەسەندە

١٣١٨- عَنْ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَتَانَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فِى دَارِنَا، فَاسْتَسْقَى، فَحَلَبْنَا لَهُ شَاةً ثُمَّ شُبْتُهُ مِنْ مَاءِ بِئْرِي هَذِهِ، قَالَ: فَأَعْطَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، فَشَرِبَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، وَأَبُو بَكْرٍ عَنْ يَسَارِهِ، وَعُمَرُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) وُجَاهَهُ، وَأَعْرَابِيٌّ عَنْ يَمِينِهِ، فَلَمَّا فَرَغَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) مِنْ شُرْبِهِ، قَالَ عُمَرُ: هَذَا أَبُو بَكْرٍ يَا رَسُولَ اللَّهِ، يُرِيهِ إِيَّاهُ، فَأَعْطَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) الأَعْرَابِيَّ وَتَرَكَ أَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ، وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «الأَيْمَنُونَ الأَيْمَنُونَ الأَيْمَنُونَ».

---

(١٣١٧) تجريد/٥، ژمارە: ١٨٥٣ = ٥٦٣١ بخاری مسلم: ٢٠٢٨ = پوختەی موسلیم/٢، ژمارە: ١٣٩٢ = ٥٢٥٣ شيحا (بخاری رقم الكتاب/٧٤ رقم الباب/٣٦).

قَالَ أَنَسٌ: فَهِيَ سُنَّةٌ، فَهِيَ سُنَّةٌ، فَهِيَ سُنَّةٌ. {الحديث: ٥٢٥٩ = ٥٢٥٠ فم. بخاري. هبة: ٢٥٧١ تحفة الأشراف/٩٧٢. تجريد/٣/١٢٣، رقم: ١٠٣٤ = ٢٣٥٢، ٢٥٧١، ٥٦١٢، ٥٦١٩}:[١٣١٨]

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەشریفی هات بۆماڵی ئێمە، داوای خواردنەوەی کرد، ئاژەڵێکی وردەمان بۆی دۆشی، ئەوجا لەئاوی ئەم بیرەی خۆمم تێکەڵ کرد، ئەوجا بەدەستی خۆم پێشکەشی پێغەمبەرم کرد، پێغەمبەر لێی خواردەوە، ئەبوبەکر لەلای چەپی پێغەمبەرەوە بوو، عومەریش بەرابەری بوو، عارەبێکی دەشتەکیش لەلای راستیەوە بوو، کە پێغەمبەر لە خواردنەوەکەی لێ بۆوە، عومەر ویستی ئەبوبەکری پیشان بدا، هەتا جامەکە بدا بەو، لەبەرئەوە فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمە ئەبوبەکرە، بەڵام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جامە شیراوەکەی دابە عەرەبە دەشتەکیەکەو نەیدا بە ئەبوبەکرو عومەر، وەبۆ ڕوونکردنەوەی ئەمە فەرمووی: (لەم جۆرە بابەتانەدا، لای راست لەپێشترە) سێجار فەرمووی: (لای راست لەپێشترە). بۆیە ئیمامی ئەنەسیش دەیفەرموو: کاری وا نەك جارێ، بەڵکوو سێ جار سوننەتە). {ریاض/٢، لاپەڕە: ٢٦٣، زنجیرە: ١١٠، ژمارە: ٧٦٠ + ژمارە: ٥٦٩، زنجیرە: ٦٣}.

١٣١٩- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ أُتِيَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِقَدَحٍ فَشَرِبَ مِنْهُ وَعَنْ يَمِينِهِ غُلامٌ أَصْغَرُ الْقَوْمِ وَالأَشْيَاخُ عَنْ يَسَارِهِ فَقَالَ يَا غُلامُ أَتَأْذَنُ لِي أَنْ أُعْطِيَهُ الأَشْيَاخَ قَالَ مَا كُنْتُ لأُوثِرَ بِفَضْلِي مِنْكَ أَحَدًا يَا رَسُولَ اللَّهِ

---

[١٣١٨] بخاری. هبە: ٢٥٧١ پوختەی موسلیم: ١٢٩٠ = ٥٢٥٩ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٥١ رقم الباب/٤).

فَأَعْطَـــاهُ إِيَّـــاهُ). (الحـــديث ٢٣٥١، أطرافُـــهُ في: ٢٣٦٦، ٢٤٥١، ٢٦٠٥، ٢٦٢٠):[١٣١٩]

سەهلی کوڕی سەعد(ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: جارێ لەخزمەت پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەر بێ) بووین، جامێ خواردنەومیان هێنا بۆ پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) خۆی لێی خواردەوە، لەلای راستیەوە کوڕێـــکی لاوی لـــێ بـــوو لـــەلای چەپیـــشیەوە پیرەکـــان دانیـــشتبوون، پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) بەکوڕە لاوەکەی فەرموو: (ئایا رازی دەبیت کە خواردنەوەکە لەپێش تۆدا بدەم بەم پیرانـە؟) کوڕەکـەش ئیبنوعـەبباس بـوو گووتی: نەبەخوا، ئەی پێغەمبەری خودا! بەشی خۆم لەبـەر ماوەی پـیرۆزی تـۆ بەکەس نادەم، پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێ) جامەکەی دایە دەستی. (ریاض/٢/٢/٥٧٠ز —٦٣ف-٢).

## (١٨) بابُ إستحباب لعق الأصابعِ وَالقَصعَةِ وَأكْلِ اللُّقْمَةِ السَّاقِطَةِ بَعْدَ مَسْحِ مَا يُصِيبُهَا مِنْ أذى وَكَرَاهَةِ مَسْحِ اليَدِ قَبْلَ لَعْقِهَا

## وا پەسەندە کە لە پاش نانخواردن پەنجەو دەست بلێسرێتەوە. هەروا قاپو لەگەنو دەورییەکە، وە ئەگەر پارویێ کەوتە خوارەوە پاك بكرێتەوەو ئەوسا بخورێ، وە نا باشە کە دەست بسرێ، لە پێش لستنەوەدا

١٣٢٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِذَا أَكَلَ أَحَدُكُمْ طَعَامًا فَلاَ يَمْسَحْ يَدَهُ حَتَّى يَلْعَقَهَا أَوْ يُلْعِقَهَا». {الحديث: ٥٢٦٣ = ٥٢٥٤ فم}:[١٣٢٠]

---

[١٣١٩] تجريد/٣، ژمارە: ١٠٣٣ = ٢٣٥١ بخاری. مسلم: ٢٠٣٠ محمد فؤاد: ٢٠٣٠ = پوختەی موسلیم: ١٢٩١ = ٥٢٦٠ شيحا (بخاری رقم الكتاب/٤٢ رقم الباب/١).

ئیبنو عـەبباس (ڕەزای خودایـان لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کاتێ نان دەخـۆن دەسـتی خۆتـان مەسـڕن، هـەتا خۆتان دەیلێسنەوە، یا یـەکێکی تـر بۆتـانی دەلێسێتەوە). {تـاج/٣، لاپـەڕە: ٢٠٠، زنجیرە: ١٦، ژمارە: ٢٦٥٩} + {ریاض/٢/٢٥٩، زنجیرە: ١٠٩، ژمارە: ٧٤٨}.

بـۆ بـەهرەی پـتر ژمـارە (١٨١٨)ی تەجریـدی بوخـاری، بـەرگی پێنجـەم، ڕاگوێز دەکەین، کە دەفەرموێ:

عَنِ إبْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنهُما أَنَّ النَّبِيُّ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ قـال: إذا أَكَـلَ أَحَدَكُمْ فَلَا يَمْسَحَ يَدَهُ حَتَّى يَلْعَقَهَا أَو يُلْعِقَهَا. (الحديث ٥٤٥٦)[١٨١٨].

ئیبنـو عـەباس ـڕەزای خوایـان لێ بـێ- دەفـەرموێ: پێغەمـەر ـدروودی خـوای لەسـەر بـێ- دەفـەرموێ: (کـەنان دەخـۆن دەسـتی خۆتـان مەسـڕن، هـەتا خۆتـان دەیلێسنەوە، یا یەکێ تر بۆتانی دەلێسێتەوە!). (تاج/٤ ز/١٦ ل/٥٦ ژ/٢٤).

## ڕوونکردنەوە:

هۆی ئەم لستنەوەیە ئەوەیە کەلەفەرمودەیەکی تردا پێغەمەر ـدروودی خوای لەسـەر بـێ- دەفـەرموێ: (ئێـوە نـازانن کـەپیتو فـەڕی خواردەمـەنیـیـەکـەتان لەکامەی دایە). (بڕوانە: ریاض الصالحین بەرگی/٢ ل/٢٦٠ ز/١٠٩ ژ/٧٥٢).

وەکی تریش مەبەست لەوەی کەکەسێ تـر لـەپاش نـانخواردن دەسـتی بـۆ بلێسێتەوە ئەگەر خۆی نەیلێسایەوە، کەسێکە کە فێـرو بێـز لەوەنەکاتـەوە، وەك

---

[١٣٢٠] تجرید/٥، ژمارە: ١٨١٨ - ٥٤٥٦ بخاری. مسلم: ٢٠٣١ - پوختـەی موسـلیم/٣، ژمـارە: ١٣٠٢ - ٥٢٦٢ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٧٠ رقم الباب/٥٢).

[١٨١٨] أخرجه مسلم في الأشربة، باب: استحباب لعق الأصابع و القصعة ... رقم: ٢٠٣١.

منالّی خۆی و فەقێی کە بۆ پیرۆزی دەستی بلێسێتەوە[1]، بەهەر حاڵ، بەهیچ شێوەیەك مەبەست ئەوە نییە کە موسوڵمان کاری ناشایستە و باری نالەبار برەو پێ بدا، ئەم جۆرە کارە سوننەتە، کردنی سوننەتیش هەرکاتێ کێشەیەکی بۆ موسوڵمانان دروست دەکرد، ئەوە نەکردنی لەکردنی باشترە، وەك زۆر لە سوننەتەکانی حەج، ئەگەر هەموو حاجییەك لەکاتی حەج کردنا حەجەرو لئەسوەد ماچ بکا، یا ئیستیلامی ڕوکنی یەمانی بکا، یا دووڕکات نوێژی سوننەت لەمەقامی ئیبراهیما بکا، ئەوە هەموو حەجەکەیان دەفەوتێ، یا هەزاران کەس دەبن بەژێر پێوە، هەتا زۆر لەزانایانی خاوەن تەقوای ئەمڕۆ قسە لەوە دەکەن، کە دروستە بۆ بەرژەوەندی ئیسلام و موسوڵمانان تەرکی هەندێ واجبیش بکرێ، وەك کچی موسوڵمان بەبەرگی مۆدەوە لەزانکۆ دەوام بکا، ئەگەر دەوڵەت ڕێگەی نەدەدا بەبەرگی موسوڵمانانەوە دەوام بکا، هەمووممان دەزانین ڕۆژ گۆڕاوە، خەڵك خراپ بوون سێ (ص) صادەکەیش: صەفەوییەتو صەلیبیەتو صەهیۆنیەتیش قەت وەك ئەمڕۆ، بەنەرمە بڕە، لەدژی ئیسلام سەنگەریان نەگرتووە، لەهەمووی بڤەتر لەوڵاتی ئێمەدا بەداخەوە، مزگەوتەکان چۆڵن، مەیدان خاڵییە، زانای دانای کارا کەم بووە، ئەوەیشی هەیە کەنارخراوە! بەتایبەتی لەوڵاتی ئێمەدا، کەسانێ پەیدابوون، پەروەردەی ناو زێرابن، کەخۆیان پێی دەڵێن: خەباتی ژێرزەمینی، ئێستا هەڵیان بۆ ڕەخساوە، دەغەزو

---

[1] کۆمەڵێکی ڕاستگۆ بۆیان گێڕامەوە: کە پیاوێك لە گەرەکی ئەوان، سێو چوار ساڵە، میزی گیراوە، بە سۆندەو شتی وا بە زۆر زەحمەتێکی زۆر گمیزی پێ دەکەن، گوتیان: ئەم پیاوە نەخۆشە کچو کوڕێکی زۆر بە دینیان هەیە، زۆرجار لەبەر ئەوەی ئازاری باوکیان نەدەن بە دەم چووکی باوکیان دەمژن هەتا میزەکەی دێتە ناو دەمیان!

خودایە لەگەڵ ئەم جۆرە موسوڵمانانە حەشرمان بکەی. ئامین.

کینەی پەنگەوە خواردووی چەند ساڵەی ناو دەروونی پیسیان بەو پەڕی سەربەستییەوە، وەبێ پەروا لەدژی ئیسلام، وەك ئاودەستخانە دەردەی هەڵ دەڕێژن، وە بۆ نەگبەتی هەلو مەرجێکی واش ڕەخساوە کەخەڵك گوێیان لێ دەگرێو بگرە باوەڕیشیان پێدەکا، بەتایبەتی لە کوردستانی ئازاددا، بەناوی ئازادییەوە، کۆمەڵێ نیمچە میرزا و بەناو ڕۆشنبیر، بە کرێگیراون، بۆ ڕەفکردنو تانەوتەشەردان لەئیسلام، هەتا شێوەی جوانی گەلی کورد ناشیرین بکەنو هەل بۆ دوژمن بسازێننەوە کەگوایە کورد کافر بونەتەوە تا ئەنفالمان بکەنەوە.

لەم ڕۆژانەدا کۆمەڵێ ڕۆشنبیر، لە دژی ئیسلام بەوپەڕی شانازییەوە بوون بە شەیتانپەرست، پیرۆزیان بێ تەیری گول ئاشق بە داری ژەقنەموتە!.

## (١٩) باب ما يَفْعَلُ الضَّيْفُ إذا تَبِعَهُ غَيْرُ مَنْ دَعَاهُ صاحِبُ الطَّعَامِ واسْتِحبابُ إذْنِ صَاحِبِ الطَّعَامِ لِلتَّابِعِ

## ئەگەر کەسێ بانگهێشت کرا بوو بۆ میوانداریی، وە کەسێ تر کە بانگ نەکرابوو، شوێنی کەوت وا پەسەندە کە مۆڵەت لە خاوەنی نانەکە وەربگیرێ

١٣٢١- عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الأَنْصَارِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ، يُقَالُ لَهُ (أَبُو شُعَيْبٍ)، وَكَانَ لَهُ غُلاَمٌ لَحَّامٌ، فَرَأَى رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَعَرَفَ فِي وَجْهِهِ الْجُوعَ، فَقَالَ لِغُلاَمِهِ: وَيْحَكَ اصْنَعْ لَنَا طَعَامًا، لِخَمْسَةِ نَفَرٍ، فَإِنِّي أُرِيدُ أَنْ أَدْعُوَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خَامِسَ خَمْسَةٍ، قَالَ: فَصَنَعَ، ثُمَّ أَتَى النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَدَعَاهُ خَامِسَ خَمْسَةٍ، وَاتَّبَعَهُمْ رَجُلٌ، فَلَمَّا بَلَغَ الْبَابَ قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِنَّ هَذَا اتَّبَعَنَا، فَإِنْ شِئْتَ أَنْ تَأْذَنَ لَهُ، وَإِنْ شِئْتَ رَجَعَ»؟ قَالَ: لاَ بَلْ آذَنُ لَهُ يَا رَسُولَ اللَّهِ. {الحديث: ٥٢٧٧ = ٥٢٨٨ فم.

تجريـد/٥/٨٧، رقـم: ١٨١٤ = ٥٤٣٤، ٢٠٨١، ٢٤٥٦، ٥٤٦١. ترمـذي. نكـاح: ١٠٩٩. تحفة الأشراف: ٩٩٩٠}: [1321]

ئەبو مەسعوودی بەدری ئەنصاری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێکی ئەنصاری، ناوی ئەبو شوعەیب بوو، خولامێکی گۆشت فرۆشی هەبوو، کاتێ پێغەمبەری بینی روانی نیشانەی برسێتی لەرووی دیارە، بە خولامەکەی خۆی فەرمووی: (داماو نەبی! نانێ دروست بکە، بەشی پێنج کەس بکات، من دەمەوێ پێغەمبەرو چوار کەسی تر خولك بکەم). فەرمووی: ئەویش نانەکەی دروست کرد، ئەوجا ئەبو شوعەیب چوو بۆلای پێغەمبەرو لەگەڵ چوار کەسی تردا خولکی کردن بۆ نان خواردن، جا کاتێ کەوتنە رێ، پیاوێ تریش شوێنیان کەوت، کە گەیشتنە بەردەرگای ماڵەکە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەخاوەن ماڵەکەی فەرمووی: (ئەم پیاوە شوێنمان کەوتووە، کە تۆ خولکت کردین ئەومان لەگەڵ نەبوو، جا ئەگەر رێی دەدەی ئەوا دێتە ژوورەوە، ئەگەر حەزیش نەکەیت ئەوا دەگەرێتەوە؟). (خانە خوێکەیش گوتی: قوربان! رێگەی نەدەم). {ریاض/٢، زنجیرە: ١٠٣، ژمارە: ٧٣٩}.

---

[1321] تجریـد/٥، ژمـارە: ١٨١٤ = ٥٤٣٤. پوختـەی موسـلیم: ١٣٠٨ - ٥٢٧٧ شـیحا (بخـاری رقـم الکتاب/٣٤ رقم الباب/٢١).

## (٢٠) باب جَوَازِ إستِتبَاعِهِ غَيْرهُ إلى دَارِ مَنْ يَثِقُ بِرِضَاهُ بِذالِكَ، وَبِتَحَقُّقِهِ تَحقُّقاً تَاماً وَاستِحْبَابُ الإجْتِمَاعِ عَلَى الطَعَامِ

## دروسته میوان کەسێ تر لەگەڵ خۆی ببا، بۆ ماڵی خانه خوێکەی، ئەگەر دڵنیابوو لەوە: کە خاوەن ماڵەکە ڕازییە، وا پەسەندە کە میوانەکان لە دەوری خوانو نانەکە کۆببنەوە

١٣٢٢- عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: لَمَّا حُفِرَ الْخَنْدَقُ رَأَيْتُ بِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) خَمَصًا فَانْكَفَأْتُ إِلَى امْرَأَتِى، فَقُلْتُ: لَهَا هَلْ عِنْدَكِ شَىْءٌ؟ فَإِنِّى رَأَيْتُ بِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) خَمَصًا شَدِيدًا، فَأَخْرَجَتْ لِى جِرَابًا فِيهِ صَاعٌ مِنْ شَعِيرٍ، وَلَنَا بُهَيْمَةٌ دَاجِنٌ، قَالَ: فَذَبَحْتُهَا، وَطَحَنَتْ فَفَرَغَتْ إِلَى فَرَاغِى فَقَطَّعْتُهَا فِى بُرْمَتِهَا، ثُمَّ وَلَّيْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، فَقَالَتْ: لاَ تَفْضَحْنِى بِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) وَمَنْ مَعَهُ، قَالَ: فَجِئْتُهُ فَسَارَرْتُهُ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّا قَدْ ذَبَحْنَا بُهَيْمَةً لَنَا وَطَحَنَتْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ كَانَ عِنْدَنَا، فَتَعَالَ أَنْتَ فِى نَفَرٍ مَعَكَ، فَصَاحَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) وَقَالَ: «يَا أَهْلَ الْخَنْدَقِ إِنَّ جَابِرًا قَدْ صَنَعَ لَكُمْ سُورًا، فَحَيَّهَلاَ بِكُمْ»، وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): «لاَ تُنْزِلُنَّ بُرْمَتَكُمْ، وَلاَ تَخْبِزُنَّ عَجِينَتَكُمْ حَتَّى أَجِيءَ». فَجِئْتُ وَجَاءَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَقْدُمُ النَّاسَ، حَتَّى جِئْتُ امْرَأَتِى، فَقَالَتْ: بِكَ وَبِكَ! فَقُلْتُ: قَدْ فَعَلْتُ الَّذِى قُلْتِ لِى، فَأَخْرَجَتْ لَهُ عَجِينَتَنَا، فَبَصَقَ فِيهَا، وَبَارَكَ، ثُمَّ عَمَدَ إِلَى بُرْمَتِنَا، فَبَصَقَ فِيهَا، وَبَارَكَ، ثُمَّ قَالَ: «ادْعِى خَابِزَةً فَلْتَخْبِزْ مَعَكِ، وَاقْدَحِى مِنْ بُرْمَتِكُمْ وَلاَ تُنْزِلُوهَا، وَهُمْ أَلْفٌ، فَأُقْسِمُ بِاللَّهِ لأَكَلُوا حَتَّى تَرَكُوهُ، وَانْحَرَفُوا وَإِنَّ بُرْمَتَنَا لَتَغِطُّ كَمَا هِىَ، وَإِنَّ عَجِينَتَنَا (أَوْ كَمَا قَالَ الضَّحَّاكُ) لَتُخْبَزُ كَمَا هُوَ. {الحديث: ٥٢٨٣ = ٥٢٧٤ فم. تجريد/٣، رقم: ٢٠٥٠ = ٣٠٧٠ + ١٥٥٠ تجريد/٤ = ٤١٠١}: [١٣٢٢]

---

[١٣٢٢] تجريد/٣، ژمارە: ١٣٥٠ = ٣٠٧٠ بخارى. پوختەی موسلیم: ١٥٣٢ = ٥٢٨٣ شیحا (بخارى رقم الكتاب/٦٤ رقم الباب/٢٩).

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لەڕۆژی غەزای خەندەق، لەکاتی هەڵکەندنی خەندەکەکەدا، سەرنجمدا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەواو برسیبوو، جا چوومەوە بۆلای ژنەکەم پێیم گوت: هیچمان هەیە؟ دەبینم پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەواو برسییەتی، ئەویش هەمانەیەکی هێنا مەنێ جۆی تیادابوو، بەرخۆلەیەکی دەستەمۆشمان هەبوو ئەویشم سەربڕی، جا ئەو جۆکەی هاڕی‌و منیش بەرخەکەم جنی‌و کردمە ناو دیزەکەیەوەو هەردوکمان پێکەوە لێ بووینەوە، ئیتر ویستم بچمەوە بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ژنەکەم گوتی: ها! ڕوو زەردم نەکەی، نەچی پێغەمبەرو ئەو هەموو عەشاماتەی کە لەگەڵیایەتی، هەموویان خوڵك بکەی‌و ئەو هەموو خەڵکە بڕژێنی بەسەرما، چونکە نانەکە کەمەو بەشی ئەوەندە ناکا، منیش چووم بەچپە عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! بەرخۆلەیەکمان سەربڕیوەو مەنێ جۆشمان هاڕیوە، خۆت‌و چەن کەسێ بفەرموون وەرن بۆ نیوەڕۆژە، کەچی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بانگەوازی هەڵداو فەرمووی: (ئەی ئەهلی خەندەق! جابیر قاوەڵتی نیوە ڕۆژەی دروست کردووە، بفەرموون بەزوویی بچین!).

ئەنجا فەرمووی: نە مەنجەڵەکەتان لەسەر سێ کوچکەکە دابگرن‌و نە هەویرەکەتان بکەن بەنان تا خۆم دێم). جا منیش گەڕامەوە، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) وەپێش مەردومەکە کەوت‌و هاتن، کە چوومەوە ژنەکەم گوتی: واوات لێ بێ بۆ وات کرد؟ گوتم: من هەرئەوەم گوت بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەخۆت گوتت: ژنەکە هەویرەکەی هێنا بۆ پێغەمبەرو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تفی پیرۆزیی خۆیی تێکردو نزای پیرۆزی بەسەردا خویندو ئەنجا چوو بۆلای مەنجەڵەکەو تفی کردە

**ئەویش‌و نزای پیرۆزیی بەسەر ئەویشدا خوێندو فەرمووی: (ژنێکی نانکەری تریش بانگکە با نانت لەگەڵدا بکاو، چێشتەکەیش بە ئەسکوێ لە مەنجەڵەکە تێ بکەو لەسەر ئاگرەکە دایمەگرن، هەزار کەس بوون سوێندم بەیەزدانی پاك هەتا توانییان نان‌و چێشتیان خوارد، هەتا لێیان مایەوەو پەڕیان لێ گرت بەڵام هێشتا مەنجەڵەکەمان وەك خۆی مابوو کەمی نەکردبوو!). {تاج/٣، زنجیرە: ١٠٦، ژمارە: ٣١٧٧} + {ریاض/٢، زنجیرە: ٥٦، ژمارە: ٥٢٠/٣٠}.**

١٣٢٣- حديث أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ قَالَ: قَالَ أَبُو طَلْحَةَ لأُمِّ سُلَيْمٍ لَقَدْ سَمِعْتُ صَوْتَ رَسُولِ اللَّهِ – صلى الله عليه وسلم – ضَعِيفًا ، أَعْرِفُ فِيهِ الْجُوعَ فَهَلْ عِنْدَكِ مِنْ شَىْءٍ قَالَتْ نَعَمْ . فَأَخْرَجَتْ أَقْرَاصًا مِنْ شَعِيرٍ ، ثُمَّ أَخْرَجَتْ خِمَارًا لَهَا فَلَفَّتِ الْخُبْزَ بِبَعْضِهِ ، ثُمَّ دَسَّتْهُ تَحْتَ يَدِى وَلاَثَتْنِى بِبَعْضِهِ ، ثُمَّ أَرْسَلَتْنِى إِلَى رَسُولِ اللَّهِ – صلى الله عليه وسلم – قَالَ فَذَهَبْتُ بِهِ ، فَوَجَدْتُ رَسُولَ اللَّهِ – صلى الله عليه وسلم – فِى الْمَسْجِدِ وَمَعَهُ النَّاسُ ، فَقُمْتُ عَلَيْهِمْ فَقَالَ لِى رَسُولُ اللَّهِ – صلى الله عليه وسلم – « آرْسَلَكَ أَبُو طَلْحَةَ » . فَقُلْتُ نَعَمْ . قَالَ بِطَعَامٍ . فَقُلْتُ نَعَمْ . فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ – صلى الله عليه وسلم – لِمَنْ مَعَهُ « قُومُوا » . فَانْطَلَقَ وَانْطَلَقْتُ بَيْنَ أَيْدِيهِمْ حَتَّى جِئْتُ أَبَا طَلْحَةَ فَأَخْبَرْتُهُ . فَقَالَ أَبُو طَلْحَةَ يَا أُمَّ سُلَيْمٍ ، قَدْ جَاءَ رَسُولُ اللَّهِ – صلى الله عليه وسلم – بِالنَّاسِ ، وَلَيْسَ عِنْدَنَا مَا نُطْعِمُهُمْ . فَقَالَتِ اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ . فَانْطَلَقَ أَبُو طَلْحَةَ حَتَّى لَقِىَ رَسُولَ اللَّهِ – صلى الله عليه وسلم – ، فَأَقْبَلَ رَسُولُ اللَّهِ – صلى الله عليه وسلم – وَأَبُو طَلْحَةَ مَعَهُ ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ – صلى الله عليه وسلم – « هَلُمِّى يَا أُمَّ سُلَيْمٍ مَا عِنْدَكِ » . فَأَتَتْ بِذَلِكَ الْخُبْزِ ، فَأَمَرَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ – صلى الله عليه وسلم – فَفُتَّ ، وَعَصَرَتْ أُمُّ سُلَيْمٍ عُكَّةً فَأَدَمَتْهُ ، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ – صلى الله عليه وسلم – فِيهِ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَقُولَ ، ثُمَّ قَالَ « ائْذَنْ لِعَشَرَةٍ » . فَأَذِنَ لَهُمْ ، فَأَكَلُوا حَتَّى شَبِعُوا ثُمَّ خَرَجُوا ، ثُمَّ قَالَ « ائْذَنْ لِعَشَرَةٍ » . فَأَذِنَ لَهُمْ ، فَأَكَلُوا حَتَّى شَبِعُوا ثُمَّ

خَرَجُوا ، ثُمَّ قَالَ « ائْذَنْ لِعَشَرَةٍ » . فَأَذِنَ لَهُمْ ، فَأَكَلُوا حَتَّى شَبِعُوا ثُمَّ خَرَجُوا ثُمَّ قَالَ « ائْذَنْ لِعَشَرَةٍ » . فَأَكَلَ الْقَوْمُ كُلُّهُمْ وَشَبِعُوا ، وَالْقَوْمُ سَبْعُونَ – أَوْ ثَمَانُونَ – رَجُلاً.

ئەنەس (رەزای خودای لیّ بیّ) فەرمووی: ئەبو طەلحە گوتی بە ئوممو سولەیم: گویّم لەدەنگی پیّغەمبەر بوو (درودی خودای لەسەر بیّ) دەنگی کزبوو، وادەزانم کە لەبەر برسیّتی واکزە، ئایا هیچت لەلا هەیە کە بۆیبنیّرین؟ گوتی: بەڵیّ، جا چەن کولیّرەیەکی جۆی دەرهیّناو بەلایەکی لەچکەکەی پیّچایەوەو خستیە بن دەستی منو ئەولای لەچکەکەی تیّوە ئاڵاندم تا نانەکان دەرنەکەونو کەس پیّیان نەزانیّ، ئەنجا ناردمی بۆلای پیّغەمبەر (درودی خودای لەسەر بیّ) کە چووم روانیم لەمزگەوتە. خەڵکەکە وان لەخزمەتیدا، منیش بە دیاریانەوە راوەستام. جا پیّغەمبەر (درودی خودای لەسەر بیّ) فەرمووی پیّم: ئەبو طەلحە ناردووتیّ؟ عەرزیم کرد: بەڵیّ، فەرمووی: نانی پیادا ناردووی؟ گوتم: بەڵیّ، جا فەرمووی بەوانەی کە لەخزمەتیا بوون: هەڵسن با بچین بۆ ماڵی ئەبو طەلحە ئەوەی کە ناردوویەتی لەویّ دەیخۆین! جا ئەوان کەوتنە ریّو منیش پیّش ئەوان گەرامەوە بۆ لای ئەبو طەلحەو حاڵەکەم تیّ گەیاند، ئەویش بە ئوممو سەلیمی گوت: ئەی ئوممو سولەیم! پیّغەمبەر وا خەڵکەکەی هیّناو هات. ئیّمەش نانی ئەم هەمموو خەڵکەمان نییە جا چار چییە؟ ئەویش گوتی: مەترسە، رووزەردیمان بەسەر نایەت، کاری پیّغەمبەر بیّ دانایی نییە، خوداو پیّغەمبەری خودا لەئیّمە باشتر ئاگایان لە کارەکە هەیە، ئیتر ئەبو طەلحە خۆی چوو بەپیری پیّغەمبەرەوەو لەگەڵیا هاتەوە بۆ ماڵەوە. پیّغەمبەر (درودی خودای لەسەر بیّ) فەرمووی: ئەی ئوممو سولەیم! خواردنت چی هەیە بیهیّنە، ئەویش کولیّرەکانی هیّنا، پیّغەمبەر (درودی خودای لەسەر بیّ) دەستووری دا وردیان کردن، ئوم سولەیمیش هیزۆڵکەیەکی هیّناو گوشی

بەسەر نانەوڵەکەداو پێی چەورکردو بوو بەپێخۆری‌و بوو بەچنگاڵ، ئەوسا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەوەندەی خودا حەزکا نزای بەسەردا خوێندو فەرمووی: فەرموو لەدەکەس بکە). فەرموویان لەدەکەس کردو دەکەس چوونە ژوورەوەو تاتێریان خوارد چنگاڵیان خواردو ئەنجا چوونە دەرەوە، ئیتر پێغەمبەر هەموو جارێ دەیفەرموو: رێگەی دەکەسی تریش بدە. وە دەکەسی تر دەچوونە ژوورەوە، تێر چنگاڵیان دەخواردو دەهاتنە دەرەوە هەتا پیاوەکان هەموویان تێرو پڕ نان‌و چنگاڵیان خوارد. ژمارەیان دەوری حەفتا – هەشتا پیاوێ دەبوون). {تاج/٣، ژمارە: ٣١٧٦}.

## (٢١) باب جواز أكل المرَقِ واستحبابُ أكْلِ اليقطين وَ إيثارِ أهْلِ المَائِدَةِ بعضهم بعضاً وَ إنْ كانُوا ضيفاناً إذا لَم يكْرَهْ ذلِكَ صَاحِبُ الطَعَامِ

## خواردنی مەرگە دروستە، خواردنی کوولەکە دروستە، دانیشتوانی سەر سفرە، با میوانیش بن، دروستە کە خواردنی باش هەڵبژێرن بۆ یەکتری، بە مەرجێ خانە خوێکە ئەوەی پێ ناخۆش نەبێ

١٣٢٤- عَنْ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) يَقُولُ إِنَّ خَيَّاطًا دَعَا رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لِطَعَامٍ صَنَعَهُ قَالَ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ فَذَهَبْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِلَى ذَلِكَ الطَّعَامِ فَقَرَّبَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خُبْزًا وَمَرَقًا فِيهِ دُبَّاءٌ وَقَدِيدٌ فَرَأَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَتَتَبَّعُ الدُّبَّاءَ مِنْ حَوَالَيْ الْقَصْعَةِ قَالَ فَلَمْ أَزَلْ أُحِبُّ الدُّبَّاءَ مِنْ يَوْمِئِذٍ (الحديث ٢٠٩٢، أطرافُهُ في: ٥٣٧٩، ٥٤٢٠، ٥٤٣٣،٥٤٣٥، ٥٤٣٦،٥٦٣٧، ٥٤٣٩)؛ [١٣٢٤]

[١٣٢٤] تجريد/٣، ژمارە: ٩٥٠ = ٢٠٩٢ بخاری. مسلم: ٢٠٤١ = محمد فؤاد = مسلم: ٥٢٩٣ شيحا = پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١٣١٤ = ٥٢٩٤ شيحا (بخاری رقم الكتاب/٣٤ رقم الباب/٣٠).

پێشەوا ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرمووی: بەرگدرویێ نانی دروست کرد بۆ پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) و بانگی کرد، گوتی منیش لەگەڵ حەزرەتدا چووم، کە نانەکەی دانا بریتی بوو لە نانی جۆ، مەرگەی کوولەکەو لەتکە گۆشت، سەرنجم دا پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) لەم لاو لای لەگەنەکەوە، کولەکەکەی دەچنیەوەو دەیخوارد، ئیتر منیش لەو ڕۆژەوە هەتا ئێستا حەزم لە کوولەکەیە) (تاج/ ٤/٧٣ –ش/د/ت/ن).

ئەمەیش دەقی ژمارە (١٣١٤)ی موختەصەری صەحیحی موسلیمە، کە ناسراوە بە پوختەی موسلیم:

عَنْ أَنَسِ بن مالك (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: دَعَا رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَجُلٌ، فَانْطَلَقْتُ مَعَهُ، فَجِيءَ بِمَرَقَةٍ فِيهَا دُبَّاءٌ، فَجَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَأْكُلُ مِنْ ذَلِكَ الدُّبَّاءِ وَيُعْجِبُهُ، قَالَ: فَلَمَّا رَأَيْتُ ذَلِكَ جَعَلْتُ أُلْقِيهِ إِلَيْهِ وَلاَ أَطْعَمُهُ، قَالَ: فَقَالَ أَنَسٌ: فَمَا زِلْتُ بَعْدُ يُعْجِبُنِي الدُّبَّاءُ. {الحديث: ٥٢٩٤ = ٥٢٨٥ فم}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەرگدروویێ نانی دروست کرد بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)و بانگی کرد. فەرمووی: منیش لەگەل حەزرەتدا چووم، کە نانەکەی دانا، برێتی بوو لەنانی جۆو مەرگەی کوولەکەو لەتکە گۆشت، سەرنجمدا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەملاو لای لەگەنەکەوە کوولەکەکەی دەچنییەوەو دەیخوارد، ئیتر منیش لەو ڕۆژەوە هەتا ئێستا حەزم لە کوولەکەکەیە). {تاج/٣، لاپەڕە: ٢١٧، زنجیرە: ٢١، ژمارە: ٢٧٠٧ – ش/د/ت/ن}.

ئەمەی سەرەوە گێڕانەوەی ژمارە: ٥٢٩٣ی موسلیمە، ئەمەیش گێڕانەوەی ئێرمیە. {تەجرید/٣/٢٣، ژمارە: ٩٥٠ = ٢٠٩٢ فتح الباري}.

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ نانی دروست کرد بۆ پێغەمبەرو بانگی کرد، منیش لەگەڵیدا چووم، مەرگەیەکیان دانا، کوولەکەی تیادابوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە کوولەکەکەی دەخواردو حەزی لێی بوو، منیش کە ئەوەم ڕەچاو کرد، کوولەکەکەم دەخستە بەردەمی پێغەمبەرو خۆم نەمدەخوارد. ئەنەس فەرمووی: ئیتر لەوساوە من حەزم لە کوولەکەیە).

## (٢٣) باب أكل القِثَّاءِ بالرُّطَبِ
## خواردنی خەیار بە ڕوتابەوە

١٣٢٥- عَنْ عَبْدِاللَّهِ بْنِ جَعْفَرِ بْنِ أَبِي طَالِبٍ رَضِي اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَأْكُلُ الرُّطَبَ بِالْقِثَّاءِ.(الحديث ٥٤٤٠، طرفاه في ٥٤٤٧، ٥٤٤٩):[١٣٢٥]

عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەری کوڕی ئەبو تالیب -ڕەزای خوا لە خۆیی و بابی بێ- فەرمووی: پێغەمبەرم دی -دروودی خوای لەسەر بێ- فەریکە خورما (ڕوتاب)ی دەخوارد بە ترۆزییەوە. وە فەرمووی: (فێنکی ترۆزیەکە گەرمیی خورماکە دەشکێنێ). (تاج/٤ ز/٢١ ل/٧٣ ژ/٢+٣).

**ڕوونکردنەوە:**

ڕشتەی ئەم فەرموودەیە لە ڕشتە چوارینەکانی بوخارییە، پیاوانی ڕشتەکە ئەمانەن (بڕوانە: ژمارە/٦٩٤ - بەرگی دووەم لاپەڕە/١١٦):

---

[١٣٢٥] تجرید/٥، ژمارە: ١٨١٥ = ٥٤٤٠ بخاری. مسلم: ٢٠٤٣ = پوختەی موسلیم/٣، ژمارە: ١٣٢٠ = ٥٢٩٨ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٧٠ رقم الباب/٣٩).

١- مامۆستای بوخاری، کە بوخاری ئەم فەرموودەیەی لەوەوە گێڕاوەتەوە، کەناوی عەبدولعەزیزی کوڕی عەبدوڵڵایە.

٢- شێخی شێخەکەی بوخاری، کەناوی: ئیبراهیمی کوڕی سەعدی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوفە (بڕوانە: ژمارە: ٩٩٣ تەجرید = ٢٠٤٨ فتح الباری = بەرگی/٣ ل/٥). مامۆستاکەی مامۆستاکەی بوخاری ئەم فەرموودەیە لەباوکی خۆیەوە دەگێڕێتەوە کە:

٣- سەعدی کوڕی ئیبراهیم، کوڕی عەبدولڕەحمان کوڕی عەوف، ئەویش ئەم فەرموودەیە دەگێڕێتەوە لە:

عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەری کوڕی ئەبوتالیب، -ڕەزاو ڕەحمەتی خودا لە هەموویان بێ- (بڕوانە: ژمارە: ٧٦١ تەجرید = ب/١ ل/١٨٨). پیاوی سێیەم لەم فەرموودەیەدا، کەسەعدە لە گچکەی پەیڕەوانە، واتە: لە صغاری تابعینە، کەناسراون بەچینی دووەمی موسوڵمانان، پیاوی چوارەمیش کە عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەرە لەگچکەی هاوڕێیانە، واتە: صغاری صەحابەیە، کە پێغەمبەر مردووە ئەو منالکار بووە. دوو فەرموودەی لەبوخاریدا هەیە، لەخاکی حەبەشە، کاتێ باوك‌و دایکی لەوێ کۆچکار بوون عەبدوڵڵا لەدایك بووە، دایکی ناوی ئەسمائی کچی عومەسە، یەکەم منالی موسوڵمانە کە لەحەبەشەدا لەدایك بووە، کاتێ باوك‌و دایکی لەحەبەشەوە هاتن بۆ مەدینە ئەویش لەگەڵیانا هات، دووبرای باوك‌و دایکی تریشی هەبوو، کەناویان موحەمەد و عەون بوو، ئەوانیش لەپاپۆڕەکەدا لەگەڵ ئەوانا کۆچیان کرد بۆلای پێغەمبەر، لەمەدینە، پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- دەستی هێنا بەسەریداو، فەرمووی: (خودایە: جێگەی جەعفەر بەمناڵەکانی پڕبکەرەوە). کاتێ پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێ- مرد، عەبدوڵڵا تەمەنی دە ساڵ بوو، لەجەنگی صفین دا

عەبدوڵڵا یەکێ بوو لەفەرماندەکانی ئیمامی عەلی، عەبدوڵڵا زۆر سەخی بوو، تەنانەت ناسراو بوو بە: بەحری جوود، واتە: دەریای سەخێتی، پیاوێکی پیاوانەی رەوشت بەرزی زمان پاكو رەوشت پاك بوو، رای وابوو کە گوێ گرتن لە گۆرانی و لەدەنگی خۆش قەیدی نییە، فەرموودەی لەپێغەمەرەوە لەبەرکردووە، ئەم زاتانە لەوەوە، لەپێغەمەرەوە، فەرموودەکانی ئەویانگێراوەتەوە: دووکورەکەی خۆی: ئیسماعیلو موعاویە، هەروا ئەبوجەعفەر محەمەدی کوڕی عەلیو قاسمی کوڕی موحەمەد و عوروەی کوڕی زوبەیر و سەعدی کوڕی ئیبراهیمی ئەکبەر و شەعبی و مورق العجلی و عەبدوڵڵای کوڕی شدادو حەسەنی کوڕی سەعدو عەباسی کوڕی سەهلی کوڕی سەعدو کەسانی تریش. لەمەدینە مرد، ساڵی هەشتای کۆچی، لەتەمەنی نەوەد ساڵیدا، (بڕوانە: فەرموودەی ژمارە/١٥٧٦ تەجرید = ٤٢٣٠، ٤٢٣١، فتح الباری + ١٥٨٠ تەجرید = ٤٢٦١ فتح الباری = بەرگی چوارەم ل/٣٢١) + (تاج/٤ ز/١٠٢ ل/٣٢٧ ژ/١).

## (٢٥) باب نهي الأكل مَعَ جَمَاعَةٍ عَنْ قِرانِ تَمْرَتَيْنِ وَنَحوِهِمَا لُقْمَةٍ إلا بإذْنِ أصْحَابِه

## ڕێگری لە خواردنی خورماو شتی تری وا دوو دەنك دوو دەنك پێکەوە، مەگەر مۆڵەت لە هاوڕێکانی وەربگرێ

١٣٢٦- عَنْ جَبَلَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قال: كُنَّا بِالْمَدِينَةِ فِي بَعْضِ أَهْلِ الْعِرَاقِ فَأَصَابَنَا سَنَةٌ، فَكَانَ ابْنُ الزُّبَيْرِ يَرْزُقُنَا التَّمْرَ فَكَانَ ابْنُ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما) يَمُرُّ بِنَا فَيَقُولُ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَهَى عَنْ

الإِقْرَانِ إِلاَّ أَنْ يَسْتَأْذِنَ الرَّجُلُ مِنْكُمْ أَخَاهُ). (الحديث ٢٤٥٥، أطرافُهُ في: ٢٤٨٩، ٢٤٩٠، ٥٤٤٦):[١٣٣٦]

جەبەلە - رەحمەتی خودای گەورەی لێ بێ — فەرمووی: جارێ لەگەڵ وەفدێکی عێراقی دا لەمەدینە بووم، لەو سەردەمەدا کە عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر(ڕەزای خوای لێ بێ) جێنشینی سەر مەدینە بوو، ساڵەکەی گرانیو وشکەساڵ بوو، ئیبنو زوبەیر بەخورما موچەی ساڵانەی پێمان دا، جاروبار کە ئیبنو عومەر(ڕەزای خوای لێ بێ) دەهات بۆ ناومان دەیفەرموو: پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێ) نەیی کردووە لەوە کە مرۆڤ دوو دەنك دوودەنك خورما پێکەوە بخوات، ئیبنو عومەر(ڕەزای خوای لێ بێ) دەیفەرموو: (بەڵام ئەگەر هاوڕێکانی ڕێگەی ئەوەی بدەن ئەو کاتە دروستەو ناباشی نییە ). (تاج/٤/ل-٦٨ز-٢٠ف-٥).

## ڕاڤەو شیکردنەوە:

ئەم نەیی کردنە لەجووت کردنی دوو دەنك لەکاتی خواردنداوبۆ هەموو میوەیەکە، هۆی ئەم نەیی کردنەش دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆیەك:

١- ئەدەبی خوانو دەستووری نانخواردن ئەوە دەخوازێ، بەتایبەت ئەگەر لەگەڵ کۆمەڵ دابێ.

٢- لەکاتی ئاوو نانخواردندا هەرچی هەڵپەهەڵپو زۆر خۆریو چاوچنۆکی بێ باش نییە.

---

[١٣٣٦] تجرید/٣، ژمارە: ١٠٦٥ = ٢٤٥٥ بخاری. مسلم: ٢٠٤٥ محمد فؤاد = پوختەی موسلیم: ١٣١٩ = ٥٣٠١ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٤٦ رقم الباب/١٤).

٣- شتی هاوبەش بەبێ مۆڵەت وەرگرتن لەهاوبەشەکان، تەصەروفێ سەربکێشێ بۆ بەکارهێنانی پتر لەبەشی خۆت ناباشە.

٤- کاتی گرانیو نەبوونی، رزقو رۆژی هاوبەش بەیەکسانی بێ باشە.

ئەمەیش ژمارە (١٣١٩)ی پوختەی موسلیمە، بەهرەی پتری واتیادا، لەبەرئەوە لەدواوە راگوێزی دەکەم:

عَنْ جَبَلَةَ بْنَ سُحَيْمٍ قَالَ: كَانَ ابْنُ الزُّبَيْرِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) يَرْزُقُنَا التَّمْرَ، قَالَ: وَقَدْ كَانَ أَصَابَ النَّاسَ يَوْمَئِذٍ جُهْدٌ، وَكُنَّا نَأْكُلُ، فَيَمُرُّ عَلَيْنَا ابْنُ عُمَرَ وَنَحْنُ نَأْكُلُ فَيَقُولُ: لاَ تُقَارِنُوا فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) نَهَى عَنِ الإِقْرَانِ، إلاَّ أَنْ يَسْتَأْذِنَ الرَّجُلُ أَخَاهُ، قَالَ شُعْبَةُ: لاَ أُرَى هَذِهِ الْكَلِمَةَ إلاَّ مِنْ كَلِمَةِ ابْنِ عُمَرَ. يَعْنِي الاِسْتِئْذَانَ. {الحديث ٥٣٠١ = ٥٢٩٢ فم. تجريد/٢، لاپەڕە: ١٥٨، ژمارە: ١٠٦٥ = ٢٤٥٠٠، ٢٤٨٩، ٢٤٩٠. أبو داود. أطعمة: ٢٨٣٤. ترمذي. أطعمة: ١٨١٤}:

جەبەلەی کوڕی سوحەیم فەرمووی: ساڵێ گرانی بوو، لەکاتی جێنشینی عەبدوڵلای کوڕی زوبەیردا، لەسەر وڵاتی حیجاز، لەباتی پارەی مووچەی ساڵانە، ئیبنو زوبەیر خورمای پێماندا، ئێمەیش دەمانخوارد، جاری وادەبوو، عەبدوڵلای کوڕی عومەر تێدەپەڕی بەلامانا، لەوکاتەدا ئێمە خەریکی خورما خواردن بووین، دەیفەرموو: (جووت جووت مەخۆن) چونکە خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) نەهیی دەکرد لەوە کە مرۆڤ دوو دەنک دوو دەنک خورما پێکەوە بخوا، مەگەر بەمەرجێ هاوڕێکانی رێگەی ئەوەی پێ بدەن.

شوعبە (رەحمەتی خودای لێ بێ) کە کەسی سێیەمە، لە رشتەی ئەم فەرموودەیەدا، دەفەرموێ: (ئەوەی کە دەفەرموێ: مەگەر بە مەرجێ هاوڕێکانی رێگەی ئەوەی پێ بدەن، وا دەزانم ئەم رستەیە قسەی ئیبنو عومەر خۆیەتی).

{تاج/٣، زنجيره: ٢٠، ژماره: ٢٦٩٨} + {رياض/٢، لاپەڕە: ٢٥٤، زنجيره: ١٠٣، ژمـاره: ٧٣٩}.

## (٢٧) باب فضل تَمْرِ مَدِينة
## باسی پیرۆزیو بەهرەی خورمای مەدینە

١٣٢٧- عَنْ سَعْدِ بْـنِ أَبِـى وَقَّـاصٍ (رَضِـيَ اللهُ عَنْـهُ) قَـالَ: سَـمِعْتُ سَـعْدًا يَقُـولُ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) يَقُولُ: «مَنْ تَصَبَّحَ بِـسَبْعِ تَمَـرَاتٍ عَجْـوَةً لَـمْ يَضُرَّهُ ذَلِكَ الْيَوْمَ سُمٌّ وَلاَ سِحْرٌ». {الحديث: ٥٣٠٦ = ٥٢٩٨ فـم. تجريـد/٥/٩٢، رقـم: ١٨١٧ = ٥٤٤٥، ٥٧٦٨، ٥٧٦٩، ٥٧٧٩. أبو داود. طبّ: ٣٨٧٦}:[١٣٢٧]

سـەعدی كـوڕی ئـەبو وەقـاص (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: لـە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەر بێ): (هەركەسێ بەیانیان لەسـەر خـواردنی حـەوت دەنـك خورمـای (عـەجوە) بخـوات، ئـیتر ئـەو ڕۆژە نـە ژەهرو نە جادوو زیانیان نابێ بۆی).

## (٢٨) باب فضل الكمأة وَمُدَاوَاةِ العَينِ بِهَا
## دوومەڵانیش جۆرێكە لە گەزۆ، ئاوەكەی دەرمانە بۆ چاو

١٣٢٨- عَنْ سَعِيدِ بْنِ زَيْدِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنْ النبي (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَمَ) قَالَ: «الْكَمْأَةُ مِنَ الْمَنِّ الَّذِى أَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ عَلَى موسـى، وَمَاؤُهَـا شِـفَاءٌ لِلْعَـيْنِ».

---

[١٣٢٧] تجريـد/٥، ژمـاره: ١٨١٧ = ٥٤٤٥ بخـاری. پوختـەی موسـليم/٤، ژمـاره: ١٤٧٤ = ٥٣٠٦ شـيحا (بخاری رقم الكتاب/٧٦ رقم الباب/٥٢).

{الحـــديث: ٥٣١٣ = ٥٣٠٤ فـــم. تجريـــد/٤، رقـــم: ١٦٣٢ = ٤٤٧٨، ٤٦٣٩، ٥٧٠٨}:[١٣٢٨]

سەعیدی كوڕی زەید (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (دوومەڵان لەچەشنی ئەو گەزۆیە كە خودای گەورەو سەروەر بارانی بۆ نەوەی ئیسرئیل، كە ناسراون بە بەنی ئیسرائیل، وە ئاوەكەی دەرمان (شیفا)یە بۆ چاو). {تاج/٣، زنجیرە: ٦٥، ژمارە: ٢٩٩٤ ج/٤ = چاپی چوارەم} + {ریاض/٤، زنجیرە: ٣٧٠، ژمارە: ١٨٦٨}.

**ڕوونكردنەوە:**

واتە: دوومەڵانیش وەك ئەو گەزۆیەی كە لەسارای سینادا، لەكاتی سەرگەردانییەكەی نەوەی ئیسرائیلدا، دەباری بۆیان، وەك ئەو لەخۆیەوە بەبێ كەسێ بیروێنێ خۆی دەڕوێ.

## (٢٩) باب فَضِيلَةِ الأَسْوَدِ مِنَ الكَبَاثِ
## بەری دار سیواك، ڕەشەكەی خۆش و باشە

١٣٢٩- عَنْ جَابِرِ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما) قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَجْنِي الْكَبَاث وَانَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: (عَلَيْكُمْ بالاسْوَدِ مِنْهُ فَانَّهُ اطيَبُهُ)، قَالُوا: اكُنْتَ تَرْعَى الْغَنَمَ؟ قَالَ: (وَهَلْ مِنْ نَبِيّ الا وَقَدْ رَعَاهَا) (الحديث:٣٤٠٦، طرفه في:٥٤٥٣ ):[١٣٢٩]

---

[١٣٢٨] تجرید/٤، ژمارە: ١٦٣٢ = ٤٤٧٨ بخاری. پوختەی موسلیم/٤، ژمارە: ١٤٧٦ = ٥٣١٣ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٣ رقم الباب/٤).

[١٣٢٩] تجرید/٤، ژمارە: ١٣٦٠ = ٣٤٠٦ بخاری. مسلم: ٢٠٥٠ محمد فؤاد، پوختەی موسلیم: ١٣٢١ = ٥٣١٧ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٦٠ رقم الباب/٢٩).

جابیر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ لەمەڕو ظەهران، لە خزمەتی پێغەمبەردا بووین (دروودی خودای لێ بێ) بەری دارسیواکمان دەڕنی، فەرمووی (دروودی خودای لێ بێ): (ڕەشەکەی بڕنن، ڕەشەکەی خۆشە) عەرزمان کرد: قوربان! دەڵێی ڕانت لەوەڕاندووە، کەوا باشی لێ دەزانیت؟ فەرمووی: (ئەدیی، بۆچی پێغەمبەر هەیە کەشوانی ڕانی نەکردبێ!). تاج/٤/ ل/٧٣ ز/٢١ - باسی خواردەمەنی.

## (٣٢) باب إكرام الضَّيف وَفضلُ إيثارِهِ
## ڕێزگرتنی میوانو نانی باش پێشکەشکردنی

١٣٣٠- عَنْ ابي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عنـهُ) انَّ رَجُـلا اتَـى النَّبـيَ(صَـلّى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) فَبَعَثَ الَى نِسَائِهِ فَقُلْنَ مَا مَعَنَا الا الْمَـاء فَقَـالَ رَسُـولُ اللّـهِ (صَـلّى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ): (مَنْ يَضمُّ اوْ يُضيفُ هَذا فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ الانْصار انَـا فَـانْطَلَقَ بِـهِ الَـى امْرَاتِـهِ فَقَالَ: اكْرِمِي ضيْفَ رَسُولِ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فَقَالَـتْ: مَـا عِنْـدَنَا الا قُـوتُ صِبْيَانِي فَقَالَ هَيِّئِي طعَامَكِ وَاصبِحِي سِرَاجَكِ وَنَوِّمِي صِبْيَانَكِ اذا ارَادُوا عَشَاء فَهَيَاتْ طعَامَهَا وَاصبَحَتْ سِرَاجَهَا وَنَوَّمَتْ صِبْيَانَهَا ثمَّ قَامَتْ كَانَّهَـا تُـصْلِحُ سِـرَاجَهَا فَاطفَاتْـهُ فَجَعَلا يُرِيَانِهِ انَّهُمَا يَاكُلان فَباتَا طاوِيَيْنِ فَلَمَّا اصْبَحَ غَدَا الَى رَسُـولِ اللّـهِ (صَـلّى اللّـهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: ضحِكَ اللّهُ اللّيْلَةَ اوْ عَجِبَ مِنْ فَعَالِكُمَـا فَـانْزَلَ اللّـهُ: ﴿وَيُـؤْثِرُونَ عَلَى انْفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ وَمَنْ يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَاولَئِـكَ هُـمْ الْمُفْلِحُـونَ﴾. (الحديث: ٣٧٩٨، طرفه في: ٤٨٨٩)[١٣٣٠]:

---

[١٣٣٠] تجريد/٤، ژمارە: ١٤٨٩ - ٣٧٩٨ بخاری. مسلم: ٢٠٥٤ ترقيم محمد فؤاد لصحيح مسلم: ٥٣٢٧ شيحا (بخاری رقم الكتاب/٦٣ رقم الباب/١٠).

لەتاج دا ئاوایە: دەیكەین بەشەرحی ئێـرە: ئـەبو هـورەیرە (رەزای خـودای لـێ بـێ) فـەرمووی: پیـاوێ هاتەخزمـەتی حـەزرەت (دروودی خـودای لـێ بـێ) فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! لەبرسانا لاكەی سەرم دێ! ئەویش یەكە یەكە ناردی بـۆ خـواردن بـۆ لای هاوسـەرەكانی خـۆی - رەزای خودایـان لێ بـێ - بـەڵام هیچی لێ هەڵنەكراندن، ئەوجا فەرمووی: ئـای بـۆ پیـاوێ ئـەم شـەو داڵدەی ئـەم پیاوە بداو میوانداریی پێ بكا، پیاوێ لەیاریدەدەران (ئەنصار) هەڵسا گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! من میوانداریی بۆ دەكەم.

جـا ڕۆیـشتنەوەو لـە ماڵـەوە بەژنەكـەی گـوت: ئەمـە میـوانی پێغەمبـەرە (دروودی خودای لـێ بـێ) هـیچ درێغـی لەگـەڵ مەكـە، ژنەكـەی گـوتی: بـە خـودا بەس خـۆراكی منداڵـەكان گومـان دەبـەم، گـوتی: كـاتێ منداڵـەكان داوای شـێویان كـرد، گورگانـە شـەوێیان بـۆ بكـەو بیانخەوێنـەو كـە نانـەكت بـۆ ئێمـە دانـا، بـە بیـانووی چـرا چـاككردنەوە خۆشـت وەرەو چـراكە بكوژێنـەوە، ئـەم شـەوخۆمان بەسكی خاڵی شەو دەكەینەوە با میوانەكەی پێغەمبەر (دروودی خودای لـێ بـێ) بـێ خزمـەت نـەبێ و نانەكـەی بـە تێروتەسـەلی بخـوا شـەوێ هـەر شـەوێكە، هەرچۆنێ بێ دەڕوا، ژنەكەیشی وای كرد.

جـا بـۆ بـەیانی كەپیاوەكـە ڕۆیـشتەوە بـۆ خزمـەتی پێغەمبـەر (دروودی خودای لـێ بـێ) فـەرمووی: (بەڕاسـتی خـودای بـاڵا دەسـت و شـكۆدار ئـەم شـەو، سەیری هات لەكاری ئەم پیاوەو ژنەكـەی، یافـەرمووی: خـودا پێكـەنینی لـەكاری شیرین و جوانیان هات ئەوەندەی پێ خۆش بـوو، جـا خـودای گـەورەیش ئەمـەی بەم بۆنەیەوە ناردە خوارەوە: ﴿وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أَنْفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ﴾ (٩/٥٩) واتە: هەرچەند خۆشیان نەداراو كەم دەستن و دەسـتیان كورتـە لەگـەڵ ئەوەشا بەرچاویان تێرەو لەپیاوەتی و خێركردن نەترساوە). (تاج/٧ ل/١٨٩ ز/٤٢ ف/٧- سوورەتی حەشر).

١٣٣١- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ثَلاَثِينَ وَمِائَةً، فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «هَلْ مَعَ أَحَدٍ مِنْكُمْ طَعَامٌ»؟ فَإِذَا مَعَ رَجُلٍ صَاعٌ مِنْ طَعَامٍ أَوْ نَحْوُهُ، فَعُجِنَ، ثُمَّ جَاءَ رَجُلٌ مُشْرِكٌ مُشْعَانٌّ طَوِيلٌ بِغَنَمٍ يَسُوقُهَا، فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «أَبَيْعٌ أَمْ عَطِيَّةٌ» أَوْ قَالَ: «أَمْ هِبَةٌ»؟ قَالَ: لاَ بَلْ بَيْعٌ، فَاشْتَرَى مِنْهُ شَاةً، فَصُنِعَتْ، وَأَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِسَوَادِ الْبَطْنِ أَنْ يُشْوَى، قَالَ: وَايْمُ اللَّهِ مَا مِنَ الثَّلاَثِينَ وَمِائَةٍ إِلاَّ حَزَّ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حُزَّةً حُزَّةً مِنْ سَوَادِ بَطْنِهَا، إِنْ كَانَ شَاهِدًا أَعْطَاهُ، وَإِنْ كَانَ غَائِبًا خَبَأَ لَهُ، قَالَ: وَجَعَلَ قَصْعَتَيْنِ، فَأَكَلْنَا مِنْهُمَا أَجْمَعُونَ، وَشَبِعْنَا، وَفَضَلَ فِي الْقَصْعَتَيْنِ فَحَمَلْتُهُ عَلَى الْبَعِيرِ أَوْ كَمَا قَالَ. {الحديث: ٥٣٣٢ = ٥٣٢٣. تجريد/٣، رقم: ١١١١ = ٢٦١٨، ٢٢١٦، ٥٣٨٢}: [١٣٣١]

عەبدورەحمانی کوڕی ئەبوبەکری صەدیق (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: سەدو سیی کەس بووین، لەسەفەرێکا، لەخزمەتی پێغەمبەردا بووین، خۆراکمان هاتە کزیو برسیمان بوو، پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کەستان خۆراکی پێ هەیە؟) پیاوێ مەنێ خۆراکی پێ مابوو، یا دەوری مەنێ دەبوو، شێلایانو کردیان بەنان. جا کابرایەکی بتپەرستی قژ ئالۆزکاوی قووچی درێژ داهۆڵ، رانێکی بەرەو ئێمە هێنا، بەرەو شوێنێ لێی دەخوری، پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (یا بە فرۆشتن، یا بەپیاوەتی ئاژەڵێکمان پێ بدە؟) یا پێی فەرموو: (یا بەدیاریو بەخشین؟).

کابرا گوتی: بەفرۆشتن دەتاندەمێ، جا ئاژەڵێکی لە رانەکەی لێ کڕی، فەرمانی فەرموو سەریان بڕیو پاکیان کرد، پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر

[١٣٣١] تجريد/٢، ژمارە: ١١١١ = ٢٦١٨ بخاری. پوختەی موسلیم: ١٥٣٣ - ٥٣٣٢ شیحا (بخاری رقم الكتاب٥١ رقم الباب/٣٨).

بێ) فەرمانیدا ناو سکەکەیان برژاند، سوێندم بەخودا ئەو (١٣٠) سەدو سیی کەسە، پێغەمبەر خۆی، هەریەکەی لەو ناوسکە، پارچەیەکی بۆ بڕیو دای پێی، ئەگەر هاوەڵەکە خۆی لەوێ بوایە دەیدایە دەست خۆی، خۆ ئەگەر لەوێ نەبوایە بۆی هەڵدەگرت هەتا دەهاتەوەو دەیدا پێی. جا کاتێ گۆشتی مەڕەکە کولا، کردی بەدوو قەرەوانە، ئەوجا هەمووومان بەدەوری ئەو قەرەوانەدا دانیشتینو هەموومان بە بەرەکەتی وجودی پێغەمبەر بە دەوریاندا جێمان بۆوەو دەستمان کرد بەخواردن لێیان، هەتا هەموومان تەواو تێرمان خوارد، کەچی هێشتا لەبەرمان مایەوە، خودا پیتو فەڕێکی ئاشکرای وای خستە ئەو مەنە خۆراکەو گۆشتی ئەو تاقە ئاژەڵە، جا ئەوەندە مابوو لەو خۆراکو مەرگەیێ من خۆم بارم کرد لە وشترێ، یا وەك راوی خۆی فەرمووی. {بڕوانە: ژمارە: ١٣٨ بۆ زانینی صاع} + {ژمارە: ١٨٦ = أوكما قال}.

روونکردنەوە:

عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبوبەکری صەدیقی کوڕی ئەبو قوحافە خۆیو ئەبوبەکری باوکیو ئەبو قوحافەی باپیری لە هاوەڵانی پێغەمبەر بوون، کوڕێکی بووە ناوی موحەممەد بووە، نازناوی ئەبو عەتیق بووە، کە ناسراوە بە (أبو عتيق محمد بن عبدالرحمن بن أبي بكر الصديق) دادەنرێ لەریزی صەحابە بچکۆلەکان، چونکە لەپێش مەرگی پێغەمبەرا لەدایك بووە، ئیبنو عەبدول بەڕ، لە ئیستیعابا دەفەرموێ: (ئەم بەهەرمیە کەچوار پشت صەحابەی پێغەمبەربن تەنیا بۆ ئەم چوار کەسە چەسپاوەو بەس: موحەممەدی کوڕی عەبدورەحمانی کوڕی ئەبوبەکری کوڕی ئەبو قوحافە) کە هەرچواریان بەخزمەت پێغەمبەر گەیشتوون.

عەبـدورەحمان بـرای حـەقی حـەزرەتی عائیـشەیە، واتـە: بـرای بـاوكو دایكییەتی. لەڕیزی لەشكری بێبڕوایانی قوڕەیشا، لەدژی موسوڵمانان ئامادەی شەڕی بەدرو شەڕی ئوحود بووە، پاڵەوانێكی ناسراو بوو، داوای كرد كە پاڵەوانێ بۆی بچێتە مەیدان، ئەبوبەكری باوكی ویستی بچێ بۆ مەیدان بۆی، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەیهێشتو پێی فەرموو: (خۆتمان پێ بهێڵە!).

دەڵێن: جارێ لەپاش ئیسلامبوونی عەرزی باوكی دەكاو پێی دەڵێ: لەشەڕی ئوحوددا تۆ بەرهەوێڵم كەوتی، دڵم بەرایی نەدەدا، دەنا دەمكوشتیت! ئەبوبەكر پێـی دەڵـێ: دەی ئەگـەر تـۆ بەرهـەوێڵی مـن بكەوتیتایـە، بـوارەم نـەدەدای دەمكوشـتیت! كـەكاتێ موسـوڵمان بـوو، موسـوڵمانێكی زۆر جـوانی لێ دەرچـوو، لەگەڵ ئیمامی خالیدی كوڕی وەلیدا ئامادەی شەڕی یەمامە بوو، حـەوت كەسـی لە سەركردەكانیان كوشت، یەكێكیان (محكم)ی یەمامـە بـوو، كـە لەسـەر كـەلێنێ لـە كەلێنـەكانی قەڵاكە بـوو، ئـیتر سوپای ئیسلام لـەو كەلێنـەوە هەڵڕژانـە نـاو قەڵاكەوە، عەبـدورەحمان كـوڕی گـەورەی ئەبوبـەكرە، لـە ئـوم ڕۆمانـە، پیـاوێكی پیاو چاكی دیـن قـایمی خـاوەن پـەیمانی راسـتگۆ بـوو، قـەت درۆی لێ نـەبینراوە، لەڕووداوی ئەل-جەمەلدا لەگەڵ عائیشەی خوشكی بوو، بەڵام موحەممەدی برای لەگـەڵ پێـشەوا عـەلی بـوو، ڕۆژێ موعاوییـە لەسـەر دوانگـە وتـارێ دەدا، لـە خەڵكەكە داوا دەكا، كە لەپاش خۆی، یەزیدی كوڕی هەڵبژێرن بەجێنشین!!

عەبدوڕەحمانیش دەفەرموێ: (بۆ ئەمە هیرقەلییەتە؟ كە دەستووریان وایـە هەركاتێ قەیصەر دەمرێ، قەیسەرێ تر لەشوێنی دادەنیشێ!).

موعاوییە لـەپاش ئـەم هەڵوێـستە سـەد هـەزار درەمـی زیـوینی بـۆ دەنێـرێ، بـەڵام ئـەو وەری نـاگرێو دەفـەرموێ: (ئـایینم نافرۆشـم بـۆ جیهـانم) جـا عەبـدوڕەحمان بـەرەو مەككـە دەكەوێتـە رێ، لـەڕێ لـەناو خـەودا بـە مـەرگی

کوتوپڕ دەمرێ، تەرمەکەی هەڵ دەگرنو دەیبەن بۆ مەککە لەوێ دەینێژن، ساڵی پەنجاو سێی کۆچی دەبێ. کاتێ عائیشە هەواڵی مەرگی دەبیستێ دەچێ بۆ حەج، لەمەککە دەچێتە سەر گۆڕەکەیو لەسەری دەگریو ئەم شیعرەی موتەممیمی کوڕی نوومیرە دەخوێنێتەوە، کە بەسەر مالیکی برایدا هەڵی داوە، لە بەحری طەویلە:

وَكُنَّا كَنَدْ مَانَيْ جُذَيْمَةَ حِقْبَةً
مِنَ الدَّهْرِ حَتَّى قِيلَ لَنْ يَتَصَدَّعَا
فَلَمَّا تَفَرَّقْنَا، كَأَنِّي وَمَالِكاً
لِطُولِ اجْتِمَاعٍ لَمْ نَبِتْ لَيْلَةً مَعَا

واتە:

وەک دوو هاودەمی گیانی بەگیانی
ڕۆژگارێ زۆرمان پێکەوە ڕانی!
گەردوون لەناکاو بێ چاوەڕوانی
ڕۆژگاری دووری و جودایی هانی!
تەونی جودایی وەهاتە نیوە
ڕێگەی پەیوەندی تەواو بڕیوە
منی لەکاکم وا دابڕیوە
دەڵێی لەمەوبەر یەکمان نەدیوە!

عەبدوڕەحمان لە سەرەتاوە ناوی عەبدولکەعبە بووە، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ناوەکەی گۆڕیو کردی بە عەبدوڕەحمان، چەند فەرموودەیەکی لە صەحیحدا هەیە، ئەم فەرموودەیەی ئێرەی (متفق علیە)یە،

شێخی بوخاریو موسلیم گێڕاویانەتەوە، ساڵێ لەپاش مەرگی عەبدوڕەحمان عائیشەی خوشکیشی دەمرێ (رەزای خودایان لێ بێ). {بڕوانە: ژمارە: ٤١ و ١٢٣٧ و ١٨٩} کە لەپێشەوە رابووردن، هەروا بۆ شانازیو سەروەرییەکانی ئەم بنەماڵەیە بڕوانە ئەم ژمارانە لە تەجریدی بوخاری، بەشی کوردییەکەی:

١- ژمارە: ٣ ژیاننامەی خاتوو عائیشەی کچی ئەبوبەکری صەدیق.

٢- ژمارە: ٧٥ ژیاننامەی خاتوو ئەسمای کچی ئەبوبەکری صەدیق.

٣- ژمارە: ٣٤٩ ژیاننامەی عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبوبەکری صەدیق لێرەدا ژیاننامەی ئەبوبەکری صەدیق، بەتێرو تەسەلی تۆمار دەکەین:

ئەبوبەکری صەدیق ناوی (عەبدوڵڵای کوڕی عوثمانە) ناسراوە بە ئەبوبەکری کوڕی ئەبو قوحافە، لەسەردەمی نەزانیدا ناوی عەبدولکەعبە بوو، پێغەمبەر گۆڕی بە عەبدوڵڵا، ئەبوبەکر قوڕەیشییە، تەمیمییە، دایکی ناوی سەلمای کچی صەخرە، ناسراوە بە ئوممولخەیر. لەپاش ساڵی فیل بەدوو ساڵو نیو لەدایك بووە، لەپێش هاتنی ئیسلامو لەپاش هاتنی ئیسلام هاوڕێتی پێغەمبەری کردووە، لەکاتی کۆچو لەسەفەری کۆچدا هاوڕێی پێغەمبەر بوو، لەهەرە موسوڵمانە پێشینەکانە، لەپاش مەرگی پێغەمبەر، بە هەڵبژاردن ئەبوبەکر بوو بەیەکەم جێنشینی پێغەمبەر، پیاوێکی سپیکاری لەڕکەلەی لاواز بوو، رووخۆشو نەرمونیان بوو، شارەزای زانستی بنەچەی عەرەب بوو، بەتایبەتی رەگەزی هۆزی قوڕەیش، بازرگان بوو، رەفتاری زۆر جوان بوو، هەمیشە خاوەنی دیوەخان بوو، متمانەی بەهەرکەسێ بکردایە بانگهێشتی لێ دەکرد بۆسەر ئیسلامەتی، زۆر کەس لەسەر دەستی ئەودا ئیسلام بووە، وەك: عوثمانی کوڕی عەففانو طەلحەو زوبەیرو سەعدو عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف. بە دەوڵەمەندی موسوڵمان بوو، بەڵام کاتێ مەرگ بوو بەمیوانی هیچی

لەپاش بەجێ نەما! چەندین کۆیلەی لەژیانی خۆیدا ئازاد کردووە، کە یەکێ لەوانە بیلالی حەبەشی بوو، پێغەمبەر (درووی خودای لەسەر بێ) خۆی بەفەرمانی خودا ناوی نا (صدیق).

ئەبوبەکر ئەو صاحیبی غارمیە، کە خودا لەم ئایەتەدا باسی فەضلی دەکاو دەفەرموێ: {إِلاَّ تَنصُرُوهُ فَقَدْ نَصَرَهُ اللّهُ إِذْ أَخْرَجَهُ الَّذِينَ كَفَرُواْ ثَانِيَ اثْنَيْنِ إِذْ هُمَا فِي الْغَارِ إِذْ يَقُولُ لِصَاحِبِهِ لاَ تَحْزَنْ إِنَّ اللّهَ مَعَنَا - التوبة}.

ئەبوبەکر رابەری خێربوو لەنێوانی خاتوو خەدیجەو پێغەمبەردا، هەتا لەئەنجاما پێغەمبەر مارەیکرد بۆ خۆی. ئەو رۆژەی کە پێغەمبەر (درووی خودای لەسەر بێ) وەفاتی کرد، ئەبوبەکر هەڵبژێررا کرا بەیەکەم جێنشینی پێغەمبەر (درووی خودای لەسەر بێ) ماوەی جێنشینییەکەی دووساڵو دەوری (٣) سێ مانگ بوو، رۆژی هەینی (٢١) بیستو یەکی (جمادی الآخرە) ساڵی سیازدەی کۆچی مەرگ بوو بەمیوانی بەهۆی نەخۆشی سیلەوە، خۆی رایسپارد کە ژنەکەی بیشوات کە ئەسمائی کچی عومەیس بوو، عومەری کوڕی خەتاب نوێژی مردووی لەسەر تەرمەکەی کرد، لەهۆدەکەی عائیشەدا، لەپاڵ گۆڕی پێغەمبەردا، بەشەو ناشتیان، تەمەنی (٦٣) شەستو سێ ساڵ بوو، بۆ زانینی چمکێ لە کۆششو هەوڵو فەضلی ئەبوبەکر بۆ خزمەتی ئیسلام بڕوانە ئەم شوێنانە:

١- تاجی کوردی بەرگی سێ، زنجیرە: ١٠٠، ژمارە: ٣١٥٥ + زنجیرە: ١٠١ بەتەواوی + تاج/٣، زنجیرە: ٣، ژمارە: ٣٢٣٤، ٣٢٣٥، ٣٢٣٦، ٣٢٣٧، ٣٢٣٨، ٣٢٣٩، ٣٢٤٠، ٣٢٤١، ٣٢٤٢، ٣٢٤٣، ٣٢٤٤ + تاج/٣، زنجیرە: ٤، ژمارە: ٣٢٥٤ + تاج/٣، زنجیرە: ٥، ژمارە: ٣٢٥٨ هەتا ژمارە: ٣٢٦٩ + تاج/٣، زنجیرە: ٨، ژمارە: ٣٢٧٤، ٣٢٧٥، ٣٢٧٣، ٣٢٧٦ + تاج/٣، زنجیرە: ٨، ژمارە: ٣٢٧٩، ٣٢٨٠ + ژمارە: ١٥٣٤ لەدواوە.

١٣٣٢- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُما) (أَنَّ أَصْحَابَ الصُّفَّةِ كَانُوا أُنَاسًا فُقَرَاءَ وَأَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ مَنْ كَانَ عِنْدَهُ طَعَامُ اثْنَيْنِ فَلْيَذْهَبْ بِثَالِث وَإِنْ أَرْبَعٌ فَخَامِسٌ أَوْ سَادِسٌ وَأَنَّ أَبَا بَكْرٍ جَاءَ بِثَلَاثَةٍ فَانْطَلَقَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِعَشَرَةٍ قَالَ فَهُوَ أَنَا وَأَبِي وَأُمِّي فَلَا أَدْرِي قَالَ وَامْرَأَتِي وَخَادِمٌ بَيْنَنَا وَبَيْنَ بَيْتِ أَبِي بَكْرٍ وَإِنَّ أَبَا بَكْرٍ تَعَشَّى عِنْدَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثُمَّ لَبِث حَيْث صُلِّيَتْ الْعِشَاءُ ثُمَّ رَجَعَ فَلَبِث حَتَّى تَعَشَّى النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَجَاءَ بَعْدَ مَا مَضى مِنْ اللَّيْلِ مَا شَاءَ اللَّهُ قَالَتْ لَهُ امْرَأَتُهُ وَمَا حَبَسَكَ عَنْ أَضيَافِكَ أَوْ قَالَتْ ضَيْفِكَ قَالَ أَوَمَا عَشَّيْتِيهِمْ قَالَتْ أَبَوْا حَتَّى تَجِيءَ قَدْ عُرِضوا فَأَبَوْا قَالَ فَذَهَبْتُ أَنَا فَاخْتَبَأْتُ فَقَالَ يَا غُنْثرُ فَجَدَّعَ وَسَبَّ وَقَالَ كُلُوا لَا هَنِيئًا فَقَالَ وَاللَّهِ لَا أَطعَمُهُ أَبَدًا وَايْمُ اللَّهِ مَا كُنَّا نَأْخُذ مِنْ لُقْمَةٍ إِلَّا رَبَا مِنْ أَسْفَلِهَا أَكْثرُ مِنْهَا قَالَ يَعْنِي حَتَّى شَبِعُوا وَصَارَتْ أَكْثرَ مِمَّا كَانَتْ قَبْلَ ذلِكَ فَنَظرَ إِلَيْهَا أَبو بَكْرٍ فَإِذا هِيَ كَمَا هِيَ أَوْ أَكْثرُ مِنْهَا فَقَالَ لِامْرَأَتِهِ يَا أُخْتَ بَنِي فِرَاسٍ مَا هَذا قَالَتْ لَا وَقُرَّةِ عَيْنِي لَهِيَ الْآنَ أَكْثرُ مِنْهَا قَبْلَ ذلِكَ بِثلَاث مَرَّاتٍ فَأَكَلَ مِنْهَا أَبو بَكْرٍ وَقَالَ إِنَّمَا كَانَ ذلِكَ مِنْ الشَّيْطان يَعْنِي يَمِينَهُ ثمَّ أَكَلَ مِنْهَا لُقْمَةً ثمَّ حَمَلَهَا إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَصْبَحَتْ عِنْدَهُ وَكَانَ بَيْنَنَا وَبَيْنَ قَوْمٍ عَقْدٌ فَمَضى الْأَجَلُ فَفرَّقَنَا اثنَا عَشرَ رَجُلًا مَعَ كُلِّ رَجُلٍ مِنْهُمْ أُنَاسٌ اللَّهُ أَعْلَمُ كَمْ مَعَ كُلِّ رَجُلٍ فَأَكَلُوا مِنْهَا أَجْمَعُونَ أَوْ كَمَا قَالَ). (الحديث ٦٠٢ – أطرافه في: ٣٥٨١، ٦١٤٠، ٦١٤١): [١٣٣٢]

عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبوبەکری صەدیق (ڕەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: دانیشتوانی میوانخانەی صوففە خەڵکێکی هەژار بوون، جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەوەی نانی دووکەسی هەیە

---

[١٣٣٢] تجرید/١، ژمارە: ٣٤٩ = ٦٠٢ بخاری. موسلیم: ٢٠٥٧ محمد فؤاد/ پوختەی موسلیم: ١٥٣٤ = ٥٣٣٣ شیحا (بخاری رقم الکتاب/٩ رقم الباب/٤١).



بایەکێ لەم میوانانە لەگەڵ خۆی بباتەوەو بیکا بەسێهەمیان، هەروا ئەوەی نانی چوار کەسی هەیە باپێنج هەمێ لەگەڵ خۆی بباتەوە، یا فەرمووی: باپێنج هەمێ یاشەش هەمێ لەگەڵ خۆی بباتەوە) ئیتر ئەبوبەکریش (ڕەزای خوای لێ بێ) سێ کەسی لەگەڵ خۆی هێنایەوە بۆماڵەوە، پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەر بێ) دەکەسی لەگەڵ خۆی بردەوە، عەبدوڕەحمان فەرمووی: ئێمە منو باوکمو دایکم بووین، راوی فەرمووی: وابزانم عەبدورەحمان فەرموشی: ژنەکەی منو نۆکەرێکیشمان لەگەڵ بوو. نۆکەرەکە هی ئێمەو ماڵی باوکم بوو، بەڵام ئەبوبەکر خۆی چووەوە بۆلای حەزرەتو لەلای ئەو شێوی کردەوە، هاتەوە ئەوەندەی خودا مەیلی لەسەربوو لەشەو رابووردبوو، جاژنەکەی پێ ی گوت: بۆچی درەنگ هاتیتەوەبۆلای میوانەکانت؟ ئەویش بەدایکمی فەرموو: ناشێ هەتا ئێستا شیوت بۆدانەنابن؟ دایکیشم فەرمووی: خۆلکیان کردن تانانیان بۆدابنرێ، بەڵام رازی نەبوون تاخۆت نەیەیتەوە. عەبدورەحمان فەرمووی: جامنیش لەترسی باوکم چووم خۆم شاردەوە نەبادا لەسەر میوانەکان قسەم پێ بڵێ. جاباوکم بانگی کردمو فەرمووی: خوێڕی! ئەوە لەکوێ ی؟ ئەی لچو لێوت بکرێ، ئەی واوالێکراو؟ ئەوە بۆنانت بۆئەم میوانانە دانەناوە؟ جا کەلەحاڵەکە حاڵی بوو بەمیوانەکانی فەرموو: دەبخۆن، بەنۆشی گیانتان نەبێ، دیارە سووچی خۆتان بووە، سابەوخودایە بەهیچ جۆرێ نابێ من لێی بخۆم، عەبدورەحمان فەرمووی: شتێکی سەیر رووی دا، بەهەقی خوا هەرپارووییەکمان لەخواردەمەنیەکە هەڵدەگرت لەبن پارووەکەوە بەرز دەبۆوەو پترو زۆرتر دەبوو، ئیتر هەروا هەتا تێرمان خوارد، کەچی نانەکە زیادی کردبوو، کەمی نەکردبوو، ئەبوبەکریش بەووردی سەرنجێکی ئەم حاڵەی داو فەرمووی: ئەرێ کچەکەی بەنی فیراسی ئەوە چییە؟ دایکیشم فەرمووی: منیش وەك تۆی لێ




دەزانم، بەڵام سوێندم بەوەی کەبووە بەمایەی ئەم چاوو دڵ ڕۆشنی یەم نانەکە ئێستا سێ قاتی پێشتریەتی و، لەپیت و فەڕی تۆو میوانەکانتەوە خودا پیت و فەڕی تێ خستووە، لەبەرئەوە ئەبوبەکریش (درودی خودای لەسەر بێ) سوێندەکەی خۆی شکاندو تیکەیەکی بۆ موفەڕکی لەونانە موفەڕکە خواردوو فەرمووی: دیارە ئەو سوێندەی کەخواردم لەم نانە نەخۆم ئەوە لەشەیتانەوە بوو، چونکە نانی پیرۆزی وا حەیفە مرۆڤ لێی نەخوا، ئەوجا قەرەوانەکەی بەخواردەمەنییەکەوە هەڵگرت و بردی بۆ خزمەتی حەزرەت، لەوێ دای نا بۆبەیانی، عەبدوڕەحمان فەرمووی: لەوەوپێش لەنێوانی ئێمەو لەنێوانی هۆزێکی تردا پەیمانێ هەبوو، ماوەی پەیمانەکەمان تەواو بوو بوو، سوپاکە کەهاتنەوە بۆمەدینە؟، حەزرەت (ڕەزای خوای لێ بێ) کردنی بەدوازدە بەشەوە هەر بەشێ لەوسوپایە سەرکردەیەکی بۆدانا، هەر سەرکردەیێ مەگەر خودا بۆخۆی بزانێ چەند کەسی لەگەڵ دا بوو، لەگەڵ ئەوەیشدا ئەو نان و چێشتە کەمە کەلەو قەرەوانەدا بوو، لەسەرەتاوە بەبەرەکەتی ئەبوبەکری صەدیق و لەدوایی دا بەپیرۆزیی حەزرەت (ڕەزای خوای لێ بێ) بەرەکەتێکی ئاشکرای وای تێ کەوت بەشی ئەو هەموو سوپایەی کردو ئەوانیش گشتیان لێیان خواردو بەسیانی کرد). (ریاض الصالحين/٣/١٠٨٢/ ١).

## (٣٣) باب فضيلة المُوَاساةِ في الطعَامِ القليل وأنَّ طعَامَ الإثنَيْنِ يكفى الثلاَثة ونَحو ذلك

## باسى خێرى زۆرى بەخشین لە کاتى کەمى خواردەمەنىدا، وە خواردەمەنى دوو کەس بەشى سێ کەس دەکا وە هەروەها

١٣٣٣- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّـهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ): «طَعَامُ الاِثْنَيْنِ كَافِى الثَّلاَثَةِ وَطَعَامُ الثَّلاَثَةِ كَافِى الأَرْبَعَـةِ». {الحـديث: ٥٣٣٥ = ٥٣٢٦ فم. تجريد/٥/٨١، رقم: ١٨٠٤ = ٥٣٩٢. ابن ماجـة. أطعمـة: ٣٢٥٤. تحفـة الأشراف: ٢٨٢٨}:[١٣٣٣]

ئـەبو هـورەیره (رەزاى خـوداى لێ بێ) فـەرمووى: خۆشەویسـت (دروودى خوداى لەسەر بێ) دەفەرموێ: (نانى دوو کـەس بەشـى سێ کـەس دەکـا، ونـانى سێ کـەس بەشـى چوارکەس دەکـا). {ریـاض/٢/٢٦٢، زنجـیره: ١١٠، ژمـاره: ٧٥٥ + ژماره: ٧٥٦ + تاج/٣/٢١٢، زنجیره: ٢٠، ژماره: ٢٦٩٥}.

## (٣٤) باب المؤمن يَأكُلُ في معًى واحِدٍ والكافرُ يَأكُلُ في سَبْعَةِ أمْعَاءٍ

## موسوڵمان کەمخۆرەو بە قنیاتە، بێباوەڕى ناموسوڵمان چاوبرسىو تێر نەخۆرە دەڵێى حەوت ورگى هەیە

١٣٣٤- عَنْ جَابِرٍ وَابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُم) أَنَّ رَسُـولَ اللَّـهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «الْمُؤْمِنُ يَأْكُلُ فِى مِعًى وَاحِدٍ وَالْكَافِرُ يَأْكُلُ فِى سَبْعَةِ أَمْعَاءٍ». {الحديث: ٥٣٤٣ = ٥٣٣٤ فم}:[١٣٣٤]

---

[١٣٣٣] تجريـد/٥، ژمـاره: ١٨٠٤ = ٥٣٩٢ بخـارى. پوختـەى موسـليم/٣، ژمـاره: ١٣١٠ = ٥٣٣٥ شـيحا (بخارى رقم الكتاب/٧٠ رقم الباب/١١).

[١٣٣٤] تجريد/٥، ژماره: ١٨٠٥ = ٥٣٩٤ بخارى. پوختەى موسليم: ١٣١٢ = ٥٣٤٣ شيحا (بخـارى رقـم الكتاب/٧٠ رقم الباب/١٢).

ئـەبو هـورەیرە (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پیـاوێ هـەبوو زۆری دەخوارد، کاتێ موسوڵمان بوو، کەمخۆر بوو، کە ئەمەیان عـەرزی حـەزرەت کـرد، فەرمووی (دروودی خـودای لەسـەر بێ): (موسـوڵمان کـەمخۆرەو بـە قەناعەتـەو خواردنی بەپیتو فەڕە، بەڵام کافرو بێ بڕوا چاو برسییەو سکەڕۆو سکدڕاوەو خواردنی بێ پیتو فەڕە، بۆیـە هـەردەخواو هـەر تێـر نابێ، وەك حـەوت ورگـی هەبێ وایـە). {تـاج/١٩٧/٣، زنجیرە: ١٦، ژمـارە: ٢٦٥٤} + {تەجریـد/٨١/٥، ژمـارە: ١٨٠٥ = ٥٣٩٤، ٥٣٩٣، ٥٣٩٥}.

ئەمـــەیش گێڕانـــەوەی ژمـــارە (١٨٠٥)ی تەجریـــدی بوخارییـــە بـــۆ ئـــەم فەرموودەیە، بەهرەی جوانی واتیادا:

عَنْ ابْنُ عُمَرَ رَضِي اللّٰهُ عَنْهُما أَنَّهُ لَا يَأْكُلُ حَتَّى يُؤْتَى بِمِسْكِينٍ يَأْكُلُ مَعَهُ، قَالَ نَـافِعُ الرَّاوِي عَنْهُ: فَأَدْخَلْتُ رَجُلًا يَأْكُلُ مَعَهُ فَأَكَلَ كَثِيرًا فَقَالَ يَا نَـافِعُ لَـا تُـدْخِلْ هَـذَا عَلَـيَّ سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: الْمُؤْمِنُ يَأْكُلُ فِي مِعًى وَاحِدٍ وَالْكَافِرُ يَأْكُـلُ فِي سَبْعَةِ أَمْعَاءٍ.(الحديث ٥٣٩٤ – طرفاه في: ٥٣٩٣، ٥٣٩٥):

نافیع –ڕەحمەتی خودای لێبێ- فـەرمووی: دەسـتووری ئیبنوعومـەر (ڕەزای خوای لێ بێ) وابوو نانی بەتـەنیا نـەدەخوارد، هەمیـشە نـانی لەگـەڵ هەژارانـدا دەخوارد، ئەگەر کەس نەبوایە، هەژارێکیان بۆ پەیدا دەکرد، هەتا نـانی لەگـەڵدا بخوات، جا جارێ هەژارێکم بـرد بـۆلای، نـانی لەگەڵیـدا خـوارد، بـەڵام زۆر زۆری خـوارد. فـەرمووی: ئـەی نـافیع! جارێ تـر ئەمـە مەهێنـە بـۆم کـەنانم لەگـەڵدا بخـوات، چـونکە مـن لەپێغەمـەرم ژنـەوتووە -دروودی خـوای لەسـەر بـێ- دەیفەرموو: (موسوڵمان کەمخۆرە و بەقنیاتە و خـواردنی بـەپیتو فـەڕە، دەڵێـی لەچاو کافردا یەك گەدەی هەیە، بەڵام بێبڕوا چاو برسییەو سکە ڕۆو سکدڕاوە و خواردنی بێ پیت و فەڕە، بۆیە هـەردەخواو تێرنـاخوا و تێـر نابێ، وەك لەچاو




پیاوی موسوڵماندا حەوت ورگی هەبێ وایە). (تاج/٤ ل/٥٣ ز/١٦ ژ/١٩ + ٢٠ ش/ت + م/ت).

ئەمەیش گێڕانەوەی ژمارە (١٣١٣)ی پوختەی موسلیمە لەم بارەیەوە:

عَنْ أَبِی هُرَیْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَسُولَ اللّـهِ (صَلَّى اللهُ عَلَیْهِ وَسَلَّمَ) ضَافَهُ ضَیْفٌ وَهُوَ كَافِرٌ، فَأَمَرَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَیْهِ وَسَلَّمَ) بِشَاةٍ، فَحُلِبَتْ، فَشَرِبَ حِلاَبَهَا، ثُمَّ أُخْرَى فَشَرِبَهُ، حَتَّى شَرِبَ حِلاَبَ سَبْعِ شِیَاهٍ، ثُمَّ إِنَّهُ أَصْبَحَ، فَأَسْلَمَ، فَأَمَرَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَیْهِ وَسَلَّمَ) بِشَاةٍ، فَشَرِبَ حِلاَبَهَا، ثُمَّ أَمَرَ بِأُخْرَى فَلَمْ یَسْتَتِمَّهَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَیْهِ وَسَلَّمَ): «الْمُؤْمِنُ یَشْرَبُ فِی مِعًى وَاحِدٍ، وَالْكَافِرُ یَشْرَبُ فِی سَبْعَةِ أَمْعَاءٍ». {الحدیث: ٥٣٤٧ = ٥٣٣٨ فم}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێکی بێباوەڕ (کافر) بوو بەمیوانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانیکرد بزنێکیان بۆ دۆشیو شیرەکەیان هێنا بۆی، ئەویش خواردیەوە، پاشان بزنێکی تریشیان دۆشی بۆی، ئەویشی خواردەوە، تا لەسەر ئەو حاڵە شیری حەوت بزنی خواردەوە، بۆ سبەینێ پیاوەکە ئیسلام بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی کرد بزنێکیان بۆ دۆشی، شیرەکەی خواردەوە، فەرمانی کرد بزنێکی تریشیان دۆشی بۆی، بەڵام بۆی تەواو نەکرا، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (موسوڵمان بۆ شت خواردنەوە یەك سکی هەیە، بەڵام بێباوەڕ (کافر) دەڵێی حەوت سکی هەیەو هەر حەوتیان پڕدەکا). {تاج/٣/١٩٨، زنجیرە: ١٦، ژمارە: ٢٦٥٥}.

١٣٣٥- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ أَنَّ رَجُلاً كَانَ يَأْكُلُ أَكْلاً كَثِيرًا ، فَأَسْلَمَ فَكَانَ يَأْكُلُ أَكْلاً قَلِيلاً ، فَذُكِرَ ذَلِكَ لِلنَّبِىِّ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ « إِنَّ الْمُؤْمِنَ يَأْكُلُ فِى مِعًى وَاحِدٍ ، وَالْكَافِرَ يَأْكُلُ فِى سَبْعَةِ أَمْعَاءٍ »: (١٣٣٥)

**لەژمارە (١٣٣٤)دا بەتەواوی رابورد.**

## (٣٥) باب لا يَعِيبُ الطعَامَ
## نەنگ لە خواردن نلگیرێ

١٣٣٦- عَنْ ابِي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عنهُ)قَالَ: مَا عَابَ النَّبِيُّ(صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) طعَامًا قَط انْ اشْتَهَاهُ اكَلَهُ وَالا تَرَكَهُ. (الحديث: ٣٥٦٣، طرفه في: ٥٤٠٩): (١٣٣٦)

**ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی پێغەمبەر (درووودی خودای لێ بێ) هەرگیز خراپەی لە خواردن و نان و ئاو نەدەگرت، ئەگەر حەزی لێی بوایە دەیخوارد، ئەگەر بەدڵیشی نەبوایە - وازی لێ دەهێناو بەس و نەنگ و ڕەخنەی لێنەدەگرت) (ریاض/٢ ل/٢٥٣ ز/١٠١ ژ/٧٣٦).**

**لەژمارە (١٣٣٤)ی پوختەی موسلیما ئاوایە:**

عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) عَابَ طَعَامًا قَطُّ، كَانَ إِذَا اشْتَهَاهُ أَكَلَهُ، وَإِنْ لَمْ يَشْتَهِهِ سَكَتَ. {الحديث: ٥٣٥١ = ٥٣٤٢ فم. تجريد/٤، رقم: ١٤٢٦ = ٣٥٦٣، ٥٤٠٩}:

(١٣٣٥) بڕوانە ژمارەکانی پێشەوە (بخاری رقم الكتاب/٧٠ رقم الباب/١٢).

(١٣٣٦) تجريد/٤، ژمارە: ١٤٢٦ = ٣٥٦٣ بخاری. مسلم: ٢٠٦٤، ترقيم محمد فؤاد = ١٣٣٤ = ٥٣٥١ شیحا (بخاری رقم الكتاب/٦١ رقم الباب/٢٣).




ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: هەرگیز نەمدیوە کە پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) خراپەو نەنگ لەخواردنو نانو ئاو بگرێ، دەستووری وابوو ئەگەر حەزی لێی بوایە دەیخوارد، ئەگەر بەدڵیشی نەبوایە وازی لێ دەهێناو بەسو نەنگو ڕەخنەی لێ نەدەگرت). {ڕیاض/٢، لاپەڕە: ٢٥٣، زنجیرە: ١٠١، ژمارە: ٧٣٦} + {تاج/٣، زنجیرە: ١٦، ژمارە: ٢٦٤٦}.